زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی 44

# چیرۆکی پێشینان لە قورئاندا




## لەبارەی ئیمان و بانگەوازی و جیهاددا

نووسینی
دکتۆر صلاح عبدالفتاح الخالدي

وەرگێڕانی
کاوە هاوڕاز



# مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشناکردنی خوێنەرە لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین.
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی.
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانە هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە.

دەگەڵ ڕێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستوورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

# چیـرۆكی
# پێشـینان له قورئاندا

## چەند وانەیەك لە ئیمـانو
## بانگـەوازو جیهـاد دا

## بەشی سـێیەم

نووسـینی
**د.صلاح عبدالفتاح الخالدي**

وەرگـێرانی
**كـاوه هاوراز**



ناوی کتێب بە عەرەبی: مع قصص السابقین فی القرآن (٣)
ناوی نوسەر: د.صلاح عبدالفتاح الخالدي
ناوی کتێب بەکوردی: چیرۆکی پێشینان لە قورئاندا بەشی سێیەم
ناوی وەرگێر: کاوە مصطفی (هاوراز)
چاپ و بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر
کۆمپیوتەرو نەخشەسازی: عزالدین محمد عمر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: ئەمین مخلص
نۆرە و سالی چاپ: یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری هونەر هەولێر ژمارەی سپاردن (٣٠٩) سالی ٢٠٠٤ ی پێدراوە

تفسير
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

**www.al-tafseer.com**

# پێشەکی

ان الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا. من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له. فأشهد أن لا إله إلا الله، وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله ﷺ.

ئنجا پاشان..

ئەمە بەشی سێیەمە لە (چیرۆكی پێشینان لە قورئاندا).. پێشتریش دوو بەشمان لێ كردە دیاری.. بەشی یەكەممان بۆ باسكردنی گرنگترین چیرۆكەكانی (بەنوئیسرائیل) تەرخان كرد، بەشی دووەمیشمان بۆ باسی چیرۆكەكانی سورەتی (كهف) تەرخان كرد. لە سەرەتای بەشی یەكەمیشدا دەربارەی (ئەو بەرنامە ڕاستو دروستو متمانەپێكراوەی تێڕوانین لە چیرۆكی پێشینەكان) دواین ، سیماو دیاردەكانی ئەو بەرنامەیەمان لەگەڵ بەڵگەكانی لە ئایەتەكانی قورئانو فەرموودە ڕاستەكانو، شێوازی تێگەیشتنی هاوەڵانو زانایانو لێكۆڵیارانی یەوە، خستە ڕوو. داواشمان لە هەموو ئەو كەسانە كرد، كە لە واتاو ماناكانی قورئان ورد دەبنەوەو سەرنجیان لێ دەدەنو، لەوانەش، كە دەربارەی زانستو زانیاریو ماناكانیو تەفسیركردنی دەنووسن، كە بەو بەرنامەیەوە پابەند بن. ئێمەش سووربووین لەسەر پابەندبوون بەم بەرنامەیە لەو چیرۆكانەی پێشینانی نێو هەرسێ لێكۆڵینەوەكانمانەوەو، هیواداریشین سەركەوتوو بووبین لە پابەندیمان پێوەی.

بۆیە دەچینەوە سەر بەرایی بەشی یەكەمو، بە بەراییی‌یەك بۆ ئەم بەشەشی لە قەڵەم دەدەین.. بەڵام لێرەدا ئەو خاڵانە دێنینەوە، كە لە پێشەكیی بەشی یەكەمو، لە پێشەكی بەشی دوەمیشدا دیاریمان كردبوون، كە چەند مەسەلەیەكم لە كاتی تێڕوانینمان لە چیرۆكەكانی پێشینان لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەو لێكۆڵینەوانەدا جەختمان لەسەریان كردبوون، كە ئەمانەن..

١- مانەوە لە کەش‌و هەوای ئەو دەقە قورئانیەدا، کە باسی ئەو چیرۆکانە دەکات‌و لێ دەرنەچوونیان‌و پیادا تێپەڕ نەبوونیان، تەنها بۆ سەر فەرمودە ڕاستەکانی پێغەمبەر نەبێت، کە تەنها پشت بەو دوو سەرچاوە ڕاست‌و جێی متمانەیە ببەسترێت.

٢- سووربوون لەسەر پەسەند نەکردنی هیچ هەواڵ‌و بەسەرهاتێکی درێژەپێدراوی نێو دەقە هەڵبەستراوەکانی جوولەکەکان، کە بە (ئیسرائیلیات) ناوبراون، هەروەها پەسندنەکردنی هیچ ڕیوات‌و هەواڵێکی پووچەڵ‌و ئەفسانەیی‌و، ڕەت کردنەوەی وتەو قسەو باسی هەرکەسێك، گەر لە هەر پلەو ئاستێکیشدا بێت، گەر لەو وتەو قسەو باسانەیدا پشتی بە دەقی ڕۆشنی قورئان‌و فەرموودەی ڕاست (صحیح) نەبەستبێت.

٣- ئاوڕدانەوە لە ڕەهەندە واقعییەکانی ئەو چیرۆکانەو، ئاماژەکارییش بۆ لێکچوون‌و هاوشێوەبوونی هەندێك دیمەن‌و وێنەو نمونەیان، لەگەڵ ئەو بارودۆخە هاوچەرخەی، کە تێیدا دەژیین‌و، هەروەها لێك چوون‌و گونجانی ئەو ڕەهەندە واقیعی‌و کردەیی‌یە زیندووەش، لەگەڵ ئەو پەندو دەلالەتانەی، کە لەو چیرۆکانەوە وەردەگیرێن.

٤- بڕوابوون بەوەی، کە ئەو چیرۆکانە بە چەند گەنجینەیەکی پاشەکەوت کراو دادەنرێن‌و، گەلێك پەندو وانەو، ڕاستی‌و بنەماو، سەرنج‌و تێڕوانینیان لەخۆگرتووەو، ئەو پەندو بنەماو تێڕوانینانەشی هەمەڕەنگ‌و شامیل‌و هەمەلایەنەن‌و، لە هەموو بوارو لایەنێکی وەك باوەڕداریتی‌و، بانگخوازی‌و، ڕەوشتمەندی‌و، فێرکاری‌و، سیاسی‌و، ئابووری‌و، سەربازی‌و جیهادی‌و، ژیاری‌و، مرۆڤایەتی‌و، چەندین لایەنی ترەوەن.

٥- چەق خستنە سەر ئەو وانە باوەڕداریتی‌و بانگخوازی‌و جیهادی‌و بەرنامەڕێژیانەی، کە لەو چیرۆکانەوە دەردەهاوێژرێن، بەو پێودانگەی گرنگترین

ئاتاجیو پێداویستیی بانگبەرانو چاکسازانو پەروەردیارانی لەم سەردەمەدا تێدایە.

ئەم بەشەی سێیەمیش لە چیرۆکی پێشینەکان، هەشت چیرۆکی لەخۆ گرتووە:

١- چیرۆکی (هاروتو ماroot)، لە سوورەتی (بقرة)دا.

٢- چیرۆکی ئەو پیاوەی کە بەلای (قریة)یەکدا تێپەڕی، کە هەر لە سوورەتی (بقرة)دایە.

٣- چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەم، لە سورەتی (مائدە)دا.

٤- چیرۆکی ئەو کەسەی کە ئایەتەکانی خوای پشت گوێ خست، لە سورەتی (أعراف)دا.

٥- چیرۆکی لوقمان، لە سورەتی (لقمان)دا.

٦- چیرۆکی گەلی (سەبەء)، لە سورتی (سبأ)دا.

٧- چیرۆکی دانیشتوانی گوندەکە، لە سوورەتی (یس)دا.

٨- چیرۆکی (اصحاب الاخدود)، لە سورەتی (بروج)دا.

لێرەشدا وتەی پێشووم دووبارە دەکەمەوە لەمەڕ ئەوەی من ئیدیعای ئەوە بۆ خۆم ناکەم کە گوایە هەموو دەرسو پەندو ئاماژەکانی نێو ئەو چیرۆکانەم دەرهێنابێت، چونکە من لەوەدا دەستەوستانمو، ئەوەی کە ئێمەی مرۆڤ زانستمان لەسەری پەیداکردبێت بڕێکی هێجگار کەمەو، بە دڵۆپێك لە ئاوی دەریایەك یان ئۆقیانووسێکیش دانانرێت، وەك چۆن (خدر) لەو کەشتە زانستیەی دا لەگەڵ (مووسا)دا، (سەلامی خوایان لێ بێت) کاتێك چۆلەکەیەك لەبەرچاویان هاتبوە سەر لێوارێکی کەشتی یەکەو دڵۆپێك لە ئاوەکەی بە دەنووکی خۆی خواردبۆوەو، ئەوانیش سەیریان دەکرد، لەوکاتەدا (خدر) بە (مووسا)ی گوتبوو: ((ئەرێ ئەو چۆلەکەیە چەندەی لە ئاوی دەریاکە برد؟)) (مووسا)ش لە وەڵامدا دەڵێت: ((دڵۆپە

ئاوێکی لێبرد)). ئنجا (خدر) پێی گوتۆتەوە: ((زانستی منو، زانستی تۆش بە بەراوردو پێوانەکاری لە ئاست زانستی خوادا وەك ئەو بڕە ئاوە کەمەیە کە چۆلەکەکە لە ئاوی دەریاکە بردوویەتی)).

شاعیرێکیش ڕاستی گوتووە، کاتێك ئەم دێڕە شیعرەی هۆنیوەتەوەو گوتویەتی:

قل لمن يدعي في العلم معرفة

حفظت شيئاً وغابت عنك أشياء

واتە: ئەو کەسەی ئیدیعای زانایی لە زانست دا بۆخۆی دەکات، پێی بڵێ: تۆ تەنها لە شتێکدا زاناو ئاگادارییت، بەڵام چەندەها شتی ترت لێ بزر بووە.

بەڕاستی منیش گەلێك لە دەرسو دەلالەتەکانی ئەم چیرۆکانەم لە ئەنجامی دەستەوسانیو کەمو کوڕیی خۆمدا لە دەست ڕۆیشتووە، هەر بۆیەش داوا لە خوێنکارو شاگردانی قورئان بە هەموو سەرنج لێدەرو تەفسیرکارو بلاوکەرەوانی زانستەکانیو واتاکانیشیەوە، دەکەم کە ئەوەی من تێبینیم نەکردووە، ئەوان تێبینی بکەنو، ئەوەش کە من هەڵوێستەم لەسەری نەکردووە، ئەوان هەڵوێستەی لەسەر بکەن.

هەروەها من پڕوپاگەندەی ڕاستیو ڕاستپێکی لە هەموو ئەو مەسەلانەی خستوومنە ڕووو درکاندوومن، بۆ خۆم ناکەم، چونکە پارێزراوی (العصمە) بۆ هیچ کەسێك لە مرۆڤەمان نیە، تەنها بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکان نەبێت.. دیارە لاوازیو دەستەوسانیو هەڵەکردنیش لەو خەسڵەتانەن کە بە دۆخی مرۆییمانەوەو زانستو کاری مرۆییمانەوە لکاون.. بێگومان هەر ئەوەندەی دادەنێم کە ئەگەر هەڵەیەك لە کارەکەم دا هەبێت ئەوە دیارە بە ئانقەستو ئامانجدار نەبووە، بەڵکو من هەوڵم داوەو کۆششم هەبووە.

بەم بەشەی سێیەمیش کۆتایی دێنین بەو ئەندازەیەی کە خوا بۆی دیاری کردووین لە لێدوان دەربارەی چیرۆکی پێشینەکان لە قورئاندا، بەم ڕەنگەش دەشێت

بڵێین ئەوا (حەوت ئەڵقەمان) لە زنجیرەی (لە گەنجینەکانی قورئانەوە) بڵاوکردۆتەوە (واتە بە عەرەبی).. لە سەرەتاو کۆتاییشدا سوپاس بۆ خوا. سوپاس بۆ خوا لەسەر فەزڵو چاکەو نیعمەتو ڕێنماییەکانی.. لە خواش دەپاڕێمەوە، کە هەموو کارەکانمان تەنهاو بە پوختی لە پێناو ڕێبازە پیرۆزەکەیدا بێتو بیانخانە نێو تەرازووی ڕۆژی قیامەتەوە.

وصلى الله على سيدنا محمد النبيّ الأميّ وسلّم تسليماً كثيراً.

صلاح عبدالفتاح الخالدي
نووسەری کتێبەکە
هەینی ٢٦-شوال ١٤٠٨ ك.
١٠-حوزەیران-١٩٨٨ ز.

# چیـرۆکی یەکـەم

## چیـرۆکی هـاروت و مـارووت

ئەم چیرۆکە لە دەقی قورئاندا، ئاوەها هاتووە، کە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟
ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟
ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟
يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ
أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ
ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ
وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا
شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ
مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ البقرة ﴾.

کورتەی واتای ئایەتەکـان:

کاتێك کۆمەڵێك لە ئەهلی کیتاب-کـە جوولەکـەکان بـوون- پێغەمبـەرێکیان لەلایەن خواوە-کە دوا پێغەمبەر محمد ﷺ بوو - بۆ هات و سەرەڕای ئـەوەی محمـد ﷺ پـشتگیری لـە ڕاسـتیی تـەورات دەکـرد، کەچـی ئـەوان کتێبەکـەی خـوا (تەورات)یشیان پشتگوێ خست و خۆیان لەو ناوەڕۆکـەی نـادان کـرد، وەك ئـەوەی گوایە نەزانن و نەیانبیستبێت، کە هەواڵی ئەم دوایین پێغەمبەری ی تێدایـەو، کـە دەبێت باوەڕی پێ بێنن و شوێنکەوتووی بن. ئیتر جوولەکەکان وازیان لە کتێبەکەی

خواو (تەورات)یش هێناو شوێنی نەکەوتن، بەڵکو دوای ئەو هەواڵە درۆو ناڕاستانە کەوتن کە شەیتانەکان دەربارەی موڵكو دەسەڵاتداریێتیی (سولەیمان) دەیانخوێندەوەو لە ماوەی حوکمی سولەیماندا بە خەڵکیان دەگەیاند. بەڵام خۆ (سولەیمان) کافرو بێباوەڕ نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان خۆیان کافر بوونو، خەڵکیان فێری سیحرو جادوگەریی دەکرد. هەروەها خەڵکیان فێری ئەو مەسەلانە دەکرد، کە بۆ (هارووتو مارووت) لە بابل دابەزی بوو، کە دوو فریشتە بوون لە بابەتداو مەبەستیشیان ئاگادارکردنەوەی خەڵکی بوو لە فڕوفێڵی سیحرو جادووگەریی، (تاکو پێی فریو نەدرێن)، بەڵام ئەم دوو فریشتەیە کەسیان فێری هیچ نەدەکرد، هەتا پێیان نەگوتایە (ئێمە بۆ تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنینو تۆش خۆ بێباوەڕ مەکە)، کەچی هەندێك کەسیان لەو بەدکارییەدا بەردەوام بوونو قسەو باسی وەها سەیرو سەمەرەیان لەو دوو فریشتەیەوە دادەتاشی، کە ژنو مێردیان پێ لە یەکتر جیادەکردنەوە، هەرچەندە ئەو جادووگەرانە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن (مەگەر تەنها بە ئیرادەی خوا نەبێتو بۆ کەسێکیش، کە خۆی بیسەرو بڕواپێکەریان بێت). خەڵکی گومڕاو سەرگەردانیش، هەمیشە شتێك فێر دەبن، کە زیانیان پێدەگەیەنێت، نەك سوودی هەبێت بۆیان، بێگومان ئەوان چاك دەزانن، کە ئەو کەسەی ئامڕازی ئاوای کڕی بێتو ئەو جۆرە شتە پووچەڵانە فێر بێت، ئەوا هیچ پاداشتێکی لە ڕۆژی دواییدا نابێت. بەڕاستی ئەو ئامڕازە نادروستەش، کە ئەوان هۆشو ویژدانو ژیانی خۆیان پێ فرۆشتوونو پێی هەڵخەڵەتاون، شتێکی زۆر خراپو نابەجێیە، ئەگەر بزانن و لێی وردبنەوەو تێیبگەن. خۆ ئەگەر خەڵکی لەجیاتی (تەفرەخواردن بە سیحرو جادووگەریی)و (هەروەها ئەو جوولەکانەش لە جیاتی فریوخواردنیان بەو ئامرازە نادروستانەی سیحربازیی) باوەڕیان بە خواو نێرراوانی بهێنایەو خۆپارێز بوونایەو لەخوا بترسانایا، ئەوا پاداشتێکیان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دەست دەکەوت، کە هەر ئەو پاداشتەی خواش بۆ ئەوان چاکترە ئەگەر (دووبارە) بیانزانیایەو لێی وردبنەوەو تێی بگەن.

# واتاکانی وشـه نامۆکـان

(مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ): ما جاء به الرسول -عليه السلام- مـصدق لما في التـورات ومقرر له.

واتا: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا محمد ﷺ هێناویەتی، بەڕاست دانـەری ئـەوەی نێو تەوڕاتو دان پیانەریشیەتی کە لە خواوە بووە.

(نَبَذَ): طرح وألقى

واتا: فەرامۆشیان کردو پشتگوێیان خستو خستیانە لاوە.

(كِتَٰبَ ٱللَّهِ): المراد به هنا التوراة

واتا: لێرەدا مەبەستی پێ لە تەوراتە.

(تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ): تقرأ وتخبر كذباً وباطلاً

واتا: ئەوەی کە شەیتانەکان بە درۆو ناڕاست دەیانخوێندەوەو هەواڵو قسەوباسی درۆیان لەسەر دەگەیاند.

(عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ): في فترة ملكه وحكمه

واتا: لەماوەی دەسەڵاتدارێتیی پادشاییو حوکمڕانیی دا

(وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ): ما هنا اسم موصول بمعـني الـذي والـواو قبلـها حـرف عطف.

واتا: لێرەدا ئامرازی گەیەنەری (ما) لە ڕێزمانی عەرەبی دا بە (اسم موصـول) دادەنرێتو مانای لا (الذي)ی هەیەو پیتی (واو)ەکەی بەردەمیشی ئامرازی لکاندن (عطف)ەو بە مانای: هەروەها ئەو ڕێنماییانەی کە بۆ هەردوو فریشتەکە نێررابـووە خوارەوە تاکو خەڵکی لە سیحرو جادووگەریی وریا بکەنەوە.

(بِبَابِلَ) : مدينة أثرية في العراق كانت مركز حضارة البابليين.

واتا: (بابل) شارێکی درێرینی پڕ شوێنەوارە لە عێراقداو سەنتەری شارستانیی بابلییەکان بووە.

(هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ): اسمان للملكين اللّذين كانا ببابل.

واتا: هارووتو مارووت ناوی ئەو دوو فریشتەیەیە، کە لە بابلدا بوون.

(نَحْنُ فِتْـنَةٌ): نحن اختبار وامتحان وابتلاء.

واتا: ئێمە هۆی هەڵسەنگاندنو تاقیکردنەوەو کێشانەتانین.

(ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ): الرجل وامرأته، واتا: پیاوو ژنەکەی.

(مِنْ خَلَٰقٍ): من حظ ونصيب، واتا: هیچ بەشو پاداشتێکیان نیە.

(شَـرَوْاْ بِهِۦ): باعوا به أنفسهم، واتا: خۆیان پێ فرۆشتووە.

(لَمَثُوبَةٌ): ثواب، واتا: پاداشت

# چەند قسـەوباسێکی ئیسرائیلی لەسەر ئەم چیـرۆکە:

ئەوانەی هەواڵو ئەفسانەکانیان گێڕاوەتـەوە چـەند ڕیوایـەتێکی هەڵبەسـتراوی جوولەکەکانیان دەربارەی چیرۆکی (هارووتو مارووت) هێناوەو، چەند نووسەرێکی تەفسیری قورئانیش ئـەو ڕیوایەتانـەیان خوێندۆتـەوەو، بەلایانـەوە جـوان بـووەو، خستوویاننەتە نێو کتێبەکانی تەفسیریانەوەو، فەرمایشتی خوایان لـە قورئـان پـێ تەفسیر کردووە.

پوختەی ئەو ڕیوایەتە پووچەڵو هەڵبەستراوانەش ئەوەیە کە گوایە "فریـشتەکان بەرهەڵستی یان لەسەر (بوونی مرۆڤ بە جێنشینی سـەر زەوی)و، لەسـەر (باشـتر دانانی مرۆڤی ئیمانداریش لە فریـشتەکان) دەربـڕی، خـواش بـۆی ڕوون کردنـەوە مرۆڤی ئیماندار بۆیە بە باشتر دانراوە، چونکە حەزو ئارەزووی لە سەرپێـچی تێـدا دانـراوەو بـەڵام کاتێـك کۆشـش لەگـەڵ دەروونـی خـۆی دا دەکـاتو بـە تونـدی دەیگێڕێتەوە، لەسـەر گوێڕایـەڵی فـەرمانی خـوا جـێگیر دەبێـت. فریـشتەکانیش گوتیان: (ئەگەر حـەزو ئـارەزووت لـە دەروونـی ئێمـەش دابنایـە، ئـەوا گونـاهو سەرپێچیمان نەدەکرد). ئنجا دوو فریشتەیان لە خۆیان هەڵبژارد تاکو بکەونە بـەر تاقیکردنەوەکە، ئەو دوو فریشتەیەش (هارووتو مـارووت) بـوون. خـواش حـەزو ئارەزووی تیا دانانو، ناردنیە خوارەوە بۆ سـەر زەویو، هـەموو کـارێکی خراپـەو ناشیرینو گوناهکاریی لێ قەدەغەکردن.

ئەوانیش لە شاری بابل دابەزینو هێنـدەی لـە توانـاو دەرفـەرتیان دابـوو (بـە خواستی خوا) بەندایەتیو خواپەرستییان دەکرد، بەڵام لە شاری بابلـدا ئـافرەتێکی زۆر جوانیان بینی کە لە جوانترینی ئافرەتانی ئەو سەردەمە بوو، بۆیەش کەوتە بەر دڵی هەر یەکەیانو حەزو ئارەزوویان چووە سەری. ئنجا ڕازی دڵـێ خۆیـان لـەلای ئافرەتەکـە بـاش کـردو داوایـان لێکـرد کـە بـەدەم حـەزو ئارەزوویانـەوە بێـت. ئافرەتەکەش لەسەرەتادا بەدەم ئارەزووەکەیانەوە نەچووو ئاوڕی لـێنەدانەوە، بەڵکو

چەند مەرجێکی بۆ دانان، وەك ئەوەی سەرپشکی کردن لە نێوان (بت پەرستی) یان (کوشتن منداڵێك)دا یاخود (مەی خواردنەوە)دا پێش ئەوەی دەستیان پێی بگات.
ئەو دوو فریشتەیەش لە وەڵامی ئافرەتەکەدا گوتیان سەبارەت بە بت پەرستی ئەوە کفرەو بێباوەڕییەو، کوشتنی منداڵێکیش تاوانێکی یەکجار گەورەیەو، بەڵام مەی خواردنەوەکە تاوانێکی بچووکە، هەر بۆیەش مەی خواردنەوەکەیان لەو سێ مەرجەی ئافرەتەکەدا هەڵبژارد. جا کاتێك مەی یەکەیان خواردەوە، مەستو سەرخۆش بوونو، لەکاتی سەرخۆشییاندا منداڵەکەیان کوشتو، بتەکەشیان پەرستو، پاشان بەدڕەفتارییشیان لەگەڵ ئافرەتەکەدا کردو کەوتنە گوناهەوە.

ئنجا ئافرەتەکە ئەو ناوە گەورەیەی خوای لێ سەندن کە پێی دەچوون بۆ ئاسمانو، لە جیاتی ئەوان خۆی بەرەو ئاسمان پێی فڕیو، خواش ڕووخسارو شێوەی بەشەرییانەی ئەو ئافرەتەی لە مرۆڤەوە بۆ ئەستێرەیەك گۆڕیو، بوو بە هەسارەیەکی گەشو رۆشن کە هەسارەی (زوهرە)یەو یەکێکە لە هەسارە گەڕۆکەکانو لە ئەندامانی کۆمەڵەی ڕۆژە. (هارووتو مارووت)یش، خوا ڕقی لێ هەڵگرتنو لێیان زویر بوو دوای ئەوەی کە ئەو گوناهانەیان ئەنجام داو، خواش لەنێوان سزای دنیاو سزای رۆژی دواییدا، جارێکی تر سەربەستی کردنەوە، ئەوانیش سزای دنیایان هەڵبژارد، چونکە سزایەکی بڕاوەو کۆتایی پێهاتووە، بۆیەش سزای دنیایان هەڵبژارد بە ئومێدی ئەوەبوو، کە لە ڕۆژی دواییدا لە سزا ڕزگار بن. بەپێی سزاکەی دنیاش لە فەزای (بابل) لەنێوان ئاسمانو زەویدا بەسەریاندا هەڵواسرانو، ئیدی لەو ڕۆژەوە تاکو هاتنی ڕۆژی دوایی ئەم دوانە بە هەڵواسراوی دەمێننەوەو، بەردەوام لە بابلدا سەرەڕای سزادانیانو هەڵواسینیانو هێشتنەوەیان لەو سزاو ئەشکەنجەیەدا، کەچی هەر سیحرو جادوو فێری خەڵکی دەکەن، جا هەرکەسێك حەزی لە فێربوونی سیحرو جادوو بێتو کاری سیحربازیو جادووگەرێتی بکات، ئەوا دەچێتە لای ئەو دوانە لە (بابل)و، سیحریان لێوە فێر دەبێت[1]. "

---

١) بڕوانە تەفسیری (طبري) بە (تحقیق أحمد شاکر) بەرگی (٢) لاپەڕە (٤٢٧-٤٣٥)و، (الدر المنثور

ئەمە پوختەی ئەو ڕیوایەتە پووچەڵو هەڵبەستراوەی جوولەکەکان بوو کە بە دەقێك لە دەقەکانی (ئیسرائیلیات) ناسراوە.

## زانا ساغکەرەوەو لێکۆڵیارەکان ئەو دەقانەی ئیسرائیلیات ڕەت دەکەنەوە

گوتمان ئەم بەسەرهاتەی کە دەربارەی یاخی بوونو سەرپێچیی هەردوو فریشتەکە (هارووتو مارووت)ە لەو دەقە هەڵبەستراوو نادروستە (ئیسرائیلیانەیە) کە هیچ زانیارییەکی بە بەڵگەو پاڵپشتێکی ڕاستەقینەوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دا لەسەر نەهاتووە. هەر بۆیەش زانایانی ساغکەرەوەو لێکۆڵیار ئەو بەسەرهاتە نادروستەیان ڕەتکردۆتەوەو بە ناپەسندیان داناوەو لە ڕووی پاڵپشت (سند)و لە سووی واتا(معنی)شەوە پووچەڵیان کردۆتەوە. لەم ڕووەوە پێشەوای زانا (ابن کثیر) دوای ئەوەی ئەو بەسەرهاتو ڕیوایەتە پووچەڵانەی دیاری کردووە، گوتوویەتی: "لە چیرۆکی هاروتو ماروت دا لە کۆمەڵە زانایەکی (تابعین)ەوە، وەك (مجاهد)و (سدّی)و (حسن البصری)و (قتادة)و (ابو العالیة)و زوهری)و (ربیع کوڕی انس)و (مقاتل کوڕی حیان)و چەند زانایەکی تریانەوە ئەم بەسەرهاتە دیاری کراوەو، چەند کەسێکی تریش لە زانایانی تەفسیرو زانایانی پێشینو پاشین گێڕاویانەتەوەو، کۆی بیروڕای هەمووشیان لە شیتەڵکردنی بەسەرهاتەکەدا ئەوەیە، کە بە یەکێك لە هەواڵو چیرۆکە هەڵبەستراوەکانی (بەنی ئیسرائیل) دادەنرێت، چونکە هیچ فەرموودەیەکی ڕاستو پلەی (مرفوع)[1] و گەیەنراوەوە بۆ خودی پێغەمبەری ڕاستبێژو بڕواپێکراوو لە گوناه پارێزراو ﷺ، کە بە هەواو ئارەزووی

---

للسیوطي) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٣٨-٢٤٩)و، تەفسیری (ابن کثیر) بەرگی (١) لاپەڕە (١٣٨-١٤٢)و، (مسند أحمد) بە (احمد شاکر) بەرگی (٩) لاپەڕە (٢٩-٣٤) فەرمودەی ژمارە (٦٧١٨).

١) فەرموودەی (مرفوع) ئەوەیە، کە (اسناد)ەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگەڕێنرێتەوە، سا ئیتر سەنەدەکەی بە کردار، یان گوتارێکەوە پەیوەست بێت. (وەرگێڕ)

خۆی هیچ قسەو باسێکی نەدرکاندووەو (لا ینطق عن الهوی) لە ئارادا نیە.. ڕواڵەتی دەقەکەی قورئانیش پوختەی ئەو چیرۆکەیە بەبێ زیادو کەم. ئێمەش باوەڕمان بەو دەقەی نێو قورئان هێناوەو بەوەش کە خوا خواستی لەسەر بووەو، خواش هەر خۆی ئاگاداری حەقیقەتی حاڵو مەسەلەکەیە[1]".

هەروەها پێشەوا (ابن کثیر) لە کتێبەکەیدا (البدایة والنهایة) لە مێژوودا، پوختەی قسەو باسە هەڵبەستراوەکانی نێو چیرۆکی (هارووتو مارووت)ی هێناوەتەوەو پاشان بەم شێوەیە لێکی داوەتەوەو، گوتویەتی: "سەبارەت بەوەی کە لە چیرۆکی (هارووتو مارووت)دا زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەوەیان دیاری کردووە کە گوایە (زهرە) ئافرەتێکەو هەردوو فریشتە (هارووتو مارووت) بۆ کاری خراپەیان هەڵنابێتو ئەویش بەرپەرچی دابنەوەو قایل نەبوویێت تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت بەومەرجەی ئەوانیش ناوی هەرەگەورەی (الأسم الأعظم)یان فێر بکەنو، ئنجا هەردووکیان ناوەکەیان پێ‌گوتووەو فێریان کردووە، ئەویش ناوەکەی گوتووەتەوەو، ئیدی وەك ئەستێرەیەك بۆ ئاسمان بەرزکراوەتەوە. دیارە من ئەمە بە دروستکراوی جوولەکەکان دادەنێم، هەرچەندە یەکێکی وەك (کعب الأحبار)یش دەری هاویشتبێتو کۆمەڵێکی تر لە پێشینەکانەوە وەریان گرتبێتو لە دەرووی حیکایەتو بەسەرهاتەکانەوەو لە بواری لێدوان لەسەر بەنی ئیسرائیلدا باسی بکەن[2]".

جا دوای ئەوەی (ابن کثیر) چەند ڕیوایەتێکی لەبارەوە هێناوەتەوە، گوتوویەتی: "ئەگەر گومان یەخەمان بگرێت، دەڵێین ئەوە لە هەواڵو بەسەرهاتە دروستکراوەکانی (بەنی ئیسرائیل)ە، کە لە ڕیوایەتی (ابن عمر) لە (کعب الاحبار)ەوە هاتووەو، یەکێکیشە لەو داستانە ئەفسانەیی‌یانەی کە هیچ پشتیان پێ نابەسترێت[3]".

---

١) تەفسیری (ابن کثیر) بەرگی (١) لاپەڕە ١٤١.
٢) (البدایة والنهایة)ی ابن کثیر، بەرگی (١) لاپەڕە (٣٧).
٣) هەمان سەرچاوە، بەرگی (١) لاپەڕە (٣٨).

بەڵام پێشەوای لێکۆڵکار (احمد محمد شاکر) دەربارەی ئەو ئەفسانە ئیسرائیلییانە لە سێ جێگەدا لێیان دواوە..

جێگەی یەکەم: لە لێدوانیدا لەو ڕیوایەتە زۆرانەی کە ئیمامی (طبري) هێناویەتی، وەك گوتوویەتی: "ئەم هەواڵو بەسەرهاتانە دەربارەی چیرۆکی (هارووت و ماروت) کە گوایە ئافرەتێك بووەو دوایی کراوە بە هەسارەیەك، ئەمانە ئەو چەند هەواڵو بەسەرهاتانەن کە زانستمەندان (ئەهلی عیلم) بە ئامراز(علّە)ی فەرموودەیانەوە بەستووە[1]". پاشان ئەو وتەیەی پێشووی (ابن کثیر) لە هەردوو کتێبی (تەفسیرەکەی)و (تأریخ)ەکەیەوە هێناوەتەوە کە پێشتر ئێمەش دیاریمان کرد.

جێگەی دووەم: لەوەدایە کە تەفسیرەکەی (ابن کثیر)ی کورت کردۆتەوەو ناوی ناوە (عمدة التفسیر عن الحافظ[2] ابن کثیر)و تێیدا لە (إسناد)ی ئەو ڕیوایەتانەی کە (ابن کثیر) لەسەر چیرۆکەکەی هێناونەتەوە، کۆڵیوەتەوە، بۆ نموونە لە (اسناد)ی ڕیوایەتێکی دیاریکراوی (ابن کثیر) کە لە (بان ابی حاتم)ەوەی هێناوە، کۆڵیوەتەوەو، گوتوویەتی: "ئەو (اسناد)ەی کە (ابن کثیر) هێناویێتییەوەو کە ئێمە (لامان بردووە) ڕاست (صحیح)ە، ئەمەش لەلایەن (ابن عباس)ەوە هەڵوێستەی لەسەر کراوەو، ئێمەش لە ئاستیدا دەوەستینو هیچی لەسەر ناڵێین. بەڵام (ابن کثیر) درێژەی بە نەقڵکردنی (خەبەرەکان)[3]ی ئەم جۆرە مانایە داوە، ڕەحمەتی خوا لەویشو لە ئێمەش بێتو خوا لەویشو لە ئێمەش خۆش بێت[4]".

---

١) تفسیر الطبری بتحقیق شاکر، بەرگی (٢) لاپەڕە (٤٣٤- پەراوێز

٢) حافظ: ئەو کەسەیە کە شارەزایی لە سێ سەد هەزار فەرموودەدا هەبێت بە ناسینی کەسەکانیان و کەسێتی و حاڵی ڕاویەکان (گێڕەرەوەکان) بە (جەرح و تەعدیل)ەوە.. (وەرگێڕ)

٣) خەبەرەکان (اخبار)ی مانا: لە زانستی فەرموودەدا خەبەر بەوە دەڵێن، کە لە تابیعیەوە وەرگیرا بێتو، بە هاومانای سوننەتیشی دەڵێن.

٤) عمدة التفسیر (١: ١٩٢) -حاشیە.

هەروەها (احمد شاكر) دوای هێنانی ئـەو دەقـە پووچـە ئیـسرائیلییانە لـەنێو (عمده التفسير)دا گوتوویەتی: "من بۆ ئەوەی ئەو فەرموودەیەش لەو کتێبـەی (عمده التفسير)دا بسڕمەوە -وەك لە پێشەکیەکەشدا بە مەرجم دانابوو- بـەڵام دیتم کە ماناکـەی هـەردەم بەسـەر زاری خـەڵکی یەوەیـەو بـە پێنوسـەکانیان ئاماژەی بۆ دەکەن‌و، کە پێویستە ڕوون بکرێتەوە، بۆیە ئەو کارەم کرد کە خێرو بەرژەوەندیی تێدایە، پاشان سەرجەم ئـەو ڕیوایەتانـەی تـرم (کـە -ابـن کثیر- درێژەی بە باسکردنیان داوە) تێدا نەهێشتووە، سەرەڕای ئەوەش کە درێـژی لـە دەرخستنی کەم‌و کووڕی‌و ناتەواوییەکانیـشیدا نـەکردووە-ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت-[(١)]".

جێگەی سێیەم: لە شیکردنەوەو ساغکردنەوەی مەسـنەدەکەی (ئیمـام ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل)ی دایە، چونکە ئیمام ئەحمەد بە سەنەدی خـۆی فەرموودەیـەکی (مرفوع)ی لـە (ابـن عمـر)ەوە-خـوا لێیـان ڕازی بێـت- هێنـاوەو، هـەر ئـەم فەرموودەیەشە کە وای لە هەندێکیان کردووە گومانی (صـحیح)یـان لەسـەری هەبێت. بۆیەش (احمد شاكر) بە درێژی لەبارەی فەرموودەکەوە (کە فەرموودەی ژمارە ٦١٧٨)ە لەڕووی سـەنەدەوە، بـدوێت. لـەم ڕووەشـەوە نـاوبراو تانـەکان (مطـاعن)ی زانایانی لەسەر کەسانی سەنەدەکەو لەسەر چەند مەسنەدێکی تری هاوشێوەشیانی دیاری کردووە، هـەروەها لـەڕووی مانـاو نـامۆیی‌و نادیـاریی فەرموودەکەشەوە لێی کۆڵیوەتەوە. پاشان وتەی زانا لێکۆڵیارەکـانی دەربـارەی باری لاوازیی‌و نادیاریی فەرموودەکەو، دەربارەی بوونی بـە یـەکێك لـە دەقـە دروستکراوە ئیسرائیلیەکان، هێناوەتەوە بۆ نمونـەش وتـەی زانایـانی وەك (ابـن كثير)و (محمد رشيد رضا)و کەسـانی تـری هێنـاوە. وتەکەشـی دەربـارەی ئـەو فەرموودەیە بەرەوە هێنـاوە کـە گوتوویـەتی: "هـەموو ئـەم ڕاسـتیانەش ئـەو

---

١) هەمان سەرچاوە (١: ١٩٧) پەراوێز.

بیروڕایە بەڕاستتر دادەنێت کە (ابن کثیر)یش بەڕاسـتتری دانـاوەو، ئەوەیـە کـە بێگومان فەرموودەکە لەو چیرۆكو بەسەرهاتە دروستکراوانەی (کعب الاحبار)ی ئیسرائیلییەو، بە پلەی (مرفوع)یش نابرێتەوە بۆ سەر زاری پێغەمبەر ﷺ.

هەرکەسێکیش بۆی بەرێتەوە ئـەوا هەڵـەی کـردووەو، کەوتۆتـە نێـو وەهـمو ناڕاسـتییەوە، هـەموو ئەوانـەش، کـە لـە چـیرۆكو بەسـەرهاتەکانی (کعـب الاحبار)ەوە گێڕاویانەتەوە زاناترو بڕواپێکراوترن لەوانـەی بـە پلـەی (مرفـوع) گێڕاویانەتەوەو داویانەتـە پـاڵ پێغەمبـەرﷺ ئەمـەش لێکدانەوەیـەکی وردو تەواوە لە ئیمامێکی زۆر زانای بەڕێزو خاوەن قەدرەوە[1]".

بەڵام مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەربارەی چیرۆکی (هـارووتو مـارووت) گوتوویەتی: "داخۆ هەردوو فریشتە-هارووتو مارووت- کێ بـن؟ ئـەی کـەی لـە بابل دا بوون؟ چونکە چـیرۆکەکەیان لـە لای جوولەکـەکان زانرابـوو، ئەمـەش بـە بەڵگەی ئەوەی، کە ئـەم ئاماژەپێکردنـەیان بەدرۆنەخـستۆتەوەو بەرهەڵستیـشیان نەکردووە. لە قورئانی پیرۆزیش دا چەندین ئاماژەی پوخت کراوە بـۆ هەنـدێك لـەو ڕووداوانە، کە گەلانی پێ دوێنراویان دوای چەند سەرجەمێکیش زانیویانـە، ئیـدی هیچ هۆکارێکی تر بۆ شیکردنەوەی زیاتر لەئارادا نیە، چونکە ئـەو شـیکردنەوەیە بە مەبەست نەگێراوە. منیش حەز ناکەم، ئێمەی موسڵمانیش لەژێر سایەی قورئان بەدوای ئەو ئەفسانە زۆرانەدا، کە دەربارەی چیرۆکی هەردوو فریشتەکە هاتوون وێڵ بین، لەبەر ئەوەی تاکە ڕیوایەتێکی ساغکەرەوەو یەکلاکەرەوە، کـە جێـی متمانـە بێت، لە ئارادا نیە[2]".

---

١) مسند احمد بتحقیق احمد شاکر/ ٩:٣٢، حاشیە، وتەکەش بەتەواوەتی لە پـەراوێزی لاپـەڕە (٢٩-٣٣) دایە.

٢) (في ظلال القرآن)ی سید قطب/ ١: ٩٧.

## کەواتە بەسەرهاتەکەیان چۆنە؟!

لە فەرموودە ڕاستەکاندا هیچ زانیاری یەك لەبارەی (هارووتو مارووت)و، هیچ وتەیەکیش لەسەر کاری ئەوان لە بابل، بەدیی ناکەین.

خۆ ئەگەر بمانەوێت بەسەرهاتەکەیان بزانین، ئەوا دەبێتە لە ئاست باسو زانیاریی قورئاندا، کە (هێندەی دەربارەی هاتووە) هەڵوێستە بکەینو، تەنها ئەوەی لێ وەرگرین کە ڕوونی کردۆتەوە بۆمان. قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خوا دوو فریشتەی لە فریشتەکانی خۆی هەڵبژاردووە کە یەکێکیان ناوی (هارووت)و ئەوی تریشیان ناوی (مارووت) بوەو لە شاری بابل دایبەزاندوون (کە شارێکی بەناوبانگە لە عێراق دا)و پایتەختی شارستانیەتی کۆنی بابلی بووەو، لە پادشاکانیشیان (حامورابی)و (نەبوخوزنەسر) هەبوون. بەڵام نازانین بۆچی ئەم دوو فریشتەیە لە ئاسمانەوە بۆ شاری بابل نێرراونەتە خوارەوەو، لەچ کاتێکیشدا نێرراون؟!

وادیاریشە ئەرکی ئەوان لە بابل دا پەیوەندییەکی بە مەسەلەی سیحربازییەوە بووبێت، وەك زانراویشە لەوکاتەدا دیاردەی سیحربازی لە بابل دا باوبووەو، لەوانەشە لەسەر دەستی جوولەکەکان بڵاوبووبێتەوە، ئەو جوولەکانەی، کە پادشای بابل (نەبوخوزنەسر) دوای ئەوەی مەملەکەتەکەیانی لە فەلەستین دا وێران کردوە، بە کۆیلەی گرتوونو بردوونی بۆ بابل. هەروەها وەك زانراویشە مەسەلەی (سیحربازی) پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە جوولەکەکانەوە هەیەو، ئەوان لە هەموو گەل نەتەوەیەکی دی، زیاتر سەرقاڵی کاری سیحرو ئەفسانەو جادووگەریی بوونو تێیاندا بڵاوبۆتەوە.

دیارە ئەو جوولەکانەش، یان کەسانو گەلانی تریش، خەڵکیان بە سیحر ترساندووەو بازنەیەکی ترسناکی گەورەیان بە دەوری سیحر داکێشاوەو ئەو وەهمو

خەیاڵە پووچەڵەشیان خستۆتە دڵیانەوە کە گوایە مرۆڤی سیحرباز توانای زیاندانو قازانج گەیاندنی هەیەو، خاوەنی هەموو شتێکەو، ئیدی بەم شێوەیە خەڵکییان بۆ خۆیان ڕامو ملکەچ کردووەو، ترستاندوویانو گێلو بێئاگایان کردوون. هەربۆیەش ئەرکی (هارووتو مارووت) لە بابل دا تایبەت بووە بە دیاردەی سیحرو سیحربازانەوەو، بۆ نەهێشتنو لابردنی ئەو ترسو بیمەی نێو دڵو دەروونی خەڵکیش بووە کە بەهۆی ئەوانەوە دروست بووە، ئنجا ئەوان هەردووکیان خەڵکیان لە بابل دا فێری زانینی سیحر کردوەو حەقیقەتو بنجو بناوانی کاری سیحربازییان بۆ دەرخستوونو، ئەو ڕێساو بنەمایانەشیان پیشان داون کە کرداری سیحربازییان لەسەر بەندەو، بەم ڕەنگەش ئەو بازنە ئەفسووناوییە گەورەیەشیان لە چواردەورەی لابردووە کە لەلای خەڵکی بە کارێکی گرنگو بێوێنەیان دادەنا. جا کاتێك ئەم دوو فریشتەیە خەڵکیان فێری ئەو دیاردەیە کردووە بەو مەبەستە بووە کەوا بێگومان دەکرێت هەموو کەسێك فێری ببێتو کارێکی هێندە گرانو گرنگ نی یەو، شتێکی هێمادارو تەلیسماوی ئەوتر نیە، کە جگە لە چەند کەسێکی کەم هیچ کەسێکی دی توانای زانینیی نەبێت، بەڵکو وەك هەر زانستێك لە زانستەکان دەشێت بە خوێندنو فێربوون بەدەست بێنرێت، ئیدی مرۆڤی سیحربازیش ناتوانێت هیچ زیانێك یان قازانجێك بە کەسێك بگەیەنێت تەنها بە خواستی خوا نەبێت.

بەڵام بۆیە خەڵکییان فێری سیحر دەکرد تاکو باری ڕاستیو بنجو بناوانی ئەو خەڵکە دەرخەنو وریاشیان بکەنەوە لێی. نەك بۆ ئەوە فێری بن کە کاری هەمیشەیی پێبکەنو بیکەنە پیشە. لەبەر ئەمە (ئەو دوو فریشتەیە) هەرکەسێکیان فێری سیحر بکردایە خێرا پێشیان دەگوت ((إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ))، واتە ئێمە هۆی تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنتانین، لەبەر ئەوەم بەم فێربوونە بێباوەڕو گومڕا مەبە.. بە مانای کار بە سیحر مەکەو، سیحربازییش مەکە بە پیشە.

ئیدی ئەرکی هەردوو فریشتەکە (هارووتو مارووت) له بابل دا تەواو بووەو، بەرەو ئاسمان (وەك دوو فریشتەی بەرێز) سەرکەوتوونو وەك چۆن (پێشتر ئاوا وەك دوو فریشتەی بەرێز) دابەزیبوونو له ئاسمانەوە هاتبوونه خوارەوە. بەڵام خەڵکی بابل پەیڕەویی ئامۆژگاریی هەردوو فریشته بەرێزەکەیان نەکردووە، بەڵکو هەڵی فێربوونی سیحرەکەیان بۆ خراپەو بەدکاری قۆستۆتەوەو، وایان لێهاتووە سیحر لەگەڵ کەسانی تردا بەکاربێننو سیحرو جادوویان لێ بکەنو، ناکۆکیو پەرتەوازەیی لەنێوان ژنو مێرددا دروست بکەن.

خواش لەسەر ئەو رەفتارە گومڕاییيە سەرزەنشتی کردوون، وەك فەرموویەتی:

﴿...وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ البقرة﴾، واتە: ئەوان-خەڵکی بابل- تەنها فێری لایەنه خراپو نالەبارەکانی سیحربازی بوون که زیانیان پێدەگەیەنێت نەك قازانج.. بێگومان زانیبووشیان که هەرکەسێك ئەو کەرەسه هەرزانەی کڕیبێت، ئەوا له رۆژی دواییدا هیچ پاداشتێکی نابێت، بەڵکو تەنانەت ئەو کەرەسەیەی، که ئەوان خۆیان پێی فرۆشتووەو کەوتوونەتە نێو داوو پیلانەکەیەوە، شتێکی هێجگار خراپە، ئەگەر پێیان بزانیایە لەراستیی مەسەلەکە تێبگەیشتنایە.

# جوولەکەکان واز لە هەق دێنن بۆ ناهەق

چیرۆکی (هارووت‌و مارووت) لە چوارچێوەی باسێکدا دەربارەی جوولەکەکان هاتووە، هەروەها دەربارەی ڕەفتارو هەڵس‌وکەوت‌و پیلانەکانیان لەدژی ئیسلام‌و موسڵمانان.

جا با سەرنج لەو ئایەتانە بدەین کە دەربارەی ئەو جوولەکانە هاتوون‌و، کە خوا تێیاندا فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ... ﴿١٠٢﴾البقرة﴾، واتە: جوولەکەکان کاتێك پێغەمبەرێکیان لەلایەن خواوە بۆ هات (کە دواپێغەمبەر محمد ﷺ بوو)و کە هەرچەندە پشتگیریی لە ڕاستیی تەورات دەکردو بەڕاستی دادەناو بڕوای پێ‌هەبوو، کەچی کۆمەڵێك لە جوولەکەکانی (ئەهلی کیتاب) کتێبەکەی خوایان پشتگوێ خست‌و پەیڕەوییان نەکرد، وەك ئەوەی گوایە هەرگیز لەو کتێبەدا (کە تەوراتە) هەواڵی هاتنە ئەم دواپێغەمبەرەیان نەبیستبێت، بەڵکو وازیان لە (تەورات) هێناو، دوای ئەو قسەوباسانە کەوتن کە شەیتانەکان لەسەر حوکم‌و دەسەڵاتی سولەیمان دەیانخوێندەوە.

بێگومان جوولەکەکان گومڕان‌و، ڕێبازی ڕاست بەدرۆ دەخەنەوەو باوەڕ بەو کەسەش ناکەن کە ڕێبازە ڕاستەکەیان بۆ دێنێت، لەبەر ئەوەی تەنها کفرو بێ‌باوەڕی‌و بەدرۆخستنەوە هەڵوێستی دیارو ڕەگ داکوتاویان‌و، تاکە بڕیاری حازر بەدەستیشیانە، هەربۆیەش هەرکاتێك ڕێبازی هەقیان پێ‌گەیشتبێت باوەڕیان پێ‌نەهێناوەو، هەر پێغەمبەرێکیش ڕێبازی ڕاستی بۆ هێنابن بەدرۆیان خستۆتەوە.. ئەمەش مانای ئاماژەبۆکراوی وشەی (لَمّا)یە کە دەلالەت لەسەر

هەڵوێستی پێشترو حوکمی ئامادەو حازریان دەکات. پێغەمبەری خواش ﷺ بەراست دانەری ئەو پەیامەی خوایە کە پێشتر بە جوولەکەکان گەیەنراوە، قورئانی پیرۆزیش هەر بەراست دانەری ئەو پەیامەی نێو تەوراتە، چونکە بێگومان قورئانیش‌و تەوراتیش دوو کتێبی فەرمایشتەکانی خوان.

جوولەکەکان دڵنیاش بوون لەوەی کە بێگومان محمد ﷺ ئەو پێغەمبەرە بەڵێن پێدراوەی خوایە، بەڵام چییان کرد؟ ئایا باوەڕیان پێهێناو دوای ڕێبازەکەی کەوتن؟

نەخێر، بەڵکو کتێبەکەی خۆیان هەڵدایە ئەو دیو پشتیانەوە وەك ئەوەی هەر نەشیانزانیبێت واتە پشتگوێیان خست‌و تووڕیان دا، وەك ئەوەی لە پشت خۆیانەوە فڕێیان دابێت. باسی فڕێدانی کتێبی خواش لەم فەرمایشتەی خوادا لە قورئاندا هاتووە کە فەرموویەتی: ﴿...نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ ...﴿١٠١﴾ البقرة﴾.، جا ئەو کتێبەی کە فڕێیان داو کاریان پێنەکردو، قورئان نەبووە، بەڵکو تەورات بوو کە جوولەکەکان ئیدیعای باوەڕ پێهێنانیان لەسەری دەکرد. لەکاتێکیشدا تووڕیاندا کە بێباوەڕ بوون‌و باوەڕیان بەو مژدەیەی نێو تەورات نەهێنا کە دەربارەی هاتنی محمد ﷺ وەك پێغەمبەرێك باس دەکرد. پەکیان خست‌و کاریان پێنەکرد. دیارە پەکخستن‌و کارنەکردنیش بە هەردەقێك لەو دەقانەی، مانای کافربوون‌و باوەڕنەهێنانە پێی، باوەڕنەهێنان بەو چەند دەقەش، باوەڕنەهێنانە بە هەموو دەقەکانی تری (تەورات).. ئەمەش هەمووی بە فڕێدان‌و واز لێ هێنان‌و پشتگوێخستن‌و توڕدان دادەنرێت.

بەم ڕەفتارە جوولەکانەو دڵڕەقانەیەش دەبینین، کە ئەوان وازیان لە هەق هێناوەو باوەڕیان پێنەهێناوەو خاوەنەکەشیان بە درۆ خستۆتەوە. ئەی لەدواییدا چی‌تریان کردوە؟ داخۆ جوولەکەکان دوای فڕێدانی کتێبی خواو باوەڕنەهێنان بە هەق، چییان کردووە؟ بێگومان هەر دوای ناهەق‌و ڕێچکەی پووچ‌و گەندەڵ کەوتوون

﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ ...﴿١٠٢﴾ البقرة﴾، پەیڕەویی ئەو قسەوباس و قسەلۆکانەیان دەکرد کە شەیتانەکان لەبارەی موڵك و دەسەڵاتی سولەیمانەوە بڵاویان دەکردەوە..

بەڕاستیش بازرگانی یەکی دۆڕاوو مامەڵەیەکی بێسوود بووە کە ئەو جوولەکانە ئەنجامیان داوە، ئەوەبوو وازیان لە هەق هێناو، دوای ناهەق کەوتن و، باوەڕیان بە پێغەمبەر نەهێناو، باوەڕیان بە پێغەمبەر نەهێناو، باوەڕیان بە شەیتانەکان هێناو، بڕوایان بە هەواڵ و قسەوباس و درۆو دەلەسەکانیان کرد. ئەمەش دووڕێیەو، سێیەمیان نیە.. یان ڕێی هەق یان ڕێی ناهەق، هەرکەسێکیش لەڕێی هەق دانەبێت، بێگومان هەر لە ڕێی ناهەق دادەبێت، هەرکەسێکیش ڕێی ڕاست فەرامۆش بکات ئەوە بەبێ گومان دوای گومڕایی دەکەوێت. ﴿...فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ ...﴿٣٢﴾ یونس﴾.

ئەمەش ڕاستییەکی بنەبڕ (قاطع)ی قورئانەو، تاکە بەڵگەی ڕاست و واقیعی و کردەیی و زیندووشی: (کایەی مرۆڤایەتییە).. ئای چەند کەسمان بینی کە لە ڕێی هەق جیابوونەوەو وازیان لێ هێناو، ئیدی کەوتنە سەر ڕێی ناهەق و گومڕایی.

## شـەیتانەکانو، سیحربازیو، سـولەیمان (سـلاوی لـێبێت)

ئایەتەکە ئاماژەی بۆ بوختانو درۆودەلەسەکانی ئەو شەیتانانە کردوە، کە کاری سیحربازییان دەدایـە پـاڵ سـولەیمان (سـلاوی خـوای لێ بێـت): ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَ﴾، ئایەتەکەش ئـەو شـەیتانانەی بـەدرۆ خـستۆتەوەو، ئەوەشی سەلماندووە کە (سولەیمان) لـە سـیحربازییەوە زۆر دوورو پـاكو بێخـەوش بووە: ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ﴾.

چیرۆك نووسـانو شـارەزایانی هـەواڵو بەسـەرهاتەکان چـەند بەسـەرهاتێکیان دەربارەی درۆودەلەسەی شەیتانەکان هێناوەتەوەو چـەند گریمانێکیـان (افتراضـات) دەربارەی پەیوەندییان بە (سولەیمان)ەوە داناوە. لەم بارەیەوە (ابن ابی حاتم) لە (ابن عباس)ەوە -خـوا لێیـان ڕازی بێـت- گێڕاویەتییـەوە کـە (آصـیف) نووسـەری لای سولەیمان بووەو ناوەگەورەکە (الإسم الأعظم)ی خوای دەزانیو، هەموو شتێکیـشی بە فەرمانی سولەیمان دەنووسیو لەژێر کورسییەکەیدا دەیشاردەوە.

جا کاتێك سولەیمان مردووە، شـەیتانەکان دەریـان هێنـاونو لـەنێوان هـەردوو دێڕێکیاندا سیحرێكو کفرێکیان نووسیوەو، گوتووشیانە: ئەمە بووە کـە سـولەیمان کاری پێکردوە.. ئنجا کەسە نەفامەکانی نێـو کۆمـەڵ (سـولەیمان)یـان بـە کـافر داناوەو، جنێویان پێداوەو، زانایانیشیان بێدەنگو ڕاڕابـوون لـە ئاسـتیدا، ئیـدی بەردەوام نەفامەکانیان جنێوو وتەی ناشیرینیان پێگوتووە، هەتا ئایەتەکە هاتووەو ئەو تۆمەتو تاوانانەی لەسەر لابردووەو، بەڕائەتی سەلماندووە.

## تیشکێك لەسەر گێڕانەوەکەی (ابن عباس)

پێشەوا (ابن کثیر) ئەم ڕیوایەتەی لە (ابن عباس)[1]ەوە هێناوەو، ئەگەر ئێمەش سەرنج لەم شێوە گێڕانەوەو ڕیوایەتە بدەین، ئەوا وای بۆ دەچین کە بە سەنەدێك بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نەبڕاوەتەوە، چونکە (ابن عباس) نەیخستۆتە پاڵ خودی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەمە تەنها لە سنووری گێڕانەوەی (ابن عباس) خۆیدا -خوا لێیان ڕازی بێت- بەندە. وتەی (ابن عباس)یش کە لە بارەیەوە دەری بڕیوە، ئەوە تەنها دەربارەی چەند ڕووداوێکی ڕابردووە، ئەو ڕووداوانەش بوونەتە بەشێك لە مەسەلە نەزانراوەکانی ڕابردوو.. ئاشکراشە (نەزانراوی ڕابردوو) تەنها لە کتێبی خواوە (واتە لە قورئانەوە)و، هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەری خواشەوە زانیاری لەسەر وەردەگیرێت.. دەنا وتەی هیچ مرۆڤێك لەبارەی ئەو نەزانراوەوە پەسند ناکرێن تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە بەڵگەی ڕۆشنی لەسەر دیاری بکاتو لە بەڵگەکەشیدا پشت بە کتێبی خوا، یان فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ببەستێت.

جا لەبەر ئەوەی وتەکەی (ابن عباس)یش -خوا لێی ڕازی بێت- پشتی بەوە نەبەستووە، بۆیە ئێمە ناچارین پەسندی نەکەین، بەڵکو تەنها هەڵوێستەی لە ئاست دا بکەن.

مامۆستا (احمد شاکر) لە (عمده التفسیر)دا تیشکی لێکدانەوەی خستۆتە سەر ئەو ڕیوایەتەی پێشوو گوتوویەتی: "ئەو اسنادەی کە (ابن کثیر) هێناویەتیو کە ئێمە لامان بردون، اسنادێکی ڕاستە، ئەمەش لە وتەی (ابن عباس)دا بە پلەی (موقوف)[2] دانراوە، ئێمەش هەڵوێستە(وقفە)ی لە ئاست دا دەکەینو هیچ ناڵێین.

---

١) عمدة التفسير عن الحافظ ابن كثير ١: ١٩٢.

٢) پلەی (موقوف) ئەو فەرموودەیەیە، کە لە هاوەڵێکەوە -لە وتارو ڕەفتاریەوە- گێڕابێتەوە. (نوسەر)

(ابن کثیر)یش درێژەی بە هێنانی خەبەرەکانی[1] ئەم مانایە داوە، خوا ڕەحم بەویش‌و ئێمەش بکات‌و لە گوناهی ئێمەو ئەویش خۆش بێت"[2].

## شەیتانەکان کێ‌بوون؟

لەم بەسەرهاتەدا پەیوەندییەکی دیار لەنێوان سیحرو شەیتانەکان دا هەیە، چونکە (سیحر) ئامرازێکی شەیتانەکانە لە جولاندنی هەواو هەوەسی خەڵکی‌و لەخشتەبردنیان‌و، جڵەکێشییان‌و کارتێکردنیان. لێرەشدا وشەی شەیتانەکان (الشیاطین) وشەیەکی گشتگیرەو بەسەر دوو جۆرە مەخلووق دا دەچەسپێت:

جۆری یەکەم: ئەوەیە کە وشەی (شەیتان)ی بەسەردا بڕاوەو لەکاتی دەربڕینی وشەکەدا مەبەست لە خودی شەیتانەکانە. ئەم جۆرە شەیتانانە بە کۆمەڵەی (جن) دانراون‌و لەوانەن کە نایانبینین، بەڵام بە خورپەو وەسوەسە دێنە سەرمان‌و، گوناهو سەرپێچی‌و کفرو لادانمان بۆ دەڕازێننەوە.

جۆری دووەم: شەیتانە ئادەمییەکانن لە کۆمەڵەی (مرۆڤایەتی)، واتە ئەو کافرو بێباوەڕانەن کە شەیتانەکانی کۆمەڵەی (جن) پشتیان پێ‌دەبەستن، دیارترین نوێنەری ئەم جۆرەش جوولەکەکانن، کە لە هەموو خەڵکی سەرزەمین زیاتر سەرقاڵی سیحرو جادووەری‌و کفرو ئاکاری شەیتانی‌و فریودان بوون.

جا ئاخۆ لەم بەسەرهاتەشدا ئەو شەیتانانە کێ‌بن، کە نەریتی سیحربازییان بڵاوکردۆتەوەو داویشیانەتە پاڵ سولەیمان؟ ئەی داخۆ ئەو شەیتانانەش کێ‌بووبن کە هەواڵی درۆو قسەوباسی ناڕاست‌و ئاکاری جادووگەرییان بڵاوکردۆتەوە؟ بێگومان

---

١) خەبەرەکان بە هاومانایی سوننەت‌و بەو فەرمودانەش دەگوترێت، کە لە (تابعین)ەوە وەرگیرابێت. (نوسەر)

٢) عمدة التفسیر عن الحافظ ابن کثیر ١: ١٩٢. پەراوێز

جوولەکەکان بوون.. ئەوان هەواڵی سەیرو سەمەرەو قسەو باسی جادووگەرییان لەلای سولەیمان دەگێڕایەوە، چونکە سولەیمان پێغەمبەریشان بوو جگە لەوەی پادشاو سەرداریشیان بووەو، پاشان چونکە لە هەمان کاتدا حاکمی (جن‌و شەیتانەکانیش) بووە. هەروەها، چونکە خودی جوولەکەکان سوودیان لە گێڕانەوەی درۆو دەلەسەکان‌و بڵاوکردنەوەیان لەنێو خەڵکیدا، وەرگرتووە تاکو ترس‌و بیم بخەنە دڵیانەوەو چەواشەیان بکەن‌و ملکەچی بەردەستی خۆیان بکەن.

## مانای ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ﴾

زانایانی تەفسیر بیروڕای هەمەجۆریان لەسەر مانای وشەی (تتلو) هەیەو، پێشەوا (ابن جریر)یش لە تەفسیرەکەیدا گرنگترینی مانا نزیکەکانی دیاری کردوە، بۆ نمونە هەندێك لە زانایان لەبارەی ماناکەیەوە گوتوویانە: "تتلو: واتە دەدوێتو دەیگێڕێتەوە یان لەبارەیەوە دەدوێتو هەواڵی لەسەر دەدات، یان کە خوێندنەوەی شتێك دەگەیەنێت (وەك چۆن پیاوێك قورئان بخوێنێت)."

هەندێك زانای تریش گوتوویانە: "ما تتلو: واتە ئەوەی کە بەدوای کەوتوونو گێڕاویانەتەوەو کاری پێکردووە."

کاتێك (ابن جریر)یش لەم کارەیدا بە تەمای ڕوون کردنەوە بووە، هەردوو ماناکەی یەکخستووەو، وای داناوە کە ئەم وشەیە دەلالەت لەسەر ئەو دوو مانایە دەکات، ئەو لەمبارەیەوە گوتوویەتی: "لە زمانی عەرەبەکاندا گەر بڵێین (هو یتلو کذا) ئەوا دوو مانا هەڵدەگرێت: یەکەمیان بە دواکەوتن (الاتباع)، بۆ نمونە کە دەگوترێت (تلوتُ فلاناً) واتە ئەگەر لەدوایەوە ڕۆیشتبمو شوێن پێو ئاسەواریم هەڵگرتبێت.. دووەمیان بە مانای خوێندنەوەو دیراسەکردن، بۆ نمونە گەر بڵێین (فلان یتلو القرآن) بە مانای ئەو قورئانە کە دەخوێنێتەوەو لێی ورد دەبێتەوەو دیراسەی دەکات). لەوانەشەو واپێدەچێت شەیتانەکان چۆنیەتی فێربوونی درۆو دەلەسەو جادووگەرییان خوێندبێتو دیراسەکردبێتو بە خوێندنی تیۆریو کرداریش ئەنجامیان دابێتو، پاشان بە کردەوە شوێنی ئەو ڕێبازە چەوتە کەوتبنو بەرپوایەتو گێڕانەوەش لێکیان دابێتەوە.. ئیدی جوولەکەکانیش بەرنامەیەکیان لەو ڕووەوە گرتبێتە بەرو کاریان پێکردبێتو گێڕابێتیانەوەو بڵاویان کردبێتەوە[1]".

---

١) تفسیر الطبري /٢: ٤٠٩

شــەیتانەکانیش هــەواڵی درۆو ناڕاســتو بەســەرهاتی پووچــەڵیان لــە وڵاتــی سولەیــماندا گێڕاوەتەوە. جوولەکەکانیش دوای ئەو هەواڵو قسەوباسە ناهەموارانە دەکەوتن کە شەیتانەکان دەیانگێڕایەوەو، کاریان لێ دەکردو بۆ کەسـانی تریـشیان دەبردو، ئەو کەسانەی تریش لەلایەن خۆیانەوە بۆ خەڵکی تریان دەگێڕایەوە. بەڕای ئیمامی (طـبري) لەم ئایەتە لــە فەرمایـشتی ((عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ))دا، ئـامرازی (علی) -حرف جـرّ-ەو مانـای لـەویَ(فی) دەگەیـەنێت، وەك دەڵێـت: ((عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ )) واتــە: ((فِي مُلْــكِ سُــلَيْمَانَ)) لــە مەملەکەتەکــەی سولەیــماندا. عەرەبەکان هەندێك جـار ئـامرازی (في) لــە جێگــەی (علــی)دا بــەکاردێنن،و، بــە پێچەوانەوە (علی)شیان لە جێگەی (في)دا داناوە، لەمبارەیەوە خواش لە قورئانــدا فەرموویەتی: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ ...﴿٧١﴾ طه﴾، واتــە: "فیرعــەون بــە سیحربازەکانی خۆی گوت-کاتێك باوەڕیان بە مووسا هێنابوو- پێی گوتن: دەبێـت لە قەدی دارخورمادا هەڵتان واسم، بە مانای بەو کەرەسەیە ئاواتان لـێبکەم، یـان لەسەر ئەو شتانە. وەك ((علی جذوع النخل))، هــەروەها وەك گوتوویانــە ((فعلت کذا في عهد کذا)) لەگەڵ ((وعلی عهد کـذا)) کــە هــەردووکیان (في عهــد، وعلــی عهد) یەك مانایان هەیە"[1].

جا کاتێك لەم ئایەتەدا ئـامرازی (علــی) بــە مانــای (في) دێــت، ئــەوا مانــای ئایەتەکەش ئەمە دەبێت: ((إن الشیاطین کانت تتحدث بالکذب وترویە وتخبر بـە في فترة ملك سـلیمان)) واتە: شەیتانەکان قسەو باســی درۆیــان دەگوتــەوەو لــەماوەی حوکمڕانی سولەیمان دا دەیانگێڕایەوەو بە خەڵکی یان دەگەیاند.

ئەمەش لەو ماوەیەدا، کە سولەیمان فەرمانڕەوایی گەلی بــەنو ئیــسرائیل بــوو،

---

١) هەمان سەرچاوە، بەرگی (٢) لاپەڕە (٤١١-٤١٢).

واتە لە ماوەی ژیانی سولەیمان -سلاوی لێ بێت- ئەو کردارو ئاکارەیان دەنواند.

لەلای پێشەوا (ابن کثیر)یش مانای (تتلو)، (تکذب)ەو مانای ئامرازی (علی)ش بە شێوە ڕواڵەتی یەکەیەتی‌و، ئەوەیە کە شەیتانەکان بەو هۆیەوە ئەو قسەو باس‌و هەواڵە درۆو دەلەسانەیان لە مەملەکەتی ژێر دەسەڵات‌و حوکمی سولەیمان دا بلاوکردۆتەوەو، بە ئامرازی (علی) لە ڕستەکەدا گوزارشتی لێ کردوە، چونکە بە فەرمان (فعل)ی (تتلو) لەخۆی گرتووە.

(ابن جریر)یش لەم بارەیەوە گوتوویەتی: "لێرەدا -ئامرازی (علی)- بە مانای ئامرازی (في) دێت، واتە لەنێو ولاتی ژێر حوکمی سولەیمان دا هەواڵە ناڕاستەکانیان بلاوکردۆتەوە.. لەخۆگرتنی ئەم مانایەش باشترو لەپێشترە".

واتە: دانانی ماناکە بەم جۆرە بەباشترو بەچاکتر دادەنرێت.

# سیحر کفرەو سیحرباز کافرە

ئەم ئایەتە بەرەنگاری سیحرو سیحربازان بۆتەوەو، (هارووت‌و مارووت)یش بەربەرەکانیی سیحرو سیحربازانیان کردووە. بە سەرنجدانی ورد لە ئایەتەکەش، دەبینین کە (سیحر)ی بە کفرو بێباوەڕیی داناوەو، مرۆڤی سیحربازیشی بە کافرو بێباوەڕ داناوە. بەڵگەی ئەمەش هەر لەنێو ئایەتەکەوە بەدیی دەکرێت، وەك ئەم بەڵگانە:

١- لە ئایەتەکەدا بە دەستەواژەی ((وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ )) کرداری سیحربازی لە (سولەیمان) دوور خستۆتەوە، بە مانای (سولەیمان سیحرباز نەبووو مامەڵەو هەڵس وکەوتیشی بە سیحر نەکردوە)، جا کەوابوو کاتێك ئایەتەکە (سیحر)ی لە کەسێتی (سولەیمان) دوورخستۆتەوە، ئەوا کفرو بێباوەڕیشی لێ دوور خستۆتەوە ((وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ )). ئەمەش دەلالەت لە هاوجووتی‌و پێکەوە لکاویی نێوان سیحرو کفر دەکات، کە پەیوەندییەکی بەهێزیان لەنێواندا هەیە.

٢- سەلماندنی کفرو بێباوەڕیی شەیتانەکان لەو حاڵەتەدا، کە خەڵکی فێری سیحربازیی دەکەن، کافر بوونی شەیتانەکانیشی بەم ڕستەیە سەلماندووە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ﴾. بێگومان شەیتانەکان خۆیان کافر ببوون، چونکە خەڵکییان فێری سیحربازیی کردبوو، بە مانای لەکاتێکدا کافر بوون، کە سەرقاڵی کاری سیحرو جادووگەریی بوون‌و کردەوەیان پێ‌کردو کەسانی تریشیان پێ‌فێر کرد. پێگەی ڕستەی ((يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ))ەش لە جێگەی (نصب على الحال) دایە، چونکە رستەیەکی (حالی)یە، واتە تایبەتە بە حاڵ‌و بارودۆخی ئەو کەسانەی، کە لە حاڵەتی (دەرس دادانی خەڵکیدا بە سیحرو جادوو) کافر بوون.

٣- ورياكردنەوەكەی (هارووتو مارووت) بۆ خەڵكی كە سەرقاڵی سیحرو كارپێكردنی نەبن، بەم شێوە دەربڕینە هاتووە: ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾ دیارە، كە هەڵبژاردنی وشەكانیش لە قورئاندا مەبەستدارەو سروشو ئاماژەی وشە هەڵبژێردراوەكانیش ئەو مەبەستانە دەگەیەنن.. ئەو دوو فریشتەیە گوتوویانە ﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ﴾ بێگومان ئێمە هۆی تاقیكردنەوەو هەڵسەنگاندنتانین، جا تۆش كار بە سیحر مەكەو بێباوەڕ مەبە.. ئەوان پێیان نەگوتوون (سیحر مەكە)، بەڵكو پێیان گوتوون ((بێباوەڕ مەبن))، ئەمەش بۆ پێكەوەلكاندنو پێك گەیاندنی نێوانی سیحرو كفرە.

بێگومان ئەم دەستەواژە هەڵبژێرراوانەی نێو ئایەتەكانیش، لە بەڵگە هەرە جوانو نایابە دەستنیشانكراوەكانی قورئانی پیرۆزن، چونكە لێرەدا قورئان، كە ویستویەتی (سیحر) لە ئاكاری (سولەیمان) دوورخاتەوە، ئەوا (كفرو بێباوەڕی) لێ لاداوەو لێی دوورخستۆتەوە.

جا لەكاتێكدا هەردوو فریشتەكەش كاری سیحربازییان لە خەڵكی قەدەغە كردووە، ئەوا لە سەرەتادا ئاكاری كفرو بێباوەڕییتیان لێ قەدەغەكردوون.

٤- پێغەمبەر ﷺ سیحربازیی بە كفرو بێباوەڕیی داناوەو، هەركەسێكیش بڕوا بە كاهینو سیحربازو جادووگەر بكات بە كافری داناوە.

لەمبارەیەوە (ابن حجر) لە (فتح الباری)دا گوتوویەتی: "دەربارەی سەرزەنشتكردنی كاهینو جادووگەران، خاوەنانی كتێبەكانی (سوننەت) فەرمودەیەكی لای (ابوهریرة)یان هێناوەتەوە كە زانای فەرموودەناس (الحاكم)یش بە (صحیح)ی داناوەو، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەكەدا، كە (ابوهریرة) بە (مرفوع) هێناویەتی، فەرموویەتی: (**(من أتى كاهناً أو عرّافاً فصدّقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد)**)، واتە: هەركەسێك بچێتە لای كەسانێك كە خۆیان بە

چاکەرەوەو گەردووnناسو زانای هەمو دەردێك دەزانن (واتە کە جادووگەر چەواشەکارن)و هەرکەسێك بۆ لای ئەم جۆرە کەڵەکبازانە بچێت ئەوا بێگومان باوەڕی بەو پەیامەی خوا نی یە کە بۆ (محمد)ی پێغەمبەری خۆی ﷺ ناردۆتە خوارەوە.

هەر لەمبارەیەوە بەڵگەی ڕاستو هاوشێوەی لە (جابر)و (عمران کوری حصین) کە (البزار) بە دوو سەنەدی چاکەوە هێناونی، گێڕاونەتەوە، (ابو یعلی)یش لە فەرموودەیەکی لای (ابن مسعود)ەوە بە سەنەدێکی چاك هێناویەتیو بەڵام بە ڕاشکاوی دانی بە پلەی (مرفوع)یێتی دانەناوە، چونکە فەرموودەی لەم جۆرەو پلەو ئاستی گێڕانەوەکانیشی تەنها بە بیروڕا نادرکێنرێت[1]."

## ئایا ئامرازی (ما) لە ئایەتەکەدا (نافیة)، یان (موصولة)؟

زانایانی تەفسیر هەڵوێستەی زۆریان لە ئاست ئەم ڕستەیەی نێو ئایەتەدا کردوە، کە خوا تێیدا فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ﴾.. لەم ڕووەوە زانایان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە پیتی (واو) لە ڕستەی ((وَمَآ أُنزِلَ..))دا ئامرازێکی پەیوەندی (عاطفە)یەو ئەم ڕستەیەی بە ڕستەی پێش خۆیەوە بەستۆتەوە، بەڵام زانایان لەسەر ئەو ڕستەیەی، کە لە دوایەوە هاتووەو پێوەی بەستراوەتەوە کۆك نینو بیروڕای لێك جودایان لەسەر ماناکەی هەیە، بنچینەی ناکۆکیو ناتەبایی بیروڕاکانیان لەسەر ڕستەی گرێدراو (المعطوف علیە)و لەسەر ئامرازی (ما)ی بەردەم ڕستەکەیە، کە ئاخۆ ئامرازێکی نەهێڵان (نەفی)یە یاخو هاوەڵناوێکی گەیەنەر (اسم موصول)ە، کە بە مانای (الذي/ کەوا) دێت؟! بۆ

---

١) فتح الباري- ابن حجر / ٧: ٢١٧.

زانینی ئەم وەڵامە هەڵوێستە لەگەڵ پێشەوا (ابن جریر) لە بیروڕای ساغکراوەییو بەڕاست دانەریداو، لەگەڵ پێشەوا (ابن کثیر)یش لە بەدواداچوونو لێکدانەوەیدا دەکەینو ان شاء الله وتەی گونجاویان یەکلا دەکەینو بەڕاستتری دادەنێین.

وتەی یەکەم: ئامرازی (ما) واتە نکوولیو نەفیکردنی، چونکە پیتی (نەفی)یەو بە مانای (لَمْ) دێت. ئەم وتەیەش دراوەتە پاڵ (ئیمام ابن عباس).

(طبري) ئەم وتەیەی ڕوون کردۆتەوەو گوتوویەتی: "لێکدانەوەی ئایەتەکە بەم ماناو تەفسیرە کە گوتراوە، واتە (خەڵکی دوای ئەو ئەفسانەو هەواڵە ناڕاستانە کەوتبوون، کە شەیتانەکان لە وڵاتی ژێر دەسەڵاتی شا سولەیماندا دەیانگێڕایەوەو بڵاویان کردەوەو، خۆ (سولەیمان)یش بێباوەڕ نەبووبوو و(خواش ڕێبازی سیحری بۆ هەردوو فریشتەکە دانەنابوو، بەڵکو شەیتانەکان خۆیان کافر ببوون)و (لە بابلیشدا هارووتو مارووت خەڵکیان فێری ناسینو زانینی سیحر دەکرد (واتە بە مەبەستی وریاکردنەوەیان) لەم حاڵەتەشدا ڕستەی (ببابل هاروت وماروت) لەو ڕستە دواخراوانە دەبێت کە واتای ڕستەی پێشخراو دەگەیەنێت"[1].

بەپێی ئەم وتەیە دەشێت مەبەست لە هەردوو فریشتەکە (جبریلو میکائیل) بێتو، (هارووتو مارووت)یش دوو ناوی پیاو لە شەیتانەکان بێتو خەڵکیان لە ئاری بابل دا فێری سیحرو ئەفسانەکاری کردبێت"[2].

بەگوێرەی ئەم وتەیەی دواییش دەبێت ڕستەکە (یعلمون الناس السحر) گەیەنەراوی سەر ڕستەی (ما کفر سلیمان) بێت. واتە بێگومان قورئانی پیرۆز کفرو بێباوەڕیی لە (سولەیمان) بەدوورگرتووەو ناردنەخوارەوەی ڕێبازی سیحربازییشی بۆ سەر هەردوو فریشتەکە هەر بە دووری گرتوەو نکوولیی لە هەردوو حاڵەتەکە کردوە. بەڵام شەیتانەکان درۆیان کردوەو سیحرو کفریان داوەتە پاڵ (سلیمان).

---

١) تفسر الطبري/ ٢: ٤١٩

٢) هەمان سەرچاوە/ ٢: ٤٢٠

هەروەها لەو قسەیەشیاندا، كە گوایە (سیحرو جادووگەریی بۆ هەردوو فریشتەكە لە بابل دا هاتۆتە خوارەوە) هەر درۆیان كردووە.

ووتەی دووەم: ئامرازی (ما) هاوەڵناوێك(اسم موصول)ە بە مانای (الذي/ كەوا): ئەم وتەیەش (طبری) داوێتییە پاڵ وتەكانی (عبدالله كوڕی مسعود)و (قتادة)و (الزهري)و (السّدّی)و ئەوانی تر.

(طبري) لە ڕوونكردنەوەی ئەم وتەیەدا گوتوویەتی: "مانای ئایەتەكە بەپێی ئەم وتەیە، ئەمەیە: واتە جوولەكەكان دوای ئەو ئەفسانەو قسەوباسە چەواشەكارییانەی شەیتانەكان كەوتن، كە لە وڵاتی ژێر حكومڕانیی (سولەیمان) دەیانگێڕایەوەو، هەروەها جوولەكەكان دوای ئەو سیحربازییەش (بەكردەوە) كەوتن، كە (هارووتو مارووت) لە بابل داو لە ڕووی تیۆری (نظري)یەوە پێیان ناساندبوونو فێریان كردبوون تاكو لێی بسڵەمنەوە"[1]. بەڵام ئەوان ئەوەشیان كردە بیانووی كردارە پووچەڵەكانیان.

(طبري) ئەم ڕستەیەی دوایی بە ڕاستتر داناوە. بەڵام (ابن كثیر) وتەی بەدواداچوونی خۆی لەسەر ئەو وتەیەی (طبري)-مامۆستای خۆی- دەربڕیوەو، (وتە بەڕاستتر دانراوەكە)ی (طبري)ی ڕەت كردۆتەوەو پاساوی لێكراویشی بەوە هێناوەتەوە كە گوتوویەتی: "پاشان (ابن جریر) سەرەتا ئەم وتەیەی ڕەت كردۆتەوە، كەوا (ما) بە مانای (الذي)یەو، وتەو بیروڕای درێژیشی لەسەری پیشان داوەو، وای لە قەڵەم داوە، كە هارووتو مارووت دوو فریشتە بوونو، خوا ناردوونیەتە خوارەوە بۆ سەر زەویو ڕێی پێداون، كە خەڵكی فێری سیحربازی بكەن -وەك تاقی كردنەوەو هەڵسەنگاندنێك بۆ بەندەكانی خوا- دوای ئەوەی، كە بۆ ئەو عەبدانەشی ڕوون كردۆتەوە، كە ئەو كاری سیحربازییە لەو كارە نالەبارانەیە كە

---

١) تفسیر الطبري / ٢: ٤٢١

لەسەر زاری پێغەمبەران ڕێی لێ گیراوەو قەدەغەیان کردوون. هەروەها (ابن جریر) وایشی داناوە، کە (هارووتو مارووت) لەوەدا گوێڕایەڵی خوا بوونو بەو فەرمانەیەوە پابەند بوون. ئەم وتەو بیروڕایەش، کە ناوبراو گرتویەتیەبەر، زۆر نامۆو سەیرو سەمەرەیە"[1].

بەڵام ئیمام (احمد شاکر) تێبینی لەسەر لێکدانەوەکەی (ابن کثیر) دەربڕیوەو گوتویەتی: "من نکوولی لە وتەی (ابو جعفر) ناکەم، وەك چۆن (ابن کثیر) نکوولیی لێ کردوە، خۆ ئەگەر تۆ دادپەروەر بیتو دوای وتەی (ابو جعفر) بکەویت، ئەوا بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراو ڕۆشنی لەسەر ڕاستیی ئەو بیروڕایە تێدا بەدی دەکەیت، کە پێی گەیشتووە، هەروەها وردبینیو بێگەردیی لە تاووتوێکردنی ماناکانو، ڕێکخستنی بێژەکان (الفاظ)دا بەدی دەکەیت، کە لەوانەیە لە تەفسیرێکی تری جگە لەم تەفسیرە ڕێزدارو گران قەدرەدا بەدییان نەکەیت"[2].

## چۆن فریشتەکان خەڵکیان فێری سیحر کردوە؟!

ئیمام (طبري) پرسیاری دەربارەی ئەرکی هەردوو فریشتەکە لە بابلدا کردوەو، کە ئاخۆ دەشێت خوا ئەرکی سیحرو ئەفسانەکاریی بۆ ناردبنە خوارەوە؟ ئەی ئاخۆ چۆن بۆیان شیاوبووە، کە خەڵکی فێری سیحر بکەن؟ لە وەڵامدا ئیمام (طبري) گوتوویەتی: "بێگومان خوای بەرزو باڵادەست، هەموو جۆرە چاکەو خراپەیەکی خوڵقاندووەو، هەموویشی بۆ بەندەکانی ڕوون کردۆتەوەو، سرووشتی بە پێغەمبەرانی داوەو، فەرمانی پێداون، کە خەڵکی فێری ئەو پەیامە بە سروش نێرراوە بکەنو، حەڵاڵەکانیان پێ بناسێننو، حەرامەکانیشیان نیشان دەنو، لێیان

١) عمدة التفسير/ ١: ١٩٤

٢) تفسير الطبري ٢: ٤٢٢ -حاشية-

ئاگادارکەنەوە، وەکو (زیناکردن)و (دزی)و هەموو ئەو گوناهو سەرپێچییانەی کە پێیان ناساندوونو ڕێگەی ئەنجامدانی ئەو تاوانانەشیان لێ گرتوون، (چونکە سیحرو ئەفسانەکاریی) یەکێکە لەو سەرپێچییانەی کە هەواڵیی لەسەریان پێداونو ڕێی کارکردنیشیان لێ گرتوون.

زانینی سیحرو ناسینی ئەفسانەکاریش بە گوناهێك دانانرێت، وەك چۆن گوناهێك لە زانینی گرتنەوەی (مەی)و داتاشینی پەیکەرو دروستکردنی ئامێری مۆسیقاو کەرەسەی یاریدا نیە، بەڵکو گوناه لە جێبەجێکردنی عەمەلیانەی ئەو زانستەدا هەیە کە تێیدا زیان بە کەسانێك دەگەیەنرێت کە نابێت زیانیان لەسەری پێ بگات.

کەوابوو هیچ گوناهێك لەو زانستی ئەفسانەیەدا نیە، کە خوا بۆ هەردوو فریشتەکەی ناردووەو لەوەشدا گوناه نیە، کە هەردوو فریشتەکە خەڵکیان فێری سیحربازیی کردوە، چونکە فێرکردنی هەرکەسێکیان، کە فێریان کردبێت بە فەرمانی خوا بووەو دوای ئەوەش بووە، کە کەسە فێرکراوەکەیان ئاگادار کردوە لەوەی ئەمە تاقی کردنەوەیە بۆت، پاشان وریایان کردۆتەوە لەوەی نابێت کاری سیحربازی بکاتو، نابێت بە کردەوە ئەنجامی بدات، ئەگینا بێباوەڕ دەرچێت. بەڵکو گوناهەکە لەسەر ئەو کەسەیە، کە کاتێك سیحر لەو دوو فریشتەیەوە فێر دەبێتو کاری پێدەکات، چونکە کاتێك خواش باسی فێربوونی کردوە، لە هەمان کاتدا ڕێی لە کارپێکردنیشی گرتووە، جا کە خوا خۆی ڕێگەی فێربوونی ئەو کارەی بە ئادەمیزاد داوە، شەرمەزارییەکی بۆ هیچ کەسێك تێدا نیە، کە فێری بووبێت، وەك چۆن ئەو دوو فریشتەیەش لە فێربوونو زانینی سیحرەکەدا شەرمەزار نەبوون، چونکە زانینی ئەو کارەیان بەپێی ئەو زانیاریانە بوو، کە خوا بۆی ناردبوونە خوارەوە[1]".

خەڵکیش ئەگەر سەرپێچییان لە ئامۆژگارییەکانی ئەو دوو فریشتەیە کردبێتو، ئەو کاری سیحربازییەی، کە ڕێی لێ گرتبوون ئەنجامیان دابێتو لە جیاکردنەوەو

---

١) تفسير طبري/ ٢: ٤٢٢-٤٢٣

پەرتەوازەیی نێوان ژنو مێرددا بەکاریان هێنابێت، ئەوا لە ڕاستیدا هیچ زیانێکی بەو دوو فریشتەیە نەگەیاندووە، بەڵکو زیانی بۆ سەر خەڵکەکە خۆیان هەبووە.. وەك ئیمامی (طبري)یش گوتویەتی: "کۆمەڵە کەسێك لە پیاوچاکانو شوێنکەوتوانی ڕێبازی خوا لە جیاتی خوا پەرستراون، ئەمەش زیانی بە خودی ئەو پیاوچاكو ئەولیایانە نەگەیاندووە، چونکە ئەوە بە فەرمانو ڕاسپاردەی خۆیان نەبووە، بەڵکو هەندێك کەس هەر لەخۆیانەوە ئەو پیاوچاکانەیان پەرستووەو، پەرستراوەکانی نکوولّییان لەو کارە ناشەرعییە کردوەو دژی بوون.

بە هەمان شێوە هەردوو فریشتەکەش سیحربازیی هیچ کەسێك لەوانەی کە سیحرەکەشیان لێوە فێربوون، زیانیان پێ‌ناگەیەنێت، چونکە دوای ئەوە بووە، کە ڕێی کارەکەیان لێ گرتوونو نکوولّییان لێ کردوونو ئامۆژگاریشیان کردونو، پێیان گوتبوون: (ئێمە هۆی تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنتینو، تۆش بەمە کافرو بێباوەڕ مەبە: (إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡ ). ئیدی ئەم دوو فریشتەیە بەو وتەیەی خۆیان فەرمانی سەرشانی خۆیان جێبەجێ کردوە[(١)]".

## دیاری کردنی ئامرازی ( ما ) لە ئایەتەکەدا

لە ئایەتەکەدا نۆ جار ئامرازی (ما) دیاری کراوە، لە هەندێکدا پیتی (نەرێ/ نەفی)یە بەمانای (لم) لە هەندێکیشیاندا هاوەڵفرانە بە مانای (الذي/ کە)، لە هەردوو جۆرەکەشدا بەم شێوەیە هاتوون:

١- ((وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ )) لێرەدا (ما) ئاوەڵفرمانە بە مانای (الذي)، واتە دوای ئەو قسەوباسانە کەوتن (کە) شەیتانەکان بڵاویان دەکردەوە (اتبعوا الذي تتلوه الشياطين).

١) تفسير الطبـري/ ٢: ٤٢٦- ٤٢٧

٢- ((وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ )))) لێرەدا (ما) پیتی (نەرێ/ نفی)یەو ئاکاری کفرو بێباوەڕیتی لەسەر (سولەیمان) لادەبات.

٣- ((وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ )) ڕای ڕاستتر وایە، کە (ما) لێرەدا ئاوەڵفرمانە، واتە: (اتبعوا السحر الذي انزل على الملكين) دوای ئەو سیحرە کەوتن، کە بۆ هەردوو فریشتەکە نێررابووە خوارەوە لە جیاتی ئەوەی نەدەبوو دوای کەونو کاری پێبکەن، بەڵکو تەنها لێی ئاگادار بوونایە.

٤- ((وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ ))لێرەدا (ما) پیتی نەرێیەو بەمانای (لا يعلمان أحد حتى يحذراه) هیچ کەسێکیان فێر نەدەکرد هەتا ئاگاداریان نەکردایەتەوە.

٥- ((مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ )) لێرەدا (ما) ئاوەڵفرمانە، واتە: (يتعلمون الذي يفرقون به بين المرء وزوجه) تەنها ئەو زانیاری یە خراپەی لێ فێر دەبوون کە بە جادووگەریی ناکۆکیو پەرتەوازەییان دەخستە نێوان ژنو مێردەوە.

٦-((وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ))، لێرەشدا (ما) پیتی نەرێیە.

٧- ((وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ ))، لێرەشدا ئاوەڵفرمانە.

٨- ((مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ)) لێرەشدا پیتی نەرێیە.

٩- ((وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ))، لێرەشدا هاوەڵفرمانە بەمانای (الذي/ کە).

جا کاتێك سەرنج لە هاتنی ئامڕازی (ما) لە ئایەتەکەدا دەدەیت، دەبینیت بەشێوەیەکی (بەپلە دانراو) ڕیزکراون، بۆ نموونە یەکەم جار (هاوەڵفرمانە) پاشان (پیتی نەرێیە)و، ئینجا دەبێتەوە بە (هاوەڵفرمان)و پاشان (پیتی نەرێ)یەو، ئیدی هەر ئاوا دێت، ئەم شێوە ڕێکخستنەش لە شێوازو نەریتی قورئاندا دیاردەیەکی جوانی بەدیی کراوە.

# جۆرەکانی سیحر

سیحر چەند جۆرێکی هەیە، وەك ڕاستیو، خەیاڵی.

ئیمام (راغیب) دەربارەی جۆرەکانی سیحر گوتوویەتی:

"سیحر چەند مانایەکی هەیەو بەو مانایانە دەگوترێت (سیحر)، وەك:

یەکەم/ (فریودان)و چەند خەیاڵدندنێك، کە هیچ بارێکی ڕاستییان نیە، وەك ئەو کردارانەی کەسێکی چەواشەکارو فێڵباز کە بەهۆی سووکیو خێرایی جووڵەی دەستەوە ئەنجامیان دەدات، یان وەك ئەو کردەوەیەی کە کەسێکی (دووزمان، واتە: قسەهێنو قسەبەر) ئەنجامی دەداتو بە وتەی ڕازاوەو باقو بریقی تامەزرۆی بیستن خۆشی دەکات، لەمبارەیەوە خوا (عزّ وجل) فەرموویەتی: ﴿...سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ الأعراف﴾، واتە: سیحربازەکانی فیرعەون سیحریان لە چاوانی خەڵکی کردو ویستیان بیانترسێنن، سیحرێکی گەورەشیان هێنا پێشەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿...يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ طه﴾، واتە: سیحرەکەی سیحربازانی فیرعەون وا هاتە بەرچاوی مووسا وەك ئەوەی مار بێتو بە خێرایی بڕوات.

دووەم/ بەکێشکردنی هاریکاریی شەیتان بەشێوە خۆنزیك کردنەوەیەك لێی، وەك ئەوەی کە خواش لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ الشعراء﴾، واتە: ئایا هەواڵی ئەوەتان پێ بدەم کە شەیتانەکان لەسەر کێ دادەبەزن؟ لەسەر هەموو کەسێکی بوختانکارو تاوانبار دادەبەزن.

هەر لەمبارەیەوە خوا فەرمویەتی: ﴿...وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴿١٠٢﴾ البقرة﴾، کە لەم چیرۆکەدا باسی ئەم ئایەتەش زۆر کراوە.

سێیەم/ ئەوەی کە سیحربازە بێدەنگەکان دەریدەبڕن، کە ناونیشانی کارێکەو وای لەقەڵەم دەدەن گوایە ئەوە بە هێزێکی خۆی کراوەو گوایە ڕوخسارو باڵای مەخلووقات دەگۆڕنو، مرۆڤ دەکەنە گیانداریکی وەك گوێدرێژ، کە لە ڕاستیدا لەلای خۆیان هیچ بارێکی ڕاستیو حەقیقەتی نیە.

چوارەم/ هەندێك جاریش لایەنێکی جوانی لە سیحردا وێنا دەکرێت.. بۆ نموونە گوتراوە لە نووسینو ڕەوانبێژییدا سیحرێك هەیە.. هەندێك جاری تریش جوانیو کاراییی کردارەکەی پیشان دەدرێت، تا وای لێهاتووە، کە پزیشکەکان بڵێن: سروشت ساحیرو ئەفسوناوییە. هەروەها خۆراکیشیان بە سیحرێك ناوبردوە بەهۆی ئەوەی وردەکاریی تێدایەو خۆشەو کاریگەریشی هەیە"[1].

ئیمام (فخرالدین الرازی)یش چەند جۆرێکی لە سیحر دیاریی کردوە، وەك:

یەکەم/ سیحری (کلدانییەکان)و (کەسدانییەکان) کە لە دێرزەماندا ژیاونو، گەلێك بوون ئەستێرەکانیان دەپەرستو، ڕایان وابوو، کە ئەستێرەکان ئەم جیهانە بەڕێوە دەبەن.

دووەم/ سیحری ئەو کەسانەی، کە وەهمو نەفسێکی بەهێزیان لە کارتێکردنو ئاڵوودەکردنی کەسانی تردا هەیە کە سیحریان لێدەکەنو چەواشەیان دەکەن.

سێیەم/ پەنابردنە بەر هاوکاریکردنی (جن)و ڕۆح لە بەرەکانی تری زەوی.

چوارەم/ خەیاڵاندن (تخیلات)و کاراییی بە (چاو).

---

١) (المفردات)ی راغب / ل-٢٢٦.

پێنجەم/ ئەو کردارە سەرسوڕهێنانەی کە لە ئەنجامی پێکهێنانی ئامێرە پێکەوە بەستراوەکانەوە هەندێك جار لەسەر ڕێژە ئەندازەییەکان دەردەکەون، هەندێك جاری تریش لەسەر ڕووبەندی خەیاڵ دەردەخرێن. کاری سیحربازەکانی فیرعەون لەم جۆرە بووە.

شەشەم/ پەنابردنە بەر چەند خاسیەتێکی دەرمانەکان، وەك ئەوەی هەندێك دەرمانی تێکچووی کۆن بکرێتە خۆراکەوە، کە عەقڵی مرۆڤ بۆ ماوەیەك ناهێڵێت، یان ماددە دووکەڵاوییە سەرخۆشکەرەکان، وەك مێشکی کەر (گوێدرێژ) کە ئەگەر مرۆڤ بیخوات ئەوا عەقڵی تێك دەدات، زیرەکیشی کەم دەکاتەوە.

حەوتەم/ پەیوەست کردنی عەقڵ: ئەوەیە کابرای سیحرباز ئیدیعای ئەوە دەکات گوایە ناوە هەرەگەورەکە (الإسم الأعظم)ی ناسیوەو، جنیش، واتە جنۆکەکانیش گوێڕایەڵیی دەکەن و لە زۆربەی کاروبارەکاندا ملکەچی دەبن، جا ئەگەر وا ڕێکەوت کە بیسەرەکە عەقڵی واز بێت و توانای جیاکردنەوەی چاك و خراپی لە یەکتر کەم بێت، ئەوا ئەمە بە هەق دەزانێت و، دڵیشی پێوەی پەیوەست دەبێت و، جۆرە ترس و لەرزێکیش لە دەروونیدا دروست دەبێت، جا ئەگەر ترس و لەرزی بۆ دروست ببێت ئەوا هێز هەستەوەرییەکانیشی لاواز دەبن.. لەو کاتەشدا سیحربازەکە دەتوانێت خواستەکانی خۆی بەدی بێنێت.. هەرکەسێکیش ئەزموونی لەم کارانەدا هەبێت و حاڵ و بارودۆخی ئەهلی عیلم و زانایانی زانیبێت، ئەوا دەزانێت کە دڵ چ کاریگەرییەکی گەورەی لە ڕاپەڕاندنی کارەکان و شاردنەوەی نهێنییەکاندا هەیە.

هەشتەم/ هەوڵدان بە هێنان و بردنی قسەوباس لە چەند ڕێیەکی شاراوەو هێمنانەوە"[١].

---

١) بڕوانە (التفسیر الکبیر)ی ئیمام ڕازی، بەرگی٣، لاپەڕە ٢٠٦-٢١٣.

## ئایا سیحر کاریگەریی هەیە؟ یان خەیاڵاندنێکە؟

زانیمان کە سیحر چەند جۆرێکی هەیە، هەندێکیان ڕاستەقینەن‌و، هەندێکیشیان خەیاڵاندنەو بەندە بە وەهم‌و ترساندن‌و فریودانەوە. زانایانی ئیسلامیش بیروڕای هەمەجۆرو لێك جودایان لەسەر سیحر هەیە، کە ئاخۆ شتێکی ڕاستەقینەیەو کاریگەریی لەسەر کەسی سیحر لێکرا هەیە یاخود خەیاڵاندنێکەو هیچ ڕاستییەك‌و کاریگەرییەکی نیە؟! لەم ڕووەوە ئیمامی (طبري) ڕای وایە، کە هیچ ڕاستییەکی نیەو تەنها بە خەیاڵاندن‌و فریودانەوە بەندە.. وەك دەڵێت: "ئەوە تەنها چەند فڕوفێڵ‌و چاوبەستی‌و کارێکی مانادارن کە کابرای سیحرباز ئەنجامیان دەدات. تاکو ئەوە بخاتە دڵی سیحر لێکراوەکەوە کە پێچەوانەی واقیعەکەیە. نمونەی ئەمەش وەك کەسێك لە دوورەوە (سەراب/ تراویلکە) ببینێت‌و وابزانێت ئاوەو هەر ئاوەکەی لە خەیاڵی خۆیدا دانابێت، ئیدی هەر شتێك لە دوورەوە ببینێت بە پێچەوانەی ڕووە ڕاستەقینەکەیەوەی دابنێت. یان وەك سەرنشینێکی نێو پاپۆڕی ڕۆیشتوو کاتێك بە هێزاشی ڕێگە دەبڕێت وادەزانێت هەرچی درەخت‌و چیای بەرچاوی هەیە لەگەڵیدا دەڕۆن.. مرۆڤی سیحر لێکراویش ئاوایەو، ئەمە نەریتیەتی‌و، ئەو دوورییەی، کە لە سیحری سیحربازەکەوە پێی دەگات وای بۆ دەچێت کە هەر ئەوە واقیعەکەیە، ئەمەش بە پێچەوانەی بارە ڕاستەقینەکەی‌و، کاریگەرێتییەکەشی"(1).

بەڵام ئیمامی (ڕازی) وای بۆچووە کە سیحر باری ڕاستی‌و کاریگەریشی هەیەو، کابرای سیحرباز -بەخواستی خوا- دەتوانێت زیان بگەیەنێت، وەك گوتوویە: "شوێنکەوتوانی سوننەت بە شیاویان داناوە گەر سیحرباز بتوانێت بەنێو هەوادا

1) تفسير الطبري/ ٢: ٤٣٦ .

بفرێـتو، کـەر بکـات بـە مـرۆڤو، مـرۆڤیش بکـات بـە کـەر، بـەڵام زانایـانی شوێنکەوتووی سوننەت گوتوویانە: خوا خۆی خالقی ئەم شتایەیەو کاتێـک کـابرای سیحرباز چەند نووشتەیەکی تایبەتیو چـەند وشـەیەکی دیـاریکراو دەخوێنێتـەوە، ئەوا لەوانەیە کاریگەرەکە لە ئەستێرەکانو گەردوونەوە بێت... ئەم زانایانـەش لـە قورئانو فەرموودە هەواڵبەخـشەکانەوەو لـە چـەند بەسەرهاتێکیـشەوە بەڵگـەیان لەسەر ڕوودانی ئەم جۆرە سیحرە هێناوەتەوە. بەڵگەی قورئانیان لەم فەرمایـشتەی خـواوە هێنـاوە کـە فەرموویـەتی: ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾ واتە: ئەوان ناتوانن زیان لە هـیچ کەسـێك پێبگەیـەنن تـەنها بـە خواسـتی خـوا نـەبێت... لـەم ئایەتـەدا ئـامڕازی (الا/ تـەنها) کـە ئـامڕازێکی جیاکـاری (أداة استثناء)ە، دەلالـەت لەسـەر پەیـدابوونی کاریگـەریو ئاسـەوارەکانی سـیحرەکە دەکات.. فەرموودەکاتی تایبەت بە هـەواڵو بەسـەرهاتەکانیش بـە شـێوەو پلـەی (متواتر)و (احاد) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاونەتەوە[(١)]".

زانایـانی بـواری فـەرموودە ڕایـان وایـە، کـە سـیحر حەقیقـەتێکی هەیـەو، سیحربازیش بەخواستی خوا، دەتوانێت کار لە سیحر لێکراوان بکات.. لـەو ڕووەوە ئیمام (ابن حجر) لە (فتح الباري)دا گوتوویەتی: "بـیروڕای جیـاواز لەسـەر سـیحر هەیە، وەك ئەوەی گوتراوە ئەوە تەنها خەیاڵاندنێکـەو، هـیچ حەقیقـەتێکی نیـە، ئەمەش ڕای (ابوجعفری استراباذي)یە لـە مەزهـەبی (شـافیعی)و، ڕای (ابـوبکری ڕازی)یە لە (حەنەفی)و، ڕای (ابن حـزم)ی (ظـاهري)یـشە، لەگـەڵ ڕای کۆمـەڵێك زانای تردا. (نووی)یش گوتوویەتی (لەڕاستیدا ئەوەیە، کە حەقیقەتێكو بناوانێکی

---

١) بڕوانە تەفسیری (رازی) بەرگی (٣) لاپەڕە (٢١٣) بە کورتی... هـەروەها دەربـارەی فـەرموودەی (متواتر)و (احاد)یش، دەڵێین: فەرموودەی (متواتر) ئەوەیە، کە ژمارەی گێڕەرەوەکانی (ڕاویەکانی) لە هـەموو چـینێکی خـەڵکی بـنو هـەموو ئاکارێـك درۆو قـسە هەڵبەسـتنیان لـێ دووربێـتو ڕاوییەکانیش بە چاوی خۆیان بینیبێتیانو بە گوێ بیستبێتیان.. فەرموودەی (احاد)یش ئەوەیە کـە نەگەیشتبێتە پلەی (تواتر) لە ڕووی ژمارەی ڕاویەکانیەوە.

هەبێت، کۆمەڵی زانایانیش وایان براندۆتەوەو سەرجەم زانایانیش هەمان ڕایان هەیەو، بەڵگەش لە قورئانو سوننەتی ڕاستو سەلمێنراوەوە لەسەری هەیە. بەڵام ئەوەی جێی ناتەبایيو جیاوازیی بیروڕاکانیانە، ئەوەیە ئایا بە سیحرکردن کار لە هەڵگەڕانەوەی چاو دەکرێت یان نا؟ جا هەرکەسێکیش بڵێت ئەوە تەنها خەیاڵاندنێکە، لێی وەرناگیرێت، ئەوانەی کە گوتووشیانە (سیحر حەقیقەتێکی هەیە) بیروڕای جیاوازو لێکجودایان لەوەدا هەیە کە ئایا ئەم حەقیقەتە هیچ کاریگەری یەکی وای هەیە بەو ڕەنگەی سرووشتو میزاج بگۆڕێتو ببێتە جۆرێك لە نەخۆشی یەکان یاخود کاریگەریی‌یەکەی بگاتە ڕادەی گۆڕانو بێگیانەکان بکاتە گیاندار، یان بە پێچەوانەوە گیاندارەکان بکاتە شتی بێگیان؟ جا ئەوەی کە ڕای کۆمەڵی زانایانی لەسەر بێت، یەکەمیانە، واتە کە سیحر حەقیقەتێکیو تەنها هێندەی کاریگەریی هەیە کە نەختێك لە میزاجو سروشتی شتەکان یان بەرامبەرەکەی تێك بدات.. بەڵام چەند زانایەکی کەم ڕایان لەسەر ئەگەری دووەمە کە گوایە گۆڕانکاری بەسەر شتەکان دا دەکات."

(مازری)یش گوتوویەتی: "کۆمەڵی زانایان ڕایان لەسەر بوونی سیحر هەیە کە لە ئارادایەو حەقیقەتو بناوانێکی هەیە، بەڵام هەندێك زانای تریش نکووڵی لە وجودو حەقیقەتی دەکەن".

هەروەها ناوبراو ڕای وایە ئەوەی بە چەند خەیاڵێکی پووچەڵ دانراوە، وانیەو بەپێی هەبوونی دەق لەسەر سەلماندنی وجودی سیحر، ڕەت دەکرێتەوە کە ئەگەر چەند خەیاڵێکی پووچەڵ بێت. جا لەبەر ئەوەی عەقڵیش نکووڵی ناکات لەوەی کە بێگومان خوا سنووری عادەتو دابو نەریت لە کاتی ئاخاوتنی سیحربازدا بە وشەیەکی هەڵبەستراو، یان بە پێکهێنانی چەند تەنێك، یاخود بە تێکەڵو پێکەڵکردنی چەند هێزێك لەسەر شێوازێکی تایبەتی، تێدەپەڕێنێت"[1].

---

١) فتح الباری، للإمام ابن حجر/ ١٠: ٢٢٢-٢٢٣

# سیحر کردن له پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕاسترین بیروڕاو ڕیوایەتیش کە لە کۆمەڵی زانایانی شوێنکەوتوی سوننەتەوە هێنراوە، ئەوەیە بێگومان سیحر وجودو کاریگەریشی هەیەو، مرۆڤی سیحرباز دەتوانێت کار لە ناحەزەکەی بکاتو زیانیشی پێ بگەیەنێت (دیارە هەموو ئەمانەش بە خواستو ئاگاداری خواو بەپێی حیکمەتێکە خۆشی لەوبارەیەوە).

هەر ئەمەش ڕای بە ڕاست دانراوو یەکلاکراوەیە، چونکە بەڵگەی لە دەقەکانی قورئانو فەرموودەوە لەسەرە. دەقی قورئانیش لە چیرۆکەکەی (هارووتو مارووت)ەوە هاتووە، کە دوای نەختێکی تر دەچینەوە سەری. ڕیوایەتەکەش ئەو ڕووداوی سیحرکردن کابرای جوولەکەیە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئیمام (بوخاری) لە چەند جێگەیەکی کتێبەکەیدا (صحيح البخاري) هێناویێتییەوە. ئەم ڕووداوەش لە (عائیشە)ەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی:

((سَحَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ كَانَ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا فَعَلَهُ حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهُوَ عِنْدِي لَكِنَّهُ دَعَا وَدَعَا ثُمَّ قَالَ يَا عَائِشَةُ أَشَعَرْتِ أَنَّ اللهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ أَتَانِي رَجُلانِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ مَا وَجَعُ الرَّجُلِ فَقَالَ مَطْبُوبٌ قَالَ مَنْ طَبَّهُ قَالَ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ قَالَ فِي أَيِّ شَيْءٍ قَالَ فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُفِّ طَلْعِ نَخْلَةٍ ذَكَرٍ قَالَ وَأَيْنَ هُوَ قَالَ فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ فَأَتَاهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ فَقَالَ يَا عَائِشَةُ كَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ أَوْ كَأَنَّ رُءُوسَ نَخْلِهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ أَفَلا اسْتَخْرَجْتَهُ قَالَ قَدْ عَافَانِي اللهُ فَكَرِهْتُ أَنْ أُثَوِّرَ عَلَى النَّاسِ فِيهِ شَرًّا فَأَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ))[1].

---

١) صحيح البخاري (٧٦) كتاب الطب، (٤٧) باب السحر، حديث (٥٧٦٣).

واتە: (عائیشە) گوتوویەتی: پیاوێك لە هۆزی (بەنی زریقە) کە ناوی (لبید کوڕی اعصم) بوو، سیحرێکی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو تەنانەت پێغەمبەر ﷺ وای دەزانی ئەو کارەی سیحربازەکە بە ڕواڵەت هەروایە، بەڵام واش نەبوو. ئەوەبوو ڕۆژێکیان یان شەوێکیان -کە لەلای خۆم بوو- هەر نزاو دوعای دەکرد، پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە، ئایا هەستت کردووە بەوەی کە خوا وەڵامی ئەو مەسەلەیەی بۆ ڕوون کردوومەوە کە داواو پرسیارم لەبارەیەوە کردبوو؟ ئەوەبوو دوو پیاو هاتبوون بۆ لام، یەکێکیان لەلای سەرمەوە دانیشتو ئەوی تریشیان لەلای قاچمەوە، ئنجا یەکێکیان لەوی تریانی پرسی: (ئەم پیاوە چ ئازارێکی هەیە؟) ئەویش گوتی: (سیحری لێکراوە)، لێی پرسیەوە: (کێ سیحری لێکردوە؟) گوتی: (لبید کوڕی أعصم). دوبارە لێی پرسی: (لە چ شتێکدا سیحری لێکردوە)، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: (لە شانەیەكو قژێکی وەریوی بە شانە داهێنراو داو، لە توێکڵی تەنگی دارخورمای نێردا). ئنجا لێی پرسی: (ئەی ئەوانە لە کوێ دان؟) ئەویش لە وەڵامدا گوتی: (لە بیری ذروان). ئیدی پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی چوونە سەر بیرەکەو، هاتەوەو پێی گوتم: ئەی عائیشە، ئاوەکەی وەك ئاوی دەرچووی خەنە بوو، سەری دارخورماکانیشی وەك سەری شەیتانەکان بوو.. منیش پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا دەرتهێنان؟ فەرمووی: (خوا پاراستمیو، منیش پێم خۆش نەبوو خراپەیەکی تێدا تووشی خەڵکی بکەم).. عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دابوو نەهێڵرێن، ئیدی لەسەر ئەو فەرمانە شارانەوە لەنێو خاکدا.

هەروەها (بخاری) لە (کتاب الطب) باب (هل یستخرج في السحر)دا بە ڕیوایەتێکی تر ئەم ڕووداوەی گێڕاوەتەوەو هەندێك ڕستەی تری بۆ زیاد کردوەو، گوتوویەتی:

"لە عائیشەوە- خوا لێی ڕازی بێت- گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: سیحر لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا بە شێوەیەك وای لێ هات کە دەچێتە لای ئافرەت (واتە

کاتێـك لەگـەڵ خێزانـی دابوایـە نەدەچـوو بەلایـدا). لـەم ڕووەوە (سـفیان) لـە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە گوتوویەتی: ئەوەش توندترین شـێوازی سـیحر لێکردنـە ئەگەر گەیشتبێتە ئـەو ڕادەیـە. ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ دوای ئـەوەی سـیحرەکەی لێکراوە فەرمووی: ئەی عائیشە، ئایا دەزانیت، کە خـوا ئـەوەی دەمویـست بـۆی ڕوون کردمەوە.. ئەوەبوو کاتێك دوو پیاو هاتنە لامو یـەکێکیان لـەلای سـەرمەوە دانیشتو ئەوی تریشیان لەلای هەردوو قاچمەوە، جا ئەوەی کـە لـەلای سـەرمەوە دانیشتبوو بەوی تریانی گوت (ئەم کابرایـە چـییەتی؟) ئـەویش گـوتی: (سـیحری لێکراوە)، پرسی: (کێ سیحری لـێکردوە؟)، گوتی: (لبیـدی کـوڕی اعـصم)، کـە پیاوێکە لە هـۆزی (بنـی زریـق)ی هاوپـەیمانی جوولەکـەکانو، کەسـێکی دووڕوو (منافق) بووە. ئنجا لێـی پرسـی ( لـە چـیدا سـیحری لـێکردوە؟) گـوتی: (لـە شانەیەكو چەند تاڵەقژێکی وەریوی داهێنـراودا)، پاشـان لێـی پرسـی: (ئـەوە لـە کوێیە؟) پێی گوت: (لەنێو توێکڵە تەنکەکەی خورمایەکی نێرداو لەژێر بـەردێکی دەرکەوتووی سەروو بیرەکەدا لە بیـری ذروان).

ئنجا عائیشە دەڵێت: پێغەمبەریش ﷺ چووەتە سـەر بیرەکـەو دەریهێنـاوەو، فەرمووی: ئەو بیرەی، کە پیشانم درا ئاوەکەی وەك ئـاوی دەرچـووی خەنـە وابـوو، خورماکەشی وەك سەری شەیتانەکان.. پاشان فەرمووی: لەوێ دەرهێنرا.. هەروەها (عائیشە) گوتوویەتی: لێم پرسـی: ئایـا هـیچ چارەسـەرێکت بـۆ خۆپـارێزی لـەو دیاردەیە بەکار نەهێنا؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، چونکە من خوا شیفای پێدامو، حەزیش ناکەم ئەم باسە لەلای خەڵکی بخروشێنمو تووشی خراپە بن پێوەی"[1].

(ابـن حجـر) بەدرێـژی لەسـەر ئـەم دوو فەرموودەیـەی پێـشوو ڕۆیـشتووەو شیکردونەتەوە، ئێمەش لێرەدا واتاو شیکاری هەندێك وشەو ڕستەی نێـو ئـەو دوو فەرموودەیە لەو سەرچاوەیەوە دیاری دەکەین:

---

١) صحيح البخاري (٧٦) كتاب الطب (٤٩) باب: هل يستخرج السحر؟ حديث (٥٧٦٥).

-وتەکەی (عائیشە) دەربارەی سیحرکردنەکە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ )کە ئەو سیحرە بە شێوەیەك بووە کاتێك خێزانی دەبینی نەدەچوو بەلایدا ئەمە تەنها لە دەرووی خەیالاندنو هەستەوەرییەوە بووە. لەم ڕووەوە قازی (عیاض) ئەمەی کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە (سیحرەکە تەنها کاری کردۆتە سەر جەستەو ئەندامە دیارەکانی جەستەی، نەك لە سەر بیروهۆشو بیروباوەڕی) [(١)].

سیحرکردنیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێچەوانەی ئەو حاڵەتە پارێزراوی یە نەبووە کە دووربووە لە شەڕو خراپەی شەیتانەکانو لێیان پارێزراو بووە. وەك (ابن حجر) گوتوویەتی: "پارێزراویی پێغەمبەر ﷺ لە شەیتانەکان، هۆی قەدەغەکردنی خواستی ئەو شەیتانانە نەبووە لە مەسەلەی فێڵ لێکردنیان دا، ئەو ئاسەوارەش کە لە سیحرەکەوە بەسەریدا هاتووە کەموکوڕییەکی لەسەر ئەرکی گەیاندنی پەیامەکەی بۆ دروست نەکردوە، بەڵکو ئەوە لە چوارچێوەی ئەو حاڵەتەدایە کە هەموو نەخۆشییەکی تری بەسەردا هاتبێت وەك لاوازییەك لە ئاخاوتندا، یان بێتوانایی‌یەکی کاتی لە ئەنجامدانی هەندێك کرداردا، یاخود پەیدابوونی خەیاڵو داڵغەیەکی کاتی کە بەردەوامیی پێوە دیار نەبووە، بەڵکو هەر زوو ڕەویوەتەوەو، ئیدی خواش فڕوفێڵی شەیتانەکانی پووچەڵ کردۆتەوە"[(٢)].

-وتەی یەکێك لەو دوو فریشتە (لەو دوو پیاوە)ی یەکێکیان دەربارەی پێغەمبەر ﷺ گوتبووی: (انه مطبوب/ ئەمە سیحری لێکراوە) لە عەرەبیدا بە مانای (انه مسحور) دێت، چونکە لە بواری گەشبینییەوە بە وشەی (طب) گوزارشتیان لە (سیحر) کردوە، وەك چۆن بۆ کەسێکی مارانگاز (لدیغ) زاراوەی ساغ (سلیم)یان بەکارهێناوە.

-وتەی یەکێکی تریشیان، کە (ئەوەی سیحرەکەی لێکردوە -لبیدی کوڕی

---

١) فتح الباري/ ١٠: ٢٢٧.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ١٠: ٢٢٨

أعصم-ە) لە شێوە گێڕانەوە (ڕیوایەتەکە)ی (مسلم)دا وا هاتووە کە "جوولەکەیەك لە جوولەکەکانی هۆزی (بەنی زریق) کە (لبیدی کوڕی اعصم)ە، سیحری لە پێغەمبەر کردوە"[1]. (واقدی)یش ڕوونی کردۆتەوە، کە ئەم سیحرکردنە لە ڕاستیدا ڕووی داوەو کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبیبەوە گەڕاوەتەوە لە مانگی (محرم)ی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا، لەوکاتەدا سەرانی جوولەکە چوونەتە لای (لبیدی کوڕی اعصم)، کە هاوپەیمانێکی نێو (بەنی زریق) بووەو جوولەکەیەکی سیحربازیش بووەو داوایان لێکردوە، سیحرێکی وەها لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، کە کاری لێبکات‌و لە پاداشتی ئەمەشدا سێ دیناری بە پارەی ئەو سەردەمە پێبدەن[2].

لەوکاتەدا خوشکەکەی (لبید)یش گوتوویەتی: ئەگەر ئەو پێغەمبەرێك بێت ئەوا خوا لەو کارە ئاگاداری دەکات، دەنا سیحرەکە هێندەی بێئاگا دەکات، تا ئەو ڕادەیەی عەقڵیشی دەبات[3]. ئەو شانەیەش (المشط) کە (لبیدی کوڕی أعصم) لە سیحرەکەدا بەکاری هێناوە (ئەو ئامێرە ناسراوەیە کە قژی سەرو ڕیشی پێ دادەهێنرێت[4].

وشەی (مشاطة)ش ئەو قژە کەمە وەریوەیە کە بە شانەکەوە دەلکێت لەکاتی سەرو ڕیش داهێناندا. هەروەها (جف طلعة ذکر)یش کە کابرای سیحرباز شانەو قژەوەڕیوەکەی تیادا داناوە، توێکڵی ناسکی ئەو خورما بەرگرتووەیە، کە بە (طلع) ناسراوەو بۆ مێینەو نێرینەکەشی بەکاردەهێنرێت) (واتە ئەو ناوەیان پێ دەگوترێت).

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ١٠: ٢٢٦
٢) فتح الباري/ ١٠: ٢٢٧
٣) هەمان سەرچاوە/ ١٠: ٢٢٩
٤) هەمان سەرچاوە/ ١٠: ٢٣٤

کابرای سیحربازیش (واته-لبید) شانەو قژه وەریوەکەی سەر دانەکانی ئەو شانەیەی بەو توێکڵە خورمایە پێچاوەو لەژێر بەردەکەی نێو بیرەکەدا، کە بە (رعوفه) ناوبراوە، دایناوە، (رعوفه)ش یان (راعوفه) به بەردێك دەگوترێت که لە سەرەوەی بیردا دانراوەو بە کەس هەڵناکێشرێت، واته بە لێواری سەرەوەی بیردا دادەکوترێتو ئەو کەسەی که دەیەوێت ئاو له بیردا دەربێنێت پای دەخاتە سەرو لەسەری دەوەستێت، پێدەچێت بەردی لەم جۆره لە بەشی خوارەوەی بیریشدا دابنرێت[1].

- بیری (ذروان)یش، هەر بیرەکەی تیرەی (بنو زريق) بووه.

-وتەی (عائیشه)ش کە بە پێغەمبەری گوتووه: (ألا تنشّرت) ئایا هیچ چارەسەرێکت نەگرتەبەرو؟ پاشان وەڵامەکەی پێغەمبەریش ﷺ که فەرموویەتی: **((إن الله قد شفاني))** بێگومان خوا هەر خۆی چارەی کردمو چاکی کردمەوە. سەبارەت به مانای (ألا تنشرت) که له چاوگی (نُشرة) بە (ضمة)ی سەر پیتی (نوونەکەی) مانای جۆره چارەسەرێکەو، بۆ چاکردنەوەی هەرکەسێك بەکاردێت، گەر وادیار بێت، که سیحری لێکراوەو هەر بەم رێگەچارەیەش کارایی‌و شوێنەواری سیحرەکه لەسەر سیحر لێکراو نەهێڵرێت. تەنها کەسێکیش توانای بەکارهێنانی ئەو رێگەچارەیەی هەیە، کە خۆیشی لە سیحر بزانێتو شارەزایی لەسەر هەبێت[2].

ئیمامی (بیهقي)یش له کتێبی (دلائل النبوة)دا باسێکی زیاتری لە ڕیوایەتی ئەم بەسەرهاته گێڕاوەتەوە کە: "پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بۆ ناو بیرەکەی (ذروان) ناردووەو، پیاوەکەش بۆ بیرەکه چۆتە خوارەوەو توێکڵی خورما بەردارەکەی لەژێر بەردە داکوتراوەکەی سەر لێواری بیرەکە دەرهێناوەو دەبینێت، کە شانەکەی پێغەمبەری خوا ﷺو چەند تاڵێکی وەریوی مووی سەریشی لەسەر دانەکانی

[1] هەمان سەرچاوە/ ١٠: ٢٣٣
[2] هەمان سەرچاوە/ ١٠: ٢٣٣

شانەکە هەبووە، هەروەها پەیکەرێکی لە مۆم دروستکراوی پێغەمبەرو چەند دەرزییەکی چەقێنراوو تەنافێکی کەوام کە لە یازدە گرێ پێکهاتووە.

(جیبریل)ی فریشتەی خواش (سلاوی خوای لێ بێت) هەردوو سوورەتی (قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ )و (قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ )ی لەلایەن خواوە بۆ هێناوەو پێی فەرمووە: ((ئەی محمد، بڵێ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ )) کە وای خوێندووە گرێیەکیان کراوەتەوە، بە ڕستەی ( مِن شَرِّ مَا خَلَقَ )یش گرێیەکی تر کراوەتەوە، تاکو لەو سورەتە بۆتەوە، پاشان پێی فەرمووە: بڵێ (قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ )، جا کەوای وتوەو کە ئەوەی خوێندووە، گرێیەك کراوەتەوە، تاکو لە هەموو سوورەتەکە بۆتەوەو ئیدی بە خوێندنی هەموو ئایەتەکانی ئەو سوورەتەش هەموو گرێیەکان کراونەتەوە. هەر دەرزی یەکیشی لابردبێت ئازارێکی کەمی بووەو دواتر هەستی بە خۆشیو حەسانەوەیەك کردوە.

ئنجا پێی گوتراوە: ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی کابرای جوولەکەشت نەکوشت؟ فەرمووی: خوا منی لەوە پاراستو چاکی کردمەوە، بەڵام لەدوای ئەمەوە سزای توندترو سەخت تر بۆ ئەو جۆرە کەسانە هەیە[1].

لەوانەشە هەندێك کەس ڕووداوی سیحرکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوور بزانن‌و وای دانێن ئەمە پێچەوانەی حاڵەتی پارێزراویی پێغەمبەرەو داکۆکی لێکرانیەتی لە شەیتان. بەڵام هیچ پاساوێك بۆ ئەم بۆچوونی بەدوورگرتنەی لە ئارادا نیە، بە تایبەتیش دوای ئەوەی ڕووداوە، کە لە هەموو کتێبەکانی فەرموودەدا سەلمێنراوە. بۆ نموونە لە نێوان (بخاریو مسلم)دا بە (متفق علیە) دادەنرێت، هەروەها لە هەموو کتێبەکانی تری فەرموودەو ژیاننامەو تەفسیریشدا دیاری کراوە.

---

١) دلائل النبوة للبیهقي/ ٧: ٩٤ ، هەروەها بڕوانە فتح الباري/ ١٠: ٢٣٠.

سەبارەت بە گونجاندنی ڕووداوەکەش لەگەڵ پارێزراوی (عصمە)ی پێغەمبەریشدا ﷺ لێرەدا تەنها وتەیەکی ئیمام (مازری) دیاری دەکەم کە ئیمامی (نووی) لە شەرحیدا بۆ (صحیحی امام مسلم) هێناویەتییەوە، لەم ڕووەوە (مازری) گوتوویەتی: "هەندێك کەس لە بیدعەکاران بەهۆیەکی ترەوە نکوڵییان لەم ڕووداوەو فەرموودەکەی کردووە، ئەویش بەو ئیدعایەی، کە لە (پلەی پێغەمبەریتی کەم دەکاتەوەو گومانی لەسەر دروست دەکات،و بە شیاودانانی ئەگەری سیحرکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ متمانە بە شەرع ناهێڵێت)، ئەم ئیدیعایەی ئەو بیدعەت کارانەش پووچ،و بەتاڵە، چونکە بەڵگە جێگیرو سەلمێنراوەکان لەسەر ڕاستی،و دروستی ڕووداوەکەو لەسەر عیصمەت،و پارێزراویی پێغەمبەریش ﷺ هەیە، بەتایبەتی لە ئەرکی گەیاندنی پەیام،و بانگەوازدا، موعجیزەش لەسەر ئەمە شایەتە. ئیدی هێنانەوەی هەر بەڵگەیەکی لابەلاو پێچەوانەی ئەم بەڵگانە کارێکی نەشیاوو پووچەڵە. سەبارەت بە هەندێك مەسەلەو کاروباری دنیاش، کە بەندێکی ڕۆشنی لەسەر نەهاتبێت،و، کە جێی بایەخ نەبووبێت،و زیاتر بەسەر حاڵەتی تایبەتیی مرۆڤەکاندا هاتبێت، ئەوە بێگومان دوور نیە هەندێك مەسەلەی ئاوا چووبێتە بازنەی ئەندێشەو خەیاڵییەوە، وەك ئەوەی گوترابوو گوایە لەکاتی سیحرەکەدا، ئەوە لە خەیاڵی پێغەمبەردا ﷺ دروست بووبوو، کە وەختێك دەچێتە لای هاوسەرانی، پێیان ناگات، بەڵام ئەم جۆرە خەیاڵ،و حاڵەتە خەیاڵییانە تەنها لەکاتی خەوتندا تووشی مرۆڤ دەبێت. واتە واقیعی نیەو، لەکاتی بێداریدا حاڵەتی ئاوا دروست نابێت، کە کاتێك پیاو دەچێتە لای هاوسەرەکەی، پێی نەگات،و لێی نەکەوێت.

گوتراویشە ئەو حاڵەتەی وەها دەخەیاڵاند، کە ئەو کاری چوونە لای هاوسەری ئەنجام داوەو، بەڵام لە ڕاستیشدا وانەبووەو بڕواو بۆچوونیشی لەسەر ڕاستیی ئەندێشەو خەیاڵاندنی نەبووە، ئیدی ئەم بڕواو بۆچوونانەی لەسەر باری ڕاستی،و ڕاست نەپێکانی بووە.

دادوەر (عیاض) گوتوویەتی: "ڕیوایەتو شێوەگێڕانەوە هەمەجۆرەکانی ئەم فەرموودەیە ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە سیحرەکە تەنها جەستەو ئەنجامە دیارەکانی جەستەی داگرتووە، نەك عەقڵو دڵو بیروباوەڕی. مانای (حتی یظن أنه یأتي أهلە ولا یأتیهن) کە هەواڵی (یخیل الیە)ش دەگێڕێتەوە، واتە تەنانەت کاتێك وای بۆ دەچوو، کە دەچێتە لای هاوسەری‌و، بەڵام لێیشی نەدەکەوت، کە ئەمەش هەواڵی (یخیل الیە/ وای بۆ دەخەیاڵاند) دەیگێڕێتەوە، بەمانای ئەوەی لە چوستو چالاکیی خۆی دەردەخستو نەریتی خۆی بۆ توانا لەسەر هاوسەرانی پێش دەخستو، ئەگەر لێیان زیك ببوایەتەوە، ئەوا بە کارایی سیحر ڕادەگیراو نەدەچووە لایانو ئەو کارەی بۆ ئەنجام نەدەدرا، وەك چۆن کەسێکی سیحر لێکراو کاری تێدەکرێت. هەموو ئەوەی لەو ڕیوایەتانەشدا هاتووە لەمەڕ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ئەنجامی سیحرەکەدا کارێکی لە خەیاڵی خۆیدا ئەنجام دابێتو، بەڵام لە ڕاستیدا ئەنجامی نەدابێت، یان لەمەڕ هەر حاڵەتێکی تری هاوشێوەی ئەوە، تەنها لە بواری خەیاڵاندنی چاودا بووە، نەك لە بواری کەموکووڕییەکی وادا، کە پەلی بۆ هۆشو عەقڵی هاویشتبێت. دیارە لەمەشدا هیچ گومانو تەمومژێك لەسەر ئەو پەیامە پاکەی نیەو، کەسانی گومڕاش ناتوانن تیروتوانجی لێبدەن"[1].

---

1) شرح النووي علی صحیح مسلم/ ١٤: ١٧٤-١٧٥.

## سیحری ڕەوا ((إنّ مِنَ البَيان لسحراً))

زانیمان سیحر بە هەركارێك دەگوترێت، كە بە هێواشیو بە وردیو، لە دەروازەیەكی پەنهانییەوە ئەنجام بدرێتو كار لە خەڵكی بكات. لێرەشدا تەنها دوو جۆر سیحر دیاریی دەكەین:

یەكەمیان: جۆرێكی نابەجێو بێزراوو پووچەڵەو، ئایینی ئیسلام دژایەتیی دەكاتو ڕەتی دەكاتەوەو لێكی هەڵدەوەشێنێت. زۆربەی سیحری ساحیرانو كردارە سیحربازییەكانیان لەم جۆرەیە.

دووەمیان: جۆرێكی بەجێیەو ویستراوو پەسندكراوە، واتە (ڕەوایە).

لێرەشدا قسەو باسی ئێمە لەسەر جۆری دووەمیانە (كە ڕەوایە).

(بخاری) لە (عبداللە كوڕی عمر)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- گێڕاوێتییەوە كە دوو پیاو لە كەرتی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوونو وتاریان دەداو، خەڵكیش بە وتارو ڕەوانبێژیی یەكەیان سەرسام ببووم. لەوبارەیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **((إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ))**[1].. واتە بەڕاستی لە دەربڕینو ڕەوانبێژییدا سیحرو سەرنج ڕاكێشانێك هەیە، یاخود بەڕاستی لە هەندێك شێوەی ڕەوانبێژیدا سیحرو سەرنج ڕاكێشانێك هەیە.. ئەم بەسەرهاتەش واتە ئەو دوو پیاوە وتاربێژەی، كە لە كەرتی ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونو كە (بخاری) بە كورتی باسی كردوە، نووسەرانی ژیاننامە (سیرة) بەدرێژی باسیان كردوە، لێرەشدا ئەم بەسەرهاتە بە درێژیی بە شێوەگێڕانەوە (روایە)ی ئیمامی (بەیهەقی) لە (دلائل النبوة)ەوە، دیاریی دەكەین.

"عن عبدالله بن عباس، رضي الله عنهما، قال: جلس الى رسول الله ﷺ قيس بن عاصم، والزبرقان بن بدر، وعمرو بن الأهتم، والتميميون، ففخر الزبرقان، فقال:

---

١) صحيح البخاري (٧٦) كتاب الطب (٥١) -ان من البيان لسحراً- حديث ٥٧٦٧.

یا رسول الله، أنا سيد تميم والمطاع فيهم، والمجاب، أمنعهم من الظلم، وآخذ لهم بحقوقهم، وهذا يعلم ذلك (يعني عمرو بن الأهتم). فقال عمرو بن الأهتم: إنه لشديد العارضة، مانع لجانبه، مطاع في أُذنيه.. فقال الزبرقان بن بدر: والله يا رسول الله، لقم علم مني غير ما قال، وما منعه أن يتكلم الا الحسد.. فقال عمرو بن الأهتم: أنا أحسدك، فوالله إنك لئيم الخال، حديث المال، أحمق الولد، مضيّع في العشيرو.. والله يا رسول الله، لقد صدقت فيما قلت أولاً، وما كذبت فيما قلت آخراً، ولكني رجل إذا رضيت قلت أحسن ما علمت، وإذا غضبت قلت أقبح ما وجت، ولقد صدقت في الأولى والأخرى جميعاً.. **فقال النبّي ﷺ: إن من البيان لسحراً**"[1]..

واتە: لە (عبداللە کوڕی عباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێت-، گێڕاویەتییەوە، کە گوتوویەتی: سێ‌کەس لە هۆزی تەمیم کە (قەیس کوڕی عاسیم)و (زەبرەقان کوڕی بەدر)و (عەمری کوڕی ئەهتەم) بوون، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و لە خزمەتیدا دانیشتن. (زەبرەقان) دەستی بە ئاخاوتن کردو شانازیی بە خۆیەوە کردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من گەورەی هۆزی تەمیممو فەرمانڕەوای گوێڕایەڵی کراون لەنێویانداو، بەدەم داواکاریەکانیانەوە دێم، ڕێی ستەمکردنیان لێ‌دەگرمو، مافەکانیان بۆ دابین دەکەم، ئەم پیاوەش-کە مەبەستی عەمری کوڕی ئەهتەم بوو- ئاگاداری ئەم حاڵەتەیە.. (عەمری کوڕی ئەهتەم)یش گوتی: ئەم پیاوە -واتە زەبرەقان- زۆر بە زەبروزەنگ‌و تاقەتە، ئەو کەسەی دێتە ژێر داڵدەی ئەو پارێزگاری لێ‌دەکات، لەناو کۆڕو مەجلیسی خۆی گوێی بۆ دەگیرێ‌.. جارێکی دی (زەبرەقان) کەوتەوە ئاخاوتن‌و گوتی: وەڵڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو بێگومان بە پێچەوانەی وتەکانیەوە لە حاڵی من دەزانێت، هیچ شتێکیش ڕێی وتنی باری ڕاستیی حاڵی منی لێ نەگرتوە تەنها حەسوودی نەبێت.. دوبارە (عەمری کوڕی ئەهتەم)یش وەڵامی دایەوەو پێی گوت: ئایا من حەسودیت پێ‌دەبەم؟ دەسا بەخوا

---

1) دلائل النبوة للبيهقي / ٥: ٣١٦-٣١٧) هەروەها بڕوانە (فتح الباري/ ١٠: ٢٣٧.

تۆلە جەمسەری خاڵوانتەوە بەدکارو قین لەدڵی‌و، تازە بەتازەش دەوڵەمەند بوویت‌و، ماڵ‌و منداڵێکی گێژو گەمژەت هەیەو، لە هۆزەکەشدا وێڵ‌و سەرگەردانیت. وەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی من یەکەم جار دەربارەی ئەم پیاوە ڕاستم گوتووە، لە دواییشدا درۆم لەسەر نەگوتووە. بەڵام من پیاوێکم کاتێك هێمن‌و ڕەزامەندم باشترین قسە لەسەر ئەوەی زانیومە دەیکەم، لە کاتێکیشدا تووڕەو زویر دەبم، دزێوترین وتەی سەرزەنشت لەسەر ئەوەی دیومەو بەدیم کردوە، دەڵێم.. ئنجا پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی شێوازی ئاخاوتنی ئەو دوو پیاوە فەرمووی: بێگومان لە ڕەوانبێژیدا سیحرو سەرنج ڕاکێشانێك هەیە."

ئیمامی (خطابي) دەربارەی مەبەست لە ڕەوانبێژی‌و جوانیی دەربڕین، لەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی: "دوو جۆرە ڕەوانبێژی هەیە.

یەکەمیان ئەوەیە کە بە هەر شێوازێك بێت، مەبەستەکەی پێ ڕوون بکرێتەوە.

دووەمیشیان ئەوەیە کە داڕێژراوو هۆنراوەتەوەو بیسەران پێی سەرسام‌و خۆشحاڵ دەبن، دڵیان بۆی بەکێش دەکرێت. هەر ئەمەشە کە کاتێك دڵ ڕادەکێشێت‌و، دەروون داگیر دەکات، لە سیحر دەچێت، تا وای لێدێت شتەکان لەسەر باری ڕاستەقینەی خۆیان دەگۆڕێن‌و، لە ڕوکارو ئاڕاستەی خۆیان لایان دەدات. ئیدی لەبەرچاوی بینەر لە جێگەیەکی دی‌و لە چەشنێکی دیدا دەردەکەوێت.

جا ئەگەر بەلای حەقدا بوو، ئەوا ستایشی دەکرێت‌و، ئەگەر بەلای ناحەقیشدا بایدا، ئەوا سەرزەنشت دەکرێت. بۆیە هەندێك لە زانایان ئەم فەرموودەیەی دواییان ((إِنَّ مِنْ الْبَيَانِ لَسِحْرًا)) لەسەر باری حەق‌و ستایشکراوێتییەکەی داناوە کە هاندەری جوانکردنی گفتارو ڕازاندنەوەی بڕگەو دەستەواژەکان دەدات"(١).

١) فتح الباري/ ١٠: ٢٣٧ .

بەڵام ئیمامی (ابن بطال)، کە ئیمامی (ابن حجر) وتەیەکی ئەوی دەربارەی شیکردنەوەی ئەم فەرمودەیە هێناوە، کە لەوەدا گوتوویەتی: "ئەم فەرموودەیە بەشێوەیەکی تەواو سەرزەنشتی ڕەوانبێژی ناکاتو، ستایشی هەموو جۆرێکیشی ناکات، بەڵکو سەرزەنشتی هەندێکیانو، ستایشی هەندێکی تریشانی بە ئامرازی (من) دەکات، کە (من) بۆ جیاکاریو هێندکارییەو، لە فەرموودەکەشدا بە (من البیان/ هەندێك لە ڕەوانبێژیی) هاتووە. ئیدی چۆن سەرزەنشتی ڕەوانبێژیی بکرێت، لە کاتێکدا خوا -وەك شتێکی چاك- بە عەبدەکانی خۆی بەخشیوەو فەرموویەتی: ﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ۝٤﴾الرحمن، واتە: خوا ئادەمیزادی دروست (خلق) کردوەو، فێری ڕەوانبێژیو وتەی جوانی کردوە".

جا (ابن حجر) تیشکی خستۆتە سەر ئەم وتەیەی (ابن بطال)و گوتوویەتی: " زانایان یەکدەنگن لەسەر ستایش کردنو بەباش دانانی (بڕگەو دەستەواژەی زیادە لە مانادا، کە بە مەبەستی سوودگەیاندن گوترابێت)، کە لە شوێنی وتاردانو بە پێی پێویستی جێگەکە بەکارهێنرابێت. بۆیە بێگومان زیادەڕۆیی لە هەموو شتێکدا بێزراوەو، باشترین شێواز لە گشت کارێکدا میانگیرییە"[1].

---

١) فتح الباري/ ١٠: ٢٣٨

## "إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ"

ئەو دوو فریشتەیە چییان بە خەڵکی بابل دەگوت کاتێك فێری سیحریان دەکردن؟ پێیان دەگوتن: ((إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ)) ئەم کاری فێرکردنی سیحرەمان بۆ تاقیکردنەوەیە، لەبەر ئەوە تۆ خۆت پێ‌کافر مەکە. لەمەدا بڕیاری خوا وابووە، کە ئەم دوو فریشتەیەی ناردۆتە خوارەوە بۆ تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی خەڵکی بابل لە ڕووی بیروباوەڕیانەوە. ئەرکی ئەم دوو فریشتەیەش تاقیکردنەوەی خەڵکەکە بووە. بۆیە کاری فێرکردنی سیحر کردنەکەشیان هەر بۆ تاقیکردنەوەی ئەو خەڵکە بووە.

لەم ئایەتەدا وشەی (فتنە) بە عەرەبی ماناکانی: (ابتلاء)و (امتحان)و (اختبار)یش دەگەیەنێت، کە هەموویان بە کوردی هاوواتای وشەکانی تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنو کێشانی وزەو توانا دەبن، وەك چۆن (مووسا)ش -سلاوی لێ بێت- بە خوای پەروەردگاری گوتبوو: ﴿...قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّىَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الأعراف﴾، واتە: ئەی خوای پەروەردگارم، ئەگەر پێشتر خواستت لەسەر بوایە ئەوانو منیشت لەناو دەبرد، جا ئایا ئێمە بەوە لەناو دەبەیت، کە گەمژەو نەفامەکانمان کردوویانە، ئەمەش تەنها تاقی کردنەوەیەکی خۆتە، کە ئەگەر بتەوێت هەرکەسێکی پێ گومڕا دەکەیتو، گەر خواستیشت وابێت هەرکەسێکی پێ ڕێنمایی دەکەیتو ڕێی ڕاستی پێ نیشان دەدەیت..

بەمانای ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی خۆتە. ئاکامی ئەم تاقیکردنەوەو

هەڵسەنگاندنو ئیمتحانانەش هەمەجۆرەو لێك جودایە، بۆ نموونە خەڵکی وا هەیە لە ئاکامی ئەم تاقیکردنەوەیەدا گومڕا دەبێتو دەرناچێتو (ڕاسب) دەبێت، خەڵکی واش هەیە کە ڕێی ڕاستی پێ وەردەگرێتو، باوەڕی پێ زیاتر دەبێتو لە تاقیکردنەوەکەشدا دەردەچێتو ناجح دەبێت.

(هارووتو مارووت)یش هۆیەکی تاقیکردنەوە بوون بۆ بابلییەکانو فێری سیحر کردنیشیان هەر تاقیکردنەوەیەك بووە بۆیان.

بێگومان ئەو دوو فریشتەیە ویستوویانە بابلییەکان لە سیحربازیو جادوگەری وریا بکەنەوەو کاتێك فێری سیحریشیان کردوون تەنها بۆ ئەوەی حەقیقەتی سیحریان بۆ دەردەخەنو کرۆكو سروشتی سیحریشییان پێ بناسێنن. بەڵام خۆ ئەگەر ئەو خەڵکەی بابلیش لە بەرامبەر تەوژمی تەفرەدەرانەی سیحرو، لەبەردەم کاری سیحربازیو کارپێکردنیشدا خۆڕاگر نەبوونو زیانیان لە خەڵکی تر پێگەیاندبێت، ئەوە مانای وایە لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچوون. هەروەها ئەم دوو فریشتەیە، کە هۆی تاقیکردنەوە بوونو خەڵکیشیان لە سیحرو بێباوەڕیو کەوتنە نێو کفرەوە ئاگادار کردۆتەوە، کەچی خەڵکی بەباش مامەڵەیان لەگەڵ تاقیکردنەوەدا نەکردوەو، هەر بۆیەش تیایدا دەرنەچوونو کاری سیحربازییان ئەنجام داوەو بێباوەڕو کافر بوون.

مامۆستای پێشەوا (سید قطب) گوتوویەتی: "لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چەندین بەڵگەو نموونە لەسەر حاڵەتی تاقیکردنەوەکان تێپەڕبوونو هاوشێوەی ئەو حاڵەتەی نێو ئەم چیرۆکە بوونو لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتیشدا هەمان دۆخ دووبارە بۆتەوە. خۆ ئەگەر تاقیکردنەوەیەکیش لە وێنەی دوو فریشتە، یان لە وێنەی دوو پیاوی بەڕێزی وەك فریشتەکاندا پەیدابووبێت، ئەوا ئەمە بە بەراورد لەگەڵ سەرجەم وێنەو نموونەکانی ئەو تاقیکردنەوە قورسو نائاساییانەی کە مرۆڤایەتی پێیاندا تێپەڕیوە شتێکی نامۆو ڕێزپەڕ (شاذ) نەبووە لە کاتێکدا

لە تاریکایی‌یەکانی شەوەزەنگدا کشاوەو پێی هەڵگرتوەو بەدوای تیشکە ڕۆشنکەرەوەکانی بڵێسەی چرای خواییدا گەڕاوە"[1].

خەڵکیش لەم ژیانەی ئەمڕۆماندا دەکەونە بەر تاقیکردنەوەی خوا کە تاقییان دەکاتەوەو هەڵیان دەسەنگێنێت. بەڵام ئایا چەند کەس لەو خەڵکەی ئەمڕۆ مانای تاقیکردنەوە (الفتنة) لە ژیاندا ڕەچاو دەکات؟ ئەی چەند کەس لەوان دەزانێت بە چاکی مامەڵە لەگەڵ ئامرازەکانی تاقیکردنەوەو هۆیەکانیدا بکات؟ ئەی چەند کەسی تر لەوان لەم تاقیکردنەوەیەدا دەردەچێت‌و دەبێتە یەکێك لە سەرکەوتووان؟

لەمبارەیەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ...﴾ (٢) الملك، واتە: هەر خوا خۆی حاڵەتەکانی مردن‌و ژیانی خوڵقاندووە تاکو تاقیتان بکاتەوە کە کامتان کردەوەی چاکترە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿... وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا﴾ (٢٠) الفرقان، واتە: ئێمە هەندێك کەسمان لە خۆتان کردۆتە هۆی تاقی کردنەوەی هەندێکی ترتان، جا ئایا ئێوە خۆڕاگر دەبن لەسەر تاقیکردنەوەکان، بێگومان خوای پەروەردگارت بینەرو بینای هەڵس‌وکەوتی بەندەکانە.

١) في ظلال القرآن- سيد قطب/ ١: ٩٧-٩٨

# پیــاوو ئافرەت" هــەریەکەیان هاوســەری یەکتــرن

قورئانی پیرۆز حەقیقەتی هەندێك جۆری سیحری سەلماندوەو ئاماژەی بۆ توانای سیحرباز کردوە لەو ڕووەوە کە نێوانی مرۆڤو هاوســەرەکەی تێــك دەدات. خــەڵکی بابلیش سەرپێچییان لە ئامۆژگارییەکەی (هارووتو مارووت) کردو لەسەر پیشەی سیحربازیو کارپێکردنی بــەردەوام بــوونو لــە بــواری ئــازاردانو زیــان گەیاندنــدا بەکاریان دەهێناو ژنو مێردیان پێ لە یەکتر زویرو جیادەکردەوە.

وەك خــــوا فەرموویــــەتی: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ﴾، واتە: ئەو جادووگەرانە شتی وایان لێوە فێردەبوون کە ژنو مێردیان پێ لە یەکتر جیادەکردەوە..

وشــەی (المــرء) واتــە (پیــاو)، وشــەی (المــرأه)ش واتــە (ئــافرەت)، (المــرأة)ش مێیینەی (المرء)ە. هەروەها بۆ پیاو جگە لە (مرء)، (أمــرؤ)یــش بــەکاردێت، بــۆ ئافرەتیش جگە لە (مــرأة)، (إمــرأة)ش بــەکاردێت. ئــەم وشــەیە دوانــە(مثنــی)ی هەیەو، بۆ دوو پیاو دەگوترێت (هذان إمرءان) وەك بۆ دوو ژنیش دەگوترێت (هاتان امرأتــان). بەڵام کۆ (جمع)یان نیە، بۆیە بە چەند پیاوێك دەگوترێت (هــؤلاء رجــال) لەجیاتی ئەوەی بگوترێت (هؤلاء امرؤ وصدق). وشەی (زوج)یش کە لە ئایەتەکەدا هاتووە بۆ هەریەکە لە پیاوو ژنیش بەکاردەهێنرێت، تەنانەت بۆ هــەموو شــتێکی هاوتاو هاوشێوەی پێکەوەلکاویش بەکاردێنرێت.

لەم ڕووەوە ئیمام (راغب)ی مامۆستا زمانەوانیی عەرەبی گوتوویەتی: "وشــەی (زوج) بۆ تاکی هەر جۆرە جووتێکی هاوتــای یــەکتر، لــەنێرو مــێی مرۆڤــو لــە ئاژەڵانیش، کە هاوسەرییەکی یەکتری بن بەکاردێت، هەروەها بۆ هەر شتێکی دی، کە جووتیان هەبێت، وەك گۆرەویو پێڵاوو نەعل، پاشان بۆ هەر شــتێکی دی، کــە بە شــتێکەوە هاووێنــەیان دژی بێــت، خــواش فەرمووێــەتی: ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ

ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ القیامـة ﴾، واتە: خوا لە (مەنی)ی باوك‌و دایك دوو جـووت نێـرو مـێی دروسـت کـردوە.. هـەروەها خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ... ﴿٣٥﴾ البقرة ﴾، واتە: ئەی ئادەم خۆت‌و هاوسەرەکەت لە بەهەشـتا نیشتەجێ بن.

وشەی (زوجة)ش داتاشراوێکی بێبەهایەو کۆ (جمع)ەکەشی (زوجات)ە. وەك لـە نیوەدێڕی شیعرێکی شاعیرێکیشدا هاتووە:

**(فبكـــا بنـــاتي شـــجوهُنَّ و زوجتي)**

کـۆی وشـەی (زوج)یـش (أزواج)ە، دەربـارەی دوانـە (مثنـى)ەکەشـی، خـوا فەرموویەتی: ﴿ وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ ... ﴿٤٩﴾ الذاریات ﴾، واتە: لە هـەموو شتێکدا جووتێکمان دروست کردوە. ئەمەش بەئاگاهێناوەیـە، کـە لەمـەڕ ئـەوەی هەموو شتەکان لە ناوەڕۆك‌و ڕواڵەتێك‌و، لە ماددەو دیـمەنێك پێکهـاتوون‌و، هـیچ شتێکیش لە پێکهاتەو داڕشتەیەك بەدەر نیە، چونکە لە هەبوونیدا دروسـتکراوێك دەخوازێـت‌و هـەر دەبێـت دروستکەرێکیـشی هـەبێت، لەمەشـدا هۆشـداری‌و بەئاگاهێنانەوە هەیە لەسەر ئەوەی، کە خـوای بـەرزو بێهاوتـا، هـەرخۆی تاکـەو بێهاوسەرو بێهاوەڵ‌و هاودەمە. فەرمایشتەکەی خواش (خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ) ئـەوە ڕوون دەکاتەوە، کە هەرچی لە دنیادا هەیە جووتێك‌و هاوسەرێکی هەیـە، ئەمـەش لـەو ڕووەوە، کە هاوسەرەکەی ڕکەبەری بێت، یان وەك خۆی بێـت، یـان هاوپێکهاتـەی بێت، تەنانەت گەر لە ڕوویەکی ترەوە لەو پێکهاتەیەشی جودابێت.

لـەم ئایەتەشـدا کـە خـوا هـەردوو جووتەکـە (زوجـین)ی دیـاری کـردوە، ئاگادارکردنەوەیەکە لەسەر ئەوەی، کە سەرەڕای ئەوەی ئەگەر شتێك دژو ڕکەبـەرو هاوشێوەیەکیشی لە بەرامبەردا نـەبێت، بـەڵام لـە پێکهاتـەی خۆیـدا لـە (نـاخ‌و

ڕواڵەت) جودا نیەو ئەم (ناخ و ڕواڵەتەش) هەردوو جووتەکەن"[1].

پیاویش هاوسەری ئافرەتە، وەك خواش فەرموویەتی: ﴿...فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ...﴿٢٣٢﴾ البقرة﴾، واتە: ئەگەر ژنانتان تەڵاق دابوو گەیشتنە کۆتایی عادەی (سووڕی) مانگانەیان، -ئیدی ئێوەی کەس وکارو کاربەدەستانی ژن- مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا، ئەگەر ویستیان شوو بە هاوسەرەکانیان (ازواجهن) بکەنەوە.

هەروەها ژنیش هاوسەری پیاوە، وەك خوا لەمبارەیەشەوە فەرموویەتی: ﴿... ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ...﴿٦﴾ الأحزاب﴾، واتە پێغەمبەر ﷺ لە خودی ئیمانداران نزیکترە لێیان و هاوسەرانیشی دایکانی ئەوانن.

کەواتە پیاوو ئافرەت هەریەکەیان هاوسەری یەکترن.

هەر لێرەدا سەرنجێکی جوان و نایاب لە بەکارهێنانی وشەی هاوسەر (جووت/ زوج) بۆ هەریەکەیان بەدی دەکرێت، سەرنجەکەش ئەوەیە: بێگومان پیاو بە تەنها خۆی (ناتەواوە) و نابێتە قەوارەیەکی سەربەخۆ، دیارە ئافرەتیش بە تەنها خۆی (ناتەواوە) و نابێتە قەوارەیەکی سەربەخۆ، لەبەر ئەمە هەر دەبێت پێك بگەن و کۆ ببنەوەو ڕێککەون، تاکو پێکەوە ببنە قەوارەیەکی سەربەخۆ. هەمدیسان هەر لە پیاودا چەند لایەنێك هەیە، کە تەنها بە ئافرەت پڕ دەکرێنەوەو، دەنا بەبێ ئەوە پیاو هەر بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. لە هەمان کاتدا ئافرەتیش چەند لایەنێکی کەم وکوڕیی تێدایە، کە تەنها پیاو دەتوانێت لەکاتی پێکەوە ژیانیاندا بۆی پڕ کاتەوە.. دەنا ئافرەتیش هەر بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. پیاو بۆیە کەم و کوڕی ژن پڕ دەکاتەوە، چونکە هاوسەرێیەتی. ژنیش بۆیە کەم و کووڕیی پیاو پڕ دەکاتەوە، چونکە هاوسەرێیەتی، ئیدی هەریەکەیان هاوسەری ئەوی تریانە.

---

١) المفردات للراغب/ ص٢١٥-٢١٦

# سیحرباز (ژنو پیاو) لەیەك دەكات

قورئانی پیرۆز سەلماندوویەتی، کە سیحرباز توانای لەیەك دابڕانی ژنو مێردی هەیە، بۆیەش دەربارەی خەڵکی بابل خوا فەرموویەتی: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾، لەمەشدا ئاماژەیەك هەیە بۆ ئەوەی، کە هەندێك جۆری سیحر حەقیقەتو کاریگەرییان لەسەر کەسانی دی هەیە، چونکە سیحربازان بە سیحرو جادوو (ژنو مێرد) لە یەك دەکەن. لەو ئایەتەدا سەرنج بدە لە بکەر (فاعل)ی نێو ڕستەی (یفرقون) کە ئامرازی (واو-ی کۆمەڵ/ واو الجماعە)یەو بۆ سیحربازەکان دەگەڕێتەوە. بکەر (فاعل)ەکەش خۆیەتی کە کردار (فعل)ەکە ئەنجام دەدات، واتە: سیحربازەکان توانای لێك دابڕانو لەیەکتر جیاکردنەوەی نێوانی ژنو مێردیان هەیە. بێگومان جیاکردنەوەی نێوان ژنو مێردو دروستکردنی ناکۆکیو هەرا لەنێوان ژنو مێرد لەجیاتی خۆشەویستیو تەبایی، ئەوە پەیامێکی بنچینەیی شەیتانو کاری سەربازانیەتی، کاتێك دەیان نێرێت بۆ لەخشتەبردنی خەڵکیو ئاژاوەنانەوە لەنێوانیانداو لەیەك دابڕاندنیان. تاکە سەربازی پێشکەوتووش لەنێو سەربازانی شەیتاندا ئەوەیانە کە دەتوانێت نێوانی ژنو مێرد تێك بدات، ئیدی ئەم کارەش پلەی باڵاو سەروەری لەلای شەیتانە گەورەو حاقیدەکەی خۆی مسۆگەر دەکات. هەر ئەمەشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردووەو ڕوونیکردۆتەوە. لەم ڕووەوە فەرموودەیەك هەیە، کە (مسلم) لە (جابری کوڕی عبداللە)وە -خوا لێیان ڕازی بێت- گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا فەرموویەتی: ((**إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً، يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ مَا صَنَعْتَ شَيْئًا، ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ نِعْمَ أَنْتَ**))[1].

---

١) مسلم (٥٠) كتاب صفات المنافقين (١٦) باب تحريش الشيطان. حديث رقم (٢٨١٣)

واته: ئیبلیسیش-كه سەرۆكی شەیتانەكانه- تەختی فەرمانداریێتی خۆی لەسەر ئاو دادەنێتو، ئنجا پۆلە سەربازەكانی خۆی بەملاو لادا بۆ خراپەو تێكدان دەنێرێت. نزیكترینو بەرێزترین سەربازیشیان ئەوەیه كه گەورەترین فیتنەو ئاژاوەی نابێتەوه، له پاشان یەكێكیان دێتەوه بۆ لایو باسی كاره چەپەڵەكانی خۆی بۆ دەگێرێتەوەو دەڵێت واو وامكرد، ئیبلیس پێی دەڵێت: هیچت نەكردوه كه شایانی باس بێت.. ئینجا یەكێكی تریان دێتەوه بۆ لایو دەڵێت: چوومه لای كەسێكو وازم لیێ نەهێنا هەتا نێوانی خۆیو ژنەكەیم تێك دا.. ئیبلیس لێی نزیك دەبێتەوەو پیێ دەڵێت: باشترین سەربازم تۆیت.

گوتمان ئەم ڕستەیه (يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ) دەلالەته لەسەر ئەوەی كه سیحر كاردەكاته سەر كەسانی تر، سیحربازیش بێگومان ژنو مێرد لەیەك زویرو جیادەكاتەوه، بەڵام ئیمامی (طبری) ڕای وایه، كه سیحر هیچ بناوانو حەقیقەتێكی نیه، بەڵكو هەر تەنها خەیاڵاندنو فریودانه، هەربۆیەش له یەكتر دابڕانی ژنو مێردی لەم ئایەتەدا لەسەر ئاقاری خەیاڵاندن داناوەو گوتوویەتی: سیحرباز كه ژنو مێرد لەیەك دادەبڕێت، ئەوه خەیاڵاندنیەتی به سیحری خۆیو دانانی هەریەكەیان بەوی تر، كه پێچەوانەی باری ڕاستیو حەقیقەتەو، چاكیو جوانییان لەبەرچاو یەكتر دەخات، تا لەبەرچاویان ناشیرین دەكات، ئیدی ڕووی هەریەكەیان لەوی تر وەردەگێرێتو پشتی پیێ لیێ هەڵدەكات، تاكو مێرد وا لیێدەكات، كه خۆی له ژنەكەی جیابكاتەوه. بەم ڕەنگەش كابرای سیحرباز توانیویەتی لەبەر بوونی شتێكی هۆی ناكۆكی لەنێوانیاندا، نێوانی هەردووكیان (ژنو مێردەكه) تێك بدات. گەلی عەرەبیش هۆی ناكۆكی دەبەنه پاڵ هۆ خولقێنەكەی، لەبەر ئەوەی هۆكاری خولقاندنی بووه، بەم پیێیه لێكدابڕانی مرۆڤو هاوسەرەكەشی ڕوودەدات.

(طبري) وتەیەكی (قتادە)شی دەربارەی لێكدابڕان (التفریق) هێناوه، كه

گوتوویەتی: "لێکدابڕانی ژنو مێرد له یەکتر ئەوەیە هەر یەکێکیان له هاوسەرەکەی بەرکەنار بکرێتو، هەر یەکەشیان لەوی دی تووڕەو زویر بکرێت"(١).

جا ئەگەر کاری لێکدابڕانی ژنو مێرد بە کردەوەیەکی سیحربازان دابنرێتو بخرێتە پاڵ ئەوان، ئەوە (دانانو خستنەپاڵێکی مەجازیو مانا بۆ داتاشراوە، نەك واقیعیو ڕاستەقینە)، سیحریش بە کارێکی خەیاڵاندن (تخییلی)و نمایشکاری (تمثيلي)ی وا دەمێنێتەوە کە هیچ حەقیقەتێکی نیەو، تەنها بەندە بە بزواندنی دەروونییەوەو، سیحر لێکراوەکەش هەر خۆی بەدەم ئەو خەیاڵاندنو بزواندنە دەروونییەوە دەچێت، یان ناچێت، خۆ ئەگەر بەدەمیەوە نەچێتو خۆی لە (بەرگری کاری)یەکدا بهێڵێتەوە، ئەوا کابرای سیحربازیش دەستەوسان دەبێت لە کارتێکردنیداو سیحربازەکەش زیانی پێناگەیەنێت. خۆ ئەگەر سیحر لێکراو بەدەم ئەو بزواندنە دەروونییەوە بچێتو خۆی بداتە دەست کرداری خەیاڵاندن، ئەوا هەر خۆی ئەو ڕێگەیەی هەڵبژاردوەو خۆی بەدەستەوە داوەو دەستیشی کردوە بە بوغزاندنی هاوسەرەکەیو زویرکردنیو، پاشان تۆرانو لێکدابڕان هاتۆتە ئاراوە.

ئەمە ڕای (طبري) بووە لەسەر کاریگەریی سیحرو، لەسەر چۆنیەتی بوونە هۆکاری لێکدابڕانی نێوان مرۆڤو هاوسەرەکەی. ئێمەش لەم لێکدانەوەو تەفسیرەدا نەختێك هاوڕای ئەوین، بەڵام لەو بوارانەدا، کە تەنها لەسەر هەندێك شێوەو جۆری سیحر هاوڕاو کۆکین لەگەڵیدا، دەنا بەسەر هەموو دیمەنو جۆرەکانی سیحردا نایگونجێنینو، ئێمە لە مەسەلەی گشتاندنو دانانی گشت جۆرە سیحرێکدا، بە مەسەلەی (خەیاڵاندنو نمایشکاری) لەگەڵ (طبري)دا نیین، چونکە سیحری وا هەیە، کە حەقیقەتو کاریگەریی خۆی هەیەو، هەر تەنها نواندنو خەیاڵاندن نیە.

هەر لەمبارەیەوە مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەڵێت:

---

١) تفسير الطبـري/ ٢: ٤٤٧

"لەوانەیە دیمەنێك لە دیمەنەکانی سیحربازیی، توانای سیحربازەکە بێت لەسەر کارتێکردنو ئیحاو بزواندنی هەستەکان یان فیکرەکان، بەڵام کارتێکردن لە شتەکانو لە تەنەکان (واتە لاشەکان)و هەرچەندە ئەو سیحرەی کە سیحربازانی فیرعەونیش -وەك لە قورئاندا هاتووە- تەنها خەیاڵاندن بووەو هیچ حەقیقەتێکی نەبووە" ﴿... يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ طه﴾، ئەوا هیچ ڕێگری یەکیش نی یە کە ئەم جۆرە کارتێکردنەش هۆیەکە بۆ لێك دابڕاندنی نێوانی ژنو مێردو، نێوانی دوو هاوڕێ، چونکە کاردانەوەکانیش لە ئەنجامی کارتێکردنەکانەوە سەر هەڵدەدەن، ئەگەرچی هۆکارو ئاسەوارو ئامرازو سەبەبکارەکانیش تەنها بە خواستو مۆڵەتی خوا پەیدا بن"[1].

(سیحر) هۆیەکە بۆ لێکدابڕانی نێوانی ژنو مێرد کە بە خواستو ئاگاداریی خواو بە حیکمەتی خۆی ڕوودەدات. سیحربازیش هەر بە خواستو ئاگاداریی خوا توانای (لێك دابڕاندنی ژنو مێردی لە یەکتر) هەیە، ئیدی دوای ئەمە گرنگ نیە کە ئاخۆ لێکدابڕانەکە بەهۆی ئەوەوەیە کە سیحرەکە حەقیقەتو کارایی‌یەکی هەبوو بێت، چونکە ئەمە لە ئارادایەو دانیشتی پێ دانراوە- یان ئاخۆ لێکدابڕانەکە لەڕێی ئیحاو جووڵاندنی دەروونییەوەیە لە دەروونی سیحر لێکراوداو، وەك هەردوو ئیمام (طبري)و (سيد قطب) وایان باس کردبوو.

---

١) في ظلال القرآن/ ١: ٩٧

# سیحر بە خواستی خوا زیان دەگەیەنێت

دوای ئەوەی قورئانی پیرۆز سەلماندی کە سیحرباز توانایەکی لەسەر لێك دابڕانی نێوانی ژنو مێرد هەیە، ئەمەی بە خواستو فەرمانی خواوە پەیوەست کردووە، وەك فەرموویەتی: ﴿...فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴿١٠٢﴾البقرة...﴾، واتە خەڵکی بابل لە جیاتی ئەوەی کار بە ڕێنماییەکانی ئەو دوو فریشتەیە بکەن، کەچی ئەوەیان لێ فێر دەبوون، کە نێوانی ژنو مێردی پێ تێکدەنو نەشیانتوانیوە کە زیانی پێ لە هیچ کەسێك بدەن، مەگەر بە خواستو فەرمانی خوا نەبێت.

لێرەشدا لەم ئایەتەدا وشەی (بِـإِذْنِ اللَّـهِ)، بە مانای (بەزانستو ئاگاداریو بڕیاری خوا)و کە ڕێگەی بە پەیوەندیی نێوان سیحر لێکراوو سیحرەکە داوە، بەو ڕادەیەش، کە سیحرەکە زیانی پێ بگەیەنێت[1].

ئەم حەقیقەتە قورئانییەش خوا لێرەدا لەم چیرۆکەی (هارووتو مارووت)داو لە بواری باسکردنی زیان گەیاندنی سیحر بە خەڵکیو ئازار بەخشینی سیحرباز بە کەسانی تردا ئاماژەی بۆ کردوە. قورئان بۆیە ئەم باسە دەخاتەڕوو لەبەر سووربوونی لەسەر پاکژیی عەقیدەو بێگەردیی ئیمانو دابڕینی گشت شتو هێزو هۆکارو دیاردەیەك لە توانای خودی (ذاتـي)و کارتێکردنی خودیو زیانو سوودی خودی (ذاتي).

بێگومان باوەڕهێنان بە خوا (لە کۆی چەمكو واتاکانیدا) ئەو مانایە دەگەیەنێت، کە خوا تا ڕۆژی قیامەت ئاگاداریی لەسەر هەموو شتێك هەبووەو هەیەو، ئاگاداریی هەر کارێکیشە لە پێش ڕوودانیدا، هەروەها (لە کۆی

١) تفسير الطبري/ ٢: ٤٤٩-٤٥٠

واتاکانیدا) ئەوە دەگەیەنێت کە هەر شتێك لـەم گەردوونـەدا بـە فـەرمانی خـواو بەرێپێدانیو ویستو خواستیو بڕیاری خۆی دەبێتو دێتە ئاراوەو، هیچ شتێکیس پەیدا نابێت ئەگەر خواستو ئیرادەو بڕیارو فەرمانی خوای لەسەر نەبێتو تەنانەت ئەگەر خواستی هەموو خەڵکیشی لەسەر بێت هەر نایەتە ئاراوە. بۆیە هەرچی خوا خواستو بڕیارو فەرمانی لەسەر دابێت، هەر دەبێت ببێت، سـەرەڕای ئـەوەی گـەر هەموو خەڵکیش بە ڕوویدا بووەستنەوە.

بێگومان کەسەکانو هێزو هۆکارەکانیش تەنیا بە خواسـتی خـوا کاردەکـەنو، کاریگەرییو زیانو سوودیشیان تەنیا بە فـەرمانی خوایـەو، خـواش خـۆی ئەگـەر خواستی لەسەریان نەبێت، پەکیان دەخاتو هـەرکاتێك بیـەوێت دەیانوەسـتێنێت، ئیدی جگە لەوەی کۆمەڵـە هۆکـارێکن هـەر بـە دەسـتی سـەبەبکارو بڕیـاردەرو خوازیارەکەی خۆیانەوەن کە خوای پاكو بێخەوشە.. بە هەمان شـێوەو بـەم جـۆرە سیحریش هەر ئاوایە، سیحر زیان دەدات، سـیحر ئـازار دەدات، بـەڵێو ڕاسـتەو، سیحر نێوانی ژنو مێرد تێك دەدات، بەڵام ئەمـە تـەنها بـە خواسـتو زانیـارییو ئاگادارییو بڕیاری خوایە، خۆ ئەگەر خوا خواستی لەسەر نەبێت کە زیان بدات ئەوا هەرگیز زیان نادات، ئەگەر خواستی لەسەر تێکچوونی نێوانی ژنو مێردیش نەبێت ئەوا هەرگیز لە یەك دانابڕێن" ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾.

مامۆستای پێشەوا (سید قطب) لەم بارەیەشەوە گوتوویەتی: "هەر بە فەرمانی خوا هۆکارەکان کاری خۆیان دەکەنو ئاسـەوارەکانیان دەخـولقێننو ئەنجامـەکانیان بەدیی دێنن. ئەمەش بنەمایەکی گشتگیرە لە تێڕوانینیدا کە دەبێت بە تەواوەتی لە ویژدانی مرۆڤی باوەڕداردا ڕووناك بێتەوە. دیاترین نموونەش لەسەر ئـەم بنەمایـەو لەم ڕووەوە ئەوەیە ئەگەر تۆ دەستت خستە بەر ئاگر ئـەوا دەسـووتێت، بـەڵام ئـەم سووتانەش تەنها بە فەرمانی خوایە، چونکە خوا خۆی سیفەتی سوتاندنی بە ئـاگر داوەو، سیفەتی پێسوتانیشی بە دەستی تۆ داوە، هەر خواش خۆی توانای ڕاگرتنی ئەو سیفەتەی هەیە کاتێك فەرمان دەدات کە بە حیکمەتێکی خوازراوی هۆی کارو

سیفەتی سوتاندن لەسەر ئاگر نەهێڵێت وەك چۆن لە بەسەرهاتی (ئیبراهیم)دا -سلاّوی لێ بێت- ڕوویدا کاتێك ئاگرەکەی لەسەر ساردکردەوە.

بە هەمان شێوە ئەو سیحرەش کە ژنو مێردی پێ لە یەکتر جوێ دەکەنەوە، ئەو کاریگەریو شوێنەوارەی بە فەرمانی خوا هەیەو، هەر خواش خۆی دەتوانێت ئەو سیفەتە لە سیحرەکەدا بوەستێنێت ئەگەر فەرمانی وەستاندنی بەپێی حیکمەتێکی خوازراوی تایبەتیی خۆی لەسەری هەبێت. هەر بەمڕەنگەش تەواوی ئەو شتانەی تر کە ناسیومانو پێیان ڕاهاتووین کاریگەریو ئاسەواری خۆیان هەیە. هەر شتێکی کاریگەریش بە فەرمانی خوا سیفەتێکی تێدا دانراوەو هەر بەو فەرمانەی خواش کاردەکاتو، دەشێت کارایشی بوەستێنرێت، وەك چۆن لەکاتی خواستی خوا لەسەر ڕەوشتو سیفەتە پێدراوەکانیدا ئەو کاراییەی هەیە[1]".

باوەڕهێنانی مرۆڤی باوەڕداریش بەم ڕاستییە باوەڕدارێتییە، ئەو ئیمانە پتەوەی بۆ بەدیی دێنێت کە جێی ویستو ئیرادەی خوایەو، هەموو جۆرە وێنەیەك لە وێنە دیارەو نادیارەکانی شیركو (هاوەڵ بۆ خوادانیشی) لێ دوور دەخاتەوەو وای لێدێت ئەو هۆکارو هێزو کەسانەی نێو سیحرەکان ناکاتە چەند هاوەڵێك بۆ خوا، یان نایانکاتە چەند خوایەکی پەرستراو لەجیاتی خوای پەروەردگار.

پاشان باوەڕهێنانیشی بەم ڕاستییە باوەڕدارێتییە، واتا بەرزو لەبارو زیندوەکانی (سەربەرزیو بوێریو ئازایەتیو جورئەتی هەنگاونانی) زیاتری لە ژیاندا پێ دەبەخشێت، چونکە جگە لە خوا، لە هیچ کەسێکی دی ناترسێتو، جگە لە خواش بەتەمای شوێنکەوتنو ڕەزامەندیی هیچ کەسێکی دی نیەو، هەر تەنها ملکەچی خواو سەری بەندایەتیو زەلیلیش تەنها بۆ خوا دادەنەوێنێت. ئەمەش لە واتاکانی بەختیاریو خۆشگوزەرانیو هێمنیو هیواداریو، ڕەزامەندیو دڵنیاییی تەواوی بەسەردا دەڕێژێت. ئەم واتایانەش هەموو کەسێك ئاتاجی پێیان هەیەو ئەگەر لە دەستیشیان بدات، ئەوا هەموو شتێکی زیان کردووە.

---

١) في ظلال القرآن/ ١: ٩٦

# زانستی زیانبەخش

خەڵکی بابل چی فێربوون؟ بێگومان سیحر فێربوون؟ ئەی چ کردەوەیەکیان بەو زانستە کردوە؟ بێگومان لە بواری زیانبەخشینو لە بواری لێکدابڕاندنی ژنو مێرددا بەکاریانهێناوە. دەیانتوانی زانستەکە لە بواری سوودگەیاندندا (کە سوودی بەخۆیانو کەسانی تریش بگەیاندایە) بەکاری بێنن، بەڵام وایان وایان نەویستووەو تەنها لە بواری زیانبەخشینو ئازاردانی خەڵکیدا بەکاریان هێناوە.

قورئانی پیرۆز ئەم ڕەفتارە سەیرو سەمەرەیەی ئەوانی بەم ڕەنگە تۆمارکردووە کە خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿...وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ (١٠٢) البقرة﴾، واتە: ئەوان ئەو زانستو زانیاریەی لێوە فێر دەبوون کە زیانیان پێدەگەیاندنو سوودیان پێنەدەگەیاندن. بێگومان دەشیانزانی ئەوەی کاڵای ئاوای کڕیبێتو شتی ئاوا نابەجێ فێر ببێت ئەوا لە ڕۆژی دواییدا هیچ پاداشتو دەستکەوتێکی لەسەری نابێت، بەڵکو بەڕاستی ئا ئەوانە خۆیان بە شتێکی هێجگار نالەبار فرۆشتووە، ئەگەر بیریکەنەوەو بزانن.

بێگومان مرۆڤی بیناو بەرچاو ڕۆشنیش سەری لەو کەسانە دەسوڕمێتو خەمبارو دڵتەنگیش دەبێت بۆ ئەو حاڵەتەی کە تووشی بوون (واتە بۆ ئەوەی کە فێری شتێکی وابوون زیانیان پێدەگەیەنێت نەك سوودیان پێ بگەیەنێت، چونکە ئەوان لە توانایان دابوو زانستەکە لە بواری سوودگەیاندندا بەکاربێنن، کەچی بۆ زیانبەخشینیان گۆڕی بووو، ئیدی زیانو خراپەی پێگەیاندن.

لەنێو زانستیشدا، زانست هەیە بەسوودەو، هەشە زیانبەخشە. فێربوونی زانستیش کارێکی قورس‌و گرانەو پێویستیی بە هەوڵ‌و کۆشش‌و دارایی‌و کات هەیەو هەرکەسێك ئەو کۆشش‌و دارایی‌و کاتی بە مەبەستی فێربوون بۆ خەرج دەکات، دەزانێت کە وایەو کە قورس‌و گرانە. مرۆڤیش لە کاتی خواستن‌و گەڕان بە دوای زانستدا هەست بە وجودی حەوانەوەو چێژێك دەکات‌و، خۆی دەخاتە بەر ئازارو ناڕەحەتی‌و هەموو هەوڵێکی خۆی لەپێناوی فێربووندا دەخاتە گەڕ، چونکە بۆ ئەنجام‌و بەروبوومەکەی دەڕوانێت‌و، بەم پێیەش هەنگاو لەسەر بەردەوامیی کاروانەوە دەنێت.

ئەی داخۆ خوێندکارێکی زانست چەندەی لە تواناادا بووبێت خستبێتییە کارو لە پێناوی بەدەستهێنانی زانست‌و زانیارییشدا زۆر زۆر ماندووو شەکەت بووبێت‌و، پاشان بۆ بەرهەم‌و بەرەنجامی زانستە بەدەست هاتووەکەی بڕوانێت‌و کەچی کاتێك دەبینێت زانستەکە زیانی پێدەگەیەنێت‌و قازانجی پێنادات، ئاخۆ حاڵی ئەو خوێندکارە چی بێت‌و زیانەکەشی چەند بێت؟ ئەی ئایا لەو بڕوایەدایت ئەگەر بە نەفامی بمابایەوە باشتر نەبوو بۆی؟

وەك (جورجانی)ی شاعیریش گوتوویەتی:

ولم أبتــذل في خدمة العلــم مهجتــــــي

لأخـــدم من لاقيــت لكن لأخدمــــــــا

أأســـقى به غرســـاً وأجنيـــــه ذلّـــــة

إذن فاتبـــاع الجهـــل قد كـــان أســـلما

واتە: من خوێنی دڵ‌و گیانم لە پێناوی وەرگرتن‌و خزمەتکردنی زانستدا بۆ ئەوە بەهەدەر نەدا، کە خزمەتی هەرکەسێکی بەرامبەری پێ بکەم، بەڵکو بۆ سوودو خزمەتی گشتی، خۆ ئەگەر نیعمەتێکی جێگیرکراوی پێ تێکدەم‌و بە سەرشۆڕی

بەرەکـەی ببینمـەوە، ئـەوا لەوکاتـەدا پـەیڕەوکردنی جهـلو نـەفامی باشـترو ئاسوودەترە.

جا ئەگەر ئەمڕۆ بڕوانیت بۆ حاڵی ئەوانەی خوازیاری زانستە دونیـاییـیـەکانو بزانە چەند کەسیان فێری ئەو زانستانە دەبـن، کـە سـوودیان پێدەگەیـەنو چـەند کەسی دیکەشیان فێرە ئەو زانستانە دەبن کە زیانیان پێ دەبەخشنو، پاشان ئەمڕۆ چەند زانست هەیە کە زیان بە خاوەنەکانیان دەبەخشنو سوودیان پێ ناگەیەننو، لە جیاتی خێرو کەڵك، شەڕو ئازارو زەرەریان پێدەگەیەنن.

ئەو زانستو زانیاریانەش کە ئەمڕۆ لە جیهانی خۆرئاواوە بۆمان دێت، زۆربەیان لە زیانبەخشەکانو سوود ناگەیەنن، دەنا ئاخۆ سوودی ڕاستەقینە لە زانـستەکانی بەناو مۆسیقاو وێنەکێشانو پەیکەرتاشیو نوانـدنو گەشـتیاریو ئاسـەواردا چـی بێت؟!

# "لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ"

ئەم دەستەواژەیەش (لوکانوا یعلمون/ ئەگەر بیانزانیایە) دوو جار لە چیرۆکی (هارووت‌و ماروون)دا هاتووە:

جاری یەکەم لە باسی سەرزەنشتکردنی خەڵکی بابلدا لەسەر فێربوونی سیحرو بەکارهێنانی لە بواری زیانبەخشین دا" ﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾، واتە: بەڕاستی ئەوان زانیبوویان هەرکەسێك کەرەسەو کاڵای ئاوای -وەك سحربازیی بۆ سوودبەخشین- کڕیبێت‌و شتی ئاوا نابەجێ فێر بێت، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا هیچ پاداشت‌و دەستکەوتێکی لەسەر نی یەو، بێگومان بە خراپترین شت خۆشیان فرۆشتووە، ئەگەر بیانزانیایە.

لەمەشدا نکوولّیی زانستمەندییان لێکراوە (واتە زانستێکیان نەبووە)، چونکە ئەگەر زانستیان هەبوایەو بیانزانیایە، ئەوا فێری شتی زیانبەخش نەدەبوون لە جیاتی سوودبەخش. هەروەها ئەگەر بیانزانیایەو زانستێکیان هەبوایە، ئەوا ڕۆژی دواییان فەرامۆش نەدەکردو دەستبەرداری بەشی رۆژی دواییان نەدەبوون، هەمدیسان ئەگەر بیانزانیایە ئەوا خۆیان بە (شتی پووچەڵ‌و ناڕەواو خراپەو شەیتان) نەدەفرۆشت.

ئایا هیچ کەسێکی خاوەن زانستێکی سوودبەخش هەیە کە ئەم جۆرە ڕەفتارە بنوێنێت؟ ئایا هیچ خاوەن زانستێك هەیە کە دنیا لەجیاتی ڕۆژی دوایی بە چاکتر بزانێت؟ ئەی ئایا هیچ کەسێك هەیە کە زاهیدو ڕەتکەرەوەی ڕۆژی دوایی‌و خێرو

بێرو نیعمەتەکانی بێتو سەرکاتە سەر خراپەو کاری پووچەڵو ڕێبازی شەیتان؟ هەرکەسێك ئاوا بکات، ئەوا بەڕوونیو بە دڵنیاییەوە دەزانین کە هیچ زانستێکی نیە تەنانەت گەر بەرزترین بڕوانامەی زانستیشی هەڵگرتبێتو چەندین ساڵی تەمەنیشی لە زانستدا بەسەر بردبێت.

جاری دووەم: لەباسی بانگکردنی خەڵکی بابلدا بۆ زاستە سوودبەخشەکەو ئەو ڕێگا ڕاستەی کە بەرەو زانستیان دەبات: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ البقرة ﴾، واتە: خۆ ئەگەر ئەوان ئیمانی ڕاستەقینەیان بهێنایەو لە خوا بترسانایەو ئەو کارە ناهەموارانەیان نەکردایەو بە تەمای ڕۆژی دوایی بوونایە، ئەوا پاداشتێك لە خواوە بۆ ئەوان باشترە ئەگەر بیانزانیایە.

کەواتە ئەگەر زانستیان هەبوایە ئەوا ئیمانو لەخواترسانیان هەڵدەبژارد، ئەگەر بیانزانیایە، پاداشتی خوایان بەچاکتر دادەناو ئەو خێرو بێرو نیعمەتانەی لای خوایان دەخواست. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاوایان نەکرد، ئەوە دیارە ئەوان نازاننو، لەبەر ئەوەش کە زانستیان لە دەستدا نەبووەو بەرەو ئەو زانستەی نەبردوون ئەوا دیارە زانستەکەش نەبووە.

ئەو یاداوەرییەی قورئانیشمان دەربارەی ڕەفتار خراپەکانی جوولەکەو خراپ ڕوانینیان بۆ هەق کە لە پێش چیرۆکی (هارووتو مارووت)و کە لە باسی جوولەکەکانو پەیڕەوکردنی سیحربازییاندا هاتووە، لەبیر ناچێت، کە لەمبارەیەوە خوا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ البقرة ﴾، واتە: کاتێك پێغەمبەرێك لەلایەن خواوە بۆ جوولەکەکان هاتو سەرەڕای ئەوەی کە پشتگیریی لە ڕاستیی تەوڕات دەکرد -کە محمدی دوا

پێغەمبەری خوا بوو کە بۆ سەرجەم خەڵکی هاتبوو- کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان -واتە جوولەکەکان- کتێبی خوایان پشتگوێ خست وەك ئەوەی هەواڵی نازانن‌و هیچ زانیاری یەکیان لەبارەوە نەبێت.

بێگومان جوولەکەکان لەو جێگەیەدا وەك کەسانێك کە (نازانن) ڕەفتاریان کردووەو، لێرەش دا لە ڕێگای ئەوانەوە دەڕۆن کە (نازانن)و، خۆ ئەگەر بیانزانیایە ئەوا ئەو ڕەفتارانەیان نەدەنواند کە ئاماژەیان بۆ کراوە.

زانستی پەند لێوەرگیراویش ئەوەیە کە سوود بە خاوەنەکەی دەبەخشێت‌و زیانی لێ نادات، زانستی پەسندکراویش ئەوەیە، کە سوود بە کەسانی تریش دەگەیەنێت، خۆ ئەگەر وانەبوو، ئەوا وەك ئەوە وایە کە هەر نەبێت‌و، خاوەنانیشی لەو کەسانە دەبن کە هیچ نازانن تەنانەت گەر گومانیشیان وابێت کە گوایە دەزانن، چونکە زانستیش بە ئەنجام‌و بەروبوومیەوە دیارە.

# چیــرۆکی دووەم

## چیرۆکی ئەو پیاوەی کە بەلای شــارۆچکــەکەدا تێپەڕی..

ئەم چیرۆکە لە دەقەکەی قورئاندا ئاوایە کە خوا فەرمویەتی:

﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٥٩) البقرة ﴾.

واتە: هەروەها —دوای گفتوگۆی ئیبراهیمو پاشا زۆردارەکە-، ئایا هەواڵی ئەو پیاوەت نەبیستووە کە بەلای شارۆچکەیەکی ڕووخـاوی وادا تێپـەڕی، کـە هـەموو خانووەکانی بەسەر بانو سەقفەکانیاندا ڕووخابوونو، ئەویش لەبەر خۆیەوە گـوتی: خوا چۆن خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە؟ جا ئەو کەسە -کە (عـوزەیر)ی پێغەمبـەری خـوا بـووە، سـڵاوی خـوای لێ بێـت- دەسـتبەجێ لەوکاتەدا خوا بۆ ماوەی سـەد سـاڵ مرانـدیو، پاشـان زینـدووی کـردەوەو پـێی فەرموو: چەند مایتەوە؟

(عوزەیر) گوتی: ڕۆژێك، یان کەمتـر لە ڕۆژێك ماومەتەوە.

ئنجا خوا لێی پرسیو فەرموی: نەخێر بەڵکو مـاوەی سـەد سـاڵت پێچـووەو،

تەماشای خواردنو خواردنەوەکەشت بکە -کە لەو ماوە زۆرەدا- نەگۆڕاوەو تێك نەچووە، هەروەها تەماشای گوێدرێژەکەشت بکە (تا بەم ڕووداوەش بتکەینە نیشانەو موعجیزە بۆ خەڵکی، جا سەیری ئێسقانەکانی گوێدرێژەکەت بکە چۆن بەرزیان دەکەینەوەو پێکیانەوە دەبەستینو پاشان بە گۆشت دایاندەپۆشن، کاتێك بینیو بۆی دەرکەوت، گوتی: چاك دەزانمو دڵنیام بەڕاستی خوا تواناو دەسەڵاتی لەسەر هەموو شتێك هەیە.

## درێژەپێدانی ئەم چیرۆکە لە دەقە ئیسرائیلییەکانەوەیە

زۆرکەس لە تەفسیرکارو چیرۆك گێڕەوەکان چەند شیکارو درێژەپێدانێکیان بۆ ئەم چیرۆکە -چیرۆکی ئەو پیاوەی بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە- هێناوەو بەوەش فەرمایشتی خوایان تەفسیر کردوە. ئەم شیکارو درێژەپێدانەش بۆ چیرۆکەکە، هیچ فەرموودەیەکی ڕاستو (صحیح)ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەسەر نەهاتووە، هەر بۆیەش بە دەقە شێوێنراوو هەڵبەستراوەکانی جوولەکە (کە بە ئیسرائیلیات) ناوبراوە دادەنێت، ئەو دەقە (ئیسرائیلیانە)ش مرۆکی هەڵبەستراویو ئیدیعاو پووچەڵیو بێ نێوەڕۆکییان پێوەیە.

لەو دەقە (ئیسرائیلیانە)دا گوتراوە: ئەو پیاوەی بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە (عوزەیر)ە شارۆچکەکەش (بیت المقدس)ە دوای ئەوەی (بەخت نەسر/بختنصری ئاشووری تێکی داوەو جوولەکەکانی لەوێوە بۆ شاری بابل هێناوە.

لێرەشدا یەك بەسەرهاتی گێڕاوە لەو دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییانە دیاری دەکەین بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەی موسڵمانانو وریابوونیان لەو شتە پووچەڵانە:

"(سیوطی) لە (الدر المنثور)داو لە (ابن عباس)و (کعب الأحبار)و (حسن البصری)و (وهب کوڕی منبە)ەوە گێڕاویەتییەوە کە گوتوویانە: (عوزەیر)

بەندەیەکی پیاوچاك بووەو، ڕۆژێکیان لە ماڵەوە بۆ سەر شوێنی کارکردنی خۆی دەردەچێت کە خووی پێوەگرتبوو، هەر دەکەوێتە ڕێو لە کۆتایی ڕێگایدا دەگاتە کەلاوەیەك -لە کەلاوەکانو ئاسەواری (بيت المقدس)- دەبێت، ئنجا کە نیوەڕۆش دادێت گەرمای دەبێتو لەبەر گەرمی دەچێتە نێو کەلاوەکەوەو بە سواری پشتی گوێدرێژێکیشەوە دەبێت، لەوێدا لە گوێدرێژەکەی دادەبەزێتو سەبەتەیەك هەنجیرو سەبەتەیەك ترێی پێ دەبێتو لەژێر سێبەری کەلاوەکەدا دادەنیشێت. هەروەها مەنجەڵێکی پێ دەبێتو هەندێك لەو ترێیە دەگوشێتە نێوی کە لەلای بووە، پاشان نانێکی وشك دەردێنێتو دەیخانە نێو مەنجەڵەکەو ئاوی ترێکەوە، تاکو تەڕببێتو پێوەی بیخوات، ئنجا لەسەر پشت پاڵ کەوتووەو هەردوو قاچیشی بە دیوارەکەوە ناوە، لەم حاڵەتەشدا تەماشای سەربانەکانی ئەو خانوانەی کردووە، کە چییان بەسەر هاتووەو بەسەر بانو سەقفەکانیاندا ڕووخاونو خەڵکەکەشیان لەناچوونو، هەندێك ئێسکی بڵاوبۆوەیشی بینی، گوتی: چۆن خوا ئەم هەمو خەڵکە لەدوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە (أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا )، ئەو گومانی نەبووە لەوەی، کە خوا زیندوویان دەکاتەوە، بەڵکو تەنیا بە سەرسوڕمانێکەوە وای گوتووە. خواش فریشتەی مەرگ (ملك الموت)ی ناردوەو گیانی (عوزەیر)ی کێشاوەو بۆ ماوەی سەد ساڵ خوا مراندوویەتی. لە ماوەی ئەو سەد ساڵەشدا لەنێو هۆزی بەنی ئیسرائیلدا چەندین ڕووداوو ئاڵوگۆڕ هاتۆتە ئاراوە.

خوا جارێکی دی فریشتەیەکی بۆ لای (عوزەیر) ناردوەو دڵێکی وای بۆ دروست کردۆتەوە، کە پێی عاقڵ ببێتو هەردوو چاویشی بۆ داناوەتەوە، کە پێیان بڕوانێتو، ئنجا بە عەقڵەوە بزانێت، کە چۆن خوا مردووەکان زیندوو دەکاتەوە، پاشان کرداری پێکهێنانو خولقاندنی پیشان داوەو ئەویش بۆی ڕوانیوە.

ئنجا گۆشتی خستۆتەوە سەر ئێسکەکانو تووكو قژو پێستیشی بەبەر لاشەکاندا کردۆتەوەو، لەدواییشدا گیانی بەبەردا کردوە، هەموو ئەمانەش لەبەر

دیدەو عەقڵی دابووە. (عوزەیر)یش بە ڕێکی دانیشتووەو، فریشتە نێرراوەکەی خوا لێی پرسیوە: تۆ لە ماوەی ئەم بێئاگایی یەتدا -کە مردنەکەی بووە- چەندت پێچوو؟ ئەویش گوتوویەتی: ڕۆژێك یان هەندێك لە ماوەی ڕۆژێکم پێچووە (لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ)، ئەمەش چونکە لە سەرەتای ڕۆژەکەو لەکاتی بەرەبەیانەوە خەوتووەو لە کۆتایی ڕۆژەکەشدا کە خۆر ئاوا نەبووە هەڵسێنراوەتەوە -ئەمە ئەگەر ڕۆژێك بێت- بۆ ماوەی هەندێکی ڕۆژێك (بَعْضَ يَوْمٍ)یش ئەوەیە کە ڕۆژێکی تەواوی پێنەچووبێت-بە وتەی خۆی-. ئنجا فریشتەکە ڕووی تێکردۆتەوەو پێی گوتووە: نەخێر، بەڵکو سەد ساڵت پێچووە(بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ)، دە سەیری خۆراك‌و خواردنەوەکەشت بکە -واتە مەبەست لە خۆراکەکەی ئەو نانە وشکە بووەو مەبەستیش لە خواردنەوەکەش ئەو شەربەتی تریێیە بووە کە گووشاندبوویە نێو مەنجەڵەکەیە-و لەسەر حاڵەتی خۆیان مابوونەوەو نەگۆڕابوون. ئەوەش مانای وشەی (لم يتسنه بە مانای (لم يتغير/ نەگۆڕاوە) بە هەمان شێوە پاشماوەی تریێ‌و هەنجیرەکەش هەر تەڕو ئاودارو جوان بوون‌و لەسەر حاڵەتی خۆیان مابوون‌و نەگۆڕابوون. لەو کاتەدا(عوزەیر) لەبەرچاوی فریشتەکە وا دەرکەوتووە کە لە دڵی خۆیدا نکووڵی لەو حاڵەتانە کردبێت، هەر بۆیەش فریشتەکە پێی گوتووە: ئەرێ نکووڵی دەکەت لەوەی بۆم باس کردیت، دە سەیری گوێدرێژەکەشت بکە.. ئەویش سەیری لاشەی گوێدرێژەکەی دەکات کە چۆن ئێسك‌و پروسکی بڵاوبۆتەوەو کلۆر بوون‌و بۆش‌و کونیان تێکەوتووە. فریشتەکەش ئێسکەکانی گوێدرێژەکە بانگ دەکات‌و ئەوانیش بە دەنگیەوە دێن‌و لە هەموو لایەکەوە کۆدەبنەوە تا فریشتەکە پێکیان دەهێنێتەوەو (عوزەیر)یش بۆ ئەو حاڵەتە دەڕوانێت.

ئنجا فریشتەکە ڕەگ‌و دەمارو ئەندامەکانی لاشەی بەبەردا دەکاتەوەو گۆشتیشی لەسەر دەپۆشێت‌و بە پێست‌و تووك دایدەپۆشێت‌و فووی ڕووحی پیادا دەکات‌و، ئیدی گوێدرێژەکەش هەڵدەستێتەوەو سەری‌و گوێیەکانیشی بەدەم

زەڕینەوە بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە، ئەمانەش هەمووی بەپێی دەقە تەفسیرکراوەکانی (سیوطي) مانای فەرمایشتەکانی خوا لەو ئایەتانەی بەسەرهاتەکەدا دەبەخشێت کە فەرموویەتی: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ﴾. بە مانای بڕوانە بۆ ئێسکەکانی گوێدرێژەکەت چۆن هەندێکیان لە پێکەوە بەستنەوەیاندا لەسەر هەندێکی تریان دادەنێین تاکو کاتێك دەبنەوە بە چەند ئێسکێکی تەواو ئەوا دەبنە گوێدرێژێکی بێگۆشت، پاشان بڕوانە چۆن گۆشتی پێ دادەپۆشین ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، واتە: دەزانم خوا بەسەر هەموو شتێکی وەك زیندووکردنەوەی مردووانو کاروباری تریشدا بە توانایە.

دوای ئەوە (عوزەیر) سواری پشتی کەرەکەی بۆتەوەو هاتۆتەوە بۆ گەڕەکی پێشووی خۆیو خەڵکیش نەیانناسیوەو، ئەویش خەڵکەکەی نەناسیوەو خانووەکانیشی نەناسوە، بۆیە هەر بە خەیاڵو بۆچوونی خۆی پێی هەڵگرتوە، تاکو چۆتە خانووەکەی خۆیو دەبینێت پیرێژنێکی کوێری تێدایەو لە تەمەنی (١٢٠) ساڵی دایەو بەندەیەکیان بووەو کاتێك (عوزەیر) بەجێی هێشتبوون ئەو لە تەمەنی (٢٠) ساڵ دا بووەو پێشتر ناسیبوویو بەچاکیش لە کەسێتیو دەروونی ئەو شارەزا بوو. ئەویش (واتە عوزەیر) لێی پرسیوە: ئەی ئەو کەسەی لێرەدایت، ئایا ئەمە ماڵەکەی (عوزەیر)ە؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی: بەڵێ، پاشان بەدەم گریانەوە گوتوویەتی: نەمدیوە تا ئەمڕۆ کەسێك لەم جۆرەو لەو ڕەنگە هەواڵی (عوزێر) بپرسێتو، ئێستاش خەڵکی ئەویان لەبیر چۆتەوە.. ئەویش دەڵێت: من (عوزەیر)م، پیرەژنەکەش دەڵێت پاکیو بێگەردیی بۆ خوا، عوزەیرێك سەد ساڵە لەناوماندا نەماوەو، تا ئێستاش هیچ هەواڵێکمان لەبارەیەوە نەبیستوە.. دووبارە (عوزەیر) دڵنیایی کردۆتەوەو پێی گوتووە: دە ئەوا بێگومان من عوزەیرمو، خواش بۆ

ماوەی سەد ساڵ مراندوومی‌و پاشان زیندووی کردوومـەوە.. پیـرەژنەکە دەڵێـت: بەڵام (عوزەیر) پیاوێکی چاك‌و نزا وەرگیراو بـووەو، نـزای بـۆ نـەخۆش‌و دەردەدار دەکرد، کە خوا چاکیان کاتەوەو شیفایان بۆ بنێرێت. دە تۆش نزام لـەلای خـوا بـۆ بکە با چاوم پێ ببەخشێتەوە، هەتاکو بت بینم، جـا ئەگـەر (عـوزەیر) بیـت ئـەوا دەتناسمەوە. ئەویش نزای بۆکرد لەلای خواو دەسـتی بـە هـەردوو چـاوی داهێنـاو هەردوو چاوی کردنەوە، ئنجا دەستیشی گرت‌و پێی گـوت: هەسـتە بـە فـەرمانی خوا)، ئیدی خواش قاچی پیرێژنەکەی کردەوەو بە ساغی هەسـتایەوە، وەك ئـەوەی پێشتـر قاچی سڕ بووبێت‌و جووڵـەی تێ‌کەوتبێتـەوە. بۆیـە کاتێـك سـەیری کـرد، گوتی: شایەتی دەدەم کە تۆ (عوزەیر)یت.

ئنجا پیـرەژنەکە چوو بۆ گەڕەکەی نیشتەجێ‌بوونی بەنی ئیسرائیل، لەکاتێکـدا ئەوان لە یانەو کۆڕو کۆبوونەوەکانی خۆیان بوون. لەنێویشیاندا کوڕێکی (عـوزەیر) هـەبوو، کـە پیـاوێکی بەساڵاچـوو بـوو لـە تەمـەنی (١١٨) سـاڵی دابـوو کوڕەزاکانیـشی (واتـە کـوڕانی کوڕەکـە)شـی، چـەند پیرێکـی نێـو ئـەو کـۆڕو ئەنجوومەنانە بوون. پیرێژنەکە بانگی کردن‌و پێی گوتن: ئەوە (عوزەیر)ەو هاتۆتەوە بۆلاتان. بەڵام ئەوان بەدرۆیان خستەوەو بڕوایان پێ‌نەکرد. هەروەها پیرێژنەکە پێی گوتن: من فلاّن بەندەو کۆیلـەی ئێوەم، (عوزەیر) لەلای خوای پـەروەردگاری نـزای بۆ کردم‌و خواش چاوی بۆ گەڕاندمەوەو، قاچیشـــمی چاك کردەوەو، هەر خۆیـشی -واتە عوزەیر) وای دادەنێت، کە خوا بۆ ماوەی سەد ساڵ مراندوویـەتی‌و، پاشـان زیندووی کردۆتەوە.

خەڵکەکـە بـە وتـەکانی ئـەو پیرێژنـە هەسـتان‌و ڕوویـان تـێ‌کرد، کوڕەکـەی (عوزەیر)یش تەماشایەکی باوکی کـردو گـوتی: بـاوکم خـاڵێکی ڕەشـی لـەنێوان هەردوو شانیدا هەبووە، چوو سەیری ناوشانی کردو بۆی دەرکەوت، کە ئـەم پیـاوە (عوزەیر)ی باوکیەتی. (بەنی ئیسرائیل)یش گوتیـان: هـیچ کەسـێك لەنێومانـدا، جگە لە (عوزێر) تـەوڕاتی لەبەرنـەکردبوو، (بـەخت نەسـر)یـش تـەوڕاتی ئێمـەی

سووتاندو هیچی وای لـێنەمایەوە ئەو هێندە نەبێت کە پیاوان لەبـەریان کردبـوو، تۆش ئەی (عوزەیر) تەوراتـمان بۆ بنووسەرەوە. باوکیشی (سەرووخا) کە پێشتر لە ڕۆژگـاری بالآدەسـتیی (بـەخت نەسـر)دا تـەوراتی لـەژێر زەویـدا شـاردبۆوە، لـە شوێنێکدا بو کە جگە لە (عوزەیر) هیچ کەس پیێ نەدەزانی.

ئەنجا هـەموویانی بـردەوە بـۆ ئـەو شـوێنەو هـەڵی کەنـدووەو تـەوراتی لـێ دەرهێناوەتەوە، بەڵام کاغەزەکانی تێك چووبوونو ئاسەواری کتێبەکەش نـەمابوو. بۆیە لەژێر سایەی درەختێکدا دانیشتووەو هۆزی (بەنی ئیسـرائیل)یـش لـە دەوری کۆبوونەتەوەو تەوراتی بۆ تـازە کردوونەتـەوەو، دوو ئەسـتێرەی پرشـنگداریش لـە ئاسمانەوە هاتوونەتە خوارەوەو چـوونەتە نـاخی جەسـتەیەوەو ئنجـا تـەوراتی بـیر کەوتۆتەوەو، بۆ (بەنی ئیسرائیل)ی نوێ کردۆتەوە. بەهۆی ئەمەوەو لە ئاکامی ئەم بەسەرهاتەوە جوولەکـەکان گوتوویانـە: عـوزەیر کـوڕی خوایـە، چـونکە ئـەو دوو ئەستێرەیەی بۆ هاتووەو تەوراتیشی نوێکردۆتەوەو کاروباری (بـەنی ئیـسرائیل)ی ڕاپەڕانـدووە. تەوراتیـشی لـە خـاکی (سـواد)و لـە دێـری (حزقیـل)دا بـۆ تـازە کردوونەتەوە. دواییش لەو دێیەدا مردووە کە پێی دەڵێن (سابیر ئاباد) [1].

---

١) الدر المنثور- للسيوطي/ ٢: ٢٧-٢٩

## بیـروڕای ( طـبـري ) لەسـەر ئەو شـیکارو درێژە پێدانـە

ئیمام (ابن جریری طـبري) بیروڕایـەکی ڕێـكو دروسـتی لەسـەر ئـەم شـیکارو درێژەپێدانەی تایبـەت بـە چـیرۆکی ئـەو پیـاوە هەیـە کـە بـەلای شارۆچـکەکەدا تێپـەڕیوەو، ڕەخنەیـەکی زانـستیانەی بەهێزیـشی لەسـەر ئـەو شـیکارە هەیـە. لەمبارەیەوە گوتوویەتی: "باشترین وتە بۆ ڕاستیی بەسەرهاتەکە ئـەوە بگوترێـت: بێگومان خوا خۆی باسی کردووەو دوایین پێغەمبەریشی ﷺ پێ سەرسام کردووە، ئەمەش لەو فەرمایشتەی دا، کە بۆی گێڕاوەتەوەو لەسەر زاری ئەو پیاوەی بـەلای شارۆچکە ڕووخاوەکـەدا تێپـەڕیوە، فەرموویـەتی: ﴿أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ﴾ ئەمە لەگەڵ زانینی ئەو ڕاستییەشدا، کە خوا هەمووی لە نەبووو بێشتێکی دی لە سەرەتادا دروست کردووە، بەڵام ئەو زانینـەی خـۆی قەناعـەتی پێنـەهێناوە، کـە توانای لەسەر دروستکردنی سەرەتای شتەکان هەیە، تا وای لـێهاتووە بڵێت: خوا چۆن ئەمانە دوای لەناوچوونیان زیندوو دەکاتـەوە (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا)؟ ئێمەش هیچ زانیارییەکی ڕوونی وامان لانیە بۆ سەلماندنی ناوی بگۆی ئەم ڕستەیە، واتە (بۆ دیاریکردنی ناوی ئەو پیاوەی بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە). دەشێت کە (عوزەیر)یش بووبێت، دەشێت کە (ئۆرمیا)ش بووبێت. بەڵام ئێمە ئاتاجێکمان بـە زانینی ناوەکەی نیە، چونکە مەبەست لەو ئایەتەدا ناساندنی ناوەکە بە خەڵك نیە. بەڵکو مەبەست لەمەدا ناساندنی قودرەتی خوایە بەو کەسانەی، کە نکوڵی دەکەن لە قـودرەتو توانـای خـوا لەسـەر زیندووکردنـەوەی مـەخلوقاتی خـۆی لـەدوای مراندنیانو، گێڕاندنەوەیان بـۆ دنیـا لـەدوای لەنێوچـوونیان، هـەروەها خـوا هـەر خۆیشی ژیانو مردنی بەدەستە.. لەوانەش کە نکوڵییان لە توانای خـوا دەکـرد، کەسانێکی بێباوەڕی نێو قوڕەیشو ئەو کەسانەی تری سەر بە هۆزەکـانی عـەرەب بوون، کە لێرەدا مەبەست بووە توانای خوایـان پـێ بناسـێنرێتو، بەڵگـەی ڕوونو

ئاشکرایان لەسەر جێگیر بکرێت، هەروەها مەبەست لەو جوولەکانەی (بەنی ئیسرائیل)یش بووە کە لە شوێنی هیجرەتگای پێغەمبەری خۆی محمد ﷺی ئاگادارکردووە لەو چیرۆكو بەسەرهاتانەی کە لەلای جوولەکەکانیش بیستراون تا بەم ڕەنگە جولەکەکانی مەدینەش گومانیان لەسەر پێغەمبەرایەتییەکی نەمێنێتو بیانووشیان (لەسەر باوەڕ نەهێنان بە پەیامەکەی) نەهێڵێت. چونکە ئەو بەسەرهاتانەی کە خوا بە سروش بۆ (محمدی پێغەمبەری) لە قورئاندا گێڕاوەتەوە، لەو هەواڵو بەسەرهاتانەن کە پێشتر پێغەمبەر ﷺو گەلەکەشی نەیاندەزانین، زانیاریش لەسەر ئەو بەسەرهاتانە لەوەوپێش تەنها لەلای شوێنکەوتوانی ئاینەکانی تر هەبوو وەك جوولەکەو دیانەکان، دیارە (محمد)ی پێغەمبەریش ﷺ لەوان نەبووەو تەنانەت نەخوێندەواریش بووەو، گەلەکەشی نەخوێندەوار بوون. ئەمەش لەلای شوێنکەوتوانی کتێبەکانی پێشوو (ئەهلی کیتاب) ڕوونو زانراو بووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم بەسەرهاتانەی تەنها بە سروشی خوا زانیوەو لێی ئاگادار کراوە. جا ئەگەر مەبەست لەم هەواڵو بەسەرهاتانە بۆ دیاری کردنی ناوی خاوەنی پرسیارەکە بێت کە دەربارەی چۆنیەتی زیندووکردنەوەو بنیات نانەوەی شارێك پرسیاری کردووە (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا)" ئەوا ئاماژە بۆ کردنەکە تەنها لەسەر ناوی خۆی دەبوو بە شێوەیەك کە هیچ ئاستەنگێك نەهێڵێتەوەو بیانوو ببڕێتو، گومان نەهێڵێت. بەڵام مەبەست لەمە ڕەخنەگرتنە لە وتەی نێو پرسیارەکەیو، ئیدی خوا بەمەش هێندەی بۆ بەندەکانی لێ دیاری کردووە[1]".

---

١) تفسير الطبري/ ٥: ٤٤١-٤٤٢.

## بیروڕای (سید قطب) لەسەر ئەم چیرۆکە

مامۆستای پێشەواش (سید قطب) بیروڕایەکی نایابو هەڵوێستێکی پتەوی لە ئاست شیکارو وردەکاری یەکانی نێو دەقە ئیسرائیلییەکانی تایبەت بەم چیرۆکەدا گرتۆتەبەر، وەك لەمبارەیەوە گوتوویەتی: "کێیە ئەو پیاوەی کە بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە؟ ئەی ئەو شارۆچکەیە کامەیە کە لەکاتی ڕووخانی داروپەردووی بەسەر یەکدا پیایدا تێپەڕیوە؟ بێگومان قورئان لەمبارەیەوە هیچ زانیارییەکی دەرنەخستووەو، گەر خواستی خواش لەسەر ئەوەبوایە ئەوا دەریدەخست.

خۆ ئەگەر حیکمەتی نێو دەقەکەی قورئانیش تەنها بەو دەرخستنە بەدیی بهاتایە، ئەوا خوا لە قورئاندا فەرامۆشی نەدەکرد. دەبا ئێمەش -بەشێوازی خۆمان لەم تەفسیری (في ظلال القرآن)ەدا- لە ئاست ئەم سێبەرەشدا هەڵوێستە بکەینو ببینین کە: بێگومان دیمەنی بەسەرهاتەکە وێنەیەکی بەهێزو ڕۆشنو سروش بەخش بۆ هەست دەکێشێت، دیمەنی مردنو کارەساتو وێرانە. بە وەسفی (وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا) دیمەنی شارۆچکەیەکی ڕووخاو پێشان دەدات کە بەسەر بناغەو کۆڵەکەکانیدا ڕووخاوە، پاشان لەڕێی هەستو سۆزی ئەو کابرایەی بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە سۆزێکی گشتی مرۆییو زاخاودراو بەو گوزارشتەی (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا) دەکێشێت"[1].

---

١) في ظلال القرآن/ ١: ٢٩٩.

# ئەو باسەی کە چیرۆکەکەی تێدا هاتووە

چیرۆکی (ئەو پیاوەی بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕی) لە باسێکی تایبەتیدا هاتووە کە (باسی لێدوانە لە بابەت ژیانو مردنەوە)، پێشتر ئاماژەیەك بۆ دەمەتەقێیەکی نێوان (ابراهیم خلیل) -سلاوی لێ بێت-و ئەو پاشایەدا کە پڕوپاگاندەی پەروەردگاریەتیی بۆ خۆی کردوە، کراوەو کە (ابراهیم) موناقەشەی لەگەڵدا دەکاتو بەڵگەی گەورەو بنەبڕی لەسەر پەروەردگارێتی خواو پووچەڵیی بیروڕاکانی ئەو دەخاتە بەردەم. دوای ئەم وتو وێژەش ئاماژە بۆ بەسەرهاتێکی تری کورتی (ابراهیم) هەیە کە نموونەیەکی کردەیی (عملی)ی لەسەر (ژیانو مردن) لەگەڵدا دانراوەو، نموونەکەش باسی زیندووکردنەوەی باڵندەکانە کە دواتر بە پەلە هاتوونەوە بۆلای.

جا بۆ ئەوەی هەر لە کەشی ئەو (ژیانو مردن)ەشدا بمێنینەوەو ساباتە گشتییەکەی باسە بنەڕەتی یەکەش ڕەچاو بکەین، هەرسێ ئایەتەکەی تایبەت بەو وتوێژو بەسەرهاتە کورتانە دیاری دەکەین کە خوای مەزن تیایاندا دەفەرموێت:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَـٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِا۟ئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِا۟ئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا

ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾
وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن
لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ
جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ البقرة ﴾.

مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەربارەی بابەتی هەرسێ ئایەتەکە گوتوویەتی: "ئەم سێ ئایەتە لەکۆی هەموویان دا یەك بابەتیان لەخۆ گرتووە: نهێنی ی ژیانو مردنو حەقیقەتی ژیانو مردن.. بەم پێیەش لایەنێك لە لایەنەکانی تێڕوانینی ئیسلامی پێك دەهێنێتو دەچێتە پاڵ ئەو ڕێسایانەی کە لە سەرەتای ئەم جوزئەی قورئانەوە ئایەتەکانی پێشوو دەریان بڕیەو، پەیوەندی یەکی ڕاستەوخۆشی بە (آية الكرسي)یەکەوەو بەو سیفەتانەی تری خواوە هەیە کە لەو ئایەتەدا دەربڕاون. ئیدی بە هەموشیان لایەنێك لە لایەنەکانی ئەو کۆششە درێژو دەرکەوتووەی نێو قورئان نمایش دەکەن کە تێڕوانینی ڕاستەقینەی بۆ ڕاستی یەکانی ئەم بوونەوەرە لە ویژدانو پەی بردنی مرۆڤی موسڵمان دا دروست کردوە"[1].

[1] في ظلال القرآن/ ١: ٩٦

# " أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا "

کاتێك ئەو پیاوە شارۆچکە ڕووخاوەکەی بینی کە داروپەردووی بەسەر یەکتردا تەپیە، خێرا زمانی بەم پرسیارە سەرسوڕهێنە کەوتە گۆ: (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا)؟ ئایا تۆ بڵێی بەم شێوە پرسیارکردنە گومانی لە توانای خوا لەسەر زیندووکردنەوەی مردووانو پێك هێنانەوەی شارۆچکەکەش دوای لەناوچوونی کردبێت؟ ئەی ئایا پاڵنەرو سەرچاوەی پرسیارکردنەکەی گومانکردنی بووبێت لە تواناو قودرەتی پەروەردگار؟ هەندێك لە ڕاڤەکاران (مفسرين) وایان گوتووە، کە گوایە ئەم گومانەی کردبێت، ئەمەشیان داناوە بە گومان کردنی پیاوەکە لە توانای خوا. وەك زانراویشە، کە گومان کردن لە توانای ڕەهاو بێسنووری خوا کفرو بێباوەڕییەو، کابرای گومانکاریش لەوەدی بێباوەڕە، نەك باوەڕدار. ئەی باشە چۆن ئەم پیاوەش -کە بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە- گومانی لە قودرەتی خوا هەبووە - واتە چۆن کافرو بێباوەڕ بووە- لە کاتێکدا هەر خودی ئەو ڕاڤەکارو تەفسیرنووسانە دەڵێن گوایە ئەوە (عوزەیر) بووەو، گوایە پێغەمبەرێکیش بووە؟! بەڵام کۆمەڵێ زانایانی تەفسیر لەسەر ئەو ڕایەن، کە پیاوەکە باوەڕدار بووەو ئیمانی بەخوا هەبووەو ئیمانی بە قودرەتی بێسنووری خواش هەبووەو، ئیمانی بە زیندووکردنەوەی مردوانیش هەبووە.

(سید قطب) گوتوویەتی: "ئەم دیمەنە وێنەیەکی بەهێزو ڕۆشنو سروش بەخش بۆ هەستو زەین دەکێشێت، کە وێنەی مردنو تاقیکردنەوەو لەناچوونەو، بە وەسفی (وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا) وێنەی کێشراوەو شوێنەکەش بەسەر هەموو بنکەو کۆڵەکەکانیدا ڕووخاوە. لەڕێی هەستو نەستی کابرای گوزەرکار بەلای

شارۆچکەکەشدا ئەو هەستو سۆزە وێنا دەکات، کە لە گوزارشتی نێو پرسیارەکەیەوە هەڵقوڵاوەو پرسیویەتی: (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ).. بێگومان دەربڕی ئەم پرسیارە دەزانێت کە خوا لەوێیە، بەڵام دیمەنی کارەساتەکەو وێرانییەکەش لەگەڵ کارایی توندیان لە دڵو هەستو دەروونیدا، وای لێکردوە سەرسامو حەیران بێتو بپرسێت: ئەرێ چۆن خوا ئەم شارۆچکەیە لە دوای لەناوچوونی دروست دەکاتەوە؟! ئەمەش ئەوپەڕی کاریگەریی دیمەنی کارەساتە لەنێو دڵو دەروونی مرۆڤدا کە سروشتی قووڵی لە پرسیار ڕاماندا پێ دەخروشێنێت. گوزارشت (تعبیر)ەکەش بەم ڕەنگە سایەو سروشتی خۆی هەڵدەخاتو، دیمەنەکەش وادەکێشێت وەك ئەوەی ئیدی لەو چرکەساتەدا هەر خۆی لەبەرچاوانو لەبەر هەستو نەستدا بێت.. (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا )؟ ئەی چۆن ژیانیش بۆ مردووەکان دەگەڕێتەوە؟"[1].

کەواتە پیاوەکە کاتێك ئەو پرسیارەی کردوە، لەبەر گومانکردنی لە توانای خوا لەسەر زیندووکردنەوەی مردووەکان نەبووە، بەڵکو لە ئاکامی سەرسام بوونی لە ئاست ئەو کارەساتەی بەردەمی دا بووە، کارەساتی شارۆچکەیەکی وێرانو ڕووخاو بەسەر هەموو خانووو دارو پەردوویدا، کە ئاخۆ چۆن خوا جارێکی دی دەیکاتەوە بەو شارەی جاران.

پاشان کابرا -گەر سەرنجی دەربڕینی بێژەو ئامرازی پرسیارکردنەکەی بدەین- گوتوویەتی: خوا چۆن دەیهێنێتەوە کایە (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا )و ئامرازی (أَنَّىٰ)ش بە مانای (کیف/ چۆن) دێت.

ڕاستە کە هەردوو وشەی (أنى)و (هل) بۆ پرسیارکردنن، بەڵام پرسیارکەر کاتێك بە وشەی (هل/ ئایا) پرسیار دەکات ئەگەر گومانی لە توانا و هێزی

---

١) في ظلال القرآن/ ١: ٢٩٩.

هاوڕێیەکی هەبێت لەسەر کردنی کارێك، هەر بۆیەش پێی دەڵێت: (ئایا دەتوانیت ئەو کارە بکەیت؟) بەڵام ئەگەر پێی بڵێت: (چۆن تۆ ئەو کارە دەکەیت؟) ئەوا پرسیاری لەسەر چۆنیەتیو شێوازی ئەنجام دانی ئەو کارەی لێ دەکات.

ئەم پیاوەش (کە بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە) حەی کردووە شێوازو چۆنیەتی پەیدابوونەوەی ئەم شارۆچکەیە بزانێت کە چۆن خوا بەدیی دێنێتەوەو خەڵکەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، حەزی کردووە ئەمە بە چاوی خۆی ببینێتو ئاگادار بێت.

ئەم پرسیارکردنەشی، کتومت وەك پرسیارکردنەکەی (ئیبراهیم)ە -سڵاوی لێ بێت- کە داوای لەخوا کرد چۆن مردووان زیندوو دەکاتەوە، وەك لەو بەسەرهاتەی نێو ئایەتەکەی پێشتردا هاتووە: ﴿...وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ...﴾(٢٦٠) البقرة، ئەوەش وەك ئەم بەسەرهاتەیەو یەك ناوەرۆکیان هەیە، چونکە پێکەوە لە یەك باسو بۆنەدا هاتوون.

# چەند موعجیزەیەك لە چیرۆکەکە

قورئانی پیرۆز لە کاتی خستنەڕووی چیرۆکی (ئەو پیاوەی بەلای شارۆچکەکەدا تێپەڕیوە) چەند موعجیزەیەکی خوایی لەسەر (ژیانو مردنو زیندووکردنەوەو چاکسازیو خراپەکاری) دەخاتە بەرچاومان، کە بەڵگەن لەسەر توانای ڕەهاو بێسنووری خوا، ئەو توانایەی، کە ملکەچی هیچ یاساو ڕێساو دەستوورێکی گەردوون نیە، چونکە خوا خۆی ڕێساو دەستوورەکانی خولقاندووەو وای لێکردوون حوکمی ژیانی مرۆڤ بکەن، بەڵام حوکم بە خوا خۆی ناکەنو هیچ سنوورو چوارچێوەیەکیش بۆ خواستو ئیرادەی خوا دانانێت. لەو موعجیزانەش کە لەم چیرۆکەدا هەن، وەك:

١/ خوا ئەم پیاوەی بۆ ماوەی سەد ساڵ مراندووەو پاشان زیندووی کردۆتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ﴾، ئەم مراندنو زیندووکردنەوەیەشی وەڵامێك بووە بۆ پرسیارەکەی ئەو پیاوە کە گوتبووی: (أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا)؟ ئیدی خواش ئەزموونێکی کردەیی (عملی)ی خستە بەرچاوی کابراو ڕاستەوخۆ بەسەر خۆیشیدا پەیڕەو بووو، بەمەش وەڵامی پرسیارەکەی خۆی دەستکەوتەوە، چونکە ئەوەتا بۆ سەد ساڵ مردووەو، دوایش زیندوو کراوەتەوە، جا ئەو خوایەی کە ئەم ئەزموونە کردەیی یەی بەسەردا پەیڕەو کردوە، ئەوا لەسەر ژیاندنەوەی شارۆچکەکەش لەدوای تێکچوونی بە توانایە. وەك (سید قطب)یش دەڵێت: "خوا لە وەڵامی پرسیاری کابرادا، تەنها بە (وتن) پێی نەفەرمووە، کە چۆن ئەو شارۆچکەیە دەژیەنێتەوە، بەڵکو لە جیهانی واقیعداو پیشانی داوە، کە چۆن ژیان بەبەر مردوودا دەکاتەوە، چونکە هەستو سۆزو سەرسام بوونیش، هەندێك جار لە ڕادەیەکی وەها توندو قووڵ

بوونەوەدایە، کە تەنها بە بەڵگەی عەقڵی‌و، تەنانەت (بە لۆژیکی ویژدانی)یش تێر ناکرێت، تەنانەت بەو واقیعە گشتییەی بەرچاوانی خەڵکیش تێرو چارەسەر ناکرێت، بەڵکو چارەسەرەکە بە ئەزموون‌و تاقیکردنەوەی شەخسی‌و تایبەتیی ڕاستەوخۆ دەبێت کە هەست‌و نەست‌و تێرو پڕ دەکات‌و، دڵیش بە تەواوەتی‌و بەبێ لێدوان هێدی‌و ئارام دەکاتەوە"[1].

٢- مردنی گوێدرێژی پیاوەکەو مانەوەی ئێسك‌و پروسکی‌و، پەیکەرە ئێسکییەکەشی کە هیچ گۆشت‌و خوێن‌و پێست‌و تووکێکی پێوە نەمابێت، ئەمەش لە فەرمایشتەکەی خواوە وەریدەگرین، کە هەر لە ئایەتەکەی ئەم بەسەرهاتەدا فەرموویەتی: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾. پاشان خوا ئەم کەرە(گوێدرێژ)ەش بە ڕێگەیەکی لەڕادەبەدەر(معجزە) زیندوو کردۆتەوەو خستوێتییە بەر هەردوو چاوی پیاوەکە" ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمًا﴾ واتە: پاشان بڕوانە بۆ ئێسقانەکانی گوێدرێژەکەت، کە چۆن بەرزیان دەکەینەوەو پێکیان دەبەستینەوەو، پاشان بە گۆشت دایاندەپۆشین.. بە مانای خوا ئەو پەیکەرە ئێسکییەی کەرەکەی پیشانی پیاوەکە داوەو، پاشان پیاوەکە بە چاوی خۆی دیویەتی کە (قۆناغ بە قۆناغ) چۆن خوا بەو قۆناغبەندییە سەرسوڕهێن‌و موعجیزەکارییە، وردەوردە گۆشت دەخاتەوە سەر ئێسکەکان‌و، پاشان دایان دەپۆشێت‌و پێست‌و تووکی بە بەردا دەکاتەوە، تاکو پێکهاتەی جەستەی گوێدرێژەکە تەواو بووەو ئەو جەستەیەی پێشووتری خۆی بۆ گەڕاوەتەو. ئنجا خوا گیانیشی بە بەردا کردۆتەوەو گیانەکە بە سەرجەم بەشەکانی لاشەی دا سووڕاوەتەوەو، ژیانی تێکەوتۆتەوە.

٣- نەگۆڕانی خۆراك‌و خواردنەوەکەی، بە درێژایی ماوەی ئەو سەد ساڵە" ﴿فَٱنظُرۡ

---

١) الظلال: ١: ٣٠٠ .

إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ﴾، واته‌: هه‌روه‌ها بڕوانه‌ بۆ خۆراكو خواردنه‌وه‌كه‌ت كه‌ هیچ نه‌گۆڕاون‌و تێك نه‌چوون.. چونكه‌ به‌ هه‌مان كه‌ڵك‌و به‌های خۆیان مابوونه‌وه‌و بۆ به‌كارهێنان ده‌ستیان ده‌داو هیچ حاڵه‌تێكی ڕزین‌و تێكچوونیان تووش نه‌بووبوو. ئیعجازی بێوێنه‌و دره‌وشاوه‌ش له‌و خواسته‌ خوایی یه‌دا بۆمان ڕه‌نگ ده‌داته‌وه‌، كه‌ بێگومان وه‌ك پێشبینی كردوه‌- به‌گوێره‌ی دیدو تێڕوانینی مرۆڤ- كه‌ ژیانی ئه‌و پیاوه‌ درێژه‌ بكێشێت، به‌ڵام خوا مراندوویه‌تی، خۆی‌و كه‌ره‌كه‌شی، وه‌ك پێشبینی كراویشه‌، كه‌ ده‌بوایه‌ - هه‌ر به‌پێی تێڕوانینی مرۆڤ- به‌ زوویی ئه‌و خۆراك‌و خواردنه‌وه‌یه‌ش تێك بچێت‌و پیس‌و بۆگه‌ن بن، به‌ڵام خوا به‌چاكی‌و پاكی‌و به‌بێ گۆڕان‌و تێك چوون، بۆ ماوه‌ی سه‌د ساڵ هێشتوونی یه‌وه‌و پاراستوونی.

ئیدی پیاوه‌ ئیمانداره‌كه‌ش، ئیمان‌و باوه‌ڕو بڕواهێنان‌و دڵنیابوونێكی زیاتری ده‌ستكه‌وتووه‌، ئه‌مه‌ش به‌هۆی ئه‌و موعجیزانه‌وه‌، كه‌ دیبوونی. بێگومان ئێمه‌ش كاتێك ئه‌م چیرۆكه‌ له‌ قورئاندا ده‌خوێنینه‌وه‌و له‌ هه‌موو جارێكیشدا، كه‌ به‌وپه‌ڕی په‌رۆشی‌و سه‌رسامی‌و كارتێكراوییه‌وه‌ سه‌رنج له‌ وێنه‌و دیمه‌نه‌كانی ده‌ده‌ین، باوه‌ڕو یه‌قین‌و ئیمان‌و دڵنیایی یه‌كی زیاترمان ده‌ست ده‌كه‌وێت، به‌ تایبه‌تیش له‌ كاتی خوێندنه‌وه‌ی ئه‌و موعجیزه‌ پڕشنگدارانه‌ی خوا تیاییدا.

## مـردنی پیـاوەکە، مردنێکـی تایبـەتی بووە

هەندێك کەس وای دادەنێن، کە مردنی ئەو پیاوە بۆ ماوەی سەد ساڵو، پاشـان زیندووکردنەوەشی، پێچەوانەی دەقەکانی تری قورئانە، کـە وای بڕیـارداوە کاتێـك مرۆڤـ دەمرێ هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوەی لە قیامەتدا، گیانی بـۆ ناگەڕێنرێتـەوە، لەو دەقانەش وەك ئەوەی، کە خوا فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ ... ﴿١٠٠﴾ المؤمنون ﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ يس ﴾.

ئێمە هیچ دژایەتیو پێچەوانەبوونێکی نێوان ئایەتی ئەم چیرۆکەو ئایەتـەکانی تـری قورئانـدا بـەدیی ناکـەین، ڕاسـتە کـە هـەموو ئـەم دەقانـە بڕیـار لەسـەر حەقیقەتێکی دیارو بنەبڕ دەدەن، کە ئەوەیە کاتێك مرۆڤ دەمرێت، جارێکی دی بۆ ژیانی دنیا نایەتەوەو ناگەڕێتەوە، چونکە ئەم دنیایەی بەجێهێشتووەو، گیانیـشی لـەنێو گۆڕەکەیـدا لـەلای لاشـەیەوە دادەنرێـتو بەخۆشـییەوە، یـان بـە ئـازارو ئەشکەنجەوە -بەپێی کردەوەکانی نێو دنیایی- ئەو گیانەی تا ڕۆژی قیامـەت لـەلا دەمێنێتەوەو، خواش لەگـەڵ زینـدووکراوانی تـردا لـە گۆڕەکانیانـەوە زینـدوویان دەکاتەوە.

جا ئەو مرۆڤەی، کە لە مردنێکی ڕاستەقینەدا دەمرێتو ماوەی ژیانی دنیایـدا بەتەواوەتی دوایی دێتو، ئەو کۆتاییەی پێدەگات، کە خوا لەپێش دروسـتکردنی بوونەوەردا بۆی نووسیوە.

بەڵام خۆ ئەگەر خوا بڕیاری بۆ تاکە پیاوێك، یان کۆمەڵە کەسێك دابوو، کە بـە

مردنێکی تایبه‌تی بمرن‌و بڕیاریشی وابوو، که‌ پاشماوه‌یه‌کیان له‌و ژیانه‌دا مابێت، که‌ له‌ ئه‌زه‌له‌وه‌ بۆی داناون، ئه‌وا له‌م حاڵه‌ته‌دا ئه‌و جۆره‌ مردنه‌، ئه‌و مردنه‌ ڕاسته‌قینه‌ دوایی‌یه‌ نیه‌، که‌ ژیانی دنیای پێ کۆتایی دێت‌و هه‌رگیز ژیانی دنیای له‌دواوه‌ ناگه‌ڕێته‌وه‌. هه‌ر بۆیه‌ کاتێك شه‌هیدان ئه‌وه‌یان له‌ خوا خواستووه‌، که‌ دوای شه‌هیدبوونیان بیانگێڕێته‌وه‌ بۆ دنیا، تاکو بجه‌نگن‌و جارێکی دی له‌ پێناوی خوادا بکوژرێنه‌وه‌، که‌چی خوا وه‌ڵامی داواکه‌یانی نه‌داوه‌ته‌وه‌، چونکه‌ خوا پێشتر بڕیاری وابووه‌، که‌ بۆ دنیا نه‌گه‌ڕێنه‌وه‌. له‌م ڕووه‌وه‌ (مسلم) له‌ (عبدالله کوری مسعود)ه‌وه‌ -خوا لێیان ڕازی بێت-و ئه‌ویش له‌ پێغه‌مبه‌ری خواوه‌ ﷺ گێڕاوێتیه‌وه‌، که‌ ده‌رباره‌ی ئه‌م حاڵه‌ته‌ فه‌رموویه‌تی: ((**أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ. فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمُ اطِّلاعَةً، فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا! فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا: يَا رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى. فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا**))[1].

واته‌: گیانی ئه‌و شه‌هیدانه‌ له‌ ناخی چه‌ند باڵنده‌یه‌کی سه‌وزدان، که‌ چه‌ند چرایه‌کی وه‌ك ئه‌ستێره‌یان هه‌یه‌و، به‌ عه‌رشی خوادا هه‌ڵواسراون‌و، به‌ ئاره‌زووی خۆیان له‌ به‌هه‌شت ڕاده‌بوێرن، پاشان ده‌چنه‌ پاڵ چراکان. خوای په‌روه‌ردگاریشیان بۆیان ده‌ڕوانێت‌و لێیان ده‌پرسێت: حه‌زتان له‌ چیه‌؟ ئه‌وانیش ده‌ڵێن: حه‌زمان له‌ چ شتێك بێت، له‌ کاتێکدا به‌ ئاره‌زووی خۆمان له‌ به‌هه‌شتدا ڕاده‌بوێرین‌و، هه‌رچیمان بوێت هه‌یه‌!

ئنجا خوا سێجار ئه‌وه‌یان لێ ده‌پرسێته‌وه‌و، ئه‌وانیش که‌ ده‌بینن وازیان لێناهێنرێت‌و، هه‌ر پرسیاریان لێده‌کرێت، تاکو وه‌ڵامێك به‌ شتێك بده‌نه‌وه‌، بۆیه‌

---

١) مسلم (٣٣) كتاب الأمارة (٣٣) باب بيان أن ارواح الشهداء في الجنّة. حديث (١٨٨٧).

دەڵێن: ئەی پەروەردگار، دەمانەوێت گیانەکانمان بۆ جەستەکانمان بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بچینەوە بۆ دنیاو جارێکی تر لە پێناوی تۆدا بکوژرێین. کاتێک خواش دەبینێت جگە لەوە هیچ پێویستییەکی تریان نیە، وازیان لێ دێنێتو وەڵامی داواکەیان ناداتەوەو بۆ دنیایان ناگێڕێتەوە.

جا ئەو پیاوەی کە خوا بۆ سەد ساڵ مراندویەتیو پاشان زیندووی کردۆتەوە، ئەو مردنە ڕاستەقینە کۆتایی پێهاتووەی دنیا نەبووە، بەڵکو مردنێکی تایبەتی بووە تاکو خوا چەند نیشانەیەکی عەمەلیی لە خودی خۆیو خۆراکو، لە گوێدرێژەکەشیەوە پیشان بداتو، لەم چیرۆکەشەوە چەند نیشانەیەك پیشانی خەڵکی تر بدات ﴿وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ﴾.

دوای ئەوەش کە خوا زیندووی کردۆتەوە، پاشماوەی ژیانی خۆی لە دنیادا بەسەر بردووەو دوای ئەمە بەو ئەجەلو کۆتایی یەش گەیشتووە کە خوا بۆی داناوەو بە مردنی ڕاستەقینە مردووە وەك چۆن تەواوی خەڵکی دی دەمرن. خۆ ئەم پیاوەش یەکەمین کەسێك یان تاکە کەسێك نیە، کە بەم مردنە تایبەتییە مردبێتو پاشان زیندوو کرابێتەوەو پاشماوەی ژیانی بەسەر بردبێت، بەڵکو وەك قورئانیش هەواڵی تری هاوشێوەی لەسەر سێ کۆمەڵە کەسی تر پێداوین کە هەمان حاڵەتیان بەسەردا هێنراوە:

<u>کۆمەڵی یەکەم</u>: کۆمەڵە کەسێك بوون لە هۆزی (بەنی ئیسرائیل) لە سەردەمی ژیانی مووسادا -سڵاوی خوای لێ بێت- کاتێك داوایان کرد خوایان بە ئاشکرا وەك خۆی پیشان بدات، خواش لەسەر ئەو داوایە مراندنیو، لە دواییشدا زیندووی کردنەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ البقرة ﴾... واتە: هەروەها ئێوە

ئەی (بەنی ئیسرائیل) ئەوە بەیاد بێننەوە کاتێك بـە مووسـاتان گـوت: ئـەی مووسا ئێمە هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین، تاکو بە ئاشـکراو بەچـاوی خۆمـان خوا نەبینین، هەر بۆیـەش لەسـەر ئەمـە دەسـبەجێ بروسـکە لێـی دان، لـە کاتێکدا تەماشاتان دەکـردو بـە سەرسـامی یـەوە بـە چـواردەوری خۆتانـدا دەتانڕوانی، پاشان دوای ئەمەو لە دوای مراندنتان زیندوومان کردنـەوە تـاکو دوای ئەو مردنەتان سوپاسی خوا بکەن.

کۆمەڵی دووەم/ ئەوانە، کە بە چەندین هەزارکەس لـە خـاکی خۆیـان دەرچـوونو، خواش مراندنیو پاشان زیندووی کردنەوە، وەك فەرموویـەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ ...(٢٤٣) البقرة ﴾، واتە: ئایا هـەواڵی ئەوانـەت نەبیـستووە، کـە بـە هەزارەها کەس دەبوونو لە ترسی مردن لە ماڵو خاکی خۆیان دەرچوون و-لە بەرەنگار بوونەوەی دوژمنو لەنێوچوونی خۆیان دەترسان-، خـواش پـێ یـانی فەرموو: بـمرن، ئنجا مراندنیو دوایی زیندووی کردنەوە.

کۆمەڵی سێیەم/ هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە (اصحاب الکهف)ن، ئەوانەی کە خـوا بۆ مـاوەی سێسـەدو نـۆ سـاڵ مرانـدوونی: ﴿ وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا (٢٥) الكهف ﴾.

## چەند بەڵگەیەك لەسەر زیندووكردنەوە لە قورئاندا

لە دیارترینی ئەو مەسەلانەی، کە لەلای کافرەکان جێی نکوولّیو بەدوورگرتن بووە، مەسەلەی زیندووکردنەوەو لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت بووە، گوایە چۆن گیانەکانیان بۆ لاشەکانیان دەگەڕێنرێنەوە، دوای ئەوەی لەنێوچوونو بوون بە خۆڵ؟

قورئانی پیرۆز ئەم گومانانەی ئەوانی تۆمارکردووەو وەڵامیشی داونەتەوەو بەدرۆی خستوونەوە، وەك لە زۆربەی ئایەتەکاندا هاتووە.. لەمبارەیەوە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ سبأ ﴾. واتە: ئەوانەی بێباوەڕ بوون بە گاڵتەجاڕییەوە دەیانگوت: ئایا پیاوێکتان پێ بناسێنین، تا هەواڵی ئەو ساتەتان پێ بدات، کە کاتێك پارچەپارچەو هەپرُوون بە هەپرُوون دەبن لەنێو خاکدا، دوای ئەوە جارێکی دی سەرلەنوێ خەلق دەکرێنەوە.. ئایا ئەو درۆی لەسەر خوا هەڵبەستووە؟ یان تووشی شێتی یەك بوو؟ نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوانەی، کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی (آخرة) نیە، ئەوانە لە سزاو گومڕایی یەکی فراوان دان..

هەروەها قورئان چەندین نموونەی لەسەر زیندووکردنەوە هێناوەتەوە، تاکو ئەم عەقیدەیە لە دڵو دەروونەکاندا بچەسپێنێت، ئەم نموونانەش چەندین بەڵگەی ڕاستو دروستی وان، کە لە پلەی بەرزترین جۆری ڕاستیو یەقین دانو دەرهاویشتەی واقیعی ژیانو ئەو شتانەی ترن، کە خەڵکی بە چاوانی خۆیان دەیانبینین و تیایاندا دەژینو هیچ ساتەوەختێکیش گومانی تیادا ناکەم.. هەندێك لە هەرە دیارترینی ئەو نموونانەش، کە لە بارەی زیندووکردنەوە لە قورئاندا هاتوون، وەك:

١- دروستکردنی ئاسمانەکان بەو قەبەیی و زەبەللاحی و بەرفراونیێتی یەیانەوە، هەروەها دروستکردنی زەویش بەو گەورەیی یەیەوە.. جا ئەو خوا بەهێزو بە توانایەی کە ئاسمانەکانی دروست کردووە، توانای لەسەر زیندووکردنەوەی ئەو مرۆڤە بچووك و لاوازەش هەیە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٣٣)﴾ الأحقاف.

٢- حاڵەتی زەوی لە پێش ئەوەدا کە ئاوی بەسەردا بێتە خوارەوەو کە چۆن مردوو وشکەو، چۆن دوای ئەوەی ئاوی بەسەردا دەبارێت ژیانی تێ دەکەوێتەوەو چەندەها جۆری ڕووەك و گژوگیای لێ سەوزو بەرهەم دێت.. جا ئەو خوایەی کە دوای مراندنی ئەو شتانە دەیانژێنێتەوە، توانای زیندووکردنەوەی مردووانیشی لەنێو گۆڕەکانیانەوە هەیە، وەکو فەرمووشیەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۚ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٣٩)﴾ فصلت.

٣- مرۆڤ خۆیشی، نموونەیەکی ترەو سەرنج بدات چۆن خوا لە نەبوو (عدم) دروستی کردووەو قۆناغەکانی ژیانیشی لەو کاتەوەی دڵۆپە ئاوێکی پاك (نطفة) بوون تاکو قۆناغەکانی نێو ڕەحمی دایك و پاشان قۆناغەکانی ژیانی لەسەر ڕووی زەوی و، دوای ئەوەش مردنی و ناشتنی لە ژێر خاکدا.. جا ئەو خوایەی کە مرۆڤی ئاوا دروست کردووەو لە قۆناغەکانی ژیانیدا سەرپەرشتی کردووە، توانای ئەوەشی هەیە کە لە ڕۆژی قیامەت دا زیندووی بکاتەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي

ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم
مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ
وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ
زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾
وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾ الحج ﴾.

٤- تواناو قودرەتی خوا لەسەر دروست کردنی شتە پێچەوانەو دژ بەیەکترەکان، بۆ نموونە خوا (شەوو ڕۆژ)ی دروست کردووە، هەروەها (تاریکیو ڕووناکی)و (ئاوو ئاگر)و (سەوزاییو وشکانی)و (ژیانو مردن)و توانای زیندووکردنەوەی مرۆڤیشی لە دوای مردنی هەیە، وەك لەمبارەیەشەوە فەرموویەتی: ﴿ وَضَرَبَ
لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ
أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا
فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن
يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن
فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ يس ﴾.

٥-لای خەڵکی ئاشکرایە کە پەیداکردنەوەو پێك هێنانەوەی شتێك لە جاری دووەمداو لەلایەن مرۆڤێکەوە ئاسان ترە لەلای وەك لە پێکهێنانی جاری یەکەمی. قورئانی پیرۆزیش ئەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرەی کردۆتە بەڵگەیەك لەسەر زیندووکردنەوە، خواش یەکەم جار مرۆڤی دروست کردو لە نەبوو (عدم)یشە پێکی هێناو، دەشتوانێت کە بۆ جاری دووەم بۆ گیانی بگێڕێتەوەو سەرلەنوێ زیندووی بکاتەوە. چونکە گێڕانەوەکە ئاسانترە لە دروست کردنو

پێکهێنانی یەکەم جار. ئەمە سەبارەت بە مرۆڤ، بەڵام سەبارەت بە خوا هیچ سەختی یەکی لە بەردەم دا نیە، چونکە هەموو شتێك لەلای ئاسانەو خوازیاری هەرکارێك بێت توانای ئەنجام دانیی هەیەو هیچ شتێکیشی نە لە زەوی‌و نە لە ئاسماندا لەلا قورس‌و گران نیەو هەر پێی بفەرمویێت ببە، ئیدی دەبێت، وەك فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُا۟ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ الروم﴾.

٦- قورئانی پیرۆز بەڵگەیەکی تری کردەیی ڕۆژانەی دیاری کردوە کە ڕۆژانە بەسەر هەر کەسێکماندا ڕوودەدات، ئەویش مەسەلەی خەوتن‌و بێداربوونەوەیە. هەریەکێك لە ئێمە لە ڕۆژەکەیدا کاردەکات‌و، لە شەویشدا وەنەوز دەیگرێت‌و خەوتن کۆنترۆڵی دەکات‌و، دەخەوێت. کاتێك دەشخەوێت، وەك مردوو وایەو گیان لەلاشەی دەردەچێت‌و کاتێك لە خەو هەڵدەستێت خوا گیانەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوەو لەو جۆرە مردنەی زیندووی دەکاتەوە. بێگومان خەوتنیش مردنەو، لەخەوهەستاندنیش زیندووکردنەوەیە. جا ئەو خوایەی کە ڕۆژانە ئەم ڕووداوە بەسەر هەر یەکێك لە ئێمەدا دێنێت، ئەوا توانای ئەوەشی هەیە، کە لە ڕۆژی قیامەتدا مردووەکان زیندوو بکاتەوە.

خوا لەمبارەیەشەوە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ الأنعام﴾.

هەر لەمبارەیەوە خوا فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِى لَمۡ تَمُتۡ فِى مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوۡمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ الزمر﴾.. واتە هەر

خوایــە کــە گیانــەکان لــەکاتی مردنیانــدا دەکێــشێت، ئــەو گیانــەش کــە لــە خەوەکەیدا نەمرد، خوا هەر بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەو کەسەش کە خــوا بڕیــاری مردنی بۆ دابێت، ئەوا ڕۆحەکەی دەگرێتــەوەو، بــۆ لاشــەی ناگەڕێتــەوە، ئــەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبوو بێت، بۆی دەنێرێتــەوە تــا کــاتێکی دیــاریکراو. بەڕاستی لەمەدا چەندین بەڵگەو نیشانە بۆ کەسانێك هەیە کە لە بیرکردنــەوەو لەم دیاردانەی قودرەتی خوا تێفکرن.

٧- قورئان چــەند موعجیزەیــەکی خواییــشی وەك بەڵگــە لەســەر زیندووکردنــەوە پیــشان داوە، لەمبارەیــەوە خــوا فەرموویــەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ ... (٢٤٣) البقــرة ﴾. پێشتر مانای ئەم ئایەتەمان لێك دایەوە.

هەروەها ئەو بەسەرهاتەش لەگەڵ (ئیبراهیم)دا -سڵاوی لێ بێت- کە دەربــارەی زیندووکردنەوەیەو خــوا پــێی فــەرمووە: ﴿ ...قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ... (٢٦٠) البقرة ﴾

یان ئەو بەســەرهاتەش لەگــەڵ ئــەو پیــاوە ئیمانــدارەی بــەلای شارۆچــکەکەدا ڕەتبــووەو گوتوویــەتی: ﴿ ...قَالَ أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ... (٢٥٩) البقرة ﴾.

هەروەها ئەو بەســەرهاتەش لەگــەڵ هــاوەڵانی نێــو ئەشــکەوتەکەدا (اصحاب الکهف) کە خوا بــۆ مــاوەی سێســەدو نــۆ ســاڵ مرانــدبوونیو پاشــان زینــدووی کردبوونەوە: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا (١٢) الکهف ﴾.

## چەند جۆرە خوێندنەوەیەك بۆ وشەكانی ئەم ئایەتە

چەند جۆرە خوێندنەوەیەك بۆ سێ وشەی نێو ئەم ئایەتە هەیە، ئێمەش لێرەداو لە كتێبی (حجة القراءات)ی (ابن زنجلة)وە ئەو جۆرە خوێندنەوانەو ئاراستەكانیان دیاری دەكەین:

خوێندنەوەی یەكەم/ فەرمایشتەكەی خوا لە وشەی (لَمۡ يَتَسَنَّهۡ )دا لە ڕستەی (فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ ).

ئیمام (ابن زنجله) لەمبارەیەوە گوتوویەتی: "هەر یەكە لە مامۆستایان (حمزە)و (كیسائی) وشەی (لَمۡ يَتَسَنَّهۡ )یان بە (لَمْ يَتَسَن) خوێندۆتەوە، واتە بەلابردنی پیتی (ها) لە گەیاندندا، بە مانای (لم تغیره السنون/ سالانو ڕۆژگار نەیانگۆڕیون)، پیتی (ە)ش زیادەیە بۆ ڕاوەستان.

بەڵگەشیان لەسەر ئەم جۆرە ئەوەیە عەرەبەكان بۆ كۆی ساڵ (سنة) وشەی (سنوات) بەكاردێنن، لە بچووك كردنەوەشیدا (سُنَيّة) بەكاردێنن، ئیدی (ها= ە)ی (لَمۡ يَتَسَنَّهۡ ) بۆ ڕوونكردنەوەی بزووتنە لە حاڵەتی ڕاگرتندا.

جا ئەگەر خوێنەر بە خوێندنەوەكەی بگات، ئەوا پیتی (نون)ەكەش بەوەی دوای خۆیەوە دەلكێتو، لەو حاڵەتەشدا ئاتاجی بە دركاندنی (ها)ەكە نەماوەو، لایشی بردووە لەبەر نەمانی ئەو هۆیەی، كە لە پێناویدا خرابووە سەری. لەم بنەڕەتەشدا (لَمْ يَتَسَنَّى) بووەو (ئەلفەكە) بۆ ڕاگرتن لابراوە.

(الفراء)یش دەیگوت: (لَمۡ يَتَسَنَّهۡ ) بە مانای (لم یتغیر)ەو وەك لە فەرمایشتێكی تری خوا (مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ) هاتووە، كە بنەڕەتەكەی (لَمۡ يَتَسَنَّهۡ )یەو پاشان (نوون)ی كۆتایی بە پیتی (یا) هەڵگێڕراوەتەوە، تاكو بارگرانیی سێ نوونی یەك لەدوای یەك سووك كرێت.

زانایانی تریش هەر بە (لَمْ يَتَسَنَّهْ) خوێندوویانەتەوە، واتە بە جێگیرکردنی پیتی (ها=ه) لە گەیاندندا، ئەمەش بە مانای ئەوەی (ساڵانی بەسەردا نەهاتووە)، چونکە پیتی (ها =ه)ەکە لەسەر (لام الفعل) دادەنرێت‌و حاڵەتی (سکون)ەکەیشی هێمای ڕاگرتن (جزم)ە.

بەڵگەشیان ئەوەیە عەرەب دەڵێن: (سانهتُ مسانهة) بە مانای (بەپێی ساڵ مامەڵەم کردوە)و لە بچووك کردنەوە (تصغیر)یشیدا (سنيهة)یە، هەر بۆیەش (ها)ەکەیان لەگەیاندن (وصل)دا داناوە، چونکە (لام الفعل)" [۱].

پوختەی ئەو دوو خوێندنەوەیەش ئەوەیە ئەوان لەسەر ئەو فەرمانە ڕابردووە (الفعل الماضي) ناتەبان، کە فەرمانی ڕانەبردوو (الفعل المضارع)ی (يتسنه)ی لێ وەرگیراوە.

لەلای (حمزە)و (کسائی) فەرمانەکە (سَنَنَ)یەو ڕانەبردووەکەشی (يَسنَنُ)وەو پیتی (ها) تیایدا جێگیرو چەسپاوە، هەروەها مانای نەگۆڕراو (لم يتغير)یشی هەیە.

خوێندنەوەی دووەم: فەرمایشتی خوا وشەی (نُنشِزُهَا) لە ڕستەی (كَيْفَ نُنشِزُهَا)ت.

(ئیمام ابن زنجلە) لە کتێبەکەیدا لەسەر خوێندنەوەی ئەم وشەیەش گوتوویەتی: "هەریەکە لە مامۆستایان (نافع)و (ابن کثیر)و (ابو عمرو) بە وشەی (نَنشِرُهَا)یان خوێندۆتەوە، واتە لەجیاتی پیتی (ز) پیتی (ر)یان تیادا خوێندۆتەوە، ئەمەش بە مانای (کیف نحییها/ چۆن زیندووی دەکەینەوە؟ یان ئاوا زیندووی دەکەینەوە).

بەڵگەشیان بۆ ئەم بۆچوونە فەرمایشتێکی پێشتری خوایە لەو ئایەتەدا: ﴿أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾؟ جا ئەگەر بە پیتی (زای= ز) وشەی (نُنشِزُهَا) بخوێنرێتەوە، ئەوا ماناکەی دەبێتە (کیف نرفعها من الأرض الی الجسد) چۆن ئێسقانەکان لە

---

١) حجة القراءات لأبن زنجلة/ ص١٤٢-١٤٣

زەوی یەوە بۆ سەر لاشەکان بەرز دەکەینەوە)، ئەمەش لەبەر ئەوەی پیاوەکە گومانێکی لەسەر بەرزکردنەوەی ئێسقانەکان نەبوە، بەڵکو گومانی لەسەر چۆنیەتی زیندووکردنەوەی مردووەکان هەبووە، بۆیەش پێی گوتراوە: (انظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نحييها)، گەر بە پیتی (را) پێی گوترابێت، واتە: تەماشای ئێسقانەکانیش بکە چۆن زیندوویان دەکەینەوەو دوای مردنیان گیانیان لەبەردا دەکەینەوە؟

ئەوانی تریش لە زانایان بە پیتی (زای)و بە (كَيْفَ نُنشِزُهَا) خوێندویانەتەوە، ئەمەش بەواتای بڕوان چۆن ئێسقانەکان بەرزدەکەینەوەو گۆشتیان دەخەینەوە سەر.. بەڵگەشیان لەسەر ئەم جۆرە خوێندنەوەیە، فەرمایشتەکەی خوایە لەم ئایەتەدا: ﴿وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا﴾، چونکە وەسفی ئێسقانەکان وا دەکرێت، کە پێکەوە دەبەسترێنەوەو هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان کۆدەکرێنەوە، ئەگەر لە حاڵێکدا خۆشیان وەسفی ژیانیان بۆ نەکرێت.

بەڵگەیەکی تریش لەمبارەیەوە، فەرمایشتی ﴿ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا﴾، کە ئاماژە دەکات بۆ ئەو حاڵەتەی کە بێگومان ئێسقانەکان پێش ئەوەی بە گۆشت داپۆشرێن زیندوو نین، چونکە ئەگەر ئێسقان گۆشتی لەسەر نەبێت، ئەوا زیندوو نیە، جا کاتێك فەرموویەتی: (ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا) ئەوا بەوە زانراوە، کە خوا گیانی پێ نەبەخشیوە، هەتا گۆشتی بەبەردا نەکردبێت"[1].

بە هەرحاڵ، بە پوختی ئەوەیە، کە یان بە (ڕا)و بە (ننشرها) دەخوێنرێتەوە، کە بە مانای (زیندووکردنەوە)یە، واتە بێگومان خوا ئێسقانەکانی زیندوو کردۆتەوە وای لێکردوون ژیانیان تێدا پەیدا ببێت. یان بە پیتی (زای)و بە (ننشزها) دەخوێنرێتەوە، کە لە چاوگی (نشوز)ەوەیەو مانای (الارتفاع/ بەرزکردنەوە) دەگەیەنێت، واتە بێگومان خوا ئێسقانەکان هەڵدەگرێتەوەو لە زەوییەوە بەرزیان دەکاتەوەو پێکیانەوە دەبەستێتەوەو، پاشان گۆشتی دەخاتەوە سەر.

---

١) حجة القراءات/ ص١٤٤.

<u>خوێندنەوەی سێیەم/</u> فەرمایشتەکەی خوا له وشەی (أَعْلَمُ)و له ڕستەی (أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ )دا، که هەر لەم لایەنەو لەم بارەیەوە ئیمام (ابن زنجله) گوتوویەتی: "هەریەکە لە مامۆستایان (حمزه)و (کسائی) بە (إعلم) خوێندوویانەتەوەو بەم ڕەنگە (قَالَ إِعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) واتە: فەرمووی بزانە، که خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە. ئەمەش بە مانای ئەوەی، که فەرمانەکە لەلایەن خواوە جەختی کراوەتە سەر. پاساوی ئەم دوو زانایەش لەسەر ئەم جۆرە خوێندنەوەیە، خوێندنەوەی (ابن مسعوده)، که ئاوای خوێندۆتەوە: (قِيلَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) واتە: گوترا دە بزانە، که خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.. هەروەها (ابن عباس)یش بە (قال إعلم) دەیخوێندەوەو، دەیشیگوت: (ئەی ئایا ئەم پیاوە باشترە، یان (ابراهیم)، که پێی گوتراوە (وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) واتە: ئەی ئیبراهیم، بزانە که بێگومان خوا سەروەرو دانایە لە کاروباری خۆیدا).

پاساوێکی تر: گونجاندنی نێوانی ئەم ڕستەیەو تەواوی ڕستەکانی پێشووترە، ئەوەبوو هەموو ئەوانی پێشوو بە فەرمان پێکردن (أمر) هاتبوون، وەك (فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ )و (وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ ) و(وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ)، بە هەمان شێوەش فەرمانی (أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ ) ئەگەر لە بۆتەی ئەو فەرمانانەدا بێت.

هەر لەمبارەیەوە (زجّاج) گوتوویەتی: "هەرکەسێك بە (إعلم) بیخوێنێتەوە، ئەوا لێکدانەوەکەشی ئاوایە، که ئەو کەسە خۆیشی ڕوو دەکاتە خۆیو دەڵێت بزانەی ئەی مرۆڤ، که بێگومان خوا توانای لەسەر هەموو شتێك هەیە.

زانایانی تریش بە (أعلم)و بە ڕستەی (قال أعلم) خوێندویانەتەوە، واتە بە هێنانی هەواڵەکە لە خودی بگۆو قسەکەرەکە (المتکلم)ەوە.

پاساویشیان ئەوەیە، که لە تەفسیرەکە وەرگێڕاوەتەوەو گوتوویانە، کاتێك ئەو پیاوەی چۆتە ناو ئەو شارۆچکەیەو ئەوەیشی، که لە توانای خوادا بەدیی کردووەو

بەچاوی خۆی بینیویەتی، ئنجا گوتوویەتی: ئەوا ئێستا دەزانم کە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە (قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ). بۆیە ئەو زانایانە گوتوویانە: (هیچ ئاڕاستەیەکی وا نەماوەتەوە کە فەرمانی پێ بکرێت لەسەر ئەوەی، کە خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، چونکە پیاوەکە بە چاوی خۆی ڕووداوەکانی بینیوەو تەماشای ئاسەواری توانای خوای کردووەو، بەم هۆیەشەوە ئەمەی لێ دەفامرێتەوە، کە لە جیاتی ئەوەی ئەو فەرمانەی پێ‌کرابێت تا وابلێت، بەڵکو خۆی بەو ڕاستی یە گەیشتووەو وای دەربڕیوە.)

هەروەها (زجّاج) گوتوویەتی: ماناو لێکدانەوەی ڕستەی نێو فەرمایشتەکەی خوا (أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ) ئەوە نیە، کە ئیدی کابرا پێش دیتنی ڕووداوەکە نەیزانیبێت کە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، بەڵکو مانای ڕستەکە ئەمەیە: (ئەوەی من بەچاوی خۆم ئەوەی لەوەوپێش بە نادیاری دەمزانی، دیتمو زانیم)[1]".

جا بە کورتی ئەم ڕستەیە، یان (إعلم)ی فەرمانی داخوازی (فعل أمر)ەو، خوا فەرمانی پێ‌دەکات، کە ئەوەی دیویەتی، بیزانێت کە وایە، یاخود ئەو کەسەی خۆی فەرمان بەخۆی دەکات، کە بیزانێت، واتە بزانێت، کە خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.. یان ئەم ڕستەیە (أعلم)ی فەرمانی ڕانەبردوو (فعل مضارع)ەو بە مانای ئەوەی پیاوەکە دانی بەوە داناوە، کە خۆی زانیویەتیو لە ناخی خۆیەوە بڕیاری لەسەر باری ڕاستیی زانینەکەی داوە.

لە کۆتایی لێدوانیشماندا لەسەر ئە جۆرە خوێندنەوانەی نێو ئایەتەکە، دان بەو ڕاستی یەدا دەنێین، کە ئەم خوێندنەوانە لە خواوەنو بە بیروڕاو ئیجتیهادی خوێنەران (زانایان) نیەو، پێویستە جێی پەسند بنو دانانو یەکلاکردنەوەی جۆرێکیان شیاو نیە.

١) حجة القراءات: ١٤٤-١٤٥.

# پیاوەکە بۆ کام ئێسقانەی دەڕوانی؟!

خوا فەرمانی بەو پیاوە کرد، کە بۆ ئێسقانەکان بڕوانێت، وەك فەرمووی: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ﴾.

زانایانی تەفسیریش بیروڕای لێك جودایان لەسەر ئەو ئێسقانانە هەیە، کە خوا فەرمانی بۆ ڕوانینیان بە پیاوەکە کردووەو، کە ئایا ئێسقانەکانی خۆیەتی، یان ئێسقانەکانی گوێدرێژەکەی؟ هەندێك لە زانایان ڕایان وایە کە پیاوەکە بۆ ئێسقانەکانی خۆی ڕوانیوەو، گوتووشیانە کە خوا پلە بە پلە زیندوی کردۆتەوەو، یەکەم جار گیان بە بەر دڵیدا کراوەتەوەو، پاشان هەردوو چاوی‌و کە بەو دوو چاوەی تەماشای پەیکەرە ئێسکی یەکەی خۆی کردووەو دیویەتی تەنها چەند ئێسقانێکە بەبێ گۆشت، دواتر دیویەتی کە چۆن وردەوردە گۆشتیان خراوەتەوە سەر. بەڵام ئەم وتەیە جێی پەسند نیە، چونکە وا پێویست دەکات کە لەم حاڵەتەش دا چەند کارێکی دی بەسەر ئەم پیاوەدا هێنرابێت‌و، ئەمەش لە هیچ فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەردا ﷺ ئاماژەی بۆ نەکراوە، بۆیە وا دادەنرێت کە لە دەقە ئیسرائیلییەکانەوە وەرگیراوە.

بەڵام زانایانی لێکۆڵیار لە زانستی تەفسیر ڕایان لەسەر بەشی دووەمی پرسیارەکەیە، واتە لەسەر ئێسقانەکانی گوێدرێژەکە، چونکە خوا فەرمانی بە پیاوەکە کردووە کە بۆ دەوروبەری خۆی بڕوانێت تا ئەو موعجیزانەی خوا ببینێت دەلالەت لەسەر توانای خوا لە زیندووکردنەوەو ژیاندنەوەی مردوواندا دەکەن، لەو موعجیزانەش پێکەوە بەستنەوەی ئێسکەکانی گوێدرێژەکەو گۆشت لەسەر دانانی‌و زیندووکردنەوەی.

مامۆستا پێشەوا (سید قطب) دەڵێت: "چ ئێسقانێك بووە؟ ئایا ئێسقانەکانی کابرا خۆی بووە؟ ئەگەر مەسەلەکە ئاوابێت‌و ئێسقانەکانی خۆی بووبێت وەك چۆن هەندێك لە خاوەنانی تەفسیر وایانگوتووە، کە ئێسقانەکانی کابرا خۆی لە گۆشت

داماڵراوە، ئەگەر وابوایە ئەوا کاتێك بە خەبەر هاتۆتەوە، ئەمە سەرنجی ڕادەکێشاو تەزووی بە هەستیشیا دەهێناو، وەڵامەکەشی ئەوە نەدەبوو کە بڵێت من ڕۆژێك بەو حاڵەتی مردن- یان خەوتن- ەوە یان کەمتر لە ڕۆژێك تیایدا ماومەتەوە (لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ). هەر بۆیەش بەڕای ئێمە ڕاستتر ئەوەیە، کە گوێدرێژەکە ئێسقانەکانی داماڵراوەو گۆشتی پێوە نەهێڵراوەتەوە، پاشان وەك نیشانەیەك پیشانی داوەو، هەروەك لە هەمان ئایەتیشدا هاتووە، ئێسقانەکان خراونەتە پاڵ یەکدیو بە یەکدییەوە بەستراونەتەوەو گۆشتیشیان خراونەتەوە سەرو بۆ ژیانیان گێڕراونەتەوە، ئەمەش هەمووی لەبەرچاوی ئەو خاوەنەی (واتە لەبەر چاوی ئەو پیاوەی) کە لە ڕووداوەکەدا هیچی بەسەردا نەهاتووەو، خۆراكو خواردنەوەکەشی تێك نەچوونو تامیان ناخۆش نەبووە. تا ئەم جیاوازییەش لە چارەنووسو سەرنجامەکانیاندا بەدی بکرێت، لە کاتێکدا هەمووشیان لە یەك جێگەدانو وەك یەك کەوتوونەتە بەر کاریگەرییەکانی یەك کەشو ئاوو هەوا.. نیشانەیەکی دی لەسەر ئەو توانایەی، کە هیچ هەڵسوکەوت دەکاتو، تاکو پیاوەکەش پەی بەو حەقیقەتە ببات، کە خوا چۆن ئەو مەخلوقاتە دوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە[١]".

ساتێکیش لەبەردەم وشەی (کیف/ چۆن) لەو ڕستەیەی (وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا) دەوەستین، کە تیایدا داوا لە پیاوەکەش کراوە، کە لە ئاست چۆنیەتی بەرزکردنەوەی ئێسقانەکانو پێکەوە کۆکردنەوەیانو پێکەوە ڕێکخستنەوەیاندا بوەستێت، تا ببینێت چۆن بە ڕێکیو بە لەگەڵ یەکدا گونجانیانەوە پێکدەگەیەنرێنو، بۆئەوەی ببن بە پەیکەرێکی تەواوی ئێسکی، پاشان دوای ئەمەش گۆشتیان بەسەردا دادەپۆشرێتو، لەوێشدا کابرا بانگ کراوە بۆ هەڵوێستەکردنی لە ئاست (چۆنیەتی/ کیفیە)ی داپۆشینی ئێسقانەکان بە گۆشت.

---

١) في ظلال القرآن/ ١: ٣٠٠.

ئەم ئاراستەکردنەش بۆ تێرامانو سەرنجی ورد لەو چۆنیەتییە، سرووشی گرنگیی زانینی (چۆنیەتی) ڕاستی یەکانو ئەو دیاردە ماددی یانەشمان پێدەبەشخێت کە لە چواردەورماندانو، کە دەبێت بە وردی سەرنجیان بخەینە سەرو لە ڕووی ماددیو کردەیی(عملی)یشەوە شیکاریان بکەین.

وادیارە ئەم ئاراستە قورئانییەو، هاوشێوەکانی تریشی کە زۆرو فرەنو، داوای تێبینی کردنی چۆنیەتیی دیاردە ماددییەکان دەکەن، لە گەورەترینی ئەو هاندەرانەیە بۆ زانایانی موسڵمانان تاکو ڕووبکەنە چۆنیەتییەکان (کیفیات)ی زانستە ماددییەکانو هەڵوێستە لەسەر لایەنە وردو درشتەکانی بکەنو، لایەنە کردەیی یەکانی ئەو زانستانەش بخەنە پێش لایەنی تیۆریو زەینیو، مەنهەجێکی زانستییانەی ئەزموونیی مەتریالی (ماددی)ی پەیڕەوکاریی زانستەکانیش بخەنە گەڕو چەند هەنگاوێك تیایدا پێهەڵگرن پێش ئەوەی خۆری پێشکەوتنی زانستییان لێ ئاوابێتو لەسەر جیهانی ڕۆژئاوا هەڵبێت، کە ئەوان (واتە ڕۆژئاواییەکان) مەنهەجە ئەزموونکارییە زانستییەکەی موسڵمانانیان وەرگرتو، کردیانە بناغەی شۆڕشی زانستیی هاوچەرخی خۆرئاوا، چونکە قورئانی پیرۆزیش هانمان دەکات بۆ وەبەرنانی لایەنی زانستیی بەگەڕخراوی ئەزموونکاریو، بۆ تێرامانو هەڵوێستە لەسەر (چۆنیەتی) ڕوودانی دیاردە بوونەوەریو گەردوونییەکان.

وەك خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ ق﴾.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ الغاشية﴾.

## زانســت دوای ڕوون بوونــەوە

کاتێك ئەو پیاوە موعجیزەکانی خوای لەبەردەمیدا بینیو، زانی کە خـوا دوای سەد ساڵ لە مردنیی، زیندووی کردۆتەوەو، کە ئەم مەسەلەیەشی بـۆ ڕوون بـووەوە گوتی: (أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ).

ئێمەش ساتێك لەبەردەم ئەم ڕستەیەدا هەڵوێـستە دەکـەین تـاکو لـە هەنـدێك مانای سروش پێدراوی تێبگەین:

بێگومان پیاوەکە، باوەڕدارە بە توانای ڕەها (مطلق)ی خواو، هیچ گومـانێکی تیایدا نیە، لە کاتێکیشدا گوتوویەتی: (أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَا )، ئەوا هـیچ گومانێکی لە توانای خوا نەبووە، بەڵکو ویستوویەتی تاقیکردنەوەیـەکی کردەیـی واقیعی ببینێت، تاقیکردنەوەکەشی بـۆ ئـەنجام دراوە، تەنانـەت بـە تاقیکردنـەوە لەگەڵ کەسێتیی خۆیشیدا بەئەنجام گەیەنراوە. بەڵام بێگومان باوەڕی بە توانای خوا زیاتر بووە، دوای ئەوەی تێبینیو سەرنجی لەسـەر ئـەو تاقیکردنـەوە کردەیـی یـە جێگیر بووەو، ئیدی لەسەر ئەندێشەو حاڵەتی نەفسیی پێشووی نەماوەتەوە.

پاشان ئەم تاقیکردنەوە کردەیـیو مەیدانییـەش، زانیارییـەکی تێـرو تەسـەلو جێی دڵنیایی تـەواوو یـەکلاکراوەی پێبەخـشوەو، خـواش دەربـارەی شـوێنەوارو کاریگەریی ئەم زانیارییە هەواڵی پـێداوینو فەرموویـەتی: ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾.

بێگومان پیاوەکە زانیاریو متمانەو دڵنیایی تەواوی دەسـتکەوتووە، ئەمـەش باوەڕ (ئیمان)ی مرۆڤ بەهێز دەکاتو زیاتریشی دەکات. وا دیارە ئەمەش جڵەومان دەگرێت بۆ تێبینیکردنی شوێنەواری بەڵگەی زانستیو نموونەی واقیعیو، نیشانەی هەسـتیاریی لەمـەڕ سـەلماندنی ڕاسـتییە تیۆرییـەکانو ڕەگ داکوتانیـانو بـاوەڕ

پێهێنانیـــان، ئەمـــەش لـــەلای خـــەڵکی تێبینـــی کـــراوە. چـــونکە پزیـــشکیش زانیارییەکانی بە شێوەیەکی تیۆری (نظري)و زەینی دەمێننەوەو جێگیرو سەلمێنراو نابن تا ئەو کاتەی دەچێتە شوێنی کاری خۆیو نێو تاقیگاکـەو تاقیکردنـەوەکانی ئەنجام دەداتو بـە دەسـتی خـۆی ڕایاندەپـەڕێنێتو بـە هـەردوو چـاوی خۆیـشی چاودێریو تێبینییان دەکات. بێگومان هەمان نموونە دەربارەی ئەندازیارو شـوفێرو مامۆستاو خاوەن پیشەکانی تریش باس دەکرێت.

لە بەسەرهاتەکەی (ئیبراهیم)ی پێغەمبەری خواشدا -سـڵاوی لێ بێـت- لەگـەڵ ئەو باڵندانـەدا کـە دوای چیرۆکی ئـەم پیـاوە هـاتووە، ئاماژەیـەك بـۆ گرنگیـی ئەزموونی کردەیی (التجربة العلمية)و کاریگەریی لە باوەڕو زانستو ورەی بـەتینو دڵنیاییدا کـراوە، ﴿...فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٦٠)﴾ البقرة.

پیاوە باوەڕدارەکەش دوای ئەوەی موعجیزەکانی بینیوە، گوتوویەتی (أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). (ئیبراهیم)یش -سڵاوی لێ بێت- دوای تاقیکردنەوەکە خوا فەرمانی بە زانستو زانین پێدەکات: (وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)، ئەمەش وەك ئەوەی کە ئەم نموونە قورئانیانەش بانگمان بکات بۆ ئاوڕدانەوە لەو نموونەو بەڵگەو ئەزموونە کرداریی یانەی کـە پـشتگیری ڕاسـتیو سـەلماندنی زانیارییـە تیـۆریو زەینییەکان دەکەنو، کە دەبێت لە کاتی پیشاندانی ڕاستییەکانی ئایینو باسەکانیدا بەکاریان بێنین.

## (سيد قطب) به‌رپه‌رچی مه‌تریالیسته‌كان ده‌داته‌وه‌

زانای پێشه‌وا (سيد قطب)-ره‌حمه‌تی خوای لیّ بێت- هه‌ڵوێستێكی نایابی له‌م مه‌سه‌له‌یه‌دا گرتۆته‌ به‌رو، چیرۆكی (ئه‌و پیاوه‌ی به‌لای شارۆچكه‌كه‌دا تێپه‌ڕیوه‌)و موعجیزه‌ خواییه‌كانی نێو ئه‌م چیرۆكه‌شی، كه‌ ده‌رباره‌ی زانینی قودره‌تی خوان له‌سه‌ر مردنو ژیانن كردۆته‌ هه‌لێكی گونجاو بۆ موناقه‌شه‌و به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی مه‌تریالیسته‌كان (مادده‌په‌رسته‌كان). له‌مباره‌یه‌وه‌ مشتومڕی له‌گه‌ڵ ئه‌و مادده‌په‌رسته‌ بێباوه‌ڕانه‌دا كردووه‌ كه‌ نكووڵی له‌ توانای خواو له‌ زیندووكردنه‌وه‌ی دوای مردن ده‌كه‌ن، نكووڵیش له‌ بوونی خوا ده‌كه‌ن..

لێره‌شدا وته‌كانی (سيد قطب) ده‌رباره‌ی مشتومڕو به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی مه‌تریالیسته‌كان دیاری ده‌كه‌ین، كه‌ گوتوویه‌تی:

"ئاخۆ چۆن ئه‌و كاره‌ مه‌زنه‌ له‌ ئاسایی به‌ده‌ری وه‌ك موعجیزه‌كان ڕویداوه‌؟ دیاره‌ وه‌ك هه‌ر كارو موعجیزه‌یه‌كی ئاوا ڕویداوه‌، وه‌ك چۆن موعجیزه‌ی ژیانی یه‌كه‌میش په‌یدا بووه‌، ئاوا بووه‌، جا ئه‌و موعجیزه‌یه‌ی به‌ ڕاده‌یه‌كی گه‌وره‌ له‌ بیرمان چۆته‌وه‌، كه‌ ڕویداوه‌و، كه‌ ناشزانین چۆن ڕویداوه‌و، چۆن هاتۆته‌ ئاراوه‌، به‌ڵام ده‌زانین له‌لایه‌ن خواوه‌ هاتۆته‌ ئاراوه‌و، به‌و شێوازانه‌ش بووه‌، كه‌ خوا خواستی له‌سه‌ریان بووه‌. به‌ڵام (داروین)ی گه‌وره‌ زانای (ژیانناسی) به‌رده‌وام پله‌ به‌پله‌ له‌ تیۆرو بیردۆزه‌ی خۆیدا داده‌به‌زیو ده‌هاته‌ خوارو قۆناغ به‌ قۆناغیش له‌ بنو قوڵاییه‌كانیدا ڕۆ ده‌چوو، تا گه‌یاندی یه‌ خانه‌ی یه‌كه‌مو پاشان له‌وێدا وه‌ستاوه‌. بێگومان ئه‌و -واته‌ داروین- سه‌رچاوه‌ی ژیانی له‌و خانه‌ی یه‌كه‌مه‌دا نه‌ده‌زانی، به‌ڵام نه‌یده‌ویست دان بنێت به‌و ڕاستییه‌دا، كه‌ پێویسته‌ هۆشو ژیریی مرۆڤایه‌تی دانی پیّ دابنێت، كه‌ به‌ ڕاده‌یه‌كی به‌هێز جه‌خت ده‌كاته‌ سه‌ر لۆژیكی خۆیی (المنطق الفطري)، كه‌ بێگومان هه‌رده‌بێت پیّبه‌خش (واهب)ێكی هه‌بێتو، ژیانی به‌م یه‌كه‌م

خانەیە بەخشیبێت.

هەروەها ئەو (داروین) نەیویستووە دانی پێدانێت، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکی نازانستی نەبووە، بەڵکو چەند هۆیەکی مێژوویی ی لە ململانێی خۆی لەگەڵ کەنیسەدا تێدا هەبووە، هەر بۆیەش گوتوویەتی: بێگومان لێکدانەوەی کاروباری ژیان بەوەی کە بوونی خوایەکی پێوە بەندە، وەك تێهاویشتنی ئۆرگانێکی سنووربەزێنی سرووشتە لە بارێکی ڕووتی میکانیکیدا.

بەڵام داخۆ چ بارێکی میکانیکی بێت؟ دیارە (شێوازی میکانیکی) دوورترین شتە لەو مەسەلەیەی کە گریمانێك بەسەر پەیبردن (ادراك)دا دەسەپێنێت. واتە گریمانی ئەوەی بەدوای سەرچاوەیەکی ئەو نهێنی یە جێگیرەدا بۆ چاوەکانو ڕێبازەکانی بەرچاو ڕوونیدا بگەڕێت. دیارە (داروین) خۆیشی خۆی لە ژێر فشاری لۆژیکی خۆی (فیطری) قوتار کردوە، کە (پەی بردنی مرۆڤایەتی) ناچار دەکات بۆ دان نان بە نهێنییەکانی پشت خانەی یەکەمدا، بەڵام هەموو شتێك بۆ (هۆی یەکەم) دەگەڕێنێتەوە، بێئەوەی بڵێت ئەم هۆیەی یەکەم چیە؟ ئەی ئاخۆ ئەم هۆیە چۆن خاوەنی پرۆسەی دۆزینەوەی ژیانە لە یەکەم جاردا؟ پاشان بەپێی ئەو بیردۆزەو تیۆرەی خۆی -کە جێی ڕامانو سەرنجی درێژە لەسەری- چۆن خانەی یەکەمی لەو ڕێگەیەدا داناوە، کە گریمانی ئەوەی بۆ دەکات، گوایە بەبێ ڕێگایەکی دیو تەنها بەم ڕێگەیە سەرکەوتووە، بەڕاستی ئەم تیۆرو بۆچوونەش، تەنها هەلاتنو مشت ومڕو مەحاڵە. هەر لێرەشدا دەگەڕێینەوە بۆ سەر موعجیزەی شارۆچکەکەو دەپرسین: چۆن لێك دەدرێتەوە، کە بەلاو کارەسات - لە یەك جێگاو لە یەك کاتیشدا- شتێك بهێنێتە دیو، شتێکی دیکەش فەرامۆش کات؟! بێگومان ڕووداوی نائاساییو (موعجیزە ئاسا)ی وەك خولقاندنی ژیان لە یەکەمین جاردا، یاخود موعجیزەی گەڕاندنەوەیشی، تەفسیری لێك جودایيو جیاوازیی نێوان چارەنوسی شتەکان لە یەك بارودۆخ دا ناکات، جا ئەوەی تەفسیری ئەم دیاردەیەش دەکات، ڕەهایی خواستەکە (طلاقة المشيئة)ی خوایە، ئەو ڕەهایی یەی، کە دابڕاوە

له هەر پابەندی یەك لەو پابەندییانەی، که ئێمه بەو یاسا گشتیو ئیلزامییانەی دادەنێین که هیچ بوارێکیان بۆ سەرپێچی لێکردن، یان جیاکردنەوه تێدا نیه. ئەم حساباتو مەزەندەکارییانەی ئێمەش به بەراورد لەگەڵ (خواستی ڕەهایی خوادا) هەڵەیەو هەڵەیەکی بێئاگاییانەیه لەوەی، که ئێمه نرخاندنو هەڵسەنگاندنو بۆچوونه عەقلانی، یان زانستییەکانیشمان بەسەر خوای پاكو بێخەوشدا دەسەپێنین، ئەم هەڵەیەش له چەندین هەڵەی زۆری تردا ڕەنگ دەداتەوه، وەك:

یەکەم/ ئەوەی گوایه بۆمان هەبێت قدرەتی ڕەهاو بێقەیدو مەرجی خوا به یاسایەکی گونجاوی خۆمانەوه ببەستینەوه، یاسایەك که له چەند تاقیکردنەوەیەکی سنووورداری خۆمانەوه سەرچاوەی گرتبێتو، پاشان له تەفسیرکردنمان بۆ ئەو تاقیکردنەوانەوه له کاتێکدا توانای زانینو پەی بردنیشمان سنووورداره.

دووەم/ خوا گەر یاسایەك له یاساکانی گەردوونی بەخشیبێت، ئەوا پەیمان پێ بردوه، ئیدی کێ پێی گوتووین ئەوه یاسایەکی گشتگیرییو دواییو ڕەهایه، که هیچ یاسایەکی تری له پشتەوه نیه؟

سێیەم/ هەروەها، که یاسایەکی دواییو ڕەهاشی پێ بەخشیبێت، ئەوا بێگومان خواستی ڕەهاو سەربەستانەش یاسا دادەمەزرێنێت، بەڵام بەو یاسایەوه پابەند نیه، بەڵکو له هەموو حاڵەتێکدا هەر هەڵبژاردنو دەستنیشانکردنی ئازادانەیه[1]".

---

١) سید قطب- في ظلال القرآن/ ١: ٣٠٠-٣٠١ .

# چیـرۆكی سـێیەم

## چیـرۆكی هـەردوو كوڕەكـەی ئـادەم

چیرۆكەكە لە قورئاندا، بەم شێوەیە هاتووە، كە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ
يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْءَاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ
يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ
أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾
فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا
يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ
مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ
كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ
فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا
وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ
لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ المائدة ﴾.

کورتەی مانای ئایەتەکان..

واتە: ئەی پێغەمبەر، هەواڵو بەسەرهاتی هەردوو کوڕەکەی ئادەمیان بۆ بگێڕەرەوە کە بەڕاستی ڕووی داوەو، ئەوەیە کاتێك هەردووکیان قوربانییان پێشکەش بەخوا کردو، قوربانیی یەکێکیان پەسند کرا -کە بێگومان خواپەرستو دادپەروەر بوو-، بەڵام قوربانیی ئەوی دیکەیان وەرنەگیرا -کە دیارە خوانەناسو لادەر بووە-، کاتێك قوربانیەکەشی پەسند نەکراوە، بە براکەی گوتووە: دەبێت بتکوژم.. ئەویش لە وەڵامی هەڕەشەکەیدا پێی گوتووە: بێگومان خوا تەنها لە کەسانی لەخواترسو خواپەرست، قوربانیو کاری چاکە پەسند دەکات. جا بەخوا ئەگەر دەستت بۆ سەرم درێژکەیت بە نیازی ئەوەی بمکوژیت، ئەوا من دەست درێژ ناکەم بە نیازی ئەوەی تۆ بکوژم، بەڵکو من لە خوای پەروەردگاری جیهانییان دەترسم. بۆیە من بەم هەڵوێستەی خۆم دەمەوێت گوناهی منو گوناهی خۆیشت لەئەستۆ بگریت، ئینجا یەکێك لە کەسانی شایستەی دۆزەخ دەبێتو هەر ئەمەشە سزای ستەمکاران.. ئیدی لە دواییدا برا شەڕخوازەکە بەهۆی دەروونی خراپەکارییەوە هاندراو ئەم کاری کوشتنەی بۆ سادە وسانا کراو براکەی خۆی کوشت، بەمەش خۆی خستە ڕیزی خەسارەتمەندەکانەوە. بەڵام دوای کوشتنی براکەی، نەیدەزانی چۆن تەرمی براکەی بشارێتەوە، چونکە یەکەم کەس بوو، کە کوژراوەو مردووە، بۆیە خواش قەلەڕەشێکی بۆ نارد، کە لەبەرچاوی ئەودا چاڵێکی لە زەوی بۆ قەلەڕەشێکی مردارەوەبوو هەڵکەند، تاکو نیشانی بداتو فێری بکات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە. ئەم برا بکوژو شەڕخوازەش (واتە -قابیل) کاتێك دیمەنی ئەو قەلەڕەشەی بینی، گوتی: ئەی قوڕ بەسەرم، ئەوە بۆچی من دەستەپاچە بوومو بەقەد ئەو قەلەڕەشەش لێهاتوو نەبوون تا بتوانم تەرمی براکەم لە خاکدا بشارمەوە.. پاشان تا ئەبەد چووە ڕیزی پەشیمان بوانەوە.

جا بۆ ئەوەی بەسەرهاتی نابەجێی لەم چەشنە ڕوونەدات، ئێمە ئەو بڕیارەمان لەسەر (بەنی ئیسرائیل) نووسی، کە هەرکەسێك کەسێکی دی بە ناحەق بکوژێتو

لە جیاتی کوژراوێکی دی نەیکوشتبێتەوە، یان هەر کەسێك تاوانو کاری تێکدەرانەی تری لەسەر زەویدا ئەنجام دابێت، ئەوە وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی سەر زەوی کوشتبێت. هەرکەسێکیش کەسێکی دی لە مردن ڕزگارکات، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکیی سەرزەمینی لە مردن ڕزگار کردبێتو ژیانی پاراستبێ. بێگومان ئێمە هەموو پێغەمبەرانمان بە بەڵگەو نیشانەی دیارەوە بۆ خەڵکی ناردووە تاکو خەڵکی سەرزەوی پابەندی ڕێگەی ڕاستو دادپەروەری بن. بەڵام زۆربەیان دوای ئەوەش لەسەر زەوی خراپەکارو لە ستەمدا ڕۆچووبوون.

## سەرکەوتنی شەیتان لە فریودانی کوڕەکەی ئادەم دا

شەیتان دوای ئەوەی سەرپێچی لە خوا کردو سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد، بەڵێنێکی توندی لەبەردەم خوادا بەسەر خۆیدا سەپاند، کە دەبێت هەموو هەوڵو کۆششێکی خۆی بۆ فریودانی ئادەمیزاد بخاتە کار، وەك لە قورئاندا خوا لەسەر زاری شەیتانەوە هێناویتی کە لەبەردەم خوادا گوتی: ﴿قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ الأعراف﴾[1].

جا کاتێك خوا ئادەمو شەیتانیشی هەڵدایە خوارێ بۆ سەر زەویو، ئادەمیشی لە دوژمنایەتیی شەیتان ئاگادار کردەو، کە دوژمنێکی دیاری خۆیو

---

١) واتە: شەیتان گوتی: خودایە بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد، سوێند بێت لەسەرم منیش لەڕێگە ڕاستەکەی تۆدا بۆسەیان بۆ دابنێمو پاشان سوێندو پەیمان بێت بەردەوام فریویان بدەمو، لەبەردەمیانەوەو، لە پشتیانەوەو، لەلای ڕاستیانەوەو، لەلای چەپیانەوە بۆیان بێمو -بیانخەڵەتێنمو لەڕێی ڕاست لایان دەم-، ئیدی تۆش نابینیت، کە زۆربەی بەندەکانت لە ئادەمیزاد سوپاسگوزارت بن.

نەوەکانیەتیو، هەروەها خوا ئادەمی لەو دژایەتییە توندەی شەیتان وریاکردەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ الأعراف ﴾[1].

هەروەها خوا فەرمانی پێکردووین کە شەیتان بە دوژمن دابنێینو وەسوەسەو چرپەو هۆکارە خراپکارییەکانی وریا ببینەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ فاطر ﴾[2].

(ئادەم)یش -سڵاوی لێ بێت- پێغەمبەرێك بوو كە خوا ناردبووی بۆ لای كوڕەكانیو نەوەكانی تاكو خوایان بەیادخاتەوەو لە شەیتانیش وریایان كاتەوە. بەڵگەش لەسەر پێغەمبەرێتیی ئادەم ئەم وتو وێژەی نێو فەرموودەیەكی پێغەمبەرە ﷺ لە نێوان (ابوذر الغفاري) -خوا لێی ڕازی بێت-و پێغەمبەری خوادا ﷺ، (ابوذر) پرسیویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ژمارەی نێردراوانی خوا چەندە؟.. ئەویش فەرموویەتی: سەدو بیستو چوار هەزار.. ئنجا لێی پرسیوە: ئەی ژمارەی پێغەمبەران (رسل)یان چەندە؟.. فەرموویەتی: (سێسەدو سیازدە پێغەمبەر-واتە نێردراوی خاوەن پەیام- بوون.. دووبارە (ابوذر) لێی پرسیوە: ئەی یەكەم كەسیان كێ بووە؟ پێغەمبەریش لە وەڵامدا فەرموویەتی: ئادەم بووە؟ دواتر

---

١) واتە: دەخیل ئەی نەوەی ئادەم، وریابن شەیتان ئێوەش تەفرە دەدات وەك چۆن باوكو دایكتانی تەفرەداو لە بەهەشتدا بە دەركردنی دان، كە ئەوەبوو دەستی كرد بە داماڵینی پۆشاكەكانیان تا عەورەتیان پیشانی یەكدی بدات. جا بێگومان شەیتان خۆیو داروودەستەكەشی ئێوە دەبینن لە شوێنێكدا كە دنیایەو بەڵام ئێوە نایانبینن، ئێمەش شەیتانەكانمان تەنها كردووە بە هاوڕێو یاوەری ئەوانەی كە بێباوەڕ بوون.

٢) واتە: بێگومان شەیتان دوژمنتانەو ئێوەش بە دوژمنی دابنێن، چونكە شەیتان تاقمەكو داروودەستەكەشی هان دەدات بۆ ئەوەی شایستەی دۆزەخ بن.

(ابوذر) پرسیویەتی: ئایا ئادەم پێغەمبەرێکی خـاوەن پـەیام بـووە؟ فەرمـوویـەتی: بەڵێ، خوا بـە دەسـتی خـۆی خـەڵقی کـردووەو، پاشـان لـە ڕۆحـی خـۆی فـووی پێداکردووەو گیانی بەبەردا کردووە[1]..

شەیتانیش ئەرکە شەیتانییەکەی خۆی، دژی کـوڕو نـەوەکانی ئـادەم جێبـەجێ کردوەو، وەسوەسەی لە دڵیاندا کردوەو، کاری خراپو سەرپێچیی یاخیبوونی لـەلا ڕازاندوونەتەوە.. شەیتان لە کاری لەخـشتەبردنو گـومڕاکردنی کـوڕێکی ئادەمـدا سەرکەوتوو بووەو توانیویەتی بەسەر بیرو هۆشـیدا زاڵ بێـتو بیخاتـە نێـو ڕیـزی خۆیەوەو، بۆ نێو شەڕو کوشتاری بەکێش کات، کە تاوانی کوشتنی براکەی بـووە. ئەم ئایەتانەی پێشووش چـیرۆکی ئـەم کـوڕە گومڕایـەیان گێڕاوەتـەوەو، هـەواڵو بەسەرهاتی ئەو تاوانە دڕندانەیەشیان پێ گەیاندووین، کە بـە ڕێنمـاییو فـەرمانی شەیتان ئەنجامی داوە.

## چیـرۆکـەکە لە دەقە ئیسـرائیـلـیـیەکاندا

هەندێك کەس لە ڕاڤەکارو مێـژوونووسو ئەوانـەی هـەواڵو بەسـەرهاتەکانیان گێڕاوەتەوە، چەند ڕیوایەتو هەواڵێکیان لەمەڕ چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی (ئـادەم) لە چەند دەقێکی ئیسرائیلییو ئەفسانەکانی جولەکەوە هێناوەو، ڕاڤەو شـیکاری هەندێك ڕووداویان بێ کردوە.

ئێمە لێرەدا دیارترینی ئەو دەقە ئیسرائیلییانە لەم چـیرۆکەدا دەخەینـە ڕوو بـۆ ئەوەی موسڵمانانی لـێ بەئاگا بێنینەوە، بەڵام داواشـیان لـێدەکەین بایـەخێکی ئەوتۆ لە گێڕانەوەو بەنـموونە هێنانـەوەدا پێنـەدەن، مەگـەر تـەنها لـە دەروازەی وریاکردنەوەی خەڵکیو ئاگادارکردنیانەوە نەبێت.. یەکێك لەو دەقانە ئەوەیە، کـە گوتوویانـە: "کاتێـك خـوا، ئـادەمو حـەوای هاوسەرییـشی خـستە خـوارەوە بـۆ

---

١) ئەم فەرموودەیە احمد و ابن حبان و ابن سعد و ابوداود و طیالیسی گێڕاویانەتەوە.

سەرزەوی‌و هەرجارێك سك‌و زایان بکردایە، حەووا دوانەیەکی لە سکدا بوو کە یەکێکیان کوڕو ئەی تریان کچ بوو، جا ئەوە بوو کە چل منداڵیان هەبوو، بیستیان نێرو بیستی دیکەشیان مێ بوو. خواش بۆ مەسەلەی لێك مارەبڕینیان بەو ڕەنگە فەرمانی بە ئادەم کردبوو کە نێرو مێکان لە یەکدی دابڕێن، واتە کچێکی ئەو سکە لە کوڕێکی سکێکی تر مارە ببڕێن‌و کچێکی سککەکەی تریش لە کوڕی ئەو سکە مارە بکرێت. هەروەها ئادەم دوای سەد ساڵ لە هاتنە خوارەوەی بۆ سەر زەوی، کوڕو کچێکی بە یەك سك لە -حەووا- هەبووەو، کوڕەکەی ناوناوە (قابیل)و کچەکەشی ناوناوە (ئیقلیما)، دوای دوو ساڵ لەمەش کوڕو کچێکی تری هەبووە کە کوڕەکەی ناوناوە (هابیل)و کچەکەشی ناوناوە (لەبوودا).. ئادەم بۆ کاری ژن بۆ هێنان‌و هاوسەر بۆ گرتنیان، فەرمانی داوە کە (لەبوودا) لە (قابیل) مارە بکرێت‌و، (هابیل)یش (ئیقلیما)ی لێ مارە بکرێت. بەڵام (قابیل) ڕازی نەبووەو تەنها ئەو خوشکەی-واتە (ئیقلیما)ی ویستووە کە بە یەك سك لەگەڵ خۆیدا لەدایك بووە، چونکە گەلێك لە لەبوودا جوانترو باشتر بووە. جا بەهۆی ئەم ناکۆکییەشەوە، ئادەم بە هەردوو کوڕەکەی خۆی گوتووە: هەریەکەتان قوربانییەك پێشکەش کەن، سا ئیتر قوربانیی کامتان پەسند بکرێت، ئەوا ئەو شایستەی خواستنی کچەکەیە.. (قابیل)یش کە جوتیارێکی خاوەن مەزرا بووو، (هابیل)یش کە شوانێکی خاوەن مەڕو ماڵات بوو، بۆ ئەم داوایە هەریەکەیان لەبواری کارەکەی خۆیدا قوربانیی پێشکەش کرد، ئەوەبوو (هابیل) بەرانێکی گەورەی لەنێو مەڕو ماڵاتەکەیدا هەڵبژاردو کردییە قوربانی، (قابیل)یش چەپکێك گوڵەگەنمی لە کێڵگەکەی هەڵبژاردو بەڵام کە دیتی گوڵەگەنمێکی گەورەی تێدایەو فەریکەیەو جوانە، لێی داماڵی‌و خواردیی. ئنجا ئاگرەکە هاتۆتە خوارەوەو، بەڵام قوربانییەکەی (قابیل)ی هێشتۆتەوەو نەیخواردووە. ئیدی بەرانەکەی (هابیل) بەردەوام لە بەهەشتدا لەوەڕاوە تاکو کراوە بە فیدای (ئیسماعیل)-سلاوی لێبێت-.. بێگومان (قابیل) زۆر پەست بووە بەوەی کە خوا قوربانییەکەی لێ

پەسند نەکردووە، بۆیەش حەسوودی بە براکەی بردووەو ڕقی لێ هەستاوەو گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی پێی بڵێت: دەبێت بتکوژم.. براکەشی لێی پرسیوە: بۆچی دەمکوژیت؟ ئەویش گوتوویەتی: لەبەر ئەوەی خوا قوربانییەکەی تۆی پەسند کردوەو، قوربانییەکەی منی پەسند نەکردوەو، خوشکە جوانەکەی منیشت لێ مارە دەکرێتو، خوشکە ناشیرینەکەی تۆش لەمن مارە دەکرێت.. (هابیل)ی برایشی گوتوویەتی: خوا قوربانی لە کەسانی خواپەرست پەسند دەکات، جا ئەگەر دەستت بۆ من درێژکەیت تا بمکوژیت، ئەوا من دەست بۆ کوشتنی تۆ درێژ ناکەم، چونکە من لە خوای پەروەردگاری جیهانییان دەترسم.. لە هەمان کاتدا (هابیل) بەهێزترو بەگوڕتریش بووە لە (قابیل)، بەڵام ترسی خوا ڕێی ئەوەی لێگرتووە کە دەستدرێژی خراپ بکاتە سەر براکەی.

ئیدی (قابیل) هاتووە تاکو (هابیل) بکوژێت، (هابیل)یش خۆی لێ لاداوەو بەرەو لوتکەی چیاکان هەڵاتووە. تا ڕۆژێکیان لەکاتی نووستنندا (قابیل) هاتۆتە سەری‌و بەردێکی گەورەی هەڵگرتووە تا بیکوژێت، بەڵام نەیزانیوە چۆن بیکوژێت، شەیتانیش لەو ساتەدا خۆی بۆ نواندووەو باڵندەیەکی لەبەر دەستدا بەدەستەوە گرتووەو سەری باڵندەکەی خستۆتە سەر بەردێك‌و، پاشان بە بەردێکی تر سەری پان کردۆتەوەو کوشتوویەتی.

(قابیل)یش بەم شێوەیە براکەی کوشتووەو سەری پان کردۆتەوەو لەنێوی بردووە. (هابیل)یش لەکاتی کوژرانیدا تەمەنی بیست ساڵ بووە. کوشتنیشی لەسەر لوتکەی چیای (قاسیۆن) بووە لە شاری دیمەشق. جا کاتێك (هابیل) کوژراوە زەوی بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەرزیوەو هەموو شتەکانی سەر خۆیشی هەژاندووەو، ئیدی بەمەش دارو درەخت دڕکیان لێ دەرچووەو، تامو بۆی خواردەمەنیش گۆڕانەوەو میوەکانی ترش‌و تاڵ بوون، ئاویش تاڵ بووەو، خاکیش تەپو تۆزی لێ هەستاوە.

(ئادەم) لەوکاتەدا لە مەککە بووەو، سەری لەو ڕووداوە سوڕماوەو، لەکاتی چوونیدا بۆ وڵاتی (هیند) بە مەبەستی زانینی هەواڵەکە، بۆی دەرکەوتووە کە (قابیل)، (هابیل)ی کوشتووە.

دوای ئەوەی (قابیل) براکەی کوشتبوو، نەیدەزانی چی لە تەرمەکەی بکات، خواش هاواری لێکردووەو لێی پرسیوە: ئەی قابیل، ئەرێ کوا (هابیل)ی برات؟.. ئەویش گوتوویەتی: نازانم، چونکە ئاگاداری نەبووم.. خواش لێی پرسیوە: ئەوا خوێنی براکەت لە زەوییەوە هاوارم لێدەکات، بۆچی براکەت کوشتووە؟.. (قابیل) لە وەڵامدا گوتوویەتی: ئەی ئاخۆ خوێنکەی لەکوێ بێت ئەگەر من کوشتوومە؟.. لەو ڕۆژەشدا زەوی خوێنەکەی خواردبۆوەو، ئیدی خواش لەو ڕۆژەوە حەرامی کرد لەسەر زەوی کە هەتاهەتایە نابێت خوێنێکی دی بخواتەوە..

(قابیل) نەیدەزانی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ لاشەی براکەیدا بکات، ئەوەبوو بۆ ماوەی یەك ساڵی ڕەبەق خستبوویە سەر پشتی هەتاکو بۆگەنی کردبوو، لەو کاتەشدا ئاژەڵە دڕندەکانو باڵندە گۆشت خۆرەکانیش چاوەڕێی ئەوەبوون کە ئاخۆ کەی لە زەویدا فڕێی دەدات تاکو لەو لاشەیە بخۆن.. خواش دوو قەلەڕەشی بۆ ناردووەو لەبەر چاوی (قابیل) شەڕیان لەگەڵ یەکدیدا کردوەو یەکێکیانی ئەوی تریانی کوشتووە، پاشان چاڵێکی لە زەویدا بە دەنووکیو هەردو قاچی بۆ هەڵکەندووەو، ئنجا لاشەی قەلەڕەشە کوژراوەکەی تێدا داناوەو ناشتوویەتی.. (قابیل)یش لەو کاتەدا بە وردی سەیری ئەو دیمەنەی کردووەو، پاشان هەستاوەو بە هەمان شێوە چاڵێکی بۆ تەرمی براکەی لە زەویدا هەڵکەندووەو ناشتوویەتی؟

(ئادەم)یش کاتێك هەواڵی ئەو ڕووداوەی بەو جۆرە پێگەیشتووە، کوڕە کوژراوەکەی بە (شیعرێکی عەموودیی عەرەبی) لاواندۆتەوەو گوتوویەتی:

تغيـــــرت البـــلاد ومن عليهـــــــا

فوجـــه الأرض مغيـر قبيـــــــــــح

تغيـرت كل ذي لـون وطعـم
وقـل بشـاشة الوجـه الصبيـح
وقابيـل اذاق المـوت هابيـل
فـوا حـزناً لقـد فقد المليـح[1]

(حەووا)ی هاوسەری (ئادەم)یش وەڵامی ئەو لاواندنەوەیەی داوەتەوەو گوتوویەتی:

دع الشـكوى فقد هلكنـا جميعـاً
بـموت ليس بالثمن الربيـح
وما يغني البكاء عن البواكـي
إذا ما المرء غيّب في الضريـح
فأبك النفس وانزل عن هواهـا
فلست مخلداً بعد الذبيـح[2]

لەوکاتەدا (ئیبلیس)یش پێیان شادو دڵخۆش بووەو وەڵامیشی داونەتەوەو گوتوویەتی:

تنـح عن البلاد وساكنيهـا
ففي الجنات ضاق بك الفسيـح

---

١) حەز دەکەم لە پەراوێزدا مانای ئەم دەقە شیعرییە هەڵبەستراوانەی نێو ئەفسانەکانی جوولەکەو ناوبراو بە ئیسرائیلیات بکەم بە کوردی، واتە: وڵاتانو ئەوانەی تیایان دان گۆڕاون، سەر زەویش تۆزاوی‌و ناشیرینە، هەموو شتێکی ڕەنگدارو بەتام‌و بۆن گۆڕاون‌و، ڕووی گەشی ڕوخسارە جوانەکەش کەم بۆتەوە.. (قابیل)یش تامی مردنی بە (هابیل) تۆشی، ئای چ خەمێکی گەورەیە کە مرۆڤە ئێسک سووکەکەمان لەدەست دەرچووە.

٢) واتە: واز لە سکاڵا بێنە، چونکە بێگومان هەمووومان تیاچووین، بە مردنێك تیاچووین کە هیچ نرخێکی قازانجداری نیە، گریانیش بۆ گیراوان هیچ سودێکی نیە کاتێك مرۆڤ لەنێو گۆڕدا ون دەکرێت، بەڵام دەروون بگریەنەو لە هەواو هەوەسی خۆی دابڕە، چونکە دوای سەربڕاوەکە تۆش بە نەمری نامێنیتەوە.

وكنت بها وزوجك في رخـــــــاء
وقلبك من أذى الدنيا مريـــــــح
فما زالت مكايدتي ومكـــــــري
الى أن فاتك الثمن الربيـــــــح[1]

ئادەم تا سەد ساڵ لەدوای مردنو کوژرانی (هابیل)ی کوڕی خەمبارو دڵتەنگ بووو، پێنەدەکەنی، پاشان فریشتە هاتووە بۆلایو پێی گوتووە: سڵاوی خوات لێبێتو پلەو پایەی بەرزو موڵكو وەجاغت پێ بدات.. هەروەها مژدەی کوڕێکی پێداوەو ئنجا ئادەم پێکەنیوە.

بەڵام بە (قابیل) گوتراوە: بڕۆ.. ئیدی ڕۆیشتووە بە دەرکراویو ئاوارەییو ترسێنراوییەوەو، دەستی (ئیقلیما)ی خوشکیشکی گرتووەو بەرەو شاری (عەدەن)ی وڵاتی یەکەمی بردووە.

شەیتانیش هاتووە بۆلایو پێی گوتووە: ئاگر بۆیە لە قوربانیی براکەتی خواردووە چونکە خزمەتی ئاگری دەکردو دەیپەرست.. (قابیل)یش بەو وتەیە خانوویەکی بۆ ئاگرپەرستی دروست کردوەو ئاگری تێدا پەرستووە، هەروەها (قابیل) کوڕێکی کوێری هەبووەو کوڕە کوێرەکەش کوڕێکی خۆی لەگەڵدا بووە. ئەم کوڕەش بە باوکی گوتووە: ئەوە (قابیل)ی باوکتە، ئنجا هەرچی لە دەستیدا بووە پێیدا کێشاوەو کوشتوویەتی، ئیدی کۆتایی ژیانی (قابیل) بەم ڕەنگە بووە.. خواش هەردوو دەستی (قابیل)ی بە هەردوو قاچییەوە بەستۆتەوەو ڕوخساریشی کردۆتە خۆرو بەشێوەیەکە کە لەگەڵ خۆرەکەدا دەسوڕێتەوەو خۆر لەکوێ بێت،

١) واتە: واز لە وڵاتو دانیشتووانی بێنە، چونکە تۆ ئەی (ئادەم) لەنێو بەهەشتدا جێی فراوانت پێ تەنگ بوو. لەو بەهەشتەدا خۆتو هاوسەرەکەت لە خۆشگوزەرانیدا بوون و دڵیشت لە خەم خەفەتی دنیا شاد بوو، بەڵام فڕوفێڵو چەواشەکاریی منت لەسەر بەردەوام بوو، تاتوانیم نرخە قازانجدارەکەی ژیانت لەکیس بدەم.

ڕووی ئەویش لە خۆرە تاکو ئازاری گەرمییەکەی بچێژێت، لە هاوینیشدا بەربەستێکی ئاگری لەسەرو لە زستانیشدا بەربەستێکی سەهۆڵی لەسەرو حاڵی ئاوایە تا ڕۆژی قیامەت"[1].

## ڕەتکردنەوەی ئەم دەقە ئیسرائیلییانە

با هیچ کەسێك وا گومان نەبات، کە ئێمە لە کاتێکدا ئەم دەقە ئیسرائیلییانەمان -دەربارەی چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەم- هێناوەتەوە، گوایە بڕوامان پێیانەو متمانەیان پێدەکەین، یان گوایە ئێمە پەسندی دەکەینو پشتی پێ دەبەستینو فەرمایشتی خوای میهرەبانی پێ تەفسیر دەکەین.

بەڵکو ئێمە بۆیە ئەو دەقانەشمان هێناوەتەوە، تاکو خەڵکییان لێئاگادارو وریا بکەینەوەو، داوای ڕەتکردنەوەو پشت گوێخستنیان لێ بکەین، هەروەها ئێمە لە دەروازەی (عرفت الشرّ لا للشرّ لکن للتوقیه: خراپەم ناسی نەك بۆ خراپە، بەڵکو بۆ خۆ لێ پاراستن)ەوە دیاریمان کرد. هەروەك لەسەر شێوازی زانایانی فەرموودەش گێڕاومانەتەوە، کە فەرموودە ناڕاستەکان دەهێننەوەو دەگێڕنەوەو پاشان خەڵکی لە ناڕاستییەکەی ئاگادار دەکەنەوە، تاکو هیچ کەسێك پێیان فریو نەدرێت.

ئێمەش نامانەوێت هیچ کەسێك فریو بدرێت بەوەی، کە دەیخوێنێتەوە، یان کە لەو ڕیوایەتە نادروستو هەڵبەستراوانەوەی دەبیسێت.. هەروەها ئێمە لە ڕوانگەی کۆششکاریی لە مەنهەجی قورئانو سوننەت، دەربارەی چیرۆکی پێشینەکانەوە ڕێ بە کەس نادەین، کە ئەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییانە لە نووسینیدا، یان لە وتاریدا بگێڕێتەوە، تەنها مەگەر بۆ وریاکردنەوەی خەڵکیو لێ ئاگادارکردنیان نەبێت.

---

١) بۆ ئەم دەقە دەسهەڵبەستو ناڕاستە ئیسرائیلییانە، بڕوانە: - عرائس المجالس/ ص٣٧-٤١، - الدر المنثور، بەرگی٣، ص ٥٤-٦٤

ئێمە لەگەڵ مامۆستا (محمد رشید رضا)ش داین کە ئەو دەقە ئیسرائیلییانەی ڕەتکردۆتەوەو، گوتوویەتی: "لەم ڕیوایەتە هەڵبەستراوانەدا شتی سەیرو سەمەرەیان دیاری کردووە کە ناشێت هاوشێوەیان بناسرێت تەنها بە گوێرەی سروشێکی خوا نەبێت، دیارە ئەوانەش لە یەکێك لە پێغەمبەرانی خواوە نەگێڕراونەتەوە، بەتایبەتیش لاواندنەوەی (ئادەم) بۆ (هابیل) بەو شیعرە عەرەبییە. بۆیە ڕوومان لەو ڕیوایەتانەی کە ڕاست نینو سوودیان نیە، وەردەگێڕینو، تەنها باسی ئەو چیرۆکانە دەکەین، کە خوا بە هەق گێڕاویتییەوە لە قورئانداو باسیشیان بە هەق ئەو ڕاستییە دەردەخات، کە ئەوەی خەڵکی دەیجوونەوەو کردوویانە بە بنێشتەخۆشەی سەر زاریان، پووچەڵو ناڕەوایە"[1].

هەروەها لەمبارەیەوە ئێمە لەگەڵ مامۆستای پێشەوا (سید قطب)یش داین، کە ئەو دەقە ئیسرائیلییانەی پووچەڵ کردۆتەوەو لەم ڕووەوە گوتوویەتی: "قورئانی پیرۆز لە بۆتەی چیرۆکەکانیدا هیچ کاتو شوێنو ناوێك لە ناوەکانی چیرۆکەکە دیاری ناکات، هەرچەندە هەندێك شوێنەواری باسەرەو چەند ڕیوایەتێکیش لە بارەی (قابیلو هابیل)ەوە هاتووەو وای باس دەکەن کە هەردووکیان دوو کوڕی ئادەمن لەم چیرۆکەداو، سەرەڕای ئەوەش چەند ڕاڤەو شیکارێك هاتبن لەمەڕ کێشەکەی نێوانیانو لەمەڕ ململانێشیان لەسەر دوو خوشکی خۆیان، بەڵام ئێمە وای بەچاکتر دەزانین کە چیرۆکەکەی قورئان بە پوختیو وەك خۆی بەبێ سنوردارکردن بهێنینەوە، چونکە هەموو ئەو ڕیوایەتانە لە بۆتەی گوماندان بەهۆی ئەوەی لە گاورو جووکەلە (اهل الکتاب)ەوە وەرگیراون. ئەم چیرۆکەش لە تەوراتو کتێبی کۆنی خۆیان (العهد القدیم)دا هاتووەو ناوەکانو کاتو شوێنیشیان تیادا تۆمار کردووەو بەو شێوەیەی کە ڕیوایەتەکانیان ئاماژەیان بۆ کردوون[2]".

---

١) تفسیر المنار/ ٦: ٣٤١ .

٢) سید قطب- في ظلال القرآن/ بەرگی ٢، لاپەڕە ٨٧٥ .

# دوو كوڕەكـەی ئادەم لە پشـتی خۆی بوون

هەندێك لە ڕاڤەكاران (مفسرين) وای بۆچوون، كە ئەو دوو كوڕەی چیرۆكەكەیان دیاری كراوە، دوو كوڕی ڕاستەقینەو لەپشتی ئادەم نەبوون، بەڵكو گوایە لە نـەوەو وەچەكانی بوونو، بەتایبەتیش لە نەوەی (بەنی ئیسرائیل) بـوون. بەڵگەشیان لـەم ڕووەوە فەرمایشتێكی خوایە لە كۆتایی چیرۆكەكەدا، كە فەرموویەتی: ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ...﴿٣٢﴾ المائـدة﴾، بـەڵام خـۆ كوشـتنی برایـەك لەلایەن برایەكی یەوەن هۆیەك نیـە بـۆ نووسـینەوەی تۆڵـەو سـزا لەسـەر (بـەنی ئیسرائیل) بە تایبەتیش، ئەگەر ئەو دوو برایە دوو كوڕی ئادەم بن.

هەندێك زانای تریش ڕایان وابوو، كە گوایە چیرۆكی هەردوو كوڕەكـەی ئـادەم، چیرۆكێكی تەمسیلیی خەیاڵییەو لەسەر زەمینەی واقیعـدا ڕووی نـەداوە، بـەڵكو قورئان نموونـەی پـێ هێناوەتـەوە لەسـەر سروشـتی چـاكەو خراپـەخوازیی لـەلای خەڵكی، هەروەها گوایە وێنەی دوو نموونەی مرۆڤانەی لەمەڕ هەردوو لایەنی خێرو شەڕ پیشان داوین.

بەڵام زۆربەی زانایانو ڕاڤەكارانی قورئان، یەكدەنگو هاوڕان لەسەر ئەوەی، كە ئەم چیرۆكە ڕاستەقینەو واقیعی بووەو بەڕاستیو بە كردەوە لـە جیهـانی واقیعـدا ڕووی داوە. هەروەها زۆربەی زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی، هەردوو كوڕەكەی ئادەم لە وەچەو پشتی خۆی بـوونو كـوڕی ڕاسـتەوخۆی بـوونو لەگەڵیـدا ژیـاون، ئـەم بەسەرهاتەشیان لەسەردەمی ژیانی ئادەم دا بووە.

(خاڵی بنـچینەیی)یـش لـە چـیرۆكەكانی قورئانـدا ئەوەیـە، كـە ڕەهەنـدێكی واقیعیانـەو بـوونێكی ڕاسـتەقینەیان هەیـەو، كەسـایەتی یـەكانی نێـو چـیرۆكە قورئانییەكانیش، چەند كەسێتییەكی ڕاسـتەقینە بـوونو، ڕووداوەكـانی نێـو ئـەو چیرۆكانەش بە كردەوە لە ماوەیەكی زەمەنیی مێژوی ڕابردوودا ڕویان داوە. هەردوو

کوڕەکەی ئادەمیش لە نەوەی هۆزی بەناو (بەنی ئیسرائیل) نەبوون. ئەمەش بەهۆی دووریی ماوەی زەمەنیی نێوان ئادەمو (بەنی ئیسرائیل)ەوە، خۆ ئەگەر ئەو دوو کوڕەی ئادەم لە هۆزی (بەنی ئیسرائیل) بوونایە، ئەوا بکوژەکە (قابیل) نەشارەزا نەدەبوو لە چۆنیەتی ناشتنی تەرمی براکەیداو وای لێ بێت، کە قەلەڕەشێك ڕێنموونیی بکات بۆ ئەو کارە، چونکە هیچ کەسێك لە (بەنی ئیسرائیل) لە چۆنیەتی ناشتنی مردواندا نەشارەزا نەبووە. هەر بۆیەش کاتێك قابیل لاسایی قەلەڕەشەکەی لە ناشتنی تەرمەکەدا کردۆتەوەو لەوەوە فێری ناشتنی تەرمی براکەی بووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ڕووداوەکە لە کاتی ساوایی (طفولة)ی گرۆی بەشەریدا لەسەر ڕووی زەویدا ڕووی داوە. واش دیارە، کە ئەوە یەکەمین کوشتنی بە ئانقەست بووبێت لەسەر ڕووی زەویو، خواش هەر خۆی زانایە (والله أعلم).

بەڵگەش لەسەر ئەوەی، کە دوو کوڕی ئادەمو لە پشتی خۆی بوون، فەرمایشتەکەی خوایە لەم چیرۆکەدا: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ ...﴿٢٧﴾ المائدة﴾. لە زمانی عەرەبیشدا وشەی (ابن) بە کوڕی حەقی باوك دەگوترێت، کە لە پشتی خۆی بێت، بەڵام مانای وشەی (ابن) بە شێوەی (مەجاز)و پتر لە یەك ماناش بۆ ڕەچەڵەك بەکاردێت. ڕێسای مامەڵەش لەگەڵ قورئاندا دانانی بێژە قورئانییەکە (اللفظ القرآني)یەکەیە لەسەر حەقیقەتە زمانەوانی یەکەی خۆی، ئێمەش لە حەقیقەتەوە بۆ مەجاز لانەدەین، تەنها لەکاتی نەتوانینی دانانی لەسەر ئەو حەقیقەتە زمانییەدا نەبێت، لەم چیرۆکەشدا، هیچ بەربەستێك بۆ دانانی لەسەر بارە ڕاستەقینەکەی نیە.

پاشان بەڵگەیەکی دی لەسەر ئەم ڕاستییە، فەرمودەیەکی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە (بخاری)و (مسلم) لە (عبدالله کوڕی مسعود)ەوە- خوای لێی ڕازی بێت- گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لا تُقتَلُ

**نَفسٌ ظُلْمًا إلاَّ كَانَ عَلَى ابْـنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْـلٌ مِـنْ دَمِهَـا وَذَلِـكَ لأَنَّـهُ أَوَّلُ مَـنْ سَـنَّ الْقَتْلَ))**[1]، واتە: هەرکەسێك کە بە زوڵمو زۆرداریـی بکوژرێـت، یەکـەمین کـوڕی ئادەمیش (قابیل) بەشێکی گوناهەکەی لە ئەستۆدایە، چـونکە ئـەو کـوڕە یەکـەم کەس بوو، کە ڕێگای کوشتنی دانا..

ئەم فەرموودەیەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە کوڕەکەی ئادەم لە پـشتی خـۆی بـووە، چـونکە دەفـەرموێت: (**ابْـنِ آدَمَ الأَوَّلِ**)، (یەکـەم کـوڕی ئـادەم)، وشـەی یەکەمینیش لێرەدا، یەکەمینی زەمـەنیو مێـژوویی یـە، هـەروەها فەرموودەکـە (یەکەم کوڕی ئادەم)، کە بکوژێکی ستەمکارە خەتابار دەکات بەوەی، کە بەشێکی گوناهی کوشتنی هەرکەسێکی، تاڕۆژی قیامەت لەئەستۆدایە، کە بە زوڵمو سـتەم (بەناهەق) کوژرابێت. جا بیربکەرەوە لـەوەی ئـاخۆ چـەندەها کـەس لـە مێـژووی مرۆڤایەتیدا بەسەریدا، تا ئەمرۆ کوژراونو ئەی چەندی تر لە ئایندەداو، تـا ڕۆژی قیامەت دەکوژرێن، ئیدی بڕوانە ئەندازەی ئەو گوناهە چـەندە، کـە یەکـەم کـوڕی ئادەم لە ئەستۆی دایە.

پاشان فەرموودەکە هۆی لە ئەستۆنانی بەشێکی هەر تاوانێکی کوشـتنی بـەوە دیاری کردووە، لەبەرئەوەی (ئەو کوڕە) یەکەم کەس بـووە، کـە ڕێگـەی کوشـتنی گرتۆتەبەرو ڕێسای کوشتنی داناوە. (دیاردەی یەکەمین)یش بۆیـە بـە دیاردەیـەکی مێژوویيو زەمەنی دانراوە، چونکە ئـەو کـوڕە یەکـەم کـەس بـووە، کـە کـرداری کوشتنی ئەنجام داوەو، یەکەمین بکوژیش بووە، بەم ڕەنگەش دەرگـای خوێنـــڕێژیی کردۆتەوەو زاڵمە دەسـتدرێژکارەکانی بانگ کردوە بۆ شوێن پێهـەڵگــرتنی خـۆی لەو تاوانەدا.

لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویـەتی: ((**مَـنْ سَـنَّ فِـي الإِسْـلامِ سُـنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَـنْقُصَ مِـنْ أُجُـورِهِمْ شَيْءٌ**

---

1) رواه البخاري في كتاب الأنبياء: ٦٠ باب خلق آدم: ١ حديث رقـم ٣٣٣٥، و رواه مـسلم في كتـاب القسام: ٢٨ باب بيان إثم من سن القتل: ٨ حديث رقم ١٦٧٧.

وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ))[1].

واتە: هەرکەسێك لە ئیسلامدا ڕێسایەکی چاك داڕێژێت، ئەوا پاداشتی خۆی لەسەری هەیەو پاداشتی هەر کەسێکی تریشی لەسەر هەیە، کە لە دوای خۆی پەیڕەویی ڕێسا چاکەکەی بکەن بێئەوەی هیچ شتێك لە پاداشتی ئەوان کەم بکات. هەرکەسێکیش لە ئیسلام دا ڕێسایەکی خراپ داڕێژێت ئەوا گوناهی لەسەر دەکەوێتو گوناهی هەر کەسێکیشی لەسەرە کە لەدوای خۆی کار بەو ڕێسا خراپەی دەکەن بێئەوەی هیچ شتێك لە گوناهی ئەوانیش کەم کاتەوە.

## مانای (گێڕانەوەی چیرۆکەکە بە هەق)

لێرەشدا ساتێك ڕادەمێنین لە ئاست فەرمایشتەکەی خوا ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ ...﴿٢٧﴾ المائدة﴾. بەسەرهاتی هەردوو کوڕەکەی ئادەمیان بە هەق بۆ بگێڕەوە..

لێرەدا هەق (الحق) مانای چیە؟ هەق لێرەدا ڕاستگۆییو ڕاستیو دروستی دەگەیەنێت، بەمانای نابێت ئەوچیرۆکەیان وەرگیرێت، تەنها لە هەواڵە ڕاستەکانو ڕیوایەتە ڕاستبێژیی یەکانەوە نەبێت، واتە لەو فەرموودە ڕاست (صحیح)انەوە، کە بە دڵنیاییو سەلمێنراوییەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕراونەتەوە.

جا ئەگەر مرۆڤی موسڵمان بەم مەرجەوە (لەبواری مامەڵە لەگەڵ چیرۆکەکانی قورئاندا) پابەند بێت، لەنێو چیرۆکەکانیشدا بە چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەمیشەوە، ئەوا بێگومان ئەم سیفەتەی لە زانستو گفتاریدا بەدیی هێناوەو، ئەو

---

١) رواه مسلم في كتاب الزكاة: ١٢ باب الحث على الصدقة (٢٠)، ديث (١٠١٧)، وفي كتاب العلم: ٤٧ باب من سن سنة حسنة أو سيئة: ٦ حديث (١٠١٧).

چیرۆکانەشی بەهەق (بەڕاستیو ئەمانەتەوە) بۆ خەڵکی خوێندۆتەوەو گێڕاوەتەوە.

هەر لەبەر ئەمەش هەموو ئەو کەسانەی دەقە ئیسرائیلییەکانیان لەبارەی چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەمەوە بەکارهێناوەو چەند ڕیوایەتێکیان لەوێوە بۆ ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە هێناوە، پێیان دەڵێین: ئێوە بەم ڕێنمایی یە قورئانی یەوە پابەند نەبوون کە داوا دەکات چیرۆکەکە بە هەق بگێڕێتەوە: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ ...﴿٢٧﴾ المائدة﴾، هەربۆیەش زۆربەی وتەکانیان لەسەر ئەم چیرۆکە ئەو سیفەتی (هەقەی کە قورئان بە مەرج گرتوویەتی) ون کردووە، لەوێشەوە سیفەتی زانستیانەو مەنهەجیو ئەکادیمیانەشیان ون کردووە، کە سیفەتی زۆر پێویستە لە بواری فیکرو زانستو مەعریفەدا.

## پەسندبوونی قوربانی لە یەکێکیان

هەردو براکە (قابیلو هابیل) لەسەر مەسەلەیەك ناتەبا بون- کە ئێمە نازانین مەسەلەکە چیە-و، پەناشیان بردۆتە بەر ئادەمی باوکیان-سلاوی لێ بێت- کە داوەر بێت لەنێوانیاندا. (ئادەم)یش داوای لێکردون، کە هەر یەکەیان قوربانی یەك پێشکەش بە خوا بکات، ئیدی کامیان لەسەر هەق بوو، ئەوە بێگومان خوا قوربانییەکەی لێوەرگرتووەو، ئەوی تریشیان تەنها ئەوەی لەسەرە کە لە هەڵوێستی خۆی پاشگەز بێتەوە، چونکە لەسەر هەق نیە. (قوربانییەکەش) شتێکی تایبەتی بووەو، -ناتوانین دەستنیشانی بکەین کە چی بووە-و تەنها ئەوەش بووە کە پێشکەشی خوای بکەن، لەوانەیە خۆراکێك یان شلەمەنی یەك، یان کەرەسەیەك بووبێت، یان لەوانەیە ئاژەڵێك، یان بەرهەمێکی کشتوکاڵی بووبێت، لەوانەشە شتێکی دیکەی غەیری ئەمانە بووبێت. بە هەرحاڵ هەریەکەیان شتێکی کردۆتە قوربانی و-هۆی نزیك بوونەوە لە خوا-، خواش قوربانیی یەکێکیانی پەسند کردووەو، قوربانیی ئەوی تریانی پەسند نەکردووە. ناشزانین خوا چۆن قوربانییەکەی پەسند کردووە، تەنانەت قورئان داوامان لێ دەکات، کە لە چۆنیەتی

پەسندبوونی قوربانییەکە نەکۆڵینەوە، چونکە لێکۆڵینەوەی لەم بوارەدا هیچ سوودێکی نیەو هیچ بەروبوومێکیشی نیە، هەروەها ئامرازی لێکۆڵینەوەشمان بەدەستەوە نیە تا بەکاری بێنین، بۆیەش لەم کاتەدا لێکۆڵینەوەو بەدواداگەڕان تەنها بە فیڕۆدانی کاتەو، خەرج کردنی هەوڵو کۆششێکی عەقڵیشە لە بوارێکدا، کە هیچ کەلکێکی لێ وەدی نایەت. لەم ڕووەشەوە مامۆستای شەهید (سید قطب) لە تەفسیرەکەیدا (في ظلال القرآن) گوتوویەتی: "فەرمانی (فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا ) فەرمانێکی نادیارە (مبني للمجهول)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە پەسندکردن، یان پەسندنەکردن، بەندە بەهێزێکی نادیار (قوة غيبية)ەوەو، بەستراویشە بە چۆنیەتیەکی نادیارەوە.

ئەم جۆرە داڕشتنەی چیرۆکەکەش، دوو خاڵی گرنگمان پێ دەبەخشێت:

<u>یەکەم</u>/ نابێت لە چۆنیەتی ئەم پەسند کردنە بکۆڵینەوەو، نابێت وەك ئەو کتێبە تەفسیرکاریانەش تێیدا قووڵ بینەوە، کە چوونەتە سەر چەند ڕیوایەتو بەسەرهاتێکی وەها، کە دەرکەوتووە تەنها لە ئەفسانەکانی نێو کتێبە دەسکاری کراوەکەی (تەورات)ەوە وەرگیراون.

<u>دووەم</u>/ دیاریکردنی ئەو ڕاستییەی، کە "ئەو کەسەی قوربانییەکەی پەسند کراوەو لێی وەرگیراوە، هیچ گوناهێکی نەبووە لەسەر ئەوەی، ببێتە پاساوی ڕق لێ هەڵگرتنو شیاوبوونی کوشتنی، چونکە هیچ دەستێکی لە پەسندبوونی قوربانییەکەیدا نەبووە، بەڵکو (هێزێکی غەیبی) کاری چۆنیەتی پەسندبوونی قوربانییەکەی لە ئەستۆ ناوەو، ئەم هێزەش گەلێك لە سەرووی پەی بردنو خواستی هەردووکیانەوە بووەو، هەر تەنهاش بە خواستو ئیرادەی (هێزە غەیبی یەکە) خۆی پەسند کراوە"[1].

١) في ظلال القرآن/ ٢: ٨٧٥ .

## کینەی قین لەدڵ لە وتەی ﴿لَأَقْتُلَنَّكَ﴾دا

(شەڕو خراپەکاری) توانیی بچێتە دڵی ئەو برا قین لەدڵەوە لە دژی براکەی تر، شەیتانیش دەستی بەسەر بیروهۆشیدا گرتو دڵی کوێر کردەوە لە ئاست بەدەمەوە هاتنی هەقو گەڕانەوە بۆ ڕاستیدا. بێگومان ئەم برا شەڕخوازە زانیبووی، کە ئەو خۆی لەسەر هەق نیە، بەڵکو براکەی لەسەر هەقە، چونکە خوا قوربانییەکەی لێ وەرگرتووە، بۆیە لە بنەڕەتدا دەبوایە لە هەڵوێستی خۆی پاشگەز بێتەوەو لە بیروڕای خۆشی وازبێنێت. بەڵام ئاخۆ کەی وادەکات لە کاتێکدا شەیتان بیرو هۆشی داگرتووەو، هەموو هەوڵێکی بیرکردنەوەی هێمنانەی بۆ نەهێشتووەو هەموو دەروازەیەکی بەخۆداچوونەوەو پاشگەزبوونەوەشی لێ داخستووەو، تەنها یەك شتی بەدەستەوە ماوە، ئەویش سووربوونیەتی لەسەر هەڵەو بەڕاستتر زانینی بیروڕای پووچەڵو، بەڕوونی شەڕخوازیی.

بەڵام خۆزگە شەیتان بەوەندە وازی لەو برا کین لە دڵە بهێنایە، جا ئایا -شەیتان بە تەنها قۆناغێك -لە قۆناغەکانی ناهەقی- لە دۆستانو و شوێنکەوتوانی قایل دەبێت؟ بێگومان شەیتان شوێنکەوتوانی خۆی لە قۆناغێکی بەتاڵو ناهەقییەوە بۆ قۆناغێکی تری خراپتر دەباتو، جم وجووڵو هەنگاوەکانیشیان لە خراپێکەوە بۆ خراپتر دەبات و.. بەم ڕەنگە هەر وا دەکات.

دیارە ئەم برا قین لەدڵەش، شەیتان بەرەو قۆناغێکی ترسناکتری بردبوو کە بیرکردنەوە بوو لە کوشتنی براکەیو، سووربوونیشی بوو لەسەر ئەو کردەوەیە. بەڕاستی هەر تەنیا بیرکردنەوەی برایەکیش لە کوشتنی براکەی خۆی، تاوانێکی گەورەیە، ئەی چۆنە ئەگەر ئەم بیرکردنەوەیە بگاتە سەر کردارو بەتەمابوونو سووربوون لەسەر ئەنجامدانی؟ ئەی چۆنە ئەگەر بەتەمابوونو سووربوونەکەش بۆ جەخت لەسەرکردنی تێپەڕێنراو بگۆڕرێت؟ ئەی چۆنە، ئەگەر دواتر پێنرایە سەر کردارەکەو ڕاپەڕاندنی بە کردەوە؟!

بەڕاستی ئەو وتە بەدکارییەی کە برا قین لـە دڵەکـە بـە ئاشـکراو بێشـەرمانە درکاندی- واتە (لَأَقْتُلَنَّكَ / دەبێت بتکوژم) چەندین ئاماژەی لەخۆ گرتووە:

١- ئاماژە دەکات بۆ زاڵ بوونی شەیتان بەسەریداو داگیرکردنی دەروونی.

٢- ئاماژە دەکات بۆ خۆ بەزل زانینیو نکوولی کردنیو، بەدەمـەوە نـەهاتنی ئەو هەقەی کە مافی براکەیەتی.

٣- ئاماژەیە بۆ گوزارشتو تەرجەمەی ئەو ڕقە ڕەشەی کە دڵـی بـە تـەواوەتی سیخناخ (پڕ) کردووە.

٤- ئاماژەیە بۆ نەمانی هەموو مانایەکی برایەتیو مرۆڤایـەتی لـە دڵیـدا لـە ئاست براکـەیدا.

## نەریتـی (هـابیـل)ی برای لە وەڵامـی هەڕەشـەکەیدا

برای ئیماندار (هابیل) بەچی وەڵامی هەڕەشەی براکـەی دایـەوە؟ پـێی گـوت: ﴿...إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنْ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾ المائدة﴾، واتە: بێگومان خـوا تەنها لە کەسانی لەخواترسو خواپەرست قوربانیو کاری چاکە پەسند دەکات. جـا بەخوا ئەگەر دەستت بۆ سەرم درێژکەیت بە نیازی ئەوەی بمکوژیت، ئەوا من دەست درێژ ناکەم بە نیازی ئەوەی تۆ بکوژم، بەڵکو من لە خوای پەروەردگاری جیهانییان دەترسم. بۆیە من بەم هەڵوێستەی خۆم دەمەوێت گوناهی منو گونـاهی خۆیـشت لەئەستۆ بگریت، ئنجا یەکێك لە کەسانی شایستەی دۆزەخ دەبیتو هەر ئەمەشـە سزای ستەمکاران..

جا کاتێك نەریتی هەردوو براکە لەڕێی وتەی هەردووکیانەوە بەراورد دەکەین‌و هەوڵی ناسینی خوونەریتی هەردووکیان دەدەین، تێدەگەین، کە ئەوان دوو نموونەی لێك جوداو دوو پیاوی لێك جیاوازن.

هەر لەم ڕووەوە (سید قطب) دەڵێت: "ئەم چیرۆکە نموونەیەکمان لەسەر نەریتی شەڕخوازی‌و دوژمنکاریی پیشان دەدات، تەنانەت نموونەیەك لەسەر دوژمنکارییەکی زۆردارانەی وەها، کە هیچ پاساوو بەهانەیەکی نی یە، هەروەها نموونەیەکمان لەسەر نەریتی چاکەخوازی‌و لێبوردەیی‌و نموونەیەکمان لەسەر دەروونپاکی‌و ئاشتی خوازی پیشان دەدات، ئەم دوو نموونەیەش بەرامبەری یەکتر رادەگرێت‌و، هەریەکەشیان بە گوێرەی نەریتی خۆی ڕەفتار دەکات"(١).

ڕازو نهێنیی ناتەبایی هەڵوێستەکانی هەردوو براکەش لەوەدایە، کە هەریەکەیان خووی بە شتێکەوە گرتووەو، بیری لێ دەکاتەوە، چونکە هەموو وتە کردەوەیەکی مرۆڤ پەیوەستن بە تێڕوانین‌و بیرکردنەوەیەوە.

ئەو برا قین لەدڵ‌و ستەمکارەش (قابیل) بەدەم خواستی شەیتانەوە چووبووو، ئەو وتەیەی، کە سوور بوو لەسەری، گوتی‌و، ئەوەش، کە بەتەمای کردنی بوو کردی. بەڵام برا ئیمانداره ئاشتی خوازەکە (هابیل) بەدەم خواستی هەقەوە چووبووو، باوەڕی بەخوا هێنابوو، هەر بۆیەش سوور بوو لەسەر ئەوەی، کە گوتبووی‌و خاوەنی وتەی خۆی بوو. ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کە ئەوان دوو برای ڕاستەقینەی یەکترو لەیەك باوك‌و یەك دایك بووبوون‌و، لە یەك ڕەحمدا کۆببوونەوەو لە یەك مەمك شیریان خواردبووو لە یەكماڵیشدا ژیابوون.

جا سەرەڕای ئەو یەکێتی‌و کۆکبوونەش لە کاروبارە دەرەکییەکاندا، کەچی لەڕووی تێڕوانین‌و فیکرو هەڵوێست‌و ڕەفتارو گفتارو کردارەوە لێك جوداو ناتەبا بوون. وادیارە لەمەشدا ئاماژەیەك بۆ ئەو لێپرسراوێتییە تاکەکەسییە (المسؤولية

---

١) في ظلال القرآن: ٢: ٨٧٤ .

الفردیـة) هەیە، کە خوا بۆ مرۆڤی داناوە، هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەو توانایەی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی هەڵوێستو ڕەفتارو ڕێبازدا کە خوا بە مرۆڤەکەی بەخشیوە، ئیـدی مرۆڤیش سەرپشك کراوە لەو ڕێگەیەدا کە دەیگرێتە بەرو، لەو هەڵسوکەوتەش کە دەینوێنێـت، خـواش بەرپرسـیارێتیی ئـەو شـێوازو ڕێگـا هەڵبـژێراوەی دەخاتـە ئەستۆی و بەم پێیە سەرەنجامی بەدەست هاتووی لێوە پەیدا دەبێت.

## "إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ"

لەو چیرۆکەدا برا باوەڕدارەکە(هابیل) بۆ هەڵسەنگاندنی گفتارو بیروڕاکانو، بۆ وەبەرنانی کردارو ڕەفتاریش تا لەلای خوا پەسند بن، بنەمایەکی باوەڕدارانەی جێگیری قورئانییانەو بنچینەیەکی ڕاستەوانەشمان پیشان دەدات، ئەمەش وەك لەو وتەیەیدا هاتووە: (إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ)..

بەوپەڕی دیاری کردنو جەخت لەسەرکردنیشەوە پێی دەڵێت: (إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ)، بێگومان خوا، تەنها لە کەسانی خواپەرستو تەقوادار وەردەگرێت. (تەقوا)ش -کە مانای لەخوا ترسانو خۆپاراستن لە سزای خوا- دەگەیەنێت، مەرجێکە بۆ پەسندبوونی کارەکان لەلای خوا. باوەڕ (ایمان)یش بنچینەیەکە بۆ وەبەرنانیو ئومێدی سوود لێوەرگرتنی.

بۆچی باوەڕو لەخواترسان بنچینەی پەسندبوونی کارەکانن لەلای خوا؟ چونکە کارەکان بۆ خود (ذات)ی خۆیان ناویسترێن، هەر بۆیەش هیچ سوودێکیان تێدا نابێت، ئەگەر لە ماناو مەبەستەکانیان دابڕێنو لە ژیانو کارابیشیان جودا بن. وەك چۆن بەروبوومیش تەنها لەسەر درەخت دەڕوێت، بەهەمان شێوەش کاروکردار چاكو پاكو ڕاست نابێتو لەلای خواش پەسند نابێت، هەتا لە سەرچاوەی باوەڕو ئیمانداریتییەوە هەڵنەقوڵێتو، هەتا لە تەقواو خۆپارێزیشەوە سەر هەڵنەدات. خواش بێگومان تەنها کارەکانی بەسادەیی ناوێت، بەڵکو دەیەوێت کارابیان لە دڵو دەروونی خاوەنەکانیاندا هەبێت.. خوا دڵ هەستو نەستیانی دەوێت. گرنگ ئەوەیە مرۆڤی باوەڕدار، ئاکاری تەقواو لەخواترسانی دەست کەوێتو هەموو ژیانو بوونو قەوارەی پێ پڕکاتەوە. خوای پەروەردگار دەربارەی حیکمەت لە پێشکەشکردنی قوربانیو دیارییەکان فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن

شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ الحج ﴾، واتە: ئێمە سەربڕینی ئاژەڵە دابەستەکراوەکانمان داناوە بە بەشێك لە دروشمو ڕێو ڕەسمو خواپەرستییەکان بۆ خوا -کە دیارە لەکاتی حەجو ڕۆژانی جەژنی قورباندا بەڕێوە دەبرێت-، چونکە بێگومان خێرو بەرەکەتی زۆریان بۆ ئێوە تێدایە. دە ئێوەش ناوی خوایان لەسەر ببەن لەکاتی سەربڕینیانداو (بسم الله، الله اکبر)یان لەسەر بڵێنەوە، لە کاتێکدا ئامادەو ڕیز دەکرێن بۆ سەربڕین، جا کە سەریشی بڕرانو گیانیان تیادا نەماو کەوڵو پارچەپارچە کران، لێیان بخۆنو بەشی هەژارو سواڵکەرانیشی لێبکەن. ئێمە بەم ڕەنگە ئاژەڵو مەڕو ماڵاتمان بۆ ئێوە دەستەمۆو ڕاهێناوە، تاکو سوپاسی خوای لەسەر بکەن. بێگومان خوا خۆی لە گۆشتو خوێنی ئەو قوربانییانەی ناوێتو بەرناکەوێت، بەڵکو تەنها تەقواو خواپەرستیو لەخواترسانی ئێوەی دەوێتو بەری دەکەوێتو بەهێندی دەگرێت. بەو شێوەیە دەبینین خوا بۆیە مەڕو ماڵاتی بۆ ئێوە ملکەچو دەستەبەر(تسخیر) کردووە، تا لەکاتی سەربڕیندا خوا بە گەورە دانێن - واتە لەڕێی وتنی (الله اکبر)ەوە-و ڕێزو قەدری زۆری خوا بزانن بەهۆی ئەوەی، کە ڕێنوونیی کردوون بۆ ڕێی ڕاست، تۆش ئەی پێغەمبەر مژدەی بەهەشتو بەختەوەریی بە چاکەکارانو خێرخوازان بگەیەنە؟

لەمبارەیەوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا ئاماژە بۆ ئەم تەقواو خۆپارێزییە کراوە، وەك ئەو فەرموودەیەی کە (مسلم) لە (ابوهریرە)ەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گێڕاویەتییەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **((إِنَّ اللَّهَ لا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ))**(١)، واتە: بێگومان خوا بۆ

١) رواه مسلم: كتاب البر والصلة رقم ٤٥، باب تحريب ظلم المسلم ١٠، حديث رقم ٢٥٦٤ .

شکڵو ڕووخسارو ماڵو سامانتان ناڕوانێت، بەڵکو بۆ دڵو دەروونو کارو کردەوەتان دەڕوانێت.

جا ئەگەر کاروکرداریش لە باوەڕەوە سەرچاوە نەگرێتو، لە تەقواوە سەر هەڵنەدات، ئەوا لەلای خوا پەسند ناکرێتو بۆ خاوەنەکەی ڕەت دەکاتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ الفرقان ﴾. واتە: کاتێك دێینو تەماشای بنچینەی کارو کردەوەیانمان کردو دیتمان هەرمووی تاوانە-یان لەسەر بنەڕەتێکی خواپەرستی نەبووە-، ئەوا هەموو ئەو کردەوانەیانمان بەباداو بوونە تەپو تۆزی پەرشو بڵاو.

پیاوچاکانی موسڵمانیش هەمیشە بۆ ماوەی زۆر لە ئاست فەرمایشتی خوادا ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ ڕاوەستاونو خەریکی خواپەرستیو گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خواو، پێشکەشکردنی قوربانییەکانیان بونو، سەرەڕای ئەوەش ترساون لەوەی نەبادا خوا لێیان پەسند نەکات، چونکە ترسی ئەوەیان هەبووە، کە لە تەقواکارنو خواپەرستان نەبن.

لەم ڕووەشەوە پیاوچاکانی موسڵمان چەند وتەیەکیان هەیە، وەك: هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ابو درداء)-خوا لێی ڕازی بێت- گوتویەتی: "ئەگەر بە تەواوەتی دڵنیابم لەوەی کە خوا یەك نوێژم لێ پەسند دەکات، ئەوە بۆ من باشترە لە هەموو دیناو ئەوەی تێی دایە، چونکە خوا خۆی دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾."

ئەمیری باوەڕداران (علی کوڕی ابوطالب) -خوا لێی ڕازی بێت- گوتوویەتی: "هەر کارێك ئەگەر تەقواو خۆپارێزیی لەگەڵ دابێت، کەم نابێتەوە، چونکە چۆن کارێك پەسند کرابێت کەم دەکات؟"

خەلیفەی بەڕێزیش (عومەر کوڕی عبدالعزیز)-خوا لێی ڕازی بێت- لەکاتی ئامۆژگاریکردنی یەکێك لە کارمەندانیدا، پێی گوتووە: "من وەسیەتت بۆ دەکەم

بەوەی هەمیشە ئەو تەقواو خۆپارێزییەت هەبێت کە خوا جگە لەوە هیچی تر پەسند ناکاتو، هەر بەوەش ڕەحم بە بەندەکانی دەکاتو، تەنها بەوەش پاداشتیان دەداتەوە. دەنا کەسانی ڕاسپێرو وەسیەت کاری تەقوا زۆرن، بەڵام پەیڕەوکارانی کەمن."

(عامری کوڕی عبدالقیس)یش گوتوویەتی: "ئایەتێك لە کتێبەکەی خوا لە هەموو دنیا لای من خۆشەویستترە کە خوا پێی بمکاتە یەکێك لە خۆپارێزو تەقواکاران، چونکە خوا خۆی فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾."

جارێکیان سواڵکەرێك دەچێتە لای (عبداللە کوڕی عمر)-خوا لێیان ڕازی بێت- ئەویش بە کوڕەکەی دەڵێت: دینارێکی پێ بدە.. کوڕەکەشی دینارێکی پێ دەدات، کاتێك سواڵکەرەکە ڕۆشت، کوڕەکەی (عبداللە) بە باوکی خۆی گوت: بابە، خوا لێت قبووڵی کات.. باوکیشی گوتی: "گەر بمزانیایە خوا یەك سوژدەم لێ قبوڵ دەکات، یان خێری درهەمێکم لێ قبووڵ دەکات، ئەوا نادیارێك لە مردن لەلای من خۆشەویستتر نیە، ئایا دەزانیت خوا کردارەکان لەکێ پەسند دەکات؟ بێگومان لە تەقواکارو خۆپارێزانی پەسند دەکات" ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾.

(مطرف کوڕی عبداللە)ش لە دووعاو نزاکردنیدا دەیگوت: "خوایە ڕۆژووی یەك ڕۆژم لێ وەرگریت، خوایە چاکەیەکم بۆ بنووسیت" پاشان دەیگوت: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾.

(عامری کوڕی عبداللە)ش کاتێك لەسەر پێخەفی مردن بوو، گریا، لێیان پرسی: چی دەتگریەنێت؟ لە وەڵامدا گوتی: ئایەتێك لە کتێبەکەی خوادا.. گوتیان: کام ئایەتەیە؟ گوتی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾(١).

١) هەموو ئەم وتانەی پێشوو لە کتێبی (الدرّ المنثور)دایە، بەرگی شەشەم، لاپەڕە (٥٦-٥٧).

## مرۆڤی باوەڕدار بیر لە کوشتنی براکەی ناکاتەوە

دوای ئەوەی برا باوەڕدارەکە بنچینەی پەسندبوونی کاروباری لەلای خوا بۆ برا ستەمکارەکە باسکرد، وەك وەڵامێك بۆ ئەو هەڕەشە بەدکارانەیە لەسەر کوشتنیو کە وەڵامەکەشی زۆر جوانو نەرمو نیانو ئاشتی خوازانە بوو" ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَ ﴾.

ئەم وەڵامەش چەند مانایەکی جوان دەگەیەنێت، وەك:

١- وەڵامێکی هێمنانەو کاردانەوەیەکی ئاشتیانەیە لە بەرامبەر هەڕەشەو گوڕەشەی براکەیدا.

٢- دڵنیاکردنی براکەی لەوەی کە ئەو (واتە هابیل) بیر لە کوشتنی (قابیل) ناکاتەوەو بە تەمای ئەو کارە نیە.

٣- دەلالەتو بەڵگەیە لەسەر نەریتی هێمنو ئاشتیخوازانەی ئەو برایەو لەسەر دەروونە بڕوادارو ڕەزامەندەکەی.

بێگومان برا باوەڕدارەکە وەڵامی هەڕەشەی براکەی بە هەڕەشەیەکی هاوشێوە، یان توندتری نەدایەوە، خراپەشی بە خراپە وەڵام نەدایەوە، بەو نەفامییەش هەڵسوکەوتی نەکرد کە لە سەرووی نەفامیی نەیارەکەیەوە بێت، وەك شاعیری سەردەمی جاهیلی گوتەنی:

ألا لا يجهلنّ أحد علينا

فنجهل فوق جهل الجاهلينا

بێگومان ئەو جۆرە هەڵوێستەی برا باوەڕدارەکە (هابیل) مەگەر تەنها لە توانای پیاوە هەرەگەورەکاندا بێت.

وەڵامدانەوەی خراپەش بە خراپەیەکی هاوشێوەی خۆی، ئاسانو سانایەو، هەموو کەسێکیش دەتوانێت بەو ڕەنگە بجووڵێتەوە. بەڵام ئەگەر بتوانیت خۆت لە سەروو خراپەو شەڕخوازیو ناهەقییەوە بگریتو، لە جاهیلێکی نەفامکار گەورەتر بیتو، لە ململانێو ناکۆکییەکانیاندا وەك منداڵو هەرزە هەڵسوکەوت نەکەیتو، وەڵامی خراپەش بە چاکە بدەیتەوە، ئەوا تەنها لە کاتێکدا توانای ئەمانەت هەیە کە مرۆڤێکی گەورەو لێهاتوو بیتو، خاوەنی دەروونێکی فراوانو، دڵێکی بەسۆزو میهرەبان بیتو، باوەڕێکی زۆرو، بەختەوەرییەکی فرەو، ڕەوشتو ئاکارێکی پاكو بەرزت هەبێت، ئەو خوایەش ڕاستی فەرمووە لەم فەرمایشتەی سوورەتی (فصلت)دا: ﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ ﴾. واتە: چاکەو خراپە وەك یەك نیینو لە یەك ئاستی هاوشێوەدا نین، جا تۆش بەڕەوشتی چاكو بە هێمنی، باشترین ڕەفتار بگرە بەر کە چاوپۆشیو لێبوردنو سینە فراوانییە.

ئیدی دەبینیت ئەوەی کە دژایەتیی لەنێوان خۆیو تۆدا هەبووە، وەك دۆستێکی نزیكو پارێزگاری لێ دێت.

دیارە هیچ کەسێکیش خاوەنی ئەم پلە بەرزە نیە تەنها ئەوانە نەبێت کە بەهۆی شاردنەوەی ڕقو کینەو نەریتی لەخۆبووردووییانەوە ئارامیان لە ئاست نەفامو جاهیلاندا گرتووەو ئەوانەن کە خاوەنی بەختێکی گەورەنو سەرفرازن.

## هـۆی چی بوو کـە (هابیـل) براکـەی نەدەکوشـت؟!

بێگومان برا باوەڕدارەکە (هابیل) دەسدرێژیی بۆ سەر براکـەی خـۆی نـەدەکرد تاکو بیکوژێت. بەڵام بۆ ئەوەی کە برا دڵڕەقەکەشی ئەم هەڵوێستە بە خـراپ لێـك نەداتەوەو، گومانیشی وا نەبێت کە گوایە بیرنەکردنەوەی (هابیل)ی بـرای بـەهۆی بێتواناییو دەستەوسانی یەوە بێت، بۆیە (هابیل) خۆی ئەم هەڵوێستەی خۆیی بـۆ ڕوون دەکاتەوەو هۆیەکەشی بۆ دیاری دەکات کە بۆچی وەك ئەو بـیر لـە کوشـتنی ناکاتەوە، ئەوەبوو پێی گوت من بۆیە دەست بۆ تۆ درێژ ناکەمو ناتکوژم، چـونکە بێگومان من لە خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان دەترسـم" (إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ).

بەڕاسـتی ئەمـەش ترسـێکە لـە خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان، بێگومـان ترسانیش لە خوا، لەلای مرۆڤـی بـاوەڕدار حاڵـەتێکی ئیمانـداریتیو خۆپـارێزیی (تقوی)و زانینی چاودێریی خوا لەسەری دەخولقێنێت. ئەم حاڵـەتی ئیمانداریـیـەش ڕێگەی ئەنجامدانی کاری ناڕەواو یاخی بوونو بەدکرداری لە خاوەنەکەی، دەگرێتو ناهێڵێت ئەو ڕێگە نابەجێیە بگرێتەبەر. هەروەها لەخواترسـان زمانـەی دڵنیـایی (صمام الأمان)ە لە ژیانی هەموو تاکەکەسو کۆمەڵێکداو، هەر ئەمەش بەهێزترین پاسەوانە بۆیان کە ڕێگەی دەستدرێژیو زۆرداریو ئازاردانیان لێ دەگرێت.

پێویستە لەسەر بیریارو تیۆرسازو پەروەردیاران سوور بـن لەسـەر پێگەیانـدنی تاکەکان بە پەروەردەی چاودێریی خـواو لەخواترسـانو، بـە تـەمابوونی پاداشـتی خواو، ڕژدیی لەسەر ڕەزامەندیی خوا، تاکو دەست بە هەقەوە بگـرنو، دەسـت لـە ناهەقو ناڕەزایی هەڵگرن.

هەر ئەمەش تاکە شیکاری ڕاسـتو دروسـتە کـە پێویـستە چـاکەخوازان بـەم

هۆیەوە لە حەرامو کاری نالەبار دوورکەونەوەو، ئەو ئامرازو هۆکارە نابەجێیانەش لە ژیاندا وەلانێن کە بەرەو بەدکارییان دەبات.

بەڵام کەسانی پیسو تەڵەکەباز، ئەم شیکارو لێکدانەوە شەرعییە ناخەنە ڕوو، بەڵکو وای لەقەڵەم دەدەن، گوایە چاکەخوازان بەهۆی بێدەسەڵاتیو بێ سەلیقەیی خۆیانەوە وازیان لە حەرامو بەدکاریو زۆرداری هێناوە. هەر ئەو تەڵەکەبازانەش پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن، کە گوایە ئەگەر دەرفەتو تواناو زەمینە بۆ چاکەخوازان بڕەخسێت، ئەوا ڕوو دەکەنە حەرامو بەدکاری، ئەمەش دیارە، کە پڕوپاگەندەیەکی پووچەڵو بەتاڵەو هەر خودی ئەو پیاوە ئیماندارە بەدرۆی دەخاتەوە، کە خوا لەسەر زاری ئەو فەرموویە: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾.

## واتای هەڵگرتنی ئۆباڵی هەردوو گوناهەکە

﴿أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ﴾

پیاوە باوەڕدارەکە (هابیل) هۆیەکی تری خستە سەر نیازە پاکەکەی خۆی کە هانی دەدات بۆ نەکوشتنی براکەی، ئەوەبوو پێی گوت: ﴿إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٩﴾ المائدة، واتە: من دەخوازم کە تۆ گوناهی منو گوناهی خۆیشت بخەیتە سەر شانی خۆتو، بەهۆی ئەمەوە ببیتە یەکێك لە کەسانی شایستەی نێو دۆزەخ، هەر ئەمەش سزای ستەمکارانە.

ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بکوژەکە دوو گوناهی لە ئەستۆدا دەبێت، گوناهەکانی خۆیو، گوناهی کوژراوەکە. سەبارەت بەم دوو جۆرە گوناهەش، ئەوە دیارە گوناهەکانی کابرای بکوژ کە لە ژیانـدا ئـەنجامی داون لێیـان بەرپرسیارەو ئەمەش هیچ گرێو گۆڵێکی تێدا نیە، چونکە گوناهـ خۆی بوونو خۆی ئـەنجامی داون، هەر بۆیەش کە دەگوترێت خۆی گوناهەکانی لە ئەستۆ دەگرێت، ئەوە بێگومـان مەسـەلەیەکی لـۆژیکی (منطقـي)و زانـراوەو لـە دەروازەی -دانـانی ئەنجامەکان لەسەر بەرایی یەکانیان-ە.

بەڵام کاتێك بکوژ گوناهی کوژراویش لە ئەستۆ دەگرێت، لەمەدا پرسیارێك هەیەو ئاخۆ مانای چی بێت؟ ئایا مانای ئەوەیە کە بکوژەکە هەموو گوناهەکانی ماوەی ژیانی کوژراوەکەش لە ئەستۆ دەگرێت؟ واتە گوناهێکی پێوە نامێنێت؟ لەو بڕوایەدا نیم وابێت!!

بەڵام واپێدەچێت ماناکەی ئەوە بێت، کە بکوژەکە گوناهی کـوژراو تـەنها لـە

مەسەلەی کوشتندا هەڵدەگرێت، واتە ئەگەر کوژراو بکوژ بوایەو گوناهی چەند دەبو، ئەوا بکوژە ڕاستەقینەکە هێندەی ئەوەش گوناهی لە ئەستۆدایە، جگە لەو گوناهە بنەڕەتییەی خۆیشی. بۆیەش ئەگەری کرداری کوشتن لە هەردوو کەسی ناکۆك ڕەچاو دەکرێتو بە ڕێژەیەکی هاوبەشو یەکسان لەنێوانییاندا، لەبەر ئەمەشە ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیانەوە-یان بە هەر چەکێکیانەوە- ڕووبەڕووی یەکدی بوەستن، ئەوا بکوژو کوژراو لە ئاگردان (لەدۆزەخ دان)، بکوژەکە بۆیە لە ئاگردایە، چونکە تاوانەکەی ئەنجام داوە، کوژراوەکەش بۆیە لە ئاگردایە، چونکە سوور بووە لەسەر کوشتنی ناحەزەکەی کە نەیهێشتبوو بیکوژێت، ئەمەش کارێکی نەتوانراوی بووەو لە سەروو ویستو توانایەوە بووە. ئەم مانا قورئانی یە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ جەختی لەسەر کراوەتەوە.

لەم ڕووەوە (مسلم) لە (صحیح)ی خۆیدا لە (احنف کوڕی قیس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گێڕاویەتییەوە کە گوتوویەتی: من لەماڵ دەرچوومو بەدوای ئەو پیاوەدا -کە مەبەستی لە (علی کوڕی ابوطالب)بووە- دەگەڕام، لەو کاتەشدا (ابو بکر)- خوا لێی ڕازی بێت- پێم گەیشتو گوتی: ئەی (احنف) بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم: دەمەوێت بچم سەرکەوتنی ئامۆزاکەی پێغەمبەر ﷺ، واتە: سەرکەوتنی عەلی- ببینم.. ئنجا (ابو بکر) پێی گوتم: ئەی (احنف)، بگەڕێوە، چونکە من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە، کە فەرموویەتی: **((إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ.. فَقُلْتُ -أَوْ قِيلَ-: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ قَدْ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ))**[1]، واتە: ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیانەوە ڕووبەڕووی یەکدی بوونەوە، ئەوا بکوژو کوژراو هەردووکیان لە ئاگردان.. منیش گوتم-یان گوترا-: ئەی پێغەمبەری خوا، باشە ئەوە حاڵی بکوژەکەیە، ئەی کوژراوەکە بۆچی لەو حاڵەتی سزایەدا دەبێت؟ فەرمووی: ئەویش

---

١) رواه مسلم: كتاب الفتن ٥٢ .

بێگومان ویستوویەتی هاوڕێکەی بکوژێت.

جا لەبەر ئەوەی لەم چیرۆکەشدا برا باوەڕدارەکە (واتە هابیل) بیری لە کوشتنی برا ستەمکارەکەی نەکردۆتەوە، ئەوا ئەگەری بە بکوژدانانی لە ئارادا نابێت، بەڵکو تەنها بکوژەکە وا دادەنرێتو هەردوو ڕێژەی گوناهەکان لە ئەستۆ دەگرێتو بە کردەوەش بەرپرسیاری گوناهەکانی هەردووکیانە، ئەمەبوو واتای: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ ﴾.

## لە لێکدانەوەی دەروونییەوە: (دەروونی خۆی هانی دابوو)

برا باوەڕدارەکە هەوڵیدا دڵی برا کینەدارەکەی نەرم کاتو، سۆزی لە دڵدا دروستکاتو، واتاکانی برایەتیو لەخۆبوردن لە دەروونیدا بخروشێنێتو، وەسوەسەی شەیتانی تێدا نەهێڵێتو، خواستەکانی کوشتنیشی بۆ لەناوبەرێت. بەڵام برا قینلەدڵەکەی بەدەم ئەم هەوڵە ڕاستەقینانەوە نەهات، بەڵکو هەر بەردەوام بوو لەسەر نیازی بەجێگەیاندنی ئەو کاری کوشتنەی، کە سووربوو لەسەری، ئیدی لەسەر ئەو هەستی کینەدارییەو لەسەر ئەو جۆرە بیرکردنەوە نالەبارە مایەوە هەتا ئەو کاتەی تاوانە گەورەکەی ئەنجامداو براکەی خۆی کوشت.

قورئانی پیرۆز بە ڕستەیەکی سەرسوڕهێنو موعجیزەدار، گوزارشتی لەو ماوە زەمەنییەی پێش کرداری کوشتنەکە کردووە، ڕستەکەش ئەمەیە کە خوا تیایدا فەرموویە: ﴿ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ المائدة﴾، واتە: نەفسی قابیل خاوەنەکەی هانداو، کاری کوشتنی براکەی بۆ ڕازاندەوەو، ئیتر بەم ڕەنگە کوشتی.

لەم ڕستەیەی قورئاندا مانای وشەی (طوعت)، واتە نەفسی قابیل، قابیلی هانداو دەرگای بۆ والآکردو کارەکەی بۆ ئاسانو جوان کرد. حەز دەکەین لێرەداو

لەبەر ڕۆشنایی زانستی دەروونناسیی شیتەڵکاری (علم النفس التحليلي)دا بۆ ئەم ڕستەیە بڕوانین‌و لەم ئاقارەشەوەشێوەیەك لە شێوەكانی تەفسیری دەروونناسیی قورئان بخەینە ڕوو.

بێگومان برا قین لە دڵو ستەمكارەكە لە ململانێیەكی توندو تاڵی دەروونیدا دەژیاو كەتبووە بەر كێشمەكێشی چەندین‌و ئارەزووو بیروبۆچوون‌و خورپەو وەسوەسەی لێك جوداو دژ بە یەك، هەروەها گوێی بۆ چەندین دەنگی جیاواز ڕادەگرت. وتەكانی برا ئاشتیخوازەكەی لە جولاندنی سۆزو بەزەییدا، واتاكانی چاكەی لە دڵو دەروون‌و هەست‌و قەوارەیدا دەبزواندو، بانگی دەكرد بۆ وازهێنان لە كوشتن، چونكە ئەوە برای خۆیەتی‌و كەسێكی ئاشتیخوازو هێمن‌و دڵفراوانەو نایەوێت براكەی خۆی (قابیل) بكوژێت، چونكە لە خوا دەترسێت، ئەی بۆچی (قابیل) ئەم دەكوژێت؟ ئاخۆ تاوانی (هابیل) چی بێت؟ پاشان ئەو ڕەوشتە بەرزانەی (هابیل) لە مامەڵەدا چاكەیەكی گەورەیەتی كە دەرهەقی براكەی كردوویەتی‌و، شایانی ستایش كردنیەتی، نەك تاوانێك بن‌و بەهۆیەوە بیكوژێت!! ئەمەش بۆ ئەوەی چەند ساتێك (قابیل) بەو هەستە پاكەوە بژی‌و ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تر لەخۆی بكات‌و، وردە وردە نزیكی كاتەوە لەلایەنگریی هەق‌و، واز لە كوشتنەكە بێنێت‌و، گوێ بۆ سەدای عەقڵ‌و لۆژیك(منطق) بگرێت.

وەلێ ئایا شەیتان لە ئاست ئەم واتا چاك‌و بەكەڵكانەدا وازی لێ هێناوە؟ ئایا پشت گوێی خستووە لە كاتێكدا ئەم كوڕە یەكەمین قوربانی ی ئادەمیزادە بە دەست شەیتانەوە؟ ئەوەبوو شەیتان بەردەوام خورپەو وەسوەسەی لە دڵیدا پەیدا دەكردو هەموو واتایەكی كینەو ڕق‌و حیقدی لە دەروونیدا دەوروژاندو، ئارەزووەكانی كوشتن‌و دەسدرێیشی تیادا بەرپا دەكرد.

دیارە نەفسە ستەمكارو شەڕخوازەكەشی، هانیی دەدا بۆ كوشتن‌و، ڕژدی یەكی زۆری خستبووە سەرو، ملكەچی كردبوو بۆ كوشتن‌و، ئەم كارەی بۆ ئاسان‌و جوان كردبووو، حەزی كارەكەی لەبەر دەناو پاڵی پێوەدەنا. هەروەها دەنگی حیكمەت‌و

عەقڵو حەقی تیادا کپ کردبوو، هەر بۆیەش تەنها دەنگی حیقدو کینەداریی پێ دەبیست‌و، تەنها وێنەی کوشتنی پیشان دەداو، تەنها واتاکانی دوژمنکاریشی خستبووە بەردەم. ئیدی ئەم کەسە نەگبەت‌و بەدبەختەش(قابیل) کاتێکی ناخۆش‌و تاڵ‌و نالەبارو نارەحەتی لەم ململانێ توندوتیژە دەروونی یەدا بەسەر بردو کەوتە دوودڵییەکی زیاد له ڕادەوە کە ئاخۆ وەڵامی کێ بداتەوە؟ گوێ لە کام دەنگە بگرێت؟ چ ڕێگایەك بگرێتەبەر.

له دواییشدا شەیتان زاڵ بووو لەگەڵیدا حیقدو ڕق‌و دوژمنکاری زاڵ بوون‌و، بەم ڕەنگەش نەفسە سەرکێش‌و شەڕخوازەکەی زاڵ بووو، هانیدا بۆ کوشتنی براکەی‌و بۆیشی ئاسان کرد.

مامۆستای پێشەوا (محمد رشید رضا) سەبارەت بە لێکدانەوەی دەروونیی ئەم ئایەتە، گوتوویەتی: "لەم جێگەیەدا کەسێکم نەدیوە کە ڕەوانبێژیی ئەم ڕستەیە (فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ)ی شی کردبێتەوە هێندەی ئەوەی کە لە دەروونمدا هەندێك تەفسیرو لێکدانەوەی تیادا بەدیی دەکەم. بۆیە بەڕاستی شوێنێکی تایبەتیی لە ڕەوانبێژییدا هەیە کە کاریگەریی لە دڵدا دروست دەکات‌و لە هەموو لایەکەوە فشار دەخاتە سەری. من ئێستا کە لەم بارەیەوە دەنووسم‌و دڵیشم ڕێی نووسینی لێ‌گرتوون بەهۆی ئەو کاریگەری‌و کاردانەوەیەی کە تێیدا بەدیی دەکەم.

بێگومان ئەم وشەیە (فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ) دەلالەت دەکات لە ڕیزبەندیی‌و دووبارەبوونەوە له هەڵنانی فیترەت‌و سروشتی مرۆڤدا بۆ گوێڕایەڵی کردنی ئەو چکۆسی‌و حەسوودی یەی کە مرۆڤ بۆ کوشتن بانگ دەکات، ئەمەش وەك چۆن ئەسپ‌و حوشتری سەرکێش، ملکەچ‌و گوێڕایەڵ دەکرێت.

هەروەها ئەم وشەیە ئەو کارە دەنوێنێت کە کوڕەکەی ئادەم خۆی لێی تێدەگەیشت‌و کە ئەوەبوو حەسوودیی یەکەی خۆی دەرهەقی براکەی، وای لێکرد ئەو برایەی بکوژێت لە کاتێکدا لەنێوان (پێ‌خستنە سەر تاوانەکە)و (دەست لێ

هەڵگرتنی)دا بووو، بیری لە هەر وشەیەك لە وشە بەپێزەکانی براکەشی دەکردەوەو لە هەر دانەیەکیشیاندا وەلانەرێکی تاوانەکەی بەدیی دەکرد کە ئەوەی لە فیترەت‌و نەریتی ئاساییدا هەیە لە (وەلانەرەکانی عەقڵ‌و لێك نزیکیی برایەتی‌و شان‌و شکۆ)ی بۆ بەهێزو پتەودەکرد. بەڵام ئەو پەتای چکۆسی‌و حەسوودییە لەنێو نەفسە فەرمانکار بە خراپەکەیەوە بەسەر هەموو هۆکارێکی وەلانەری نێو نەفسی گازاندەکارو ڕەخنەگریدا دەهات‌و دەچوو، ئیدی بەردەوام ئەم نەفسە بە هەردوو ڕووکارە (فەرمانکار بە خراپە)و (ڕەخنەگر لە خراپە)وە بۆ هۆکاری خراپەو وەلانەری خراپە دەهێنراو لادەبرا، تا لە ئاکامدا نەریتی حەسوودییەکە بەسەریاندا زاڵ بووەو پەلکێشی کردووە بۆ گوێڕایەڵیکردنی ئەم نەریتە.

هەر بۆیەش گوێڕایەڵیکردنی هۆکارە وەلانەرەکانی فیترەت‌و پەندو ئامۆژگاری بۆ بانگەشەکاری حەسوودی (واتە ملکەچ کردن‌و بەچۆکداهاتنی هەموو ئەو وەلانەرانەی تایبەت بە فیترەت‌و سروشتی ساغ‌و تایبەت بە پەندو ئامۆژگاریی جوانیش، بۆ هۆکارو نەریتی حەسوودی) ئەو ملکەچی‌و گوێڕایەڵییە، کە مانای فەرمایشتەکەی خوا دەبەخشێت، کە خوا لەو ئایەتەدا مەبەستێتی.

ئیدی کاتێك ئەمە هاتۆتە ئاراوە (واتە کاتێك فیترەت بۆ حەسوودی ملکەچ‌و گوێڕایەڵ بووە) ئەو برا ستەمکارە، برا ئاشتیخوازەکەی خۆی کوشتووە[1]".

1) محمد رشید رضا، تەفسیری (المنار)، بەرگی ٦، لاپەڕە ٣٤٥ .

## " فَقَتَلَهُۥ "

لە دواییدا برا دڵ پڕ لە قینو حاقیدەکە، بەدەم ملکەچ کردنی دەروونییەوە هات، کە ئاڕاستەی کات بۆ کوشتنی براکەی، ئەوەبوو تاوانەکەی جێبەجێ کردو خوێنی براکەی ڕشتو، کوشتیی.

کوشتیی (فَقَتَلَهُۥ) بەم ڕەنگەو بە یەك وشە ئەم دیمەنە کۆتایی پێ هێنراوە. قورئانی پیرۆز ئەم وشەیەی بە کورتی بۆ باسی تاوانەکە داناوەو لێ جیا نەکردۆتەوە، بەڵکو تێپەڕیوە بۆ سەر ئاسەوارەکانی تاوانەکە ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ واتە: دوای ئەو کوشتنە، برا بکوژەکە بووە بە یەکێك لە ڕەنجەڕۆو خەسارەتمەندان..

هەر لەم ڕستە کورتەدا (فَقَتَلَهُۥ) چەند پەندو حیکمەتێك دەربارەی گوزارشت لە تاوانەکە، بەدیی دەکرێت، وەك:

١- ویستو ئارەزووی قورئان لە تێپەڕاندنی دیمەنی کوشتنی براکە لەلایەن براکەیەوە، چونکە ئەو شوێنە شایستەی درێژەپێدانو باسی چۆنیەتی تاوانەکە نیەو، پێویست بە هەڵوێستەی زۆریش لەسەری ناکات. چونکە ئایا کارە قەدەغەکراوەکە ئەنجام نەدراو، تاوانەکە ڕووی دەدا؟ لەبەرئەوە تاکە وشەیەك لێرەدا بۆ باسکردنی تاوانەکە بەسە.

٢- قورئان نایەوێت ئەم دیمەنە ترسناکە بەدرێژی لە زەینو هەستی بیسەردا بهێڵێتەوە، تاکو لەلای بیسەر هیچ پەسندکردنێك، یان لاساییکردنەوەیەکی تاوانبار پەیدا نەبێت، بەڵام قورئان وا دەخوازێت، کە بیسەر دیمەنی کوشتنەکە تێپەڕێنێت بۆ بارودۆخی دوای تاوانەکە، کە ئاسەوارو ئاکامو

زیانەکانە، تاکو (ئەو سەرسام بوونو ئارەزوو لە لاسایی‌کردنەوەی تاوانبارەکە) کە لەوانەیە لە زەینو هەستی بیسەردا دروست ببێت، لاببات‌و بیسڕێتەوەو، پەندیی لێوەرگرێت.

٣- واش دیارە قورئان ئەوەمان لێ دەخوازێت کە تەنها بە هەواڵی کوشتنەکەی قایل بینو بەدوای شیکاری شێوازی کوشتنەکەیدا نەگەڕێین. جا لەبەرئەوەی خوا لە قورئاندا بە درێژی باسی کرداری کوشتنەکەی نەکردووە، ئێمەش بۆمان نیە کە لەو باسەدا ڕۆبچین، بەڵکو ئەوەمان لێ خوازراوە کە تەنها لەگەڵ ڕادەی باسە دیاریکراوەکەی قورئاندا بمێنینەوەو، واز لە هەر قسەو باسێکی درێژکراوە بێنین، کە لەسەر کرداری کوشتنەکە درێژەی پێدەدرێت، چونکە ئەوە قسەوباسێکی نێو دەقە ئیسرائیلییەکانە کە چەند تەفسیرنووسێك هێناویانە، بۆیە ناشێت کە گوتارو فەرمایشتی خوا بە قسەو باسی پووچەڵو پڕ لە ئەفسانەو درۆودەلەسە تەفسیر بکەین، چونکە دیاردەی پووچەڵی‌و ئەفسانەیی‌و درۆو دەلەسە تاکە سیفەتی دیاری ئەو دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلیانەن.

## زیانە دیارو بێسنوورەکانی تاوانبارەکە لە کوشتنی براکەیدا

برا، برای خۆی کوشت، بەڵام چ سوودێکی لەوە دەستکەوت؟ ئایا مەبەستو ئامانجەکانی بەدیی هێنا؟ ئەی ئایا ئەوەی کە ئەشتانی نەفرەت لێکراوو نەخشە شەڕخوازەکەی خۆیشی بەڵێنیان پێدابوو، بەدەستی هێنا لێیانەوە؟

بێگومان ئەو لە ڕشتنی خوێنی براکەیدا هیچ سوودو چاکەیەکی چنگ نەکەوتو، هیچ شتێکیشی لێ دەست نەکەوت، بەڵکو زیانێکی دیارو بێسنووری کرد ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾، بەڕاستی زیانی ئەو گشتیو هەمەلایەنە بوو، هەموو چەمكو مانایەکی نێو زاراوەی (زیان/ الخسارة)ی لەخۆ گرتبوو، جگە لە هەموو وێنەو هاوشێوەیەکی وێنە نابەجێکانو، لە هەموو دیاردەیەکی لە

ئەستۆنراوی نێو وشەکەش، ئەمەش هەندێك وێنەو دیاردەی زیانەکەیەتی:

١- بێگومان براکەی لەدەست چوو لە کاتێکدا خوێنی ڕشت.

٢- بێگومان باوكو دایكو خزمو کەسوکاری لەدەست چوو، چونکە ئەوان هەموویان لەسەر ئەو تاوانە لێی زویر بوون.

٣- بێگومان هەموو ماناکانی ئەو برایەتییەی لەدەست چوو، کە بە براکەیەوە دەیبەستەوە.

٤- بێگومان هەموو مانا جوانەکانی مرۆڤایەتیی لەدەستدا، وەك سۆزو خۆشەویستیو لێبوردەییو لەخۆبڕان.

٥- بێگومان خۆی لەدەستداو هێمنیو ئارامیو بەختەوەریی خۆیشی لەدەستدا.

٦- بێگومان ژیانی خۆیشی لەدەستدا، چونکە لە ژیانێکی چاکەخوازیو سوودمەندو ئیجابییەوە، بۆ ژیانێکی خراپەکاریو ستەمکارییو دەستدرێژکارییی، گۆڕیی.

٧- بێگومان دوارۆژو قیامەتی خۆی لەدەستدا بەو ڕەنگەی، کە لە ڕەحمەتو بەهەشتی خواوە دەری پەڕاند بۆ نێو سزاو دۆزەخی خوا.

٨- بێگومان مێژووی خۆی لەدەستدا، چونکە بووە مێژوویەك بۆ زولمو ستەمو دوژمنکارییو دەسدرێژیی. ئیدی ئەوەبووە نموونەیەك بۆ ماناکانی شەڕخوازیو خراپەکاریو، بووە پێشەنگێکیش بۆ گشت بکوژێکی ستەمکارو شەڕانی.

ئەمە جگە لە چەندین وێنەو دیاردەو شێوەی ئەو زیانە دیارەی کە لە فەرمایشتەکەی خوا ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ پیشان دراون.

هۆکاری هەموو ئەم زیانەش تەنها بەدەمەوەچوونی خورپەو وەسوەسەکانی شەیتان بووە. هەر کەسێکیش سەرپێچیی لە خوا بکات دەکەوێتە نێو ئەم زیانەوە، چونکە ئاکامێکی سرووشتیو ئاساییی هەر گوناهێكو هەر سەرپێچییەکەو، ئەنجامی هەر کەسێکیشە، کە دوای هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێت، هەروەها

به‌رهه‌می كفرو به‌دكاری‌و سه‌رپێچی كردنه‌.

هه‌ر لێره‌شدا زیانی ئه‌و برا كینه‌دارو سته‌مكاره‌ تێده‌په‌ڕێنین تاكو سه‌رنج له‌ به‌خشینی مانایه‌كی گشتگیرترو فراوانتری ئه‌و زیانه‌ بده‌ین كه‌ له‌ كات‌و شوێنی خۆی تێپه‌ڕیوه‌ بۆ هه‌ر كات‌و شوێنێكی تریش لێك ده‌درێته‌وه‌. چونكه‌ هه‌ر كه‌سێك خوێنی برای خۆی بڕێژێت، ئه‌وه‌ بێگومان خه‌ساره‌تمه‌نده‌، هه‌ر كه‌سێكیش هه‌ر مرۆڤێك له‌ ناهه‌ق بكوژێت، بێگومان ئه‌ویش زه‌ره‌رمه‌ندو ڕه‌نج به‌خه‌ساره‌، خواش ڕاستی فه‌رمووه‌، كه‌ دوابه‌دوای ته‌واوبوونی چیرۆكه‌كه‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ...(٣٢) المائدة﴾، واته‌: بۆ ئه‌وه‌ی ڕووداوی له‌م جۆره‌ ڕوونه‌دات، له‌م پێناوه‌دا ئه‌و بڕیاره‌مان له‌سه‌ر به‌نی ئیسرائیل نووسی، كه‌ ئه‌گه‌ر هه‌ركه‌سێك كه‌سێكی دی به‌ ناهه‌ق بكوژێت‌و له‌جیاتی كه‌سێكی تر نه‌یكوشتبێت، یان هه‌ر كه‌سێك تاوان‌و كاری تێكده‌رانه‌ له‌سه‌ر زه‌وی ئه‌نجام بدات، ئه‌وه‌ بێگومان وه‌ك ئه‌وه‌ وایه‌ كه‌ هه‌موو خه‌ڵكیی سه‌ر زه‌ویی كوشتبێت. هه‌ر كه‌سێكیش كه‌سێكی دیی له‌ مردن ڕزگار بكات‌و ژیانی بۆ پاراستبێت، وه‌ك ئه‌وه‌ وایه‌، كه‌ هه‌موو خه‌ڵكی سه‌ر زه‌ویی له‌ مردن ڕزگار كردبێت.

هه‌ر ئه‌م جۆره‌ زیان‌و خه‌ساره‌تمه‌ندیه‌شه‌، كه‌ به‌سه‌ر نه‌ته‌وه‌ی موسڵماندا دێت له‌ كاتێكدا له‌نێوخۆیدا كوشتاری یه‌كدی ده‌كه‌ن‌و، له‌ كاتێكیشدا دوژمنایه‌تی‌و ڕق‌و كینه‌ له‌جیاتی برایه‌تی‌و خۆشه‌ویستی‌و لێبوردن، دڵانی ڕۆڵه‌كانی نه‌ته‌وه‌ داگیر ده‌كات.

مێژووش هه‌واڵێكی ڕاستمان ده‌رباره‌ی ئه‌م حه‌قیقه‌ته‌ بۆ ده‌كات، بۆ نموونه‌ له‌ كاتێكدا نه‌ته‌وه‌ی ئیسلام له‌سه‌ر برایه‌تی‌و خۆشه‌ویستی‌و هاوكاری پێك هاتوون‌و هه‌موویان وه‌ك دڵی یه‌ك كه‌س بوون، قازانجیان ده‌ستكه‌وتووه‌و سه‌ركه‌وتووو سه‌رفرازو شادمان بوون. دیارترین نموونه‌ش له‌سه‌ر زیانباریی‌و زه‌ره‌رمه‌ندیی

نەتەوەی ئیسلام ئەو حاڵەتەیە، کە لەم سەردەمەدا بە دەستیەوە دەناڵێنێت، ئەوەتا وتەو یەکدەنگیی نەتەوە نەماوەو بەش بەش بووە، ڕۆڵەکانیشی ناتەبا بوونو شەڕو کوشتاری یەکدی دەکەنو، وازیان لە یەکێتیو برایەتیو هێزیان هێناوە. بەم ڕەنگەش موسڵمانان زەرەرمەند بوون، زەرەرەکەشیان هەمەلایەنەیەو هەموو شتێکی گرتۆتەوە، چونکە خوێنو ڕۆڵەشیان لەدەست چووە، ئاکارو ئاشنایەتییان لەدەست چووە،ماڵو داراییو ئابوورییان لەدەست چووە، بوونو قەوارەیان لەدەست چووە، هەروەها کاریگەرییو سەنگو پلەی خۆیشیان لەدەست چووە.

## قەلەڕەش بکوژی دەستەوەستان فێر دەکات

کاتێك برا کینەدارەکە، براکەی خۆی کوشتبوو، دەستەوەستانیش بوو لە هەڵسو کەوت، نەیدەزانی لاشەی براکەی چی لێ بکات، ئیدی ئەم بەهێزە سەرکێشە، وەك لاوازێکی بێدەسەلاتی لێ هات، خواش خواستی وابوو کە لاوازیو بێدەسەلاتییەکەی خۆی پیشان دات، هەر بۆیەش قەلەڕەشێکی بۆ نارد، تا فێری هەڵسوکەوتی داهاتووی بکات ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ... ﴿٣١﴾ المائدة﴾، واتە: دوای کوشتنی براکەی، (قابیل) نەیدەزانی چی لە تەرمی براکەی بکات، بۆیە خوا -دوای ئەوەی ئەو لاوازیو بێدەسەلاتی یەی خۆی پێ سەلماند) قەلەڕەشێکی بۆ نارد، کە لەبەر چاوی ئەودا چاڵێکی لە زەوی بۆ قەلەڕەشێکی مرادەرەوەبوو هەڵکەند، تا پیشانی بداتو فێری بکات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە. ئەم برا بکوژەش کاتێك دیمەنی ئەو قەلەڕەشەی بینی، گوتی: هەی واوەیلا قوڕبەسەرم، ئەوە بۆچی من دەستەوسان بوومو بەقەد ئەو قەلەڕەشەش کارامە نەبووم، تابتوانم تەرمی براکەم لە خاك دا بشارمەوە.

ئایا یەك قەلەڕەش بووە، یان دوان بوون؟ ئایا ئەگەر دوو قەلەڕەش بوون شەڕیان لەگەڵ یەکدیدا کردووە؟ ئەی ئایا قەلەڕەشە بکوژەکەیان چاڵی لە زەوی هەڵکەندووە تاکو لاشەی قەلەڕەشە کوژراوەکەی تیادا بشارێتەوە؟

ئەمانە چەند پرسیارێکن‌و، هیچ وەڵامێکیان لەلای ئێمە نیە، چونکە قورئانی پیرۆزو فەرموودەی ڕاست (صحیح)یش وەڵامیان نەداونەتەوە. بەڵکو هێندەی کە هاوەڵان لە تێگەیشتنی ئەو ئایەتەدا پێی دابین بوون، ئێمەش پێی دابین دەبین. گرنگ ئەوەیە کە بکوژەکە لە هەڵس‌وکەوت دەستەوسان بووەو، قەلەڕەشەکە هاتووە تاکو فێری بکات چۆن تەرمەکە بنێژێت، ئنجا هەر قەلەڕەشەکە دەست دەکات بە هەڵکەندنی زەوی‌و، چاڵی تیایدا هەڵدەکەنێت، چاڵ هەڵکەندنەکەشی بەردەوام دەبێت تیایدا (وەك لە فەرمانە ڕانەبردووەکەی (یبحث)دا ئاماژەی بۆ دەکات‌و کە بەڵگەشە لەسەر نوێ‌کردنەوەو بەردەوام بوون تا ئەو ساتەی کە بکوژە دەستەوسان بووەکەش سەرنجی بەلادا ڕادەکێشرێت وەك ئەوەی داوای لاسایی کردنەوەی کاری چاڵ‌کردنەکەی لێ بکات. ئەم کەسە دەستەوسانەش لە جم‌و جوولی قەلەڕەشەکە تێگەیشتووەو دەستی بە هەڵکەندنی زەوی کردووەو چاڵی بۆ تەرمی براکەی هەڵکەندووەو تیایدا ناشتویێتی.

لە کاتێکیشدا سەرنجی ورد لەو دیاردەیەی قەلەڕەشەکە دەدەین کە چۆن مرۆڤە بکوژەکەی فێری ناشتنی تەرم کردووە، چەند ئاماژەیەك دەردێنین، وەك:

١- بێگومان ئەم ڕووداوە یەکەم تاوانی کوشتنە کە ئەنجام دراوە، چونکە بکوژەکە نەیزانیوە چۆن لە تەرمەکە دەرباز بێت، ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەوەی کە کوڕەکەی ئادەم ڕاستەوخۆ لە (پشتی ئادەم) خۆی بووە، وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە.

٢- ئەم ڕووداوە بێ‌دەسەڵاتی‌و دەستەپاچەیی ئەو مرۆڤە کینەدارەی تۆمار کردووە کە ئیدیعای هێزو هۆشمەندی‌و زیرەکی‌و ڕەفتاری چاك دەکات‌و، کەچی گومڕاو

ئازاردەرو دەسدرێژکارو ستەمکار دەبێتو، پاشان لە ئاست گرفتێکدا کە دێتە ڕێی، دەستەوسان دەبێت، ئیدی قەلەڕەشێك کە هیچ زانستێکی نیەو هیچ هۆشیاریو زیرەکییەکیشی نیە، دێتو ئەم مرۆڤە هۆشدارو زیرەکە فێر دەکات.

٣- ئەم ڕووداوە لاقرتێ بەو مرۆڤە دەکات لەوەدا کە دەستەوستان بووەو سووکایەتی بە نەفامییەکەیو گەمژەییو ساویلکەییەکەشی دەکات. چونکە پەککەوتەو دەستەوسان ماوەتەوەو چاوەڕێی کەسێکی کردووە کە فێری بکات، تا ئەو کاتەی کە قەلەڕەشەکە هاتووەو فێری کردووە.

ڕەنجەڕۆ بێت ئەو مرۆڤەی کە هەموو دنیا بە پڕوپاگەندەو زاناییو هاتو هاواری گەورەیی خۆی پڕ دەکاتو، کەچی هەندێك مەسەلەی مەعریفیی بەڵگەنەویستیی لی پەنهان دەبێتو، لەبەردەم هەندێك مەسەلەی سەرەتاییشدا دەستەوسان دەبێت.. داخۆ چەند مەسەلەی بنچینەیی تریش هەبێت کە لەم مرۆڤە خۆ بەزانا دانەرە نەفامە پەنهانە!!

## پەشیمان بوونەوەی بکوژەکە..
## پەشیمان بوونەوەی کەسێکی دەستەوسان و
## خەسارەتمەندە، نەك پەشیمانیی کەسێکی تۆبەکار

دوای ئەوەی بکوژەکە براکەی خۆی کوشت، هەستی بە پەشیمانییەکی زۆر کرد، وەك خوا دەربارەی فەرموویەتی: ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، بەلام ئەم پەشیمان بوونەوەیەی بە شێوەیەکی لەبارنەبووە، بەڵکو پەشیمانبوونەوەیەکی نالەبار (سلبی) بووە، چونکە پەشیمان بوونەوەی پەککەوتەیەکی کینەدار بووە، نەك پەشیمانیی گوناهبارێکی تۆبەکار.. هەروەها پەشیمان بوونەوەی کەسێکە، کە هەستی بە زیانێکی گەورە کردوە، لە کاتێکدا بە تەمای سوودێکی زۆرو هەمەلایەنە بووە.

لەوانەیە هەندێك کەس لێرەدا ئەو پرسیارە بخروشێنن، کە لەبەرئەوەی بکوژەکە -بەپێی دەقی قورئان- لە تاوانەکەی پەشیمان بووە، ئەی بۆچی خوا تەوبەی لێ پەسند نەکردووە؟ بۆچی خوا لێی خۆش نەبووە؟ لە کاتێکدا هەر کەسێك، ئەگەر گوناهێك بکات و لێی پەشیمان بێت و تۆبە لەلای خوا بکات، خواش تەوبەی لێ وەردەگرێت؟!

وەڵامی ئەم پرسیارەش ئەوەیە، ئەگەر بکوژەکە وەك تۆبەکارێك پەشیمان ببوایەتەوە، ئەوا خوا تەوبەی لێوەردەگرت، بەڵام بکوژەکە (قابیل) بەم شێوەیە پەشیمان نەبۆتەوە، تەوبەی نەکردووەو، داوای لێخۆشبوونی نەکردووەو، هەستی بە هەڵەو گوناه نەکردوە. خۆ ئەگەر ئاوای بکردایە، ئەوا خواش تەوبەو پەشیمانیی لێ پەسند دەکرد، چونکە خوا لە هەموو گوناهێك دەبوورێت ﴿...إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ...﴿٥٣﴾ الزمر﴾، بۆیە هەرکەسێك، ئەگەر بە ڕاستگۆیی و پاکی و

دڵسۆزییەوە تەوبە بکات، خواش تەوبەی لێوەردەگرێت.

بەڵام پەشیمانیی ئەم بکوژەش لە ئەنجامی نەتوانینو پەککەوتەیی خۆیەوە، دەرهەقی ڕەفتار بەلاشەکەوە بوە، ئیدی کاتێك قەلەڕەشەکە هاتووەو ئەو کارەی فێرکردووە، ئەویش هەستی بە کەموکوڕییەك لە مرۆڤایەتییەکەیو شەرمەزارییەك لە هێزو دانایی یەکەدا کردوە، بەم پێیەش هەستی بە پەشیمانییەکی زۆر کردوە.

پاشان لەوانەیە پەشیمان بوونەوەکەی لەبەر هۆیەکی تریش بووبێت، ئەو هۆیەی، کە نەیتوانیوە مەبەستی خۆی لەو کوشتنە بەدی بهێنێت، چونکە بێگومان ئەو، براکەیو خۆیو ئامانجەکانیشی لە دەستداون، ئیدی وادیارە پەشیمان بوونەوەکەی لەسەر لەدەستدانی مەبەستەکەیو ونبوونی ئاواتەکانی بووبێت.

بێگومان بکوژەکە دوو پەژارەی بەسەردا هاتووە، پەژارەی زیانو، پەژارەی پەشیمان، (فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ) لەگەڵ (فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ).

**واتاکانی** ﴿ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾ **و** ﴿ فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًاۚ ﴾...

لە کۆتایی چیرۆکەکەدا ئایەتێك بۆ لێکدانەوەی بەسەرهاتی هەردوو کوڕەکەی ئادەمو بۆ دیاریکردنی ئاکامی بکوژە کینەدارەکەش خراوەتە ڕوو، کە خوا تێیدا فەرموویەتی:

﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ ... ﴿٣٢﴾ المائدة﴾.

بێگومان ئەمە ڕاستییەکی ڕۆشنو ڕاستگۆیانەی قورئانە کە بە ڕستەی مەرج (جملە الشرط) دارێژراوەو مانای جەخت کردنە سەرو حەقیقەتی چەسپاو (یەقین) دەگەیەنێت. بۆیە هەر کەسێك مرۆڤێك بە ناهەق بکوژێتو لەجیاتی کەسێکی کوژراوی دی نەیکوشتبێت، یان هەر کەسێك تاوانو بەدکاریی تری لەسەر زەوی ئەنجام بدات، وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکیی سەر زەمینیی کوشتبێت، هەر کەسێکیش مرۆڤێك لە مردن ڕزگار بکاتو ژیانی بپارێزێت، وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی سەرزەمینی لە مردن ڕزگار کردبێت.

جا ئیدی ئەگەر کەسێك کەسێکی دی بە ستەمو بە ناهەق بکوژێت، وەك ئەوە وابێت کە هەموو خەڵکیی کوشتووە، ئاخۆ ئەمە چۆن بێتو، بۆچی وایە؟!

١- بێگومان کوشتنی تەنها یەك کەس کوشتنی هەموو خەڵکییە، چونکە بەڕاستی کارێکی هێجگار قورسە لەسەر مرۆڤێك کە مرۆڤێکی دی بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا بکوژێت، بۆیە پێش ئەو تاوانەش بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەنێوان خۆگرتنەوەو دوودڵیو ترسو لەرزدا دەژی -وەك یەکەم کوڕی ئادەم

(قابیل) که لەو بارودۆخەدا بوو-، پاشان سەدای ناهەقو دوژمنکاری بەسەریدا زاڵ دەبێتو کرداری کوشتنەکە ئەنجام دەداتو، بەربەستە دەروونی یەکەش دەشکێنێت که لەنێوان خۆیو کاری کوشتندا دروست ببوو.

جا ئەگەر ئەم بکوژە بیەوێت بۆ دووەم جار کەسێکی دی بکوژێت، ئەوا ئەم کارە ئاسانترە دەبێت لەلایو، لێپرسینەوەی ویژدانیشتی لەسەر خۆی کەمتر دەبێت، جگە لەوەی باری دەرونیی نامێنێتو دوودڵیو ترسو لەرزیش لە تاوانەکانی سێیەم، یان چوارەم، یان پێنجەمی کوشتندا هەر نامێنێت. بەم ڕەنگەش لەلای ئەم بکوژە (پسپۆڕە) که لە کاری کوشتندا پسپۆڕ بووەو کردوێتی بە پیشە، کرداری (کوشتن) دەبێتە مەسەلەیەکی پەسندی ئاسایيو هیچ نامۆییو تەمومژێکی تێدا نیەو هیچ شەرمەزارییەکیش بەدی ناکات. هەر بۆیەش وادیارە کە هەموو خەڵکیی کوشتووە (فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا).

٢- مانایەکی تری ئاماژە بۆکراوی ڕستەی (فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا) ئەوەیە کە دەسدرێژی بۆ سەر یەك کەسو ڕژاندنی خوێنی بە ستەم، دەسدرێژییە بۆ سەر هەموو خەڵکی، دەرهێنانی ئەو گیانەش لەنێو نەفسێکی بەشەری دا، وەك ئەوە وایە کە گیانی هەموو نەفسێکی بەشەری دەربهێنرێت.

بێگومان واتاو چەمکی مرۆڤایەتی لەلای مرۆڤ پارێزراوو ڕێزلێگیراوە، مرۆڤایەتیی مرۆڤیش پارێزراوو ڕێز لێنراوە، پێویستە هەموو خەڵکیش کۆك بن لەسەر ڕێز لێگرتنیو بە هێندگرتنیو پارێزگاریکردنی، هەروەها پێویستە ڕێگەچارەیەك لە هەر مرۆڤێکی دڵ پڕ لە قینو زۆرداریش بگرنو نەهێڵن سنوور ببەزێنێتو دەسدرێژیی بکاتە سەر نەفسی بەشەریو کوشتنی خاوەنەکەی، چونکە بەو ڕەنگە واش دیارە کە هەموو خەڵکیی کوشتبێت.

سەبارەت بە فەرمایشتەکەی تری خواش (وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًاۚ) هەرکەسێکیش بیژیەنێت وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی ژیاندبێت، دوو

مەبەست دەبەخشێت:

١- بێگومان گەر مرۆڤ گیانو نەفسی مرۆڤی برای بژیەنێتو پارێزگاریی بکات، بەڵگەیە لەسەر بوونی واتا مرۆییەکان له دەروونیداو، پاشەکەوتبوونی ئاکارە بەرزە ئینسانییەکان تێیداو، ئاراستەکردنیان لەسەر هەڵسوکەوتو ژیانی.

٢- بێگومان ئەوکەسەی ڕێز له دەروونی مرۆڤەکان دەگرێتو دەیانپارێزێت، دەبێتە پێشەنگی کەسانی دی، لەو ڕەفتارە نایابە مرۆییەدا، هەر ئەم جۆرە مرۆڤەش خاوەنی کاراییو شوێنەواری لەبار دەبێت له ئاراستەکردنی خەڵکیدا بۆ سەر ئاقاری کردەیی ئیجابی له بواری پاراستنی ژیانی خەڵکیو ژیاندنیاندا. بۆ حەقیقەتیش دەڵێینو دانی پیادا دەنێین، کە بێگومان له هیچ بەرنامەیەکی تردا وەك ئیسلام ئەم مانا ئینسانییە ڕەچاو نەکراوەو، هیچ بەرنامەیەکیش وەك ئیسلام ڕێز له مرۆڤایەتی مرۆڤ ناگرێت، هیچ خەڵکێکیش وەك موسڵمانانی پابەند بە ئیسلام، نەفسی بەشەریی ناپارێزێت. مێژووش شایەتی پێوەری دروستی ئەم ڕاستییەیە.

ئەو شاعیرەش ڕاستی پێکاوە، کە گوتوویەتی:

ملكنا فكان العدل منا سجيـــــة
فما ملكتم سال بالدم أبطـــــح
وحللتم قتل الأسارى وطالمـــــا
غدونا على الأسرى نمن ونصفـــح
فحسبكم هذا التفاوت بيننـــــا
فكل إناء بالذي فيه ينضـــــح

بێگومان ئاساییترین کار، لەلای خەڵکی غەیری موسڵمان، کوشتنی مرۆڤو لەناوبردنی گیانو ڕشتنی خوێنە بەبێ هۆیەك، وەك لەم سەردەمەشدا دەیبینین.

## (كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ).. بۆچی بووە بە یاسا لەسەر گەلی بەنی ئیسرائیل؟!

هەر لەو ئایەتەی کۆتایی چیرۆکەکەدا هەڵوێستە لەسەر ئەو ڕستەیەش دەکەین کە خوا دەفەرموێت: ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ...﴾ جا داخۆ پەیوەندی نێوانی چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەمو، گەلی (بەنی ئیسرائیل) چی بێت؟ ئەی بۆچی بە تەنها ئەوان لە جیاتی گەلو نەتەوەکانی دی، لەم ئایەتەدا بە تایبەتی ناویان هاتووە؟

وادیارە تاکە پەیوەندی یەك لەنێوان (بەنی ئیسرائیل)و (هەردوو کوڕەکەی ئادەم)دا، یان بە وتەیەکی ڕوونتر بڵێین" لە نێوان (بەنی ئیسرائیل)و کوڕە بکوژەکەی (ئادەم)دا، پەیوەندیی (کوشتن)ە، یان پەیوەستی یەکی نێوان (ئارەزووکردنە لە کوشتن).

ئەو تەفسیرنووسانەی ڕایان وابووە کە هەردوو کوڕەکەی ئادەم لە هۆزی (بەنی ئیسرائیل) بوون، ئاوڕیان لەم مانایە نەداوەتەوە (واتە پەیوەندیی کوشتنو ئارەزوو لە کوشتن) لەنێوان ئەو کوڕەی ئادەمو (بەنی ئیسرائیل)دا، بەڵکو ڕایان وایە کە گوایە ڕەچەڵەك(نسب)ی ئەو دوو کوڕە بۆ (ئادەم) بە شێوەیەکی گشتی یەو بەو پێودانگەیە کە (ئادەم) باوکی هەموو مرۆڤایەتی یەو خەڵکی هەموویان بە دوو کوڕەو بە (بەنی ئیسرائیل)یشەوە ئادەمیزادن. هاندەری ئەو جۆرە تەفسیرنووسو لێکدەرەوانەش بۆ دەربڕینی ئەم جۆرە واتاو بیروڕایە ئەم ڕستەیەی ئایەتەکەیە ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ...﴾.

بێگومان لێرەدا باسی (بەنی ئیسرائیل)و ناوهێنانیان، ئاماژەیە بۆ چەند ڕاستییەك، وەك:

١- یەکێتیی پەیامەکانو، کۆك بوونیان لە بنچینەو بنەماکانی بیروباوەڕو یاساکاندا. چونکە لە شەریعەتی (ئادەم)دا -سڵاوی لێ بێت- کە بە کوڕو نەوەکانی گەیاندبوو، کوشتن بە ستەمکاریو بە ناهەق، حەرام بووە. وەك چۆن لە شەریعەتی (بەنی ئیسرائیل)و لە شەریعەتی ئیسلامیشدا حەرامە.

٢- لە دڵو دەروونی (بەنی ئیسرائیل)دا بیری کوشتن هەبووەو لە ژیانیشیاندا ڕەگی داکوتاوەو لە مێژووشیاندا قووڵ بۆتەوەو لە هەڵسوکەوتو کردەوەکانیشیاندا ڕەنگی دەداتەوەو، بەوەش لەنێو گەلانی تردا زۆرترین ئارەزوویان لە کوشتن هەبووەو زیاتریش ئەنجامیان داوە.

مێژووی مرۆڤایەتیش ڕاستیی ئەم مەسەلەیەی تۆمار کردووەو دەکات، ئەوەتا بەردەوام چەندەها تاوانی کوشتنی تاکەکەسو کوشتنی بە کۆمەڵیش، کە ئەنجام دەدرێن، جوولەکەکان لە پشتیەوەنو دەستیان هەیە تیایدا.

٣- پەیوەستی یەکی تر کە نێوانی کوڕە بکوژەکەی ئادەمو، بێباوەڕانی نێو (بەنی ئیسرائیل) پێکەوە دەبەستێت، نەریتێکی تریانە، کە ئەویش بەربەرەکانی کردنیانە لە ئاست واتاو چەمکە مرۆیی یەکانداو، ڕقو کینەیانە لە دژی بەها بەرزەکانی ئیمانداریتی، سووربوونیانە لەسەر هەڵەو نارەوایی‌و، حەسوودی بردنیانە، بە کەش‌و گەلانی دی‌و دەستدرێژی کردنە سەریان، بێ ئەوەی گوناهێکیان دەرهەق کردبن، هەروەها شوێن پێ هەڵگرتنیانە بۆ شەیتان.

## کورتـەی گرنگتـرین وانـەی ئەم چیـرۆکە

١- بێگومان هەردوو کوڕەکەی ئادەم دوو نموونەی لێك جودا لە نموونـەکانی مـرۆڤ بەرجەستە دەکەن: یـەکێکیان نموونـەی بـاوەڕدارێکی هـێمنو ئاشـتی خـوازو نەرمونیان، ئەوی تریشیان نموونەی شەڕخوازێکی کینـەدارو سـتەمکار. گـرۆی مرۆڤایەتیش لە هیچ کاتو جێگەیەکدا ئەم دوو نموونەیەی لێ نابڕێت.

٢- بێگومان کابرای بکوژ (قابیل) خۆی تەسلیم بە شەیتان کرد، بۆیە تاوانەکەشی، ئاکـامێکی دیـارو ئاسـایی بــە دەمەوەچـوونی شـەیتانو پـەیڕەوکردنی هەنگاوەکانیەتی.

٣- بێگومان هەردوو پیاوەکە دوو کوڕی خودی ئادەم بوون لە پشتی خۆی.

٤- حاڵەتی کۆمەڵایەتی ی بکوژ لەم چیرۆکەدا کـە کـوڕێکی ئادەمـە لـە پـشتی خۆی، ئاماژەیەکی گرنگ پیشان دەدات، چونکە هەرچەندە ئـادەم-سـڵاوی لێ بێت- پێغەمبەرێکە، بەڵام کوڕەکەی خۆی (قابیل) ڕێگای بێباوەڕیو پووچەڵی هەڵبژاردوە. دیارە پێدەچێت کـە پێغەمبـەران-سـڵاویان لێ بێـت- کـوڕانی بەدکارو بێباوەڕیان بووبێت (وەك کوڕەکەی ئادەمو کوڕەکەی نووح)، هـەروەها پێدەچێت پیاوچـاکانیش کـوڕانی بـەدکاریان هـەبێت. ئەمـەش نابێتـە هـۆی خەوشبارکردنو لەکەداربوونی باوکانی پیاوچاك، بـەڵام بـەو مەرجـەی ئـەرکی خۆیان بەرامبەر ڕۆڵەکانیان لەڕووی بانگـەوازو ئامۆژگـاریو بەیادهێنانـەوەدا بەجێ بگەیەنن.

٥-لە پێداویستییەکانی (خوێندنەوەی چیرۆکەکە بەڕاسـتیو بـە هـەق) -وەك خـوا فەرمانی پێداوین- ئەوەیە تەنها پابەند بین بەو ڕادەیەی چـیرۆکەکەوە کـە لـە قورئانو فەرموودەی ڕاسـت (صـحیح)ی پێغەمبـەردا ﷺ باسـکراوە، ئیـدی

نابێت بچینە سەر ئەو چاوگ‌و سەرچاوانەی تر کـە دەقـە ئیـسرائیلی یـەکان‌و ئەفسانەو شتە پووچەڵ‌و دەسهەڵبەستەکانیانە.

٦- پێویستیی گێڕاندنەوەی ئەو مەسەلانەی جێی ناکۆکیین، بۆ خواو قایل بوون بە حوکمی خوا، ئەمەش بەڵگەی ڕاستیی ئیمانەو، هەر بەم ڕەنگـەش (نـاکۆکی) چارەسەر دەکرێت‌و، حوکمی ڕاست‌و دروستی لەسەر دەدرێت.

٧- بێگومان خوا چاکەو عیبادەت، تەنها لە کەسانی خـاوەن تـەقواو لـەخواترس پەسند دەکات، جا هەرکەسێك بیـەوێت خـوا ئـەو بـە عەبـدی خـۆی پەسـند بکات‌و کـارو کـردەوەی چـاکی لێ وەرگرێـت، دەبێـت سـیفەتی تـەقواداری‌و لەخواترسان لەخۆی دا بەدی بێنێت.

٨- ئەگەر مرۆڤی باوەڕدار دیتی حەق لەگەڵ براکەی دایە، ئەوا دەبێت دەستی لـێ هەڵگرێت‌و، ڕێگەش نەدا کە هیچ ئاستەنگێك کاریگەریی خراپ بکاتـە سـەر پەیوەندیی نێوان خۆی‌و براکەی‌و، سەرخۆشەویستی‌و سۆزی بۆی.

٩- ڕەوا نیە بۆ مرۆڤی باوەڕدار کە باوەڕدارێك بکوژێت مەگەر بە هەڵە نەبێت.

١٠- ئەو هۆکارەی کە ڕێگە لـە بـاوەڕدار دەگرێـت بـۆ ئـەوەی خـوێنی برایـەکی نەڕێژێت، تەنها ترسـانە لـە خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان، نـەك هۆکـاری لاوازی‌و نەتوانین‌و ترسنۆکی‌و کەمیی سەلیقەو تەکنیکیی شەڕ.

١١- مرۆڤی بکوژ دوو گوناه لە ئەستۆ دەگرێت. گوناهی خۆی، کە کاری کوشتنی ئەنجام داوە، گوناهی کوژراوەکەش گەر ئەویش بکوژ بوایە.

١٢- بکوژ، یان تاوانبـار، ماوەیـەك لـە ململانێیـەکی دەروونیـی تـاڵدا دەژی، ئەویش کاتێك بۆ یەکەم جار ئەو تاوانە ئەنجام دەدات، کە لەو کاتەدا واتاکانی هـەق پـەروەردەی‌و چـاکەخوازی لـە ململانـێدان لەگـەڵ خورپـەو چـرپەکانی شەیتان‌و، وەسوەسەکانی دەروندا.

١٣- پێویستی پشت بەستن بە زانیاریو زانستە تازەکان لە بەرفراوان کردنی چەمکی ئایەتەکانداو، زیادکردنی چەند مەودایەکی نوێش بۆیان، وەك چۆن ئەو، شێوازەکانی گرتەبەر لە ماوەی هەڵوێستەکردنی شیکارو لێکدانەوەمان لەبەردەم ئەم دەستەواژانەی ئایەتەکاندا: (فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ)، (قَالَ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا ٱلْغُرَابِ)،(فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّـٰدِمِينَ)، (مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا)..

١٤- تاوانبار، لە کاتێکدا تاوانەکەی ئەنجام دەدات، هەموو شتێك لە دەست دەدات.

١٥- بێگومان ئەو مرۆڤەی، کە گومرا دەبێتو زەبروزەنگو زۆرداری دەنوێنێت، هەندێك جاریش دەستەوسان دەبێت لە چارەسەری چەند گرفتو مەسەلەیەکی ساناو ئاساندا.

١٦- پەشیمانی، دوو جۆرە:

١) پەشیمانییەك مرۆڤ هەڵدەنێت بۆ تەوبەکردنو داوای لێخۆشبوون، کە ئەمەش پەشیمان بوونەوەی تۆبەکاری گەڕاوەیە.

٢) جۆری دووەمیش پەشیمانییەکە، کە مرۆڤ بۆ ئەوە هەڵنانێت، ئەمەش پەشیمان بوونەوەی دەستەوسانێکی شکستی دۆڕاوە.

١٧- بێگومان هەرکەسێك بۆ خۆی شیاو کرد، کە مرۆڤێك بە ناهەق بکوژێت، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکیی کوشتبێت، چونکە شەرم کردن لە کاری کوشتن پێش ئەنجام دانی تاوانەکە لە ئارادا بووە، بەڵام دوای کوشتنەکە ئەو شەرمەزاری یەش نامێنێتو دەسڕێتەوە، ئیدی کاری کوشتن دەبێتە پیشەیەك یان نەریتێك، یان ئارەزوویەك.

١٨- پێویستە گرۆی بەشەری بە ڕووی بکوژانو دەستدرێژکاراندا بوەستنو، دەستیان بگرنو، ڕێی موماسەرەکردنی ئەو پیشەو ئارەزووە شەیتانییەیان لێبگرن.

١٩- جوولەکەکان لەنێو گەلانی تردا زۆرترین کرداری کوشتن بە ناهەقو زۆرداری ئەنجام دەدەنو زۆرترین خوێنی خەڵکی تر دەڕێژن.

٢٠- هەرکەسێك شێوازێکی باش دابنێتو بیگرێتە بەر، ئەوا پاداشتی خۆیو پاداشتی هەرکەسێکیشی تیادایەو تا ڕۆژی قیامەت پاداشتی بەردەوامە، چونکە بەو شێوازە چاکە دەبێتە پێشەنگێك بۆ کەسانی تر لە ئەنجام دانی کاری چاکدا.. هەر کەسێکیش شێوازێکی خراپ دابنێتو بیگرێتە بەر، ئەوا گوناهی خۆیو هەرکەسێکی تریشی تا ڕۆژی قیامەت لە ئەستۆدایە، کە کاری پێدەکات، چونکە بەو شێوازە خراپە دەبێتە پێشەنگێك بۆ کەسانی تر لە کرداری خراپدا. لەبەر ئەمەش تا ڕۆژی قیامەت لە هەر کارێکی کوشتندا، کە بە ناهەق ئەنجام بدرێت بەشێکی گوناهی یەکەم کوڕە بکوژە کینەدارەکەی (ئادەم) -واتە قابیل-ی تێدایە، چونکە ئەو کوڕە یەکەمین کەسێك بوو، کە شێوازی کوشتنی داهێناو ڕێی کوشتنی بە ناهەقی گرتەبەر.

# چیــرۆکی چــوارەم

## چیرۆکی ئەو کەســەی خــۆی لە پەیڕەوکردنی ئایەتەکانی خــوا داماڵی

ئەم چیرۆکە لە قورئاندا، بەم دەقە هاتووە، کە خوا فەرموویە:

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ
مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ
فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ
ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا
ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ الأعراف ﴾.

### کورتەی مانای ئایەتەکان بە کوردی

ئــەی پێغەمبــەر ﷺ بەســەرهاتی ئــەو کەســەیان بــۆ بخوێنــەوە کــە زانــستی ئایەتەکانمانو فەرمانەکانی خۆمان پێگەیاندبوو، بەڵام ئەو خۆی لێیــان دامــاڵی - وەك چۆن مار خۆی لە کاژەکەی دادەماڵێت-، بەمە شــەیتانیش شــوێنی کــەوتو دایەپێش خۆی، ئیدی ئەو کەسەش بوو بە یەکێك لە سەرگەردانو سەرلێ شێواوان. خۆ ئەگەر خواستمان وابوایە سەرفرازی کەین، ئەوا بەو ئایــەتو فەرمانانــە بــەرزو

پایەبڵندمان دەکرد، کەچی ئەو -بەخواستی خۆی- خۆی لە زەوی توند کردو حەزی لە پایەنزمیو دنیاپەرستی بووو دوای هەواو ئارەزووی چەپەڵی خۆی کەوت.. نمونەی ئەم جۆرە کەسەش وەك - نمونەی سەگ- وایە، کاتێك ئەو سەگە دەردەکەیتو ڕاوی دەنێیت، ئەویش لە هەناسەبڕکێی دایەو زمان دەردێنێت، یان تەنانەت کاتێك واز لەو سەگەکە دێنیت، ئەو هەر لەو حاڵەتی هەناسەبڕکێو زمان دەرهێنانەی دایە. دیارە ئەمەش نموونەی ئەو تاقمو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە ناڕاستو درۆ داناو بڕوایان پێنەکرد. جا کەواتە ئەی پێغەمبەر! ئەم جۆرە چیرۆكو بەسەرهاتانە بۆ خەڵکی بخوێنەوە تاکو بیربکەنەوەو هۆشیار بن. بەڕاستی ئەمەش نموونەیەکی ناشیرینی ئەو کەسانەیە کە بەڵگەو نیشانەو ئایەتەکانمانیان بەدرۆ داناوەو باوەڕیان پێ نەبووە، بەڵام هەر تەنها زوڵمو ستەمیان لەخۆیان کردووە.

هەندێك لە ڕاڤەکارو تەفسیرنووسان، بەشێوازی گێڕانەوەی دەماودەمو پشتاوپشت چەند شیکارو لێکدانەوەیەکیان لەسەر ئەم چیرۆکە هێناوەتەوە (چیرۆکی ئەو پیاوەی خۆی لە ئایەتەکانی خوا داماڵیو کە دواتر شەیتانیش شوێنی کەوت)، لەو شیکارو درێژەدانەی چیرۆکەکەشدا، تەفسیرکاران ناوی کابراو کارەکەیو ئەو ئایەتو فەرمانانەشیان دیاری کردوە، کە خوا پێی گەیاندبوو، لەگەڵ دیاریکردنی جەنگەکەی بۆ (بەنی ئیسرائیل) وردەکارییەکانی ئەو جەنگە.

لێرەشدا - بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەی خوێنەران لەو جۆرە گێڕانەوەو ڕیوایەتە ناڕاستانە- بەشێکی هەڵبستراوی ئەو دەقە ئیسرائیلیانە دەستنیشان دەکەین، تاکو بە تەواوی لێی وریابن.

"(طبري) لە تەفسیرەکەی خۆیداو، لە (سالم ی کوڕی ابی النضیر)ەوە گێڕاوێتیەوە، گوتویەتی: گوایە (موسا)-سلاوی لێ بێت- کاتێك لە خاکی (بەنی کەنعان) لە ولاتی شام دا دابەزیوەو (بەلعەم)یش لە گوندی (بالیعە) بووە، کە یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی (بەلقاء)، کاتێك (موسا) بەنی ئیسرائیلی لەوێ

دابەزاندووە، هۆزەکەی (بەلعەم) هاتوونەتە لای (بەلعەم)و پێیان گوتووە: ئەی بەلعەم! ئەوە (موسای کوڕی عیمران)ە لەگەڵ بەنی ئیسرائیلداو، هاتووە لە وڵاتی خۆمان دەرمانپەڕێنێت‌و بمانکوژێت‌و بەنی ئیسرائیلی تیادا جێگیر کات. ئێمەش هۆزی تۆین‌و هیچ جێگایەکی ترمان نیە، تۆش کابرایەکی نزا وەرگیراویت‌و دوعات قبوڵە، دەبچۆ لەلای خوا دووعایان لێ بکە.. ئەویش گوتوویەتی: کوڕە قوڕتان بەسەر، ئەوە پێغەمبەری خوایەو فریشتەکان‌و ئیماندارانیشی لەگەڵدایە، چۆن بچم دووعایان لێ بکەم لە کاتێکدا دەزانم خوا چی هەیەو چۆن وەڵامم دەداتەوە!! ئەوانیش گوتیان: ئاخر ئێمە هیچ جێگەیەکمان نیە!... ئیدی ئەو هۆزە بەردەوام لەلای (بەلعەم) سکاڵای حاڵی خۆیان کردوەو دڵیان بەلای خۆیاندا ڕاکێشاوەو لێی پاڕاونەتەوە تا تووشی فیتنەکەیان کردوەو، ئەویش کەوتۆتە نێو فیتنەو بەڵایانەوەو دوژار بووە. بۆ ئەم مەبەستەش سواری ماکەرێك-واتە گوێدرێژێکی مێینە-ی خۆی بووەو بەرەو ئەو چیایەی کە دەیڕوانی بەسەر سەربازگەکەی بەنی ئیسرائیلدا کە چیای (حوسبان) بووە، بەرێ‌کەوتووە، کاتێك ماوەی زۆری پێ‌دەبڕێت، گوێدرێژەکە وەستاوەو چۆکی داداوە. ئەویش دابەزیوەو لێی داوە، هێندەی لێداوە تاکوو ماندووو ناچاری کردوە کە هەستێتەوەو، ئەمیش سواری ببێتەوە، بەڵام گوێدرێژەکە زۆر نەڕۆشتووەو چۆکی داداوەتەوە. ئەویش لێی داوەتەوە. خواش ڕێی بە گوێدرێژەکە داوە کە بتوانێت بۆی بدوێت، ئیدی هاتۆتە قسەو - وەك شایەتێك لەسەری- دواندویەتی‌و پێی گوتووە: وریابە ئەی (بەلعەم) بۆ کوێ دەچیت؟ ئایا نابینیت فریشتەکان لەبەردەمم دان‌و دەمگێڕنەوەو ناهێڵن بڕۆم؟ ئایا تۆ دەڕۆیت بەرەو ڕووی پێغەمبەری خواو ئیمانداران بوەستیت‌و دووعایان لێ بکەیت؟! (بەلعەم) بەردەوام هەر لێی دەداو، خواش ڕێگای بۆگوێدرێژەکە واڵاکردووە تاکو (بەلعەم)ی گەیاندۆتە سەر چیای (حوسبان)، کە دەیڕوانی بەسەر سوپاکەی (مووسا)و بەنی ئیسرائیلداو وای لێ‌کردووە دووعایان لێ بکات. بەڵام بە هەرشێتك -بەهەر بێژەو وتەیەك- دووعای لێ بکردنایە زمانی بەلای هۆزەکەی

خۆیدا بادەدرایەوە، هەر دووعایەکیشی بۆ هۆزەکەی خۆی بکردایە، لێی تێك دەچووو زمانی -بەدوعای باشەوە- بەلای گەلی بەنی ئیسرائیلدا بادەدرایەوە. هۆزەکەشی پێیان گوت: ئەرێ ئەی (بەلعەم) ئەوە تۆ چی دەڵێی؟! تۆ دوعای باش بۆ ئەوان دەکەیت‌و، دووعای خراپیش لە ئێمە دەکەیت! (بەلعەم)یش لە وەڵامیاندا گوتی: ئەوە بەدەست خۆم نیە، بەڵکو ئەوە شتێکەو خوا خۆی وای لێکردووەم.. ئیدی لەوکاتەدا زمانی (بەلعەم) هاتۆتە دەرەوەو کەوتۆتە سەر سینگی.

ئینجا پێی گوتن: ئەوا من دنیاو ڕۆژی دواییشم لەدەست چووو، تەنها فڕوفێڵ ماوە بیگرمەبەر، بۆیە لەمەولا فێڵ‌و تەڵەکەبازیتان بۆ بەکاردێنم. ئێوەش بۆ ئەم مەبەستە ئافرەتان جوان بکەن‌و بیانڕازێننەوەو شت‌ومەك‌و کەرەسەی بازرگانییان پێ بدەن‌و پاشان بیاننێرن بۆ ئەو سەربازگەیەی بەنی ئیسرائیل تاکو پێیان بفرۆشن. فەرمانیشیان پێبکەن کە هیچ ئافرەتێك بەرگریی لەخۆی نەکات ئەگەر پیاوێك لەوان ئارەزووی کەوتبووە سەری، چونکە ئەگەر یەکێك لەوان زیناو داوێن پیسی ئەنجام بدات، ئێوەش پێیان ڕزگار دەبن.. ئەوانەیش -واتە هۆزەکەی بەلعەم- ئەو ڕێنماییە گەندەڵەیان جێبەجێ کردووە، جا کاتێك ئافرەتەکانیان چوونەتە نێو سەربازگەکەوە، ئافرەتێکی کەنعانییەکان کە ناوی (کەسبای کچی صور)ی سەرۆك هۆزەکەیان بووە، چۆتە لای پیاوێك لە گەورەکانی بەنی ئیسرائیل کە ناوی (زەمری کوڕی شلۆم)ی بووەو سەرۆکی تیرەکەی (شەمعوون) بووە. ئەم پیاوەش پێشوازیی گەرمی لێکردووەو پێی سەرسام بووەو حەزی لێکردووەو دەستیشی گرتووەو بردویەتی بۆ لای مووسا -سلاوی لێ بێت-و پێی گوتووە: من وای بۆ دەچم کە تۆ بڵێیت ئەمە حەرامە بۆت؟.. مووساش پێی گوتووە: بەڵێ، ئەم ئافرەتەت پێ حەرامەو بۆت ناشێت، بۆیە نابێت نزیکی ببیتەوە.. ئەویش گوتوویەتی: دەسا بەخوا لەمەدا گوێڕایەڵیت ناکەین.. ئیتر بردوێتیەوە بۆ نێو خێوەتەکەی خۆی‌و بەدکردارییەکەی لەگەڵدا ئەنجام داوە. خواش نەخۆشیی تاعوونی تووشی هۆزی بەنی ئیسرائیل کردووە، (منخاص ی کوڕی عیزار) کە لێپرسراوی کاروباری

ئیداریی (موسا) بووەو پیاوێکی بەگورِو کەڵەگەتو بەهێز بووه، لەو ماوەیەدا کە (زەمری کوڕی شلۆم) بەدکارییەکەی ئەنجام داوه لەویٚ نەبووەو، کە هاتۆتەوەو دەبینێت ئەوا نەخۆشی تاعون تووشی بەنی ئیسرائیل بووەو، ئەو هەواڵەشی پیٚدەگەیەنرێت -ڕمەکەی هەڵگرتووه -کە هەمووی لە ئاسن دروست کرابوو-و چوەتە خێوەتەکەی پیاوە زیناکارەکەوەو لەوکاتەشدا پیاوەکەو ژنە کەنعانیەکەش پێکەوە ڕاکشابوون، بۆیە هەردووکیان -بەیەك جارو پێکەوە- بە ڕمەکە دەکوژێت. پاشان تەرمەکانیانی هێناوەتە دەرەوە بۆ ئاسمان بەرزی کردوونەتەوەو ڕمەکەشی بە قۆڵی گرتووەو مەچەکی خستۆتە سەر ناوکیو، پاشان ڕەمەکەی لەسەر ڕیشی جێگیر کردووەو، گوتوویەتی: خوایە ئاوا بەسەر ئەو کەسەدا دێنین کە سەرپێچیت لیٚ دەکات.. ئیدی تاعوونەکە لابراوەو ژمارەی (بەنی ئیسرائیسل)یش ئەوانەی لەو ماوەیەدا بە تاعوونەکە مردوون حەفتا هەزارکەس بوون. سەبارەت بەم بەسەرهاتەی (بەلعەم ی کوڕی باعورا)یش، خوا ئەو ئایەتانەی بۆ (محمد)ی پێغەمبەر ﷺ ناردۆتە خوارەوە: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا ﴾[1]".

## ڕەتکردنەوەی ئەو دەقە هەڵبەستراوانەی ئیسرائیلییەکان

ئەم شیکارو لێکدانەوەیەی کە هەندێك لە تەفسیرنووسو ڕاڤەکاران دیارییان کردووه، بەهیچ پاڵپشتو سەنەدێکی (ڕاست-صحیح) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەهێنراوەو، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ شتی ئاوای لەسەر ئەو چیرۆکە نەدرکاندووه. جا لەبەر ئەوەش کە چیرۆکی ئەم پیاوە لە چیرۆکەکانی پێشینانو، ئەم چیرۆکانەش لە جیهانی نادیارو نەزانراودانو تەنها خوا خۆی دەزانێت چۆن بووه، بۆیە هیچ کەسێك بۆی شیاو نیە کە بچێتە نێو قوڵایی وردەکاریو

---

١) بڕوانە (تفسیر الطبري)، تحقیق محمود شاكر، بەرگی١٣، لاپەڕە ٢٦٤-٢٦٧، کە ئەم دەستهەڵبەستەی جولەکە لە دەقە ئیسرائیلییەکانی تیادا هێنراوەتەوە.

شیکارەکانیەوەو، لە کەسێکی ترەوە قسەوباسی لەسەر بگوازێتەوە، چونکە ئێمەی موسڵمان پابەندین بەوەی، کە تەنها لە ئایەتەکانی قورئانو فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەو چیرۆکانەی وەرگرینو بەو ڕادەیە لەگەڵیاندا بمێنینەوە، کە ئەو دوو سەرچاوە پاکەی ئیسلام دیارییان کردوە. لەبەر هەموو ئەمانە ئەو جۆرە شیکارو لێکدانەوەیە دەربارەی چیرۆکی ئەو پیاوەی (خۆی لە ئایەتو فەرمانەکانی خوا داماڵیوە) ڕەت دەکەینەوەو پەسندیان ناکەینو، بە دەقی دیاریکراوی نێو ئەفسانەو ئیسرائیلییاتی دادەنێین.

ئەو ئەفسانەو شتە پووچەڵە ئیسرائیلییاتانەش شیاو نیە بۆ ئەوەی، کە فەرمایشتی ڕاستو گران قەدری خوای پێ تەفسیر بکەین. بێگومان ئێمە هەندێك لەو دەقە ئیسرائیلییانە (بەپێی بەرنامەی خۆمان لە تێڕوانینی چیرۆکی پێشینەکانی نێو قورئان) هێناوەتەوە، تاکو خەڵکی موسڵمانی لێ هۆشیارکەینەوەو، ئاگاداریشیان بکەین لە هەڵبەستراویو ناڕاستییانو، داواشیان لێ بکەین نەیانگێڕنەوەو دەستنیشانیان نەکەن، تەنها لەکاتی بەراوردکردنو هەڵسەنگاندنیان لەگەڵ دەقەکانی قورئانو سوننەت)دا نەبێت، کە چۆن داوای ڕەتکردنەوەو پشتگوێ خستنیان دەکەن. ڕێگا بە کەسیش نادەین، کە بە ئانقەست ئەو هێندەی دەقە ئیسرائیلییەکان -کە ئێمە بۆ ئاگادارکردنەوە دیاریمان کردوون- لە ئێمەوە وەرگرێتو بیگێڕێتەوەو پەسندی بکاتو، لەنێو کەسانی تردا بڵاوی بکاتەوە.

## هەڵوێستی پێشەوا (سید قطب) بەرامبەر بەو جۆرە لێکدانەوانە

مامۆستای پێشەوا (سید قطب) ڕایەکی نایابی دەربارەی ڕەتکردنەوەو پەسندنەکردنی ئەو شیکارو لێکدانەوە ئیسرائیلیانە هەیە، لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئایا ئەمە هەواڵێکە بخوێنرێتەوە؟ یاخود پەندێکەو بەنموونە لە شێوەی هەواڵێکدا دەهێنرێتەوە چونکە زۆرجار ڕوودەدات؟ لەو ڕووەوە ئەمە هەواڵو بەسەرهاتێکەو دەگێڕرێتەوە.

هەندێك لەو گێڕانەوەو ڕیوایەتانەش باسیان لەوە کردوە، کە بەسەرهاتی پیاوێك لە ئارادا هەبووەو پیاوێکی چاك بووە لە فەلەستیندا پێش ئەوەی بەنی ئیسرائیل بچنە ناوی. ئەم ڕیوایەتانەش چیرۆکی لەڕێلادان، شکست خواردنی ئەو پیاوەیان بەجۆرێك گێڕاوەتەوە، کە هەرکەسێك شارەزایی لەو ڕیوایەتە ئیسرائیلییە زۆرو زەبەندانە هەبێت، کە لە کتێبەکانی تەفسیردان، متمانە ناکات بەوەی، کە ئەم بەسەرهاتەش یەکێك لەوانە نەبێت. هیچ نەبێت بەلانی کەمەوە دڵنیا نابێت لە سەرجەم قۆناغو بەشەکانی تری چیرۆکەکەو، دەترسێت هەندێکی لەو ئیسرائیلییانە تێکەوتبێت.

پاشان هەر ئەم ڕیوایەتانە هێندەی لێك نەچوونو قسە وباسی دژە بەیەك تێدایە، کە دەبنە هۆی ئاگاداروبونەوەی زیاتر لێیان.. بۆ نموونە وایان گێڕاوەتەوە، کە پیاوەکەی نێو ئەم چیرۆکە (بەلعام ی کوڕی باعورا) لە هۆزی (بەنی ئیسرائیل) بووە، جارێکی تریش وایان گێڕاوەتەوە، گوایە لە خەڵکە بە زەبروزەنگەکەی فەڵەستین بووە. هەروەها واشیان گێڕاوەتەوە، کە گوایە لە عەرەبەکان بووەو ناوی (ئومەییەی کوڕی ئەبی سەڵت) بووە. یاخود وایان گێڕاوەتەوە، کە یەکێك بووە لە هاوچەرخانی زەمانی بوون بە پێغەمبەری محمد ﷺو ناوی (ابو عامری فاسق) بووە. واش گێڕراوەتەوە گوایە هاوزەمانی (موسا) بووە-سلاوی لێ بێت-، واش

گێڕراوەتەوە کە دوای (موسا) بوبێـتو، لەسـەردەمی (یوشـەع ی کـوڕی نـوون)دا بوبێت، کە ئەو (یوشع)ە شان بەشانی هۆزی (بـەنی ئیـسرائیل) لـەدوای ونبـوونی ماوەی چل ساڵەکەیان لە دژی خەڵکە بەهێزەکەی فەڵەستین جـەنگیوە -واتـە دوای ئەوەی، کە بەنی ئیسرائیل پێش ئەو چل ساڵە، ئامادە نەبوون بچنە فەڵەستینەوەو لەگەڵ خەڵکە بەهێزەکەیدا شەڕ بکەن، خواش ماوەی چل ساڵ ئەو نەوە ترسنۆکەی بەنی ئیسرائیلی لە بیابانی (سینا)دا ونکرد، تا نەوەیەکی تر پێگەیـشتنو شـەڕیان کردو چوونە فەڵەستینەوە-.

هەروەها لە هەندێك تەفسیری تردا واش گێڕراوەتەوە، کە ئـەو ئایەتانـەی پێـی گەیەنراوە (ناوی هەرەگەورەی خوا) بوون، کە نزاو دوعای لـەلای خـوا پێبکـاتو، نزاکانیشی گیرابن-پەسند بکرێن-. هەروەها وایان گێڕاوەتـەوە، کـە ئـەو ئایـەتو فەرمانانەی پێی گەیەنراون، کتێبێکی خوا بووە، کە بۆی نێرراوەتە خوارەوە، گوایە خۆیشی پێغەمبەرێك بووە. ئیدی وردەکاریو شیکاری ئەم بەسـەرهاتە دوای ئـەوە چەندین جۆرو شێوازی تری هەبووە. لەبەرئەوە ئێمەش بـەپێی شـێوازو مەنهـەجی خۆمان لە تەفسیری (في ظلال القرآن)دا وای بەباش دەزانین، کە نەچـینە نێـو هـیچ شتێك لەو هەموو لێکدانەوانەی، کە جێی گومانن، بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی، کە لە دەقی قورئانو لە دەقی فەرموودەی گێڕراوەی پێغەمبەریش ﷺ هیچ شـتێکی لەسەر نەهاتوون، بەڵکو تەنها بەوەندە پابەنـد بـین، کـە لـە هەواڵەکـەی قورئانـدا هاتووە[1]».

١) في ظلال القرآن/٣: ١٣٩٧

# چەند نەزانراوێك لەم چیرۆکەدا

لە چیرۆکی (ئەو پیاوەی خۆی لە ئایەتەکانی خوا داماڵی) چەند نەزانراوێك هەیەو، قورئانو فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەریش ﷺ ڕوون نەکراونەتەوە، بۆیە هیچ ڕێگەیەك بۆ ڕوونکردنەوەیان نیە. بەڵام لێرەدا هەندێك لەو نەزانراوانە کە پێویستە هەڵوێستەیان لەئاستدا بکرێت بێئەوەی هەوڵێکی ڕوونکردنەوەیان بدرێت، دەستنیشان دەکەین:

١- ناوی ئەو پیاوەی کە خۆی لە فەرمانەکانی خوا داماڵیوەو، وازی لە زانستو زانیاریی هێناوەو دوای شەیتان کەوتووە. خەڵکانی زەمانی زووش بیروڕای لێك جوداو هەمەجۆریان لەسەر دیاری کردنی ناوەکە هەیە، هەندێکیان گوتویانە کە ناوی (بەلعەمی کوڕی باعورا)، یان (بەلعامی کوڕی باعورا) بووە، هەندێکی تریش گوتوویانە کە ناوی (ئومەییەی کوڕی ئەبی سەڵت) بووە، هەندێك کەسی تر گوتوویانە کە ناوی (ابوعامری فاسق) بووە، هەندێك کەسی تریش ناوی تریان لەبارەیەوە هێناوە. ئێمە دەربارەی ئەم ناوە هەمەجۆرانەو دەربارەی بیروڕای لێك جوداش لەسەر ناوی پیاوەکە، هیچ سوودێکی کردەیی (عملی)و زانستییش بەدیی ناکەین کە لەسەر زانینی ناوەکەی ڕامانگرێت. هەر لەمبارەیەشەوە وتەیەکی ئیمام (طبري)م پێ باشو سەرنج ڕاکێشە کە تیایدا تیشکی خستۆتە سەر جیاوازیی بیروڕاکان لەسەر ناوی پیاوەکەو گوتوویەتی:

"بێگومان خوا لەم چیرۆکەدا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی خۆی محمد ﷺ کردوە کە هەواڵو بەسەرهاتی پیاوێك بۆ گەلەکەی خۆی -قوڕەیش- بگێڕێتەوە کەوا خوا بەڵگەو نیشانەو فەرمانەکانی خۆی پێ ڕاگەیاندوە، کە ئەوانەش ئایەتەکانن دەشێت ئەوەی کە خوا ئایەتەکانی بۆ ناردووە (بەلعەم) بێتن هەروەك دەشێت کە ئومەییەش بێت[1]".

---

١) (تفسير الطبري)، ١٣: ٣٥٩ .

٢- ئەو زەمانەش، کە ئەو پیاوە تیایدا ژیاوە -یەکێکە لەولایەنانە نەزانراوانەی چیرۆکەکە، دەشێت کابرا لە هۆزی بەنی ئیسرائیل بووبێت، وەك دەشێت، کە لە خەڵکە بەهێزو زەبەلاحەکانی نێو فەڵەستینیش بووبێت، یان لە کەنعانیەکان لە زەمانی موسادا -سلاوی لێ بێت- یان لە زەمانی (یوشعی کوری نون) لەدوای (موسا)، یان دەشێت لە زەمانی پێغەمبەری خواش محمد ﷺ دا بووبێت، کاتێك ئەو لە مەککەدا بووە، یان کاتێك لە مەدینەدا بووە. لەبەر ئەوە ناشێت تاکە زەمەنێك دیاریی بکرێت، کە ئەو پیاوەی تیادا ژیاوە، یان ئەو گەلەی تیادا ژیاوە کە ئەو هاوزەمانی بووبن.

٣- لایەنێکی نادیارو شارراوەی تر لەم چیرۆکەدا، ئەو ئایەتو بەڵگەو نیشانانەیە کە خوا پێی گەیاندوونو، کە ئایا ئەو ناوە هەرەگەورەیەی خوایە، کە ئەگەر دووعای پێکردبێت، دووعاکەی گیراو پەسندکراو بووە، ئەگەر داواکاریی پێکردبێت پێی دراوە؟ یان ئایا کتێبێکی خوا بووەو بۆی نێرراوەتە خوارەوە، یان چەند بەڵگەو نیشانەیەکی عەقلیو مەعنەوی بوون؟

٤- درێژەی چۆنیەتی خۆدابرینو خۆ داماڵینی لە ئایەتو فەرمانەکانی خواو، ئەو جێگایەش، کە خۆداماڵینەکەی تیادا ڕوودوە.

٥- چۆنیەتی شوێنکەوتنی بۆ شەیتان، یان چۆنیەتی شوێنکەوتنی شەیتان بۆ ئەو.

٦- چۆنیەتی زمان دەرکێشانو هەناسەبڕکێ بەردەوامەکەی وەکو سەگو هۆکاری ئەو زمان دەرکێشانەی.

## لایەنە جوانەکانی تێڕوانینی هونەرییانە لەم چیرۆکەدا

چیرۆکی (ئەو پیاوەی خۆی لە ئایەتەکانی خوا داماڵی) بەشێوازێکی تێڕوانینی هونەرییانە باسکراوە.. ئەم شێوازەش بێهاوتاو بەچاکتر دانراوی گوزارشتی قورئانییەو، بەلایەنی نزیکییەوە لە سێچارەکی بابەتەکانی قورئاندا بەکارهێنراوە.

لەمبارەیەشەوە مامۆستای پێشەوا (سیدقطب)، کە پێشەنگی تیۆری وێنەگرتنی هونەرییە لە قورئاندا، دەربارەی شاکارو لایەنە جوانییەکانی وێنەگرتنی هونەرییانەی نێو ئەم چیرۆکەش گوتوویەتی: ((ئەمە دیمەنێکە لە دیمەنە سەرسوڕهێنو تازەکان، کە هەموویان بۆ گەنجینەی ئەم زمانە بە هەموو تێڕوانینو وێنەگرتنێکی یەوە، هەمیشە تازەن.. مرۆڤێك خوا ئایەتو بەڵگەو نیشانەکانی خۆی بۆ ڕەوانە بکاتە خوارەوەو، لە فەزڵو بەخششی خۆی پێ بداتو، لە پۆشاکی زانستی خۆی پێ بپۆشێتو دەرفەتی تەواویشی بۆ ڕێی ڕاستو پەیوەندی بە خواو پایەبەرزیی بۆ والاّ کردبێت، کەچی ئەو خۆی لە هەموو ئەمانە دادەماڵێت، خۆیان لێ دادەماڵێت، وەك ئەوەی ئایەتەکان پێستێکی بنو بە گۆشتەکەیەوە نووسابن، ئیدی بە توندیو هیلاکیو شەکەتییەوە خۆیان لێ دادەماڵێت. وەك چۆن گیاندارێك خۆی لەو پێستەی دادەماڵێت، کە بە قەوارەی لەشیەوە نووساوە. ئەی ئەوە نیە قەوارەی مرۆڤایەتیش بە پۆشاکی باوەڕو ئیمانداریتی بەخواوە (وەك لکاندنی پێست بە جەستەوە) لکاوە؟ کەچی ئەوەتا -هەر ئەم قەوارەی مرۆڤایەتییە- لە ئایەتەکانی خوا خۆی دادەماڵێتو، لەو بەرگە پارێزگاری یەو ئەو قەڵغانە بەرگری کارییەش لەخۆی دادەکەنێتو، لەڕێی ڕاستیش لادەدات بۆ ئەوەی دوای هەواو ئارەزووی خۆی بکەوێت، لە ئاسۆی پڕشنگداریشەوە دادەبەزێتە نزمایی، تاکو بە قوڕی ڕەشو تاریکەوە بنووسێتو، ببێتە ئامانجێك بۆ شەیتان، کە لەو ئاستی نزماییەشدا هیچ شتێك ناپارێزێتو بەرگریی لێ ناکات، هەر

بۆیەش دوای دەكەوێتو پابەندی خۆی دەكاتو بەسەریا زاڵ دەبێت.. پاشان ئێمە لەبەردەم دیمەنی مەخلوقێكی ترسناكو بەدبەختو نەگبەت داین، كە دەبینین بە زەوییەوە نووساوەو، بە قوڕ پیس بووە، ئنجا ڕوخساریشی لەشێوەی سەگێكدا گۆڕاوە، كە ئەگەر دەربكرێتو ڕاوبنرێت، هەناسەبڕكێیەتیو زمان دەردێنێت، كاتێك دەریش نەكرابێت هەر زمان دەردێنێت.. هەموو ئەم دیمەنە جووڵاوو بزوێنراوانەش بەدوای یەكدا دێنو دەچن. خەیاڵی مرۆڤیش لە حاڵەتەكانی كارلێكو سەرسام بوونو پێخرۆشاندا سەرنجی دەدات.

جا كە دەگاتە دوایین دیمەن، دیمەنی ئەو هەناسەبڕكێو زمان دەركێشانەی كە بەردەوامەو ناوەستێت، ئەو لێكدانەوە مەترسیدارو بەسروش وەسف كراوە دەبیستێت، كە تیشك دەخاتە سەر هەموو دیمەنەكان: ﴿...ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ الأعراف﴾.

واتە: ئەمەش نموونەی ئەو تاقمو كەسانەیە، كە ئایەتو فەرمانەكانی ئێمەیان بەدرۆ خستەوەو باوەڕیان پێ نەهێنان، جا تۆش -ئەی پێغەمبەر- ئەم جۆرە چیرۆكو بەسەرهاتانە بۆ خەڵكی بگێڕەوە، تاكو بیربكەنەوەو تێفكرینیان هەبێت. بەڕاستی ئەوە نموونەیەكی ناشیرینی ئەو گەلو كەسانەیە، كە بەڵگەو نیشانەو ئایەتەكانمانیان بەدرۆ خستۆتەوەو باوەڕیان پێ نەبووە، بەڵام لە ڕاستیدا هەر تەنها زوڵمیان لەخۆیان كردوە[1]".

لەو دیاری كردنە گشتیە كورتكراوەی وێنەگرتنی هونەرییانەی نێو چیرۆكەكەشەوە -وەك سید قطب خستبویە ڕوو-، دەچینە سەر ئاماژەیەكی هەندێك وێنەی لاوەكی (جزئی) لەو دیمەنە وێنەگیراوە زیندووەدا، وەك ئەم ئاماژانە:

1) في ظلال القرآن/٣: ١٣٩٦-١٣٩٧

١- فەرمایشتی خوا (فَانسَلَخَ مِنْهَا) مانای زەینیو تیۆرییەکەی ئەوەیە، واتە: (ئەو پیاوە وازی لە ئایەتەکانی خوا هێناو، ئەو حەقەشی پشتگوێ خست کە تیایان دابوو)، بەڵام ئایەتەکەی قورئان لەم چیرۆکەدا ئەم مانا زەینییە لە شێوەیەکی سروشبەخش (موحی)دا پیشان داوەو وای دەگەیەنێت کە وەك ئەوە وایە ئایەتو فەرمانەکانی خوا بەو کابرایە درابنو پێیەوە لکابنو، بووبن بە پێستێك بۆی، ئیدی کابراش کاتێك بەتەمابووە ڕوو لە ئایەتەکانی خوا وەرگێڕێت، وەك ئەوە وابووە کە خۆی لە پێستەکەی خۆی داماڵێت.

تۆش وێنەی ئەم کابرا بەدبەختە بخەرە بەر دیدەی خەیاڵت لە ساتێکدا کە ئەو هەوڵێکی قورس دەدات بۆ خۆداماڵینی لەو پێستەی، هەروەها دیمەنی ئەو خۆداماڵینە جوزئییە هێواشەش بخەرە بەر دیدەی خەیاڵتو بە خەیاڵ وای دابنێ ئەوا ئەو لەسەریەوە دەست پێدەکاتو پێستی سەری لەخۆی دادەماڵێت، ئنجا پێستی هەردوو دەستیو، پێستی سنگیو، دواجار پێستی هەردوو قاچیی. جا ئایا دەشێت کە مرۆڤ پێستی خۆی لەلاشەی داماڵێت؟ یان بڵێ: ئایا پێستی مرۆڤ دادەماڵرێتو دەگۆڕێت؟ وەك هەموان دەزانین پێستی مرۆڤ زۆر ناسكو تەنکەو کرداری داماڵینی ئەم پێستەش -ئەگەر بکرێت- ئەوپەڕی توندوتیژیو دڵڕەقیو ماندوبوونو مەینەتی دەخوازێت. جا ئاخۆ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە کرداری پێست داماڵین ئەنجام دەدات-کە مرۆڤەکە خۆیەتی-و خۆی خاوەنی پێستەکەش بێتو ئاخۆ چی دابماڵێت؟ بێگومان ئەو خۆی پێستی خۆی دادەماڵێت.

ئەم وێنە سەرسام کەرەش، وشەی (فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا) بڵاوی کردۆتەوە.

٢- فەرمایشتی خوا (فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ)، تیایدا وێنەی ئەو مەخلووقە بەدبەختە -واتە پیاوەکە- لە دیمەنێکی تازەی شێواوو ناشیرین کراودا بەدیی دەکەین، وای دەخەینە بەر دیدەی خەیاڵمان کە بیگومان ئەو کابرا لە پێستەکەی خۆی

داماڵدراوەو، دەرچووە بۆ سەر ڕێگاو دەڕوات -بەبێ پێستێك-یش دەڕوات، جا خۆزگە بە ڕۆیشتنێکی ئاسایی بڕۆیشتایەو، ئیتر مەسەلەکەش سووكو ئاسایی دەبوو.. بەڵام بەجۆرێك دەڕوات کە شەیتان لەدوایەوەیەتیو، هانی دەدات بۆ ڕۆیشتن، تەنانەت بۆ ڕاکردن، هەر ساتێکیش ماندوو دەبووو هەوڵی ڕاوەستانی دەدا، شەیتان لەدواوە بە قامچی تێی بەردەبووو پشتی سوور دەکردەوەو تەنانەت شوێنو نیشانەی جێقامچییەکانی لەسەر ئەو جەستە لەپێست داماڵراوەی دەنەخشاند. ئای چەند بە ئازاریشە لێدانی قامچی لەسەر پێست!! ئەی ئاخۆ ئازارەکەی لەسەر لاشەیەکی لەپێست داماڵراو چۆن بێت؟ دیمەنێکی تازەی ئەم وێنەیەش ئەوەیە شەیتان بەدوای هەنگاوەکانی ڕۆیشتنی ئەم پیاوەوەیە، نەك پیاوەکە دوای هەنگاوەکانی ئەو کەوتبێت، ئەمە لەکاتێکدا کە قورئان چەندەها نموونەی تری لە بەسەرهاتەکان وا پیشان داوە، کە خەڵکی دوای شەیتان کەوتوونو شوێن پێی هەنگاوەکانیان هەڵگرتووە.

٣- (وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ) بە مانای خۆی بە زەوییەوە نووساندو لکاندو خۆی بەو قوڕو لیتەو پیساییانەی زەوی ڕەنگ کرد، لەکاتێکدا دەیتوانی بەهۆی ئەو ئایەتو فەرمانو بەڵگەو نیشانانەی خواوە خۆی بەرزکاتەوەو بگاتە جیهانی سەربەرزیو سەروەریو، ڕاستگۆییو پابەندیی بە حەقو، پاکژیو بێگەردیی، کەچی حەزی لەوە بووە، کە وا دابەزێتە سەر نزماییو داڕووخانو کەوتنو چەقین لە زەویداو خۆ چەسپ کردن بە قوڕەوە.

دە تۆش تەماشای جیاوازیی نێوان هەردوو وێنەکە بکە: وێنەی بەرزبوونەوە لە ئاسمانداو، وێنەی خۆگرتن بە زەوییەوە، ئەمەش لەو فەرمایشتەی خوادا: (وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ).

جا ئەو کەسەی حەزی لە بەرزبوونەوەو سەربڵندیی نیە، ئەوا تەنها یەك ڕێگەی لەپێشە، ئەویش خۆنووساندنە بە زەوی یەوەو دابەزینە بۆ نزمایی.. جا ئیدی، یان سەرکەوتن، یان دابەزین.. یان بەرزبوونەوە، یان ڕۆچوون..

٤- فەرمایشتی (وَاتَّبَعَ هَوَاهُ) تیایدا ئەوە دەبینین کە پیاوەکە دوای شتێکی بەردەستی خۆی کەوتووە، ئەوەش (هەواو ئارەزوویەتی). هەواو ئارەزووش هەرچەندە شتێکی مەعنەویی و نەبینراوە، بەلام لەم دیمەنە وێنەگیراوو بزوێنراوەدا دەبێتە شتێکی بەرجەستەکراو، تەنانەت دەبێتە کەسێکی زیندووی وا، کە دەجوولێتەوەو دەڕوات. ئەم پیاوە لە پێست داماڵراوەش بەدوای ئەوەدا -واتە لەدوای هەواو ئارەزووەکەیدا- دەڕواتو دوایشی دەکەوێت.

بۆیە گەر هەواو ئارەزوەکە بەهەر لایەکدا بڕۆیشتایە ئەویش بەدوایەوە بوو. دیارە لەبیریشمان ناچێت، کە شەیتانیش بەدوای ئەو پیاوەوە دەڕواتو هانیشی لەسەر ئەو جۆرە ڕۆیشتنە دەداتو، پشتیشی بە قامچی سوورکردۆتەوە.

بەم دیمەنە بزوێنراوەش دەبینین، کابرای لەپێست داماڵراو -کە خۆی لە ئایەتەکانی خوا داماڵیوە- دوای هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووەو، شەیتانیش دوای خۆی کەوتووە، لەمەشدا تێبینی ئەو ئابلۆقە توندەش دەکەین، کە لەسەریەتی، تاکو دەرباز نەبێت، چونکە هەواو ئارەزوو لە پێشیەوەیەتیو، شەیتانیش لە پاشیەوەیەتی.

٥- فەرمایشتی خوا (فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث)، ئەمەش ئەوپەڕی وەسفی سەرزەنشتکاریو ناشیرین کردنی سەرو ڕوخساری ئەو پیاوەیەو، لەکەدارکردنی ڕەفتاریشیەتی. چونکە ئەو لەم وێنەیەی نێو فەرمایشتەکەدا، وەك وێنەی سەگێکە (فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ) لەو هەلوێستە تازەیەشیدا وەکو سەگێکە.. بەلام ئەو بەچی لە سەگ دەچێتو، ئاخۆ دیمەنی لێکچووی نێوانیان چی بێت؟ بێگومان لە زمان دەرکێشانو هەناسەبڕکێی بەردەوامدا، کە نابڕێتەوە لێك دەچن. سەگ هەمیشە زمان دەدرێنێتو تەنگەنەفەسە، وەختێك زۆری بۆ دێنێتو ڕاوی دەنێت زمانی دەردێنێت، وەختێکی تریش کە وازیشی لێ دێنێت هەر زمانی دەردەهێنێت.

هەروەها كە ڕادەكات، زمان دەردێنێت، كە بە ڕێگاشدا دەڕوات هەر زمان دەردێنێت، لەكاتێكیشدا كە دادەنیشێت هەر زمان دەردێنێتو تەنگەنەفەسە. ئەو كابرایەش دوای ئەوەی ئایەتەكانی خوای پشتگوێ خستبوەو خۆیی لێیان دابڕیوەو داماڵیوە، زمانی دەركێشاوەو بەردەوام لەو حاڵەتەدا بووەو هەر زمانی دەركێشاوەو لە هەناسەبڕكێو تەنگەنەفەسیی دابووە. بۆیەش زمانی دەرهێناوە، چونكە دوای هەواو هەوەسی خۆی كەوتووە.. هەروەها بۆیە زمانی دەرهێناوە، چونكە خۆی بە زەوییەوە چەسپ كردووە. پاشان بۆیەش زمانی دەرهێناوە، چونكە شەیتان هاندەری بووە لەسەر ڕۆیشتن.. بۆیەش زمانی دەرهێناوە، چونكە خۆی لە پێستی خۆی داماڵیوە.

## ( سید قطب ) و.. ڕەهەندی واقیعییانەی ئەم چیرۆكە

چیرۆكی قورئانی، چیرۆكی واقیعین، واتە ڕووداوەكانی لە جیهانی واقیعداو لە ماوەیەكی ڕابردووی زەمەندا هاتوونەتە كایەوە. هەروەها (چیرۆكی قورئانی) ڕەهەند (بُعد)ێكی واقیعییانەی هەیە، واتە بۆ هەر (كایەو واقیعێك)ی دیكەی ژیانی خەڵكی دەشێت، مۆركو سیماو ڕوخسارەكانی كەسانو پاڵەوانانی (ئەو چیرۆكە قورئانی یانەش) بەسەر خەڵكانو كەسانی تریشدا وەسف دەكرێن، سا ئیتر لە هەر واقیعێكی ژیانی ئادەمیزاد دابن. بۆیە ئەو ئایەتانەی، كە دەربارەی پێشینەكان دەدوێن، دەربارەی خەڵكانو كەسانێكی واش دەدوێن، كە هەر مرۆڤێك لەئێمە ڕۆژانە لەپێش چاوی خۆیدا دەیانبینێتو تێبینیی پەیڕەو بونی ئایەتەكان بەسەریاندا دەكات. ئەمەش سیفەتێكی گشتیی چیرۆكی قورئانیو ئەو نموونە مرۆییانەشە، كە دەیانخاتە ڕوو. سەبارەت بەم بابەتەشمان ئەوەی، كە ئایەتەكانی قورئان بەدیاریی خستووە، وەك وێنەگرتنی دیمەنەكانو ڕۆڵی نواندنو نمایشكردنی ئەو پیاوەی، كە لە ئایەتەكانی خوا خۆی داماڵیوەو، ئەو سیفەتو سیماو

ڕوخسارەی، کە پیشانی داوەو ئەو جموجووڵو کارو کردەوانەشی، کە خستوونیە ڕوو، ڕەهەندێکی ڕاستەقینەو واقیعییانەیان هەیەو، دەبینین لە واقیعی ئەمڕۆماندا بەسەر هەندێك کەسی دەوروبەریشماندا دەچەسپێن، کە لە نێوماندا دەژین، هەروەها بەسەر هەرکەسێکدا دەچەسپێن، کە ڕووی لە زانست وەرگێڕاوەو خۆی لە ئایین داماڵیوەو، زانستە شەرعییەکەشی بۆ خزمەتکردنی دەسەڵاتدارانی ستەمکار خستۆتە گەڕ، لەجیاتی ئەوەی بۆ بەختیارکردنی خەڵکیو بڵاوکردنەوەی ئایین بەکاری بێنێت.

باشترین کەسیش، کە ڕەهەندی واقیعیی ئەم چیرۆکەی ڕوون کردبێتەوە، مامۆستا پێشەوا (شەهید سید قطب)ە، کە تووشی چەند کەسێك ببو لەوانەی هەڵگری زانستی شەرعی بوونو، کەچی لەپێناوی خۆ نزیك کردنەوەیان لە ستەمکارو زۆرداران بەکاریان هێنابوو. لەم ڕووەوە مامۆستای شەهید گوتوویەتی:

"ئەم چیرۆکە نمایشی بارودۆخی ئەو کەسانە دەکات، کە ئایەتەکانی خوا بەدرۆ دادەنێن، دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆتەوەو دەیزاننو لێی شارەزا دەبن، پاشان لەسەریان دانامەزرێنو کاریان پێناکەن.. بەڕاستی ئەم بەسەرهاتەش بەڕادەیەکی زۆر لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دووبارەو چەندبارە دەبێتەوە، بەڕاستی زۆرن ئەوانەی ئایینی خوایان پێ دەگەیەنرێتو، پاشان ڕێی ڕاستی پێ ناگرنەبەر، بەڵکو لەجیاتی ئەمە ئەو زانستە دەکەنە ئامڕازێك بۆ گۆڕینو لابردنی فەرمایشتی خواو، بۆ ئەوەش، کە دوای هەواوهەوەسی خۆیان پێبکەون، هەروەها دوای هەواوهەوەسی ئەو زۆردارانەشی پێبکەون، کە دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا سەپاندوون، کە -بەوەهمو گومانی ئەمان- گوایە سامانی ژیانی دنیاییانی لەدەست دایە. بەڕاستی چەندەها (زانای ئایین)مان بینی لەوانەی، کە شارەزای حەقیقەتی ئایینی خوا بوونو، پاشان لایان داوە لێیو زانستەکەیان لە شێوانو دەسکاریکردنی بە ئانقەستو نیازداردا بەکارهێناوە، هەروەها لە فەتواخوازراوەکانی دەسەڵاتداری

لەنێوچووی سەرزەویدا بەکارهێناوەو، ویستووشیانە ئەو دەسەڵاتە دەستدرێژکارییە لەسەروو دەسەڵاتی خواو یاساو هەموو پیرۆزییەکانەوە لەسەر زەوی جێگیرکەن.

بێگومان هەندێك لەو جۆرە زانایانەمان دیوە کە سەرباری ئەوەی زانیویشیانە - یاساو دەسەڵات لە مافەکانی خوان-و گوتووشیانە: (بێگومان یاسادانان مافێکە لە مافەکانی خوا-سبحانە وتعالی-، جا هەرکەسێك ئەوە بە مافی خۆی دابنێت ئەوە دیارە ئیدیعای خوایەتیشی بۆخۆی کردووە. هەرکەسێکیش ئیدیعای خوایەتی بکات، ئەوە بێگومان کافر بووە، هەر کەسێکیش دان بەو ئیددیعایەدا بنێتو ئەو مافەی بۆ بڕیار بداتو شوێنکەوتوویشی بێت، ئەویش کافر بووە.)

جا وەك گوتمان هەندێك زانایانی ئایینی سەرباری ئەم زانینو وتانەشیانو لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەزانن (ئەم حەقیقەتە زانراوێکی زۆر پێویستو زەرورەتی دینیشە)، کەچی بانگەوازو پڕوپاگەندە بۆ ئەم دەسەڵاتدارە ستەمکارانە دەکەن، کە ئیددیعای مافی یاسادانان بۆ خۆیان دەکەن، کە بەمەش ئیددیعای خوایەتی دەکەن، جا ئاخۆ ئەم جۆرە زانایانە، لە کێوە حوکمی کافربوون بەسەر ئەو ستەمکارانەدا بدەنو ناوی (موسڵمان)یان لێ بنێنو ئەو بەرنامەیەش، کە گرتوویانەتە بەر بە ئیسلامێکی وای دابنێت، کە ئیدی هیچ ئیسلامێکی تری لەدواوە نیە.

هەروەها هەندێك لەوجۆرە زانایانەمان دیوە، کەساڵێکیان دەربارەی قەدەغەکردنو حەرامبوونی سووخۆری (ریبا)ی نووسیوەو، ساڵێکی تریش دەربارەی ڕەواکردنو حەڵاڵبوونی (ریبا)کەی نووسیوە. هەروەك هەندێکی تریانمان دیوە، کە دەسخۆشیی لە بەدڕەفتاریو بڵاوبوونەوەی بەدکاریی لەنێو خەڵکیدا کردووە، لە هەمان کاتدا بەرگی ئایینو دروشمو نیشانەکانی ئایینیشی بەبەر ئەو زۆنگاوەدا کردووە.

ئیدی هەریەکێك لەم جۆرە زانایانە، دەبێتە نموونەیەکی بەڕاست دانەری ئەو بەسەرهاتەی کابرای نێو چیرۆکەکە ﴿...نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥﴾ الأعراف.

هەروەها ئەم جۆرە زانایەش هەر دەبێت تووشی ئەو حاڵەتی گۆڕانو نزماییە بێت کە خوا دەربارەی کابرای نێو بەسەرهاتەکە فەرمویەتی: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ...﴿١٧٦﴾ الأعراف ﴾ خۆ ئەگەر خوا خواستی وابێت ئەم جۆرە زانایە بەهۆی زانستی ئایەتەکانەوە بەرزو پایەبلند دەکات، بەلام خوا خواستی وانیە، چونکە ئەو کەسەی، کە ئایەتەکانی خوای زانیوەو لەجیاتی پەیڕەوکردنیانو خۆ پێبەرزکردنەوەیان، خۆی بە زەوییەوە لکاندووەو دنیاپەرست بووەو دوای هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووەو کاری بە ئایەتەکان نەکردووە.

ئەمەش پەندێکە بۆ هەر کەسێك، کە خوا زانستی ئایەتەکانی پێ بەخشیوەو، بەلام سوودی لێوە دەسگیر نەبووەو، لەسەر ڕێگای باوەڕداریش جێگیرو دامەزراو نەبووەو، خۆی لە نیعمەتی خوا داماڵیوە تاکو ببێتە بە شوێنکەوتوویەکی ملکەچی شەیتانو، لە دواییشدا بگاتە پلەو ئاستی ئاژەڵ.. ئەی ئاخۆ ئەو زمان دەرکێشانو هەناسەبڕکێیە چی بێت، کە هەر نابڕێتەوە؟! ئەمە -بەگوێرەی ئاماژەکانی کاریگەریی‌و کێشی بەسەرهاتەکەو وێنەگرتنی دیمەنەکان لە قورئاندا و لە هەستی ئێمەشدا-، ئەو زمان دەرهێنانەیە بەدوای کەرەسەکانی ئەو دنیایەدا، کە کەسانێك لەپێناوی خۆیان دادەماڵن، کە خوا ئایەتو فەرمانەکانی خۆی پێ‌گەیاندوون ئەوانیش خۆی لێ دادەبڕنو دادەماڵن، هەر ئەو زمان دەرکێشانە نائارامەشە، کە ئارامیی‌و هێمنی بەکەس نادات‌و واز لە خاوەن زمانەکەش ناهێنێت، سا ئیتر دەرسێکی دادابێت، یان دای نەدابێت، چونکە ئەو هەمیشە تیایدا دێت‌و دەچێت.

ژیانی بەشەرییش بەردەوام لە هەموو جێگەو ولاتو، لە هەموو سەردەمێك‌و لە گشت ژینگەو دەوروبەرێکدا، نموونەی هاوشێوەی ئەم چیرۆکەمان پیشان دەدات.. تەنانەت جاری وا هەیە بە ماوەیەکی درێژیش تێپەڕ دەبێت‌و، چاوی مرۆڤ

بەر چەند زانایەك دەكەوێت، كە نموونەی ئاوای تێدایە، مەگەر ژمارەیەكی هێجگار كەمو دەگمەن نەبێت لەوانەی كە خوا پاراستوونی، كە خۆیان لە زانستی ئایەتەكانی خوا دانامالّنو پێ لە زەوی گیرناكەنو، دوای هەواو هەوەس ناكەونو، شەیتان ملكەچی خۆیان ناكاتو، زمانیش بۆ ئەو كەلاوەی شرەخۆریە درێژ ناكەن، كە خاوەن دەسەلاّتەكان هەیانە. ئەم نموونەیەش لە هیچ زەمانێكدا بزر نیەو هەر دێتو هەیەو، تەنها لە چیرۆكێكدا بەند نیە، كە لە چاخێكی زەمەندا ڕووی دابێت.

هەر لەم چیرۆكەو لەو ئایەتانەی قورئاندا، خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی خۆی محمد ﷺ كردوە، كە ئەم بەسەرهاتە بۆ ئەو گەلەی خۆی بخوێنێتەوە، كە ئایەتەكانی خوایان بۆ دەهاتە خوارەوە، تاكو لێیان دانەمالّرێتو لێی دانەبڕێت، لەكاتێكدا بۆ ئەوان هاتووە، ئنجا دوای خۆشیان بەردەوام بۆ نەوەكانی تر بخوێنرێتەوە (واتە ئەم چیرۆكە) تاكو ئەوانەی شتێك لە زانستی خوا دەزانن ئاگادار بن لەوەی، كە نەبادا بگەنە ئەم ئاكامی بەدبەختییەو، تووشی ئەو هەناسەبڕكێو زمان دەرهێنانەش نەبن، كە هەرگیز نابڕێتەوەو، ئەو ستەمە گەورەیەش لەخۆیان نەكەن، كە هیچ دوژمنێك بەو ڕەنگە ستەم لە دوژمنەكەی ناكات، چونكە ئەوان بەم ئاكامی نەگبەتیو چارەڕەشی‌یە، تەنها ستەم لەخۆیان دەكەن.

بێگومان هەر لەم سەردەمی خۆیشماندا، كەسانی ئاوامان لە زانایان بینیوە، كە -پەنا بەخوا- وادیارە هەر بە ئەنقەست سوورە لەسەر ستەم كردن لەخۆی، یان وەك ئەو كەسەی -بە كاكیلەی ددانەكانی- خۆی پابەندكات بە جێگەیەكەوە لە بنی دۆزەخداو، تەنها ترسی ئەوەی هەیە، نەبادا یەكێكی دی لە پێشبڕكێكارانی دنیا لەسەر سەكۆی ململانێ بەربەرەكانیی بكات، ئیدی بەردەوام هەموو بەیانی یەك كاروكردەوەی خراپی وەها ئەنجام دەدات، كە زیاتر ئەو جێگەیەی دۆزەخی بۆ شایستە دەكات، بۆیەش هەمیشە درێغی ناكات لە زمان دەركێشانو پەلەقاژە بەدوای ئەو مەبەستە دنیاییەداو، لە زمان دەركێشانێكی نەبڕاوەدایە، تا ئەو ڕۆژەی لەژیانی ئەم دنیایە دەردەچێت.

خوایە بمانپارێزیتو، لەسەر ڕێی ڕاست جێگیرو دامەزراومان کەیتو، ئارامیی تەواومان پێببەخشیتو، بە موسڵمانێتی بمانمرێنیت[1]".

ئێمەش وەك تیشكێك لەسەر ئەو نزا گەرمەی كە (سید قطب) كۆتایی لێكدانەوەكەی خۆی پێ هێناوە، دەڵێین كە بێگومان خوا نزاكەی لێ پەسندكردو ئەویش -شەهید سیدقطب- لەسەر ئایینی خواو بانگەوازەكەی جێگیرو دامەزراو بوو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵاو ئازارەی تووشی كراو، سەرەڕای ئەو فریودانو تەفرەدانەش كە دەیانویست بە هەندێك پلەوپایەی دنیایی تاقی بكەنەوە. بەڵام ئەو لەسەر ڕێبازەكەی خۆی بەردەوام بوو تاكو بە شەهیدیی بۆ لای خوا گەڕایەوە.

## ئیمانو پێستی مرۆڤ

لێرەشدا هەڵوێستەیەكی خێرا دەكەین لە ئاست حیكمەتی چواندنی ئایەتەكانی خوا بە پێستی مرۆڤو، پیشاندانی وێنەی (ئەو پیاوەی خۆی لەو ئایەتانە داماڵیوە) وەك ئەو كەسەی كە پێستی خۆی لەلاشەی داماڵیبێت.

دیارەو ڕاستە كە پێستی مرۆڤ بەلاشەیەوە نووساوەو بەردەوام پێوەیەتیو هەموو جەستەی داپۆشیوەو، پارێزەریشیەتی لە دەردو مەترسییەكان. جگە لەوەی كە مرۆڤ بە پێستەكەیەوە جوانیو بەهایەكی تایبەتیی هەیە. ئیمانیش بۆ مرۆڤ هەر بەم ڕەنگەیەو، ئایەتەكانی خواش بەم ڕەنگە بایەخی خۆیان لەسەر مرۆڤ هەیە.

بنچینەی مەسەلەكەش ئاوایە، كە دەبێت ئایەتەكانی خواو، هەموو ئەو باوەڕو ڕاستگۆییو پابەندییەی تیایاندان -وەك نووسانی پێستی مرۆڤ بە جەستەیەوە- پێوەی نووسابنو هەمیشە پێوەی چەسپ بووبن، بۆیە ئەوەش چاوەڕوان ناكرێت كە مرۆڤی باوەڕدار ساتێك لە ساتەكانی شەو یان ڕۆژ ڕوو لەو ئایەتانە وەرگێڕێت، چونكە چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناكرێت، كە واز لە پێستەكەی خۆی بهێنێن. جا

1) في ظلال القرآن/٣: ١٣٩٧-١٣٩٩ .

بەڕاستی ئەوانەی تەنها لە هەندێك بۆنەی ئیسلامیو كۆڕو كۆبوونەوە ئاینییەكاندا ئیمان (باوەڕ) دەكەنە بەرگێكو لەبەری دەكەن، لە بنەڕەتو حەقیقەتی ئیمان تێنەگەیشتوونو، بە حەقی تەواوی خۆی پێوەی وابەستە نابن. چونكە ئیمان مۆدەو مۆدیلی كاتێك لە كاتەكان نیەو، پۆشاكی سەعاتێك لە سەعاتەكان نیە.. هەروەها ساتێكی واش نیە كە مرۆڤ لە بەشێكی ڕۆژەكەیدا تیایدا بژیو تەواوی ساتەكانی تری ئەو ڕۆژەی بە شتی ترەوە بەسەر ببات.. بەڵكو بێگومان ئیمانو باوەڕداریتی (حاڵەتێكی هەمیشەیی)ی مرۆڤی باوەڕدارەو لە هەموو كاتو زەمانو جێگەیەكدا هۆگریەتی.

جا لەبەرئەوەی (پێست) داپۆشەری جەستەیەو، جوانیو ڕازاوەییو قەشەنگی یەكی تری بەبەردا دەكات، ئیمانیش هەر ئاوایەو، ئەم ئیمانەشە كە خاوەنە (ئیماندارەكەی) دەڕازێنێتەوەو لەو جوانیو قەشەنگییەی بەبەردا دەكات، وەك خواش فەرموویەتی: ﴿...وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ ...﴿٧﴾ الحجرات﴾. واتە: بەڵام خوا باوەڕو ئیمانی لەلاتان خۆشەویست كردوەو لە دڵو دەروونتاندا ڕازاندوێتییەوە، هەروەها كفرو بێباوەڕیو بەدكاریو یاخی بوونو سەرپێچی لە فەرمانی خوای لەلاتان ناشیرین كردووە.

مرۆڤیش بە ئیمانو باوەڕدارێتییەوە قۆزو جوانە، دەنا بەبێ ئیمان ناشیرینو شێواوو بێزراوە، هەر بەبێ ئەو ئیمانو باوەڕدارێتیەش گەندەڵیو ناشیرینیو بەدكارییو بێنرخیو لادانەكانی دەردەكەونو، بەڕادەیەكی زۆریش ئەم دیاردە نالەبارانەی لێ دەبینرێت، بەڵام هیچ شتێك ئەم دیاردانە ناشارێتەوە، تەنها ئیمان نەبێت، كە خوا بۆ مرۆڤی ڕازاندۆتەوە.

# ئاکامی پشتگوێ خستنی حەق و شوێنکەوتنی ئارەزوو

ئەم چیرۆکە ئاماژە بۆ ئاکام و شوێنەواری (خۆدامالّین لە ئایەتەکانی خوا)و (پشتگوێخستنی حەق) لەسەر مرۆڤ، دەکات، ئەوەش لەم چەند دەستەواژانەدا:

١- (فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ) شەیتان دوای کەوت.

٢- (فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ) بوو بە یەکێك لە سەرگەردان و سەرلێشێواوان.

٣- (وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَـٰهُ بِهَا وَلَـٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ) گەر خواستمان وابایە، کە سەرفرازی کەین، ئەوا بەو ئایەت و زانستانە بەرز و پایەدارمان دەکرد، بەڵام ئەو کابرایە، خۆی لە زەوی و ژیانی دنیاپەرستیدا توندکرد و، حەزی لە ژیانی سەر زەوی و خۆنووساندن بە زەوییەوە بوو.

٤- (وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ) هەروەها دوای هەواو ئارەزووی خۆی کەوت.

٥- (فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ) نموونەی ئەو وەك نموونەی سەگە.

٦- (إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث) کاتێك ئەو سەگە دەربکەیت و ڕاوی بنێیت، زمان دەردێنێت و لە هەناسەبڕکێدایە، یان کاتێك وازیشی لێ بێنیت، هەر لە حاڵەتی زمان دەرکێشان دایە.

ئەم شەش دەستەواژەیەی پێشوو، شەش ئاسەوار و ئاکامی ترسناکی ڕوو لە هەق وەرگێڕان و خۆدامالّین لە ئایەتەکانی خواو، هەریەکەشیان بە مەترسییەکی گەورەو، زیانێکی زۆر دادەنرێت، ئەی ئاخۆ ئەگەر هەموویان پێکەوە لە کەسێکدا هەبن، حاڵی چۆن بێت؟ بێگومان لەناوی دەبات و، ڕەنجەڕۆ و بزری دەکات و، دەیشیکات بە سەربازێك لە سەربازانی شەیتان.

لەمەشەوە بەو دەرەنجامە دەگەین کە لە ژیاندا دوو ڕێگا هەیە: (ڕێگای ڕاست)و (ڕێگای گومڕایی)، (ڕێگای خوا)و (ڕێگای شەیتان).. خۆ ئەگەر هەر کەسێك بەرێگای یەکەمدا نەڕوات، ئەوە بێگومانو (شتێکی بەڵگەنەویستە)، کە بە ڕێگایەکی تردا دەڕوات.

هەروەها لەم مەسەلەیەدا بەوەش دەگەین، کە پابەندیی بەڕێگای ڕاستو باوەڕدارییەوەو، شوێنکەوتنی چەمكو حەقیقەتەکانی ئیمانو، وابەستەیی بەتین بە ئایینی تۆکمەی خواوە، تاکە زمانەی دڵنیاییە، کە بە یارمەتیو کۆمەکی خوا مرۆڤ لە شەیتان دەپارێزێتو، شەیتانو سەربازەکانیشی لە مرۆڤی باوەڕدار دووردەخاتەوە.

بەڵام ئەوەی دەسبەرداری ئەم ڕێگەیە بێت، ئەوە بێگومان وەك نێچیرێك دەکەوێتە بەردەستی شەیتانو، دیلی لای کۆمەڵی (حیزبی) شەیتان دەبێتو، پێکراوو کەوتووی وەسوەسەکانی دەبێت.. ئەی ئاخۆ کاتێك تەسلیمی شەیتان دەبێت، لە چ حاڵێکدا بێت؟ بێگومان بەخێراییو زمان دەرکێشانەوە لەپێشیەوە دەڕواتو، دەبێتە یەکێك لە سەرلێشێواوو گومڕاو لادەران، هەروەك کە شوێنکەوتووی هەواو ئارەزووی خۆی دەبێت، دیارە هەر بە تەنیاش (شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووش دەردێکی کوشندەیەو مرۆڤی هەوەس پەرست لە زەویداو لە خۆشویستنی دنیادا دەچەقێنێت، مرۆڤیش (واتە لەم جۆرە کەسانە) تەنها شتە کرچ وکاڵەکانی دنیاو شتە ئارەزوو بەخشەکانو کەرەسە هەواپەرستییەکانی دنیای چەنگ دەکەوێتو هەر ئەوانەی تیادا هەڵدەبژێرێت، ئیدی لەو کاتانەدا وەك سەگی لێدێتو لە حاڵەتی زمان دەرکێشانو هەڵپەکردنێکی بەردەوامدا دەژیو، ئەم زمان دەرکێشانو هەڵپەکردنەش بەدوای ئەو شت ومەكو کەرەسە خۆشی بەخشە بڕاوانەی دنیادایە، کە مرۆڤ لە زەویدا هۆگرو وابەستەیان دەبێتو واش دەزانێت بە نەمری تیایاندا دەمێنێتەوە.

# ڕێگـەی بەرزبوونـەوەو، ڕێگـەی ڕۆچـوون

هەروەها لەم ئایەتانەوە ڕێگەی بەرزبوونەوەو، ڕێگـەی ڕۆچـوونو نـزم بوونـەوە ڕەچاو دەکەین، ئەمەش لەم فەرمایـشتەی خـوادا: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ... ﴿١٧٦﴾ الأعراف ﴾ بە مانای: گەر ئیرادەمان لەسـەری بوایە کە بەو ئایەتانە بەرزیو سـەرفرازو پایـەداری بکـەین، ئـەوا ئـەو پلەیـەمان پێدەدا، بەڵام -ئەو خۆی- حەزی لە دنیاپەرسـتیو پێچـەقاندن لـە زەوی دابـووو شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوت.

وەك لەنێو خەڵکیشدا یەکدەنگیو تەباییەکی بـیرورا لەسـەر ئـەوە هەیـە، کـە بێگومان هەموو مرۆڤێکی ژیرو هۆشمەند لەم دنیایەدا حـەزی لەوەیـە کـە بـەرزو پایەدارو خاوەن ئاستێکی بالاّ بێتو، شانو شەوکەتێکی گـەورەی هـەبێتو لـەنێو کەسانی تردا بەچاکی باسی بکرێت.. بەڵام ڕێگاو شێوازەکانی خەڵکی بۆ گەیـشتن بەم نیازە جـوانو نایابـە هەمـەجۆرن، هەنـدێکیان ڕێگایـەکی پێـچەوانەو هەڵـە دەگرنەبـەر، وازەدانـن بەمـە دەگەنـە مەبەسـتەکەیان، بـەڵام لەڕاسـتیدا تـەنها پێچەوانەی ئەو مەبەستەیان دەسگیر دەبێت.

بێگومان ڕێگای بەرزبوونـەوەو سـەربەرزی، پابەنـدییو دەسـگرتنی جیـددیو ڕاسـتگۆیانەو پەیڕەوکارانەیـە بـەو ئایـەتو فەرمانانـەی خـواو بـە ئـایینو شەرعەکەیەوە، ئەمەش لە فەرمایشتەکەدایە (لَرَفَعْنَاهُ بِهَا).

بێگومان خوا مرۆڤی لە جوانترینو باشترین شێوەو ڕوخساردا دروست کردووەو، لە تەواوی مەخلوقاتی تری سـەر زەوی باشـتری دانـاوەو، خوازیـاری سـەربەرزیو پایەبڵندیو ڕێزلێنانیەتی، هەر بۆیەش ڕێنمایی کردووە بۆ گرتنەبەری ئەو ئـامڕازو شـێوازەی، کـە بـەو سـەربەرزیو ڕێـزو پایەبڵندییـەی دەگەیـەنێت، لـەم ڕووەوە ئایەتەکانی بۆ نادرۆتە خوارەوەو پێغەمبەرانی بۆ ناردووەو، حـوکمو فەرمانـەکانی

بۆ دیاری کردووە.

جا کەسێك بەو حوکمو فەرمانانەی خوا قایل بێتو پەسندیان بکاتو پێوەیان پابەند بێت، ئەوا پلەی سەربەرزیو بڵندبوونەوەو ڕێزو کەرامەتی دەسگیر بووە.

پێچەوانەی ئەم ڕێگایەش، ڕێگای ڕۆچوونو، خەسارەتمەندیو گومڕابوونە، بێگومان ڕێگای ڕۆچوونو دابەزینیشی لە ڕەتکردنەوەی ئایەتو فەرمانەکانی خوادایەو، لە پشتگوێخستنی شەرعەکەداو بەدەمەوەچوونی وەسوەسەو خورپەکانی شەیتان دایە.

هەروەها ڕێگەی ڕۆچوونو بەناخی زەوی داچوون، لە خۆچەقاندن لە زەویداو شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوودایە (وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ).

مانای (أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ)یش ئەوەیە مرۆڤ بەدنیا هەڵخەڵەتێتو لە ڕۆژی دوایی بەباشتر دابنێتو، مەیل بخاتە سەر شتە جوانو فریودەرو خۆشی بەخشەکانیو، سەرکردنە سەر ئارەزووو چێژو کەسەرەو باقو بریقو ئاڵو والآ بێشەرعیەکانیو، ڕێبازە ناڕەواو بێپەرژینەکانی.

جا هەرکەسێك ئاوا ڕەفتار بکات، ئەوە بێگومان شوێنی هەواوهەوەسی کەوتووەو جڵەوی داوەتە دەست شەهوەتو ئارەزووەکانیو، بووەتە کەسێکی (زیندەوەری سەرزەوی)و ئاژەڵیانەو ئارەزووپەرستانەو بەرەڵلایانە دەژی.

بەهۆی خۆ بەزەوی گرتنو دنیاپەرستیشەوە زیاتر نزم دەبێتەوەو دەکەوێتو لێژ دەبێتەوە، ئەم کەوتنەشی بەبنی زەوی دەگەیەنێت.

دیارە باڵندەش هەتا بەرزتر بێتەوە لە بۆشاییداو بە پانتایی ئاسماندا بفڕێت ناهێڵێت ڕاوبکرێتو ببێتە نێچیری دڕندەکان. بەلآم کاتێك دادەبەزێتە سەرزەویو بەو خۆراکە فریودەرەی نێو داوەکە تەفرە دەخوات، دەکەوێتە ناو داوەکەوە.. مرۆڤیش ئاوایە.

## بۆچی سـەگ هەمیشـە لە زمان دەرکێشان و هەناسـەبڕکێدایە؟

ئەم چیرۆکە لەلایەکی ترەوە باسی ئەوە دەکات کـە سـەگ بـەردەوام لـە زمـان دەرکێـــشان دایـــە، (إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث) کاتێـــك دەری دەکەیتو تەنگی پێ هەڵدەچنیت زمان دەردێنێت، یان کاتێك وازی لێ دێنیت هەر زمان دەردێنێت.

ئەم حاڵەتەش لەنێو حاڵەتەکانی سـەگدا تێبینـی کـراوە کـە لـەکاتی ڕۆشتنو هەڵاتنیدا زمان دەردێنێتو، لەکاتی پەلاماردانیدا بەڕاکردنەوە زمـان دەردێنێـت، هـەروەك لـەکاتی بـەڕێگا ڕۆیـشتنیدا زمـانی دەردێنێـتو، لـەکاتی پاڵکـەوتنو دانیشتنیشیدا زمان دەردێنێت.

بۆچی ئەم زمان دەرهێنانە بەردەوامەی هەیە؟

ئەمەش سەرنجو ئاوڕدانەوەیەکی زانستیانەیە لە سەرنجە زانستیەکانی قورئـان. چونکە وەك زانراوە قورئانی پیرۆز چەندین سـەرنجو ئامـاژەی زانـستیی لـەبارەی گـشت بوارەکـانی ژیـانو، بابەتـە هەمەجۆرەکانـەوە تێدایـەو، دەقـەگرانو موعجیزەدارەکـانی قورئـانیش گـەلێك ئامـاژەی زانـستیانەیان لـەخۆ گرتـووەو، ڕۆژبەڕۆژ، هەتا گرۆی بەشەریش زیاتر لە زانستو زانیارییەکاندا پێش بکەون، ئەو ئاماژە زانستیانەی قورئانیش زیاتر ڕوون دەبنەوە.

بەڕاستی ڕازو نهێنیی (زمان دەرهێنانی هەمیـشەیی)ی سـەگ لەوەدایـە، کـە خوای پەروەردگار لە پێستی سەگدا ئەو کونە وردیلانەی دروست نەکردووە، کە لـە تەواوی گیانەوەرانو مەخلووقاتی تردا دروستی کردوون، دیارە ئەم کونە وردیلانەی پێستیش زۆر بۆ لەش پێویستن، چونکە ئـەو عەرەقـەی لـەش دەردەدەن، کـە لێـی دەردەچێت، ئەو عەرەقەش، کە لە جەستە دەردەچێت، چـەندین شـتی ژەهـراویو مادەی میکرۆبیو ترسناکی تێدایە، کە ئەگەر لەگەڵ عەرەقداو لەڕێی ئەو موانەوە دەرنەچنو، لە لەشدا بمێننەوە، ئەوا ئازاری دەداتو، لە ناویشی دەبات، لەبەر ئەوە

كونه وردیلانەكانی نێو لەش‌و دەرچوونی عەرەق لێیانەوه، نیعمەتێكی گەورەی خوایه بۆ مرۆڤ و (بۆ گیانەوەرانی تریش)، ئەمەش لەو نیعمەته گەورەو زۆرانەی تری خوایه، كه هیچ كەسێك ناتوانێت بیانژمێرێت.

جا لەبەر ئەوەی سەگ ئەو كونانەی له پێستیدا نیه، ئاخۆ چۆن ئەو ژەهره زیانبەخشانەی لەشی دەركات؟ بێگومان لەڕێی زمان دەرهێنانەوه دەری دەكات. واته لەڕێی دەم‌و زمانیەوه، ئەمەش كردارێكەو، خوا بە فیترەت پێی داوەو ڕێنمایی بۆ ئەو كاره ئاسایی (فیتری)یەی كردووه، وەك فەرمووشیەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠ ﴾ طه. هەروەها فەرمویەتی: ﴿ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣ ﴾ الأعلى.

بێگومان ئەم ئاماژه زانستییەش ئاگادارمان دەكاتەوه له وێنەیەك له وێنەكانی حیكمەتی زۆر گەورەو بەرفراوانی خوا، چونكه خوا حەكیم‌و زاناو دانایەو، هەموو مەخلوقێكی به حیكمەتی خۆی‌و بۆ مەبەستێك خەلق كردووەو، سروش‌و ئیلهامی ئەو ئامرازو شێوازانەشی پێ ڕاگەیاندووه، كه پێی دەژی‌و، هەر بەو حیكمەته زۆرەشی ڕێنمایی كردووه، كه چۆن ئامرازەكانی ژیانی بەكاربێنێت.. پاكی‌و بێگەردی هەر بۆ خوایه.

## ڕازو نهێنی چواندن به سەگ‌و گوێدرێژ

قورئانی پیرۆز نموونەی به هەریەكه له سەگ‌و كەر (گوێدرێژ) هێناوەتەوەو چواندوونی به دوو نموونەی دیاریكراو، بۆ چەند كەس‌و تاقمێكی دیاریكراو، ئەو كەسه دیاری كراوانەو، ئەو دوو ئاژەڵەشی ڕوون كردۆتەوه. دیاره ئەوەی، كه به سەگەكه چوێنراوه، ئەو كابرایەیه، كه خوا ئایەتەكانی پێ سپارد، بەڵام خۆی لێیان داماڵی‌و خۆی به ژیانی ئارەزوو پەرستانەی سەر زەوییەوه چەسپ كردو، شەیتانیش بۆ ڕێنموونی كردنی، دوای كەوت، ئەو كابرایەش دوای هەواو ئارەزووی

خۆی کەوت. یان با بڵێین (ئەوەی بە سەگەکە چوێنراوە، ئەو زانایەیە کە کاری بە زانستەکەی خۆی نەکردووە)، ڕووکاری هاوشێوەی نێوانیشیان (واتە لەنێوان ئەوو سەگەکەدا) ئەو هەڵپەکردنو هەناسەبڕکێو زمان دەرکردنە هەمیشەیی و بەردەوامەیە. سەگەکە بۆیە زمان دەردەهێنێتو هەناسەبڕکێیەتی، تاکو عەرەقەکەی نێو لەشی لەڕێی زمانیەوە دەردات. ئەو زانایەش کە کاری بە زانستەکەی نەکردووە، بەردەوام بەدەم ڕۆیشتنەوە بەدوای کەلاوەی دنیادا زمان دەردێنێتو بۆ خۆ نزیککردنەوەش لە زۆردارانی لە ستەمدا ڕۆچوو، کە سوورە لەسەر ئەوەی لەسەر حیسابی زانستو دینەکەی ڕازییان بکاتو ئەو زانستو ئاینەی بخاتە خزمەتیانەوە.

هەروەها ئەو کەسەی، کە بە کەر (گوێدرێژ) چوێنراوە، ئەو زانایەیە، کە کاری بە زانستەکەی نەکردووە، وەك خوا لەبارەوە فەرموویەتی: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ... ﴿٥﴾ الجمعة ﴾، واتە: نموونەی ئەوانەی، کە تەوراتیان پێ سپێردراو، بەڵام لە ئەستۆیان نەگرتو کاریان پێنەکرد، وەك نمونەی گوێدرێژێکە، کە بارێك لە کتێبی هەڵگرتبێت. بەڕاستی ئەمەش ناشیرینترین نمونەیە بۆ ئەو کەسانەی، کە ئایەتو فەرمانەکانی خوایان بەدرۆ داناوەو باوەڕیان پێ نەبووە.

مەبەست لە وشەی (قوم) لەم ئایەتەدا (بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ...) جوولەکەکانو زاناو قەشەکانیانە، کە تەوراتیان خوێندبووو لێی تێگەیشتبوونو لێی کۆڵیبوونەوەو (لە ئەستۆشیان نابوو کاتێك پێیان سپێررابوو)و پڕوپاگەندەی عیلمو زانستیشیان پێوە دەکرد، بەڵام لە ژیانی عەمەلیو لە کردەوەکانیاندا پێوەی پابەند نەبوون. هەروەها ڕێنماییە تیۆری (نظري)یەکانی تەوراتیان لەبواری ژیانی ڕاستەقینەی ئیمانیدا بۆ حەقیقەتە زیندووەکانی ژیان تەرجەمە نەکردبوو، ئەوان بەم ڕەنگە، کە ئەرکی پەیڕەوکردنی تەوڕاتیان پێ سپێررابوو، کەچی لە ئەستۆیان

نەگرتو کاریان پێ نەکرد. خواش ئەوانی بەو جۆرە گوێدرێژە شوبهاند کە چەند کتێبو نامیلکەیەکی لێ بارکرابێتو بەڵام کاتێك هەڵیان دەگرێت نازانێت چی یەو چییان تێدایە. چونکە لەلای گوێدرێژەکە (ئەگەر کتێبی هەڵگرتبێت) (یان دارو تەختەی هەڵگرتبێت) وەك یەکەو هەر تەنها قورسایی‌و نارەحەتیی لە هەڵگرتنی بارەکە دەسگیر دەبێتو، هیچی تری لێ ناچنێتەوە.

داخۆ جیاوازیی نێوان (جوولەکەکان لە هەڵگرتنی تەورات)و ئەو گوێدرێژەشدا چی بێت کە باری چەند کتێبێکی هەڵگرتووەو، چ شتێك ئەوانی لەم گوێدرێژە جیاکردبێتەوە؟ ئەوان تەوراتیان لەسەر عەقڵو بیرو هۆشیاندا هەڵگرتبوو، ئیددیعای ئەوەشیان دەکرد گوایە بەوە بوون بە زانایان، بەڵام ئایا سوودیان لەو خوێندنو لێکۆڵینەوەو لەبەرکردنەی تەورات بینیو، پاراستیان؟ ئەی ئایا ژیانو کارو کردەوەیان بەگوێرەی ئەو دیراسەو لەبەرکردنو زانیارییانەی نێو تەوراتیان بووە؟ نەخێر، ئەوان لەو رووەوە وەك گوێدرێژەکە بوون، ئیدی لە چ شتێکدا لە گوێدرێژەکە جیابوونەتەوە؟

ئەو جۆرە کەسەی، کە خوا وەك نموونە شوبهاندوویەتی بە سەگو بە کەر، ئەو زانایەیە، کە خوا زانستی پێ بەخشیوە تاکو بەرزو پایەبڵندی بکات پێی، بەڵام ئەو -واتە ئەو زانایەی خۆی- پایەبەرزی یەکەو رێزلێنانەکەی خوا رەت دەکاتەوەو ئەوەی لەلا باشترە خۆی بە زەوییەوە بچەسپێنێتو دوای هەواو هەوەس بکەوێت.

ئەم دوو نموونەو وێنە قورئانییەش بانگەوازێکن بۆ هەر خاوەن زانستێك، کە کاروباری خۆی بەتوندی رابگرێتو بەو زانستەی خۆی لەخوا بترسێتو لە سزای خوا خۆی پێ بپارێزێتو، بۆ پایەبەرزیو رێز لەخۆگرتنو سوودی کەسانی دی بەکاری بێنێت، نەك بۆ خۆنزمکردنەوەو پایەنزمیو شوێنکەوتنی سەرشۆرانەی کەسانی بەدکار.

بەراستی چەندەها کەس هەن لە هەڵگرانی پلەو نازناوی زانستیو، خاوەنانی بروانامە بەرزە زانستییەکانو، لەوانەش، کە بەرزترین پلەو فەرمانی رەسمیی

ئیسلامی لەلای زۆردارانی لە ستەمدا ڕۆچوو بەرێوە دەبەن.. چەندەها کەس هەن لەوانەی، کە ئەم دوو نموونە قورئانییانە دەیانگرێتەوەو چەندەها کەس لەمانە لە سەرشۆڕی‌و ئاستی نزم‌و زمان دەرکێشان‌و هەناسەبڕکێ‌دان بەدوای ماڵ‌و سامان‌و شتومەکی ساختەی بڕاوەی دنیادا -وەك چۆن سەگ زمان دەردەکێشێت‌و لە هەڵپەدایە-، بەڕاستی چەندەها کەسی تریش لەوانە -وەکو گوێدرێژ چۆن لە نەفامی‌و گەمژەیی‌و ماندوێتی‌و نارەحەتی دایە- ئایا لەو حاڵەدان‌و، هیچ سوودێك لە زانستەکەیان وەرناگرن..

لەناوچێت ئەو کەسەی، کە وا خۆی بادەدات گوایە زانایەو کەچی لە پەندو نمونەی سەگ‌و کەرەکەیە.. لەناوچێت ئەو کەسەی کە (زانستەکەی خۆی) زەلیل‌و سەرشۆڕ دەکات، کە زانستەکەی خۆی نەگبەت‌و بەدبەختی دەکات‌و، خەسارەتمەندو لەنێوبراوو، سزادراوی ڕۆژی قیامەتی دەکات.. دەسا خوا بەرەکەت نەخاتە زانستێکی واوە کە خاوەنەکەی بەم ئاکامی چارەڕەشییە دەگەیەنێت.

## کەی زانست خاوەنەکەی لە کەوتن دەپارێزێت؟

کەی زانست خاوەنەکەی لە کەوتن دەپارێزێت؟ پرسیارێکی گرنگەو وەڵامەکەشی لە مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەخوازین، کە لە تەفسیرەکەیدا (في ظلال القرآن) لەم بارەیەوە گوتوویەتی:

"لەبەر ئەوەی زانست بە تەنها خاوەنەکەی ناگرێتەوە لە کەوتن، بەرنامەی (قورئانی) ڕێگەیەکی بۆ پێکهاتنی دەروونی موسڵمان‌و ژیانی ئیسلامیانە داناوە کە هەر زانست بە تەنیا بۆ زانین‌و مەعریفەیە نیە، بەڵکو ئەم بەرنامە قورئانی یە زانست دەکاتە عەقیدەیەکی گەرم‌وگوڕو هاندەرو بزوێنراو بۆ بەدیهێنانی چەمك‌و مەدلوولی خوازراوی خۆی لە جیهانی ویژدان‌و، هەروەها لە جیهانی ژیانیشدا.

بێگومان بەرنامەی قورئانی (المنهج القرآني) بیروباوەڕو عەقیدە لە وێنەیەکی

تیۆری (نظري)دا بۆدیراسەکردن ناخاتە بەرچاو، چونکە ئەوە تەنها زانستێکی ڕووتەو، نە لە جیهانی ویژدانو، نە لە جیهانی ژیانیشدا هیچ شتێك بەرهەم ناهێنێت، چونکە زانستێکی ساردو سڕەو، خاوەنەکەی لە هەواو هەوەس ناگرێتەوەو، هیچ شتێك لە قورسایی ئارەزووەکانی لانابات و شەیتانیشی بۆ دەرناکات، بەڵکو لەوانەیە ڕێگای ئارەزووەکانی بۆ خۆش بکات و بیانپەرستێت. هەمدیسان بەرنامەی قورئانی، ئەم ئایینە هەر تەنها لەشێوەی (ڕژێمێکی ئیسلامی)و (فیقهێك و زانستێکی شەرعیی ئیسلامی)و لە شێوەی (ئابوورییەکی ئیسلامی)و (چەند زانستێکی گەردوونی)و (چەند زانستێکی دەروونی)و لەهیچ شێوەیەك لە شێوەکانی لێکۆڵینەوەی (مەعریفی)دا ناخاتە ڕوو، بەڵکو ئەم دینە وەك عەقیدەیەکی پاڵنەری بەلێشاوو زیندوکەرەوەو بێدارکەرەوەو هەستێنەرەوەو بەرزکەرەوە دەخاتە ڕوو کە پاڵنەری هەڵسوکەوت و چلاکیە بۆ بەدیهێنانی چەمکە عەمەلییەکەی لەکاتی دەستبەجێ ستارگرتنی لە دڵ و عەقڵ داو، مردنی دڵ لادەبات و زیندووی دەکاتەوەو، دڵیش بەخێرایی دەست بە لێدان و جموجووڵ دەکاتەوەو دەبزوێت و هیواکانی تیا دەگەشێنەوەو، دەزگاکانی پێشوازیی و وەرگرتن و بەدەمەوەچوونی فیترەتیان تێدا دەکەوێتە گەڕو دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین سەردەمی بەرنامەی خوا، ئیدی بایەخ و مەبەستەکانیشی پەیدا دەبنەوەو بەرز دەبنەوەو هێزی بەکێشکردنی زەوی ناتوانێت لە زەویدا بیهێڵێتەوەو، لەشێکی قورس و تەمبەڵی هەبێت و، هەر بە زەویدا نووسابێت و سەرگەرمی ژیانی دنیا بێت.

هەروەها بەرنامەی ئیسلامی، ئەم دینە وەك مەنهەجێك بۆ لێوردبوونەوەو تێڕامان دەخاتە ڕوو، کە جوداو دەگمەنە لە مەنهەجەکانی دەسکردی مرۆڤ لەڕووی تیۆری و لێوردبوونەوەشەوە، چونکە ئەم بەرنامەیەی خوا بۆ ئەوە هاتووە، کە مرۆڤ لە کورتی و کەم کورپییەکانی خۆیان ڕزگار بکات و، لە هەڵە و لادانەکانی ژێر باری یاری هەواو هەوەس دەربازیان کات و، لەژێر قورسایی جەستەکان و، چەواشەکاریی شەیتانیش قوتاریان کات. هەمدیسان ئەم ئاینە وەك تەرازویەك بۆ حەق دەخاتە

ڕوو کە عەقڵو بیروهۆشی خەڵکیو تێگەیشتنیان ڕێك دەخات، هەر بەم تەرازووی حەقەش ڕەوتو تەوژمی فیکرییو بزوتنەوەکانیانو دیدو تێڕوانینیان دەپێوێتو هەڵدەسەنگێنێت. جا ئەوەی بەپێی ئەم تەرازوە پەسند بێت، ئەوە ڕاستو دروستە بۆ ئەوەی عەقڵو بیروهۆشی خەڵکی لەسەریی بڕۆن، بەڵام ئەوەی کە ئەم تەرازووە ڕەتی دەکاتەوەو پەسندی ناکات، ئەوە هەڵەیەو پێویستە دەستی لێ هەڵگیرێت. هەروەها (بەرنامەی قورئانی) بیروباوەڕی ئیسلام وەك مەنهەجێك بۆ بزووتنو جمو جووڵ دەخاتە ڕوو کە هەنگاو بە هەنگاو پێشڕەوایەتی گرۆی بەشەری دەکات لەسەر ڕێی بەرزبوونەوە بەرەو لوتکەی هەرە بڵندو، بەگوێرەی نەخشەو پلانی خۆیو بەڕادەی مەزەندەکراوی.. لەکاتی بزووتنی واقیعیو جوولانەوەی ڕاستەقینەش دا (بەرنامەی قورئانی) یاساو ڕژێمی ژیان بۆ خەڵکی دادەڕێژێت، هەروەها ڕێساکانی شەریعەتەکەیانو بنەماکانی ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسەتیشیان دادەڕێژێت، پاشان خەڵکیش بە (عەقڵو بیروهۆشی ڕێکخراوو وابەستەیان بەو بەرنامەیەوە) شێوازی یاسادانانو ڕەوتی فیقهییانو زانستو زانیارییە گەردوونیو دەروونییەکانیانو سەرجەم مەسەلە خوازراوەکانی ژیانی کردەییو واقیعییان دادەڕێژنەوە، لەکاتێکیشدا دایدەڕێژنەوە کە لە دڵو دەروونیاندا گەرمیو هاندانی عەقیدەو، کارابیو واقیعییەتی شەریعەتو، پێداویستییەکانی ژیانی واقیعیو، ڕێنمایی یەکانی ئەم ژیانە، هەیە..

ئا ئەمەیە (مەنهەجی قورئانی) لە داڕشتەنەوەی دەروونە موسڵمانەکانو ژیانی ئیسلامیدا. بەڵام لێکۆڵینەوەی تیۆریی کە تەنها (بەمەبەستی لێکۆڵینەوە بێت) ئەوە بێگومان ئەو زانستەیە کە مرۆڤ ناپارێزێت لە ئاکاری خۆ قورس کردن بە زەویو، لە پاڵنەری هەواو ئارەزووو، لە فریودانی شەیتانو، هیچ خێرو چاکەیەکیش بۆ مرۆڤایەتی بەدیی ناهێنێت"[1].

---

١) (في ظلال القرآن)ی سید قطب/ ٣: ١٣٩٩.

## بۆ کۆتـایی چیـرۆکەکە..
## شـیعریکی زانـای سـەربەرزو پایەدار (جورجانی)
## بەنـاوی (العالم الأبيّ)

بۆ کۆتایی باس‌و لێدوانـمان دەربـارەی ئـەم چـیرۆکەی قورئـان (چـیرۆکی ئـەو کەسـەی کـە خـۆی لـە ئایەتـەکانی خـوا دامـاڵی)و کـە لەناوچـووو ڕەنجـەڕۆو خەسارەتـمەندیش بـوو، قەسـیدەی پێـشەوایەکی زانـای سـەربەرزو دلێـرو بـەڕێز دێنینەوە کە ئەویش (قاضي، أبو الحسن علی بـن عبـدالعزيز الجرجـاني)یـە، کـە قەسیدەیەکی بەنرخ‌و بەهاداری نووسـیوەو تیایـدا سـیفەتەکانی زانـای سـەربەرزو پایەبڵندو، کاریگەریی زانستی بەسوودی لەسەر خاوەنەکەی -واتە لەسەر زاناکـە- تۆمار کردووە، ئەم قەسیدەیەش مامۆستای لێکۆڵیارو ساغدەرەوە (عبدالفتاح ابو غدە) لـە کتێبـە بەنرخەکەیـدا (صـفحات مـن صـبر العلمـاء علـی شـدائد العلـم والتحصيل) بە تەواوەتی هێناوێتییەوە، ئەمەش قەسیدەکەیە:

يَقُولـونَ لي: فيـكَ انْقِبـاضٌ وَإِنَّمـا — رَأَوْا رَجُـلاً عَنْ مَوْقِفِ الـذُّلِّ أَحْجَمَا
أَرَى النَّـاسَ مَنْ دَانَاهُمُ هَـانَ عِنْدَهُمْ — وَمَنْ أَكْـرَمَتْـهُ عِـزَّةُ النَّفْسِ أُكْـرِمَـا
وَلَمْ أَقْضِ حَقَّ الْعِلْمِ إِنْ كَـانَ كُلَّما — بَـدَا طَـمَـعٌ صَيَّـرْتُـهُ لِيَ سُلَّمـا
وَمَـا زِلْتُ مُنْحازاً بِعِـرْضِيَ جَـانِبـاً — مِنَ الـذُّلِّ أَعْتَـدُّ الصِّيَـانَـةَ مَغْنَمـا
إذا قِيـلَ: هَـذا مَنْهَـلٌ قُلْتُ قـد أرى — وَلَكِنَّ نَفْسَ الحُـرِّ تَحْتَمِـلُ الـظَّمـا
أُنَــزِّهُهَـا عَنْ بَعْضِ مَـا لاَ يَشِينُهـا — مَخَـافَـةَ أَقْـوَالِ العِـدا فِيمَ أَوْ لِمـا؟
فَـأُصْبِـحُ عَنْ عَيْبِ اللَّئِيمِ مُسَـلَّمـا — وَقَدْ رُحْتُ فى نَفْسِ الْكَرِيمِ مُعَظَّمـا
وَإِنِّي إِذا مـا فـاتَني الأَمْـرُ لَمْ أَبِتْ — أُقَـلِّبُ كَـفِّـي إِثْـرَهُ مُـتَـنَـدِّمـا

وَلَـكِنَّـهُ إنْ جَـاءَ عَـفْـواً قَـبِلْتُـهُ ... وَإنْ مَـالَ لَمْ أُتبِعْـهُ: هَـلاَّ وَلَيْتَمَـا
وَأَقْبِضُ خَـطْـوِي عَنْ حُـظوظٍ كَثِيـرَةٍ ... إذَا لَمْ أَنَلْهَـا وَافِـرَ الْعَـرْضِ مُكْـرَمـا
وَأُكْـرِمُ نَفْسِي أَنْ أُضَـاحِـكَ عَـابِسَـاً ... وَأَنْ أَتَـلَقَّى بِـالْـمَـدْيـحِ مُـذَمَّمـا
وَكَمْ طَـالِبٍ رُقِّي بِنُعْمَـاهُ لَمْ يَصِـلْ ... إلَيْـهِ وَإنْ كَـانَ الـرَّئِيسَ الْمُعَـظَّمـا
وَكَمْ نِعْمَـةٍ كَـانتْ عَلَى الحُـرِّ نَقْمَـةً ... وَكَمْ مَغْنَمٍ يَعْتَـدُّهُ الحُـرُّ مَغْـرَمـا
وَلَمْ أَبْتَذِلْ فِي خِدْمَـةِ الْعِلْمِ مُهْجَتِي ... لأَخْـدِمَ مَنْ لاَقَيْتُ لَكِـنْ لأُخْـدَمَـا
أأَشْقَى بِـهِ غَـرْسَـاً وَأَجْـنِيـهِ ذِلَّـةً ... إذاً فَـاتِّبَاعُ الْجَهْـلِ قَدْ كَـانَ أَحْـزَمـا
فَـإنْ قُلْتَ: زَنْدُ الْعِلْمِ كَـابٍ فَـإنَّمَـا ... كَبَـا حِينَ لَمْ نَحْـرُسْ حِمَـاهُ وَأَظْلَمـا
وَلَـوْ أَنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ صَـانُـوهُ صَـانَهُمْ ... وَلَـوْ عَـظَّمُـوهُ فِي القُلوبِ لَعُـظِّمـا
وَلَكِنْ أَهَـانُـوهُ فَهَـانُـوا وَلَـطَخُـوا ... مُحَيَّـاهُ بِـالاطمَـاعِ حتى تجهمـا
وَمَـا كُـلُّ بَـرْقٍ لاَحَ لِي يَسْتَفِـزُّنِي ... وَلاَ كُـلُّ مَنْ في الأَرْضِ أَرْضَاهُ مُنْعِما
وَلَكِنْ إذَا مَا اضْطَرَّنِي الضُّـرُّ لَمْ أَبِتْ ... أُقَلِّبُ فِكْـرِي مُنْجِـداً ثُـمَّ مُتْـهِمـا
إلَى أَنْ أَرَى مَا لاَ أَغُصُّ بِذِكْرِهِ ... إذَا قُلْتُ: قَدْ أَسْدَى إلَيَّ وَأَنْعَمَا[1]

---

١) صفحات من صبر العلماء لأبي غدة: ص ٩٥-٩٦

# چیـرۆكی پێنجـەم

## چیـرۆكی لوقمـــــان

ئەم چیرۆكە لە دەقە قورئانییەكەیدا ئاوا هاتووە، كە خوا فەرمویەتی:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن
كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ
إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ
وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ
عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ
وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾
يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى
ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ
وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ
لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ
وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ لقمان﴾.

واتە: بێگومان ئێمە عەقڵو حیکمەتو زانستمان بە (لوقمان) گەیاندبوو -کە پیاوێکی چاکەخوازو وردبینو ڕەوانبێژ بوو-و بەو ڕەنگەی پێمان ڕاگەیاند، کە سوپاسگوزاری خوابە، جا هەرکەسێك سوپاسگوزار بێت، ئەوا لە پێناوی سوودو پاداشتی خۆی دایە، هەرکەسێکیش سوپاسگوزاری خوا نەبێتو سپڵەبێت، ئەوە بێگومان خوا بێباکە لە سوپاسی خەڵکیو، پێویستی پێ نیە.. لوقمان بۆ دانانی کوڕەکەشی لەسەر ئەو ڕێگە پاکەو لەکاتی پەروەردەکردنیو ئامۆژگاریکردنیدا، بە کوڕەکەی خۆی گوت: کوڕی خۆم، هاوەڵو هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، چونکە بەڕاستی هاوەڵ دانان بۆ خوا (شیرك)، ستەمێکی هێجگار گەورەو ناڕەوایە. هەروەها ئێمە فەرمانمان بە مرۆڤ کردووەو پابەندمان کردووە بەوەوە، کە ئاکاری چاك لەگەڵ دایكو باوکیدا بنوێنێت. بەتایبەتیش، کە دایکی بە لاوازیو ئازارو ناڕەحەتییەکی زۆرەوە لەکاتی هەڵگرتنی بە پێستی سكو لەکاتی منداڵبوونیشدا زەحمەتی پێوە کێشاوە، هەروەك کە دوو ساڵیش شیری پێدەداتو دوای ئەوەش لە شیر دەیبڕێتەوە، بۆ ئەمە فەرمانمان بە مرۆڤ کردوە، کە ئەی مرۆڤ دەبێت تۆ سوپاسی منو دایكو باوکت بکەیتو، هەر بۆ لای خواش دەگەڕێیتەوە. ئەی مرۆڤ ئەگەر دایكو باوکت بەوپەڕی هەوڵو کۆششیانەوە وایان لێ کردیت، کە هاوەڵ بۆ من دابنێیت بێئەوەی هیچ بەڵگەو زانیارییەك لەو ڕووەوە هەبێت، ئەوا گوێڕایەڵییان لەوەدا مەکەو بەدەم فەرمانەکەیانەوە مەچۆ، بەڵام هەمیشە لە دنیادا بەچاکیو گوێڕایەڵیو خزمەتگوزارییەوە لەگەڵیاندا بژیو لە هەمان کاتیشدا ڕێگەی ڕاستی ئەو کەسە بگرەبەر، کە بە دڵسۆزیو خواپەرستییەوە بۆ لای من گەڕاوەتەوە، لە دواییشدا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منەو هەواڵی هەموو ئەو کارو کردەوانەشتان پێدەدەم کە لە دنیا ئەنجامتان داوە.. -جارێکی تر لەسەر زاری لوقمان دەفەرموێت: ئەی کوڕی خۆم، ئەگەر گوناهێك هێندەی تۆوی دەنکە خەرتەلەیەك -کە بچووکترین شتی بەچاوبینراوە- هەبێتو لەنێو بۆشایی بەردێکدا حەشار درابێت، یان لە ئاسمانەکاندا، یاخود لە شوێنێکی دیاری زەویدا بێت، خوا

هەر دەیزانێت‌و ئاگاداریەتی‌و دەیهێنێتە بەرچاو، بێگومان خواش زاناو ئاگادارە. ئەی کوڕی خۆم، بەردەوام نوێژەکانت بکەو لەسەریان جێگیر بەو، فەرمانیش بە چاکەو، ڕێ لە خراپە بگرەو، بەئارام‌و خۆڕاگریش بە لە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەدا کە تووشت دەبن. بەڕاستی ئەم کارانەش لەوانەیە کە هەر دەبێت پابەند بیت پێیانەوە. هەروەها کوڕم، ڕووت لە خەڵکی وەرمەگێڕەو خۆت بە گەورە پیشان مەدەو خەڵکی بە سووك‌و کەم دامەنێ‌و، بە نازو دەعیەو خۆبادانەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ، چونکە بەڕاستی خوا هیچ کەسێکی خۆ بەزلزان‌و خۆهەڵکێشی خۆش ناوێت کە سوپاسی نیعمەتەکانی خوا ناکات. پاشان کوڕم، لە ڕۆیشتنندا بەشێوەیەکی (میانڕەویی) بڕۆ، واتە لەنێوان خێرایی‌و هێواشیداو، بە دەنگێکی نەرم‌و هێواش بدوێ‌و بەڕادەی پێویست دەنگت بەرزکەوە، نەك بە دەنگێکی گەورەو ناخۆش، چونکە ناشیرینترین دەنگ دەنگی گوێدرێژەکانە.

## چەند وتەیەکی هەڵبەستراوی ئیسرائیلی لەسەر ئەم چیرۆکە

زۆر لە ڕاڤەکارو تەفسیرنووسە پێشینەکان-بە نەریتی خوان- کەوتوونە نێو قووڵایی دەقە ئیسرائیلییەکان‌و ئەفسانەکانەوەو، چەندین وتەو قسەوباسیشیان لەسەر چیرۆکەکەی (لوقمان) لەو دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییانەوە هێناوەو، چەند وتەو ڕووداوو سیفەت‌و کردارێکیشیان داوەتە پاڵ (لوقمان).

ئێمەش -تەنها لە دەرووی ئاگادارکردنەوە- پوختەی ئەو وتەو قسەو باسانە دەخەینە ڕوو، نەك لە دەرووی دان پێدانان‌و پشت پێ‌بەستنیانەوە.. لەم ڕووەشەوە ئیمامی (سیوطی) لە کتێبی (الدر المنثور)دا وای هێناوەتەوە، کەوا (لوقمان) بەندەیەك (عەبدێك)ی دارتاشی حەبەشی بووەو، کورتەبالاو لووت خوار بووەو، دوو لێوی ئەستوورو دوو پێی پانی هەبووە، خواش حیکمەت‌و دانایی پێ‌بەخشیوە، بەڵام ڕێی پێغەمبەرێتیی لێ‌گرتووە، ناوبراو لە گەورەپیاوانی سوودان‌و حەبەشە

بووە، گەورەپیاوانیش سێ‌کەس بوون کە (لوقمان)و (نەجاشی)و (بیلالی کوڕی ابی رباح) بوون.

گوتراویشە کە خوا (لوقمان)ی لەنێوان (حیکمەت)و (پێغەمبەرێتی)دا سەربەست کردوە کە ئاخۆ کامیان هەڵدەبژێرێت، (لوقمان)یش حیکمەتی لەجیاتی (پێغەمبەرێتی) هەڵبژاردووە، ئنجا لەکاتی خەوتنیدا (جیبریل) هاتۆتە لای‌و حیکمەتی بەسەردا ڕشتووەو، ئەویش وای لێ هاتووە کە پێی بدوێت. لێشیان پرسیوە: چۆن حیکمەتت لەجیاتی پێغەمبەرێتی هەڵبژارد لەکاتێکدا خوای پەروەردگارت سەرپشکی کردبوویت؟

(لوقمان)یش لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا گوتوویە: ئەگەر خوا تەنها بە فەرمان‌و عەزمی خۆی کاری پێغەمبەرێتی پێ بسپاردمایە، ئەوا هیوای سەرکەوتنم تێدا دەخواست‌و، بەتەماش دەبووم کە لە ئەستۆی بگرم. بەڵام خوا سەرپشکی کردم، منیش لەو سەرپشککردنەمدا ترسی ئەوەم هەبوو کە لەکاری پێغەمبەرێتییەکەدا لاوازو بێ‌توانا بم، هەربۆیەش حیکمەتەکەم لەلا خۆشەویست تر بوو.

گوتراویشە کە ئەو لە کوڕانی (ئازەر) بووەو، گوایە ماوەی هەزار ساڵ ژیاوەو، لەپێش (داود)دا -سلاوی لێ بێت- فەتوای بۆ خەڵك داوەو، بەڵام کاتێك (داود) وەك پێغەمبەرێك ڕەوانەکراوە، (لوقمان) وازی لە فەتوادان هێناوەو، گوتوویەتی: بۆچی وازنەهێنم کە مادام لەجیاتی خۆم کارەکە ڕادەپەڕێنرێت؟!

هەروەها گوتراوە (لوقمان) دادوەر(قاضي)یەکی (بەنی ئیسرائیل) بووەو لەپێش (داود)دا بە (خەلیفە) بانگکراوەو لەم بارەیەوە پێی گوتراوە: ئەی لوقمان، ئایا ئەگەر بتکاتە خەلیفە، تۆ دادوەریی لەنێوان خەڵکیدا بەڕاستی پێ‌دەکەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی: ئەگەر خوا فەرمانی ئەو کارەم پێ‌بکات، ئەوا دەیکەم، چونکە دەزانم ئەگەر خوا ئەو فەرمانەم پێ‌بکات، کۆمەکیشم دەکات‌و فێرم دەکات‌و دەمپارێزێت، خۆ ئەگەر خوا سەربەستشیم بکات، ئەوا ساغی‌و سەلامەتی هەڵدەبژێرم، نەك بەڵاو دەردەسەری.

مەلائیکەکانیش لێیان پرسیوە: ئەی لوقمان، بۆ وادەکەیت؟

ئەویش گوتوویەتی: چونکە مرۆڤی حاکمو دەسەڵاتدار لە ناخۆشترین جێگەو ناهەموارترینیدا لەوە دەترسێت، کە ستەم لە هەموو لایەکەوە بیگرێتەوەو، ئیدی سەرکزو زەلیل بێت، یان لەوانەیە کۆمەك بکرێتو لە حوکمدا بمێنێتەوە، جا ئەگەر لەکاری خۆیدا ڕاستی بپێکێت، ئەوا شایانی ئەوەیە، کە ڕزگارو سەرفراز بێت، خۆ ئەگەر بە هەڵەشدا بچێت، ئەوا ڕێگای بەهەشتی لێ هەڵەبووە، ئەگەر لە دنیاشدا زەلیلو سەرکز بێت، باشترە لەوەی، کە پایەدارو گوم بێت. هەرکەسێکیش دنیای لەجیاتی ڕۆژی دوایی بوێت، ئەوا دنیاشی لەدەست چووەو، بە مولکی ڕۆژی دواییش ناگات..

لەوکاتەدا فریشتەکانیش سەرسام بوون لە جوانی مەنتیقو بێژەکانی، ئیتر (لوقمان) جارێك خەوتەوەو سەراپای بە حیکمەت داپۆشرابوو، بۆیە ئاگادار بووەوەو قسەی پێکرد. پاشان دوای خۆی (داود) بە خەلیفە بانگ کراو دانرا. ئەویش پەسندی کرد، بەڵام هەمان مەرجی (لوقمان)ی دانەنا، هەر بۆیەش کەوتە هەڵەوە (خواش لێی خۆش بوو).

(لوقمان)یش بە زانستو حیکمەتی خۆی پشتگیریی دەکرد، (داود) سڵاوی لێ بێت، پێی گوت: ئەی لوقمان، هەر شادمان بیت، بەڕاستی حیکمەتت پێدراو بەڵاو تاقیکردنەوەت لێ دوورخرایەوە، بەڵام داود خەلافەتو دەسەڵاتی پێدراو بە گوناهو بەڵا تاقی کرایەوە.

هەمدیسان گوتراوە گوایە (لوقمان) عەبدێك بووە لەلای ئاغاکەیو لە هەموو عەبدەکانی تر هێمنو لەسەرخۆ بووە بۆی. یەکەم کرداری بینراو لە حیکمەتەکانیشی، ئەوەبووە ڕۆژێکیان، کە لەگەڵ ئاغاکەیدا دەبێت، ئاغاکەی دەچێتە سەر پێشاو (مرافق) بۆ بەجێهێنانی پێویستییەکەی، بەڵام زۆری تیا دادەنیشێت. (لوقمان)یش بە زمانی حیکمەت بانگی کردوەو پێی گوتووە: بێگومان درێژبوونەوەی ماوەی دانیشتن لە پێشاودا، جگەر ماندوو دەکاتو،

حاڵەتی کۆمیش تێك دەدات‌و گەرمایی یەکی زۆر بەسەری مرۆڤ دەگەیەنێت، لەبەرئەوە کەم دانیشەو وەرە دەرەوە.. ئاغاکەشی هاتە دەرەوەو ئەم حیکمەتەی لەسەر دەرگای ئەو هۆڵە نووسی کە بۆ بەجێ‌هێنانی پێویستی پێشاو تەرخان کرابوو.

ڕۆژێکی تریشیان ئاغاکەی سەرخۆش‌و مەست ببوو لەو حاڵەتەیدا مەرجی لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکدا کردبوو کە هەموو ئاوی دەریاچەکە بخواتەوە، هەر بۆیەش (لوقمان)ی بانگ کردو پێی گوت: من بۆ ئەم مەبەستە پێویستم بەتۆ هەیە)، لوقمانیش پێی گوت: (ئەو کۆمەڵە کەسەم بۆ کۆبکەرەوە). جا کاتێك کۆی کردنەوە، (لوقمان) پێی گوتن: (ئێوە لەسەر چ شتێك مەرج‌و گرەوتان لەگەڵێدا کردووە. گوتیان: لەسەر ئەوەی کە بتوانێت هەموو ئاوی ئەم دەریاچەیە بخواتەوە.. لەو ساتەدا (لوقمان)یش پێی گوتن: دەباشە، بەڵام ئاخر لەم دەریاچەیەدا چەندین مادەو شتی وردی تر بە ئاوەکەوە نووساون‌و، دەبێت ئەو ماددانەی لێ‌بکەنەوە تاکو ئەویش ئاوەکە بخواتەوە.. ئەوانیش گوتیان: ئاخر ئێمە چۆن دەتوانین ئەو ماددانەی لێ جیابکەینەوە؟ (لوقمان)یش لە بەرامبەر ئەو پرسیارەدا لێی پرسین: ئەی چۆن ئەویش دەتوانێت ئاوەکە بەو هەموو ماددەو شتە وردانەوە بخواتەوە؟

گوتراویشە: ئەوەی بە لوقمان دراوە لە حیکمەت‌و دانایی، لەجیاتی کەس‌و کارو ماڵ‌و سامان‌و کوڕو کاڵ‌و بنەماڵەو چەند سیفەتێك نەبووە، بەڵکو ئەو پیاوێکی ڕژدو بێ‌دەنگ بووەو، بیرکردنەوەو تێفکرینی دووروودرێژی هەبووەو، زۆر وردبین بووەو، هەرگیز لە ڕۆژدا نەخەوتووەو، هیچ کەسێکیش نەیدیوە تف بکاتە سەر زەوی‌و، یان قرخەقرخ‌و بەڵغەمی هەبێت، نەشیان دیوە کە میز، یان پیسایی بکات، یان خۆی بشوات، یان یاری‌و گەمە بکات یان پێ‌بکەنێت، هەروەها هەر وتەیەکی دانایی‌و ژیربێژیی بدرکاندایە، جارێکی دی لە دەمی دەرنەدەچووو دووبارەی نەدەکردەوە، مەگەر وتەیەك نەبێت کە لەگەڵ تازەیەکدا بیدرکاندایە. (لوقمان) ژنیشی هێنابووو چەند منداڵێکی هەبوو کە هەموویان مردن‌و ئەویش بۆ

یەکێکیان نەگریا، هەروەها (لوقمان) وای لە حاکمو دەسەڵاتداران دەکرد کە ئەوانە سەردانی بکەن، بەڵام خۆی بۆ لای داناو حەکیمان دەچوو تاکو تێڕامانو تێفکرینو پەندوەرگرتنی هەبێت.

گوتراویشە جارێکیان پیاوێك بەلای (لوقمان)دا تێپەڕیو لەو کاتەدا چەند کەسێکیش لەلای بوون، پیاوەکە لێی پرسی: ئەرێ تۆ عەبدەکەی فلاّن خانەوادە نیت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ ئەوم.. هەروەها لێی پرسی: ئەی ئایا تۆ نەبوویت کە لەلای فلاّن شاخ ئاژەڵت دەلەوەڕاند؟ (لوقمان) هەر گوتی: بەڵێ ئەوم.. ئنجا پیاوەکە لێی پرسی: ئەی چی گەیاندیتیە ئەم پلەوپایەی کە ئێستا دەتبینم تیایدا؟ (لوقمان) گوتی: لەخواترسانو، ڕاستگۆییو، گەیاندنی سپاردەو، بێدەنگیی زۆر لە ئاست هەر مەسەلەیەکدا کە پەیوەندیی بە منەوە نیە[1]..

بێگومان هەڵوێستی ئێمەش لە ئاست ئەم وتەو دەقە ئیسرائیلییە، ڕاوەستانە تێیداو، پشت پێنەبەستنیەتی، هەر بۆیەش نایلێینەوەو، ناشیخەینە پاڵ (لوقمان)و، دانیشی پێ دانانێین کە لەم مەسەلانەی لێ گێڕرابێتەوە. چونکە هیچ فەرموودەیەکی ڕاستەقینە (صحیح)ی لەبارەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر نەهاتووە. هەروەها بەوپەڕی دڵنیاییشەوە پێ لەسەر ڕەتکردنەوەیان داناگرینو ناشڵێین، کە لەم مەسەلانەی بەسەردا نەهاتووە یان لەو وتانەی نەگوتووە، ئەمەش لەبەر ئەگەری ئەوەی لەوانەیە بەڕاستی ئەم شتانەی لێ بەسەر هاتبێت. بەڵام لەڕاستیدا هەڵوێستی ساغو دروست ئەوەیە، کە لە ئاستی ڕادەوەستینو، نە حاشای لێ بکەینو، نە دانیشی پێدا بنێین، یان نە پەسەندی بکەینو، نە ڕەتیشی بکەینەوە، بەتایبەتی لە حاڵەتێك دایە، کە هیچ سوودێکی زانستی لەخۆ ناگرێتو، هیچ بەروبوومێکی بەکەڵكو، هیچ کردارێکی پەسندیشی لەسەر هەڵناچنرێتو، زانینی ئایەتەکانیشی پێوە بەند ناکرێت.

---

١) بڕوانە (الدر المنثور)ی سیوطی/٦: ٥٠٩-٥١٢، کە ئەم دەقە دەستهەڵبەتو نادروستە ئیسرائیلییەی تێدایە.

لەبەرئەوە ئێمە داوای بێدەنگ بوون دەکەین لە ئاست ئەو لایەنانەی چیرۆکەکاندا، کە قورئانو فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەریش ﷺ لە ئاستیاندا بێدەنگ بوونو، جگە لەوەی هەیە شتێکی تریان لەوەزیاتر نەخستوونە ڕوو. هەروەها ئێمە خوێنەرانی موسڵمان ئاگادارو وریا دەکەینەوە لە پەسندکردنی هەر شتێکی زیادەو، هەر وتەیەکی زیادە، کە لەسەر چیرۆکەکانی پێشینان دروست کراونو، ڕێگای گێڕانەوەو باسکردنیشیان نادەین تەنها لە دەرووی لێ وریاکردنەوەی خەڵکییەوە نەبێت.

## هەندێك لەو پەندو حیکمەتانەی دراونەتە پاڵ لوقمان

جگە لەمەی پێشووش، هەندێك لە زاناکانی سەردەمانی پێشوو چەند وتەیەکی نەستەقو، چەند حیکمەتێکی بەرزو، چەند دەستەواژەیەکی کاریگەریان بۆ وتەکانی (لوقمان) بردۆتەوە. لێرەشداو لەم بڕگەیەدا گرنگترینی ئەو وتەو حیکمەتو بەندانە دیاریی دەکەین، بەڵام نەك لەبەرئەوەی چەند وتەیەکی (لوقمان) بن، چونکە ئێمە ڕامان وانیە، کە ئەو گوتوونیو، حاشای ئەوەشیان لێ ناکەین، کە وتەی ئەو نەبووبن، بەڵکو لە ئاست ئەوەدا ڕادەوەستین، کە درابنە پاڵ لوقمان. لە هەمان کاتیشدا بەو ڕەنگە دیارییان دەکەین، کە چەند وتەیەکی نایابو، چەند حیکمەتێکی کاریگەرنو، بەچاونووقان لە بگۆو لە خاوەنەکەیان، بۆ ناوەڕۆکیان دەڕوانینو، چەمكو واتاو مەبەستە بڕیاردراوەکانیان وەردەگرین (حیکمەتیش ئەو کەرەسە ونبوەی مرۆڤی باوەڕدارە، کە لە هەر کاتو شوێنێکدا بیدۆزێتەوە، هەر خۆی شایستەترین کەسە پێی)، لە دێرزەمانیشەوە گوتراوە: (بۆ بێژەرو بگۆی وتەکە مەڕوانە، بەڵکو بۆ گەورەییو کاریگەریی وتەکە بڕوانە)..

ئەمەش هەندێك لەو وتە نەستەقو پەندە شیرینو پڕ حیکمەتانەیە، کە بۆ وتەکانی (لوقمان) بڕاونەتەوە:

١- بێگومان ئەگەر شتێك بەخوا بسپێردرێت، دەپیارێزێت.

٢- کوڕی خۆم.. تکایەکی وەها لەخوا بکە کە لە سزاکەی پارێزراو بیت. ترسێکی وەهاشت لەخوا هەبێت کە لە ڕەحمەتەکەی نائومێد نەبیت.

کوڕەکەشی لێی پرسیوە: چۆن ئەوەم بۆ دەکرێت کە من هەر یەك دڵیشم هەبێت؟

لوقمان لە وەڵامیدا گوتوویە: مرۆڤی باوەڕدار دوو دڵی هەیە، دڵێکیان تکای لەخوا پێ‌دەکات‌و، دڵێکیشیان لێی دەترسێت پێی.

٣- کوڕی خۆم بەڕادەیەکی زۆر بڵێ: (خوایە لێم خۆش ببە)، چونکە خوا ساتێکی تایبەتیی هەیە کە تیایدا دەست بەڕووی هیچ داواکارێك دا نانێت.

٤- گوتراوە: جارێکیان (لوقمان) چووە بۆ لای (داود) -سڵاویان لێ بێت-، لەو کاتەشدا (داود) سەرقاڵی کونکردنی هەردوو لای قەڵغانێك بووە. (لوقمان)یش نەیزانیوە کە (داود) چ کارێك دەکات -واتە لە ئیشەکەی تێنەگەیشتووە-، هەر بۆیەش سەری لێ سوڕماوەو، ویستوویەتی پرسیاری لەبارەیەوە لێ‌بکات، بەڵام حیکمەتەکەی خۆی ڕێی ئەو پرسیارکردنەی لێ‌گرتووە.. جا کاتێك (داود) کارەکەی تەواوکردوە، قەڵغانەکەی لەبەر کردوەو گوتووشیەتی: (بەڵێ، قەڵغانی جەنگ ئەمەیە). (لوقمان)یش گوتوویە: (بێ‌دەنگی لە حیکمەت باشترە، کەسانی بێ‌دەنگیش کەمن. من ویستم پرسیارت دەربارەی ئەو کارە لێ بکەم، بەڵام بێ‌دەنگ بووم تا خۆت لەجیاتی منیش هاتیتە قسەو کارەکەت پێ ناساندم).

٥- گوتراوە: ئەو ئاغایەی کە (لوقمان) کاری لەلا کردووە، ڕۆژێك بە لوقمانی گوتووە: بەرخێکم بۆ سەربڕەو کە لێت نا، دوو پارچەی زۆر خۆشم لە گۆشتەکەی بۆ بێنە). لوقمانیش زمان‌و دڵەکەی بۆ هێناوە.. ڕۆژێکی تریش ئاغاکەی پێی گوتەوە: (بەرخێکم بۆ سەربڕەو دوو پارچەی هەرە ناخۆشیی لێ

فـرێ بـدە). ئـەویش زمـانو دڵەکـەی لـێ فـرێ دەدات. ئاغاکەشـی لـەو هەڵسوکەوتەی سەرسام دەبێتو کاتێك هۆی ئەوەی لێ دەپرسێت، (لوقمـان) پێی دەڵێت: (لەڕاستیدا دڵو زمان ئەگەر خۆش بن، هیچ شتێك لێیـان خۆشـتر نیە، خۆ ئەگەر ناخۆشیش بوون هیچ شتێك لێیان ناخۆشتر نیە.)

٦- هەروەها (لوقمان) بە کوڕەکەی گوتووە: کوڕم من بەردو ئاسنو باری قورسیشم هەڵگرتووە، بەڵام شتێکم هەڵنەگرتووە کە قورسو ناڕەحـەت تـر بووبێـت لـە دراوسێی خراپ.. کوڕم من هەموو تاڵییەکم چەشتووە، بەڵام شـتێکی تاڵتـرم لە هەژاری نەچەشتووە.

٧- هەروەها لە ئامۆژگارییەکانیدا بـۆ کوڕەکـەی، پێـی گوتـووە: (کـوڕم، کـارو کردەوە تـەنها بـە یـەقینو بـاوەڕی پتـەو توانـات بەسـەریدا دەشـێکت، هـەر کەسێکیش یەقینو باوەڕی لاواز بێت، ئەوا کارو کردەوەشی لاواز دەبێت).

٨- دیسان پێی گوتووە: (خواپەرستیو لەخواترسان وەك بازرگانیەك دابنێو ئەوسا دەبینیت قازانجت بەبێ کەرەسەو دەسمایە دەسگیر دەبێت).

٩- هەروەها پێی گوتووە: (کوڕم، هەرکەسێك درۆ بکات، ئاوی ڕوخساری -واتـە حەیاو حورمـەتی- دەڕوات، هەرکەسـێکیش ئاکـاری ناشـیرین ببێـت، خـەمو پەژارەی زۆر دەبێت. گواستنەوەی گاشەبەردیش لەجێگەی خۆیەوە بـۆ لایـەکی تر ئاسانترە لە تێگەیاندنی ئەو کەسەی کە تێناگات).

١٠- دیسان پێی گوتووە: (لەو کەڵەشێرە بێدەسەڵات تر مەبـە، کـە دەمەوبـەیان دەخوێنێتو تۆش لەنێو پێخەفەکەتدا نوستوویت).

١١- هەروەها پێی گوتووە: (کوڕم، خراپترین کەس ئەوەیە کـە بـاکی نیـە لـەوەی خەڵکی بە خراپکاری ببینن).

١٢- هەمدیسان پێی گوتووە: (کوڕم، با تەنها کەسانی خواپەرستو لەخواترس لـە خۆراکت بخۆن، لە کاروباری خۆیشتدا پرسو ڕا بە زانایان بکە).

١٣- هەروەها گوتوویەتی: (هەرکەسێك خۆی بکاتە ئامۆژگاری خۆی، خواش پارێزگاری دەبێت، هەر کەسێکیش لەلایەن خۆیەوە لەگەڵ خەڵکیدا دادپەروەر بێت، خواش بەهۆی ئەوەوە ڕێزو کەرامەتی زیاتری پێدەدات. سەرکزیو ملکەچیش لە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانی خوا باشترە لە خۆهەڵنانو سنگ دەرپەڕاندن بە سەرپێچیکردنی فەرمانیەوە).

١٤- هەروەها (لوقمان) لە ئامۆژگارییەکانی دا بە کوڕەکەی گوتووە: (کوڕم، بێگومان هەر حیکمەتو داناییە کە هەژارانی لە کۆڕی پادشایاندا دانیشاندووە).

١٥- هەمدیسان پێی گوتووە: (کوڕم، لەگەڵ عەبدە ساڵحەکانی خوادا دابنیشە، چونکە بە دانیشتن لەگەڵیاندا خێرو چاکەت دەسگیر دەبێتو، تا لە کۆتایی ئەو لەگەڵ دانیشتنەشیاندا کاتێك ڕەحمەتیان بۆ دێتە خوارەوە بەر تۆش بکەوێت.. کوڕم لەگەڵ کەسانی خراپو شەڕخوازدا دامەنیشە، چونکە بەوە تۆ هیچ خێرو بێرێکت لێیانەوە دەست ناکەوێتو، پاشان نەبادا لە کۆتایی ئەوەدا کاتێك سزایەك بۆ ئەوان دێتە خوار، بەر تۆش بکەوێت).

١٦- گوتراوە: جارێکیان (لوقمان) گەشتی کردووەو، کاتێك لە گەشتەکەی هاتۆتەوە، کوڕێکی مێردمنداڵ- نەوجەوان- ی پێگەیشتووەو لوقمان لێی پرسیوە: (هەواڵی باوکم چیە)؟ ئەویش گوتوویەتی: (مردووە). (لوقمان)یش گوتوویەتی: (سوپاس بۆ خوا بوومە سەرکاری خۆم)، ئنجا لێی پرسیوە: (ئەی دایکم چی بەسەر هاتووە؟ مێردمنداڵەکەش گوتوویەتی: (مردووە)، (لوقمان)یش گوتوویەتی: (ئەوا خەمو پەژارەشم نەما)، پاشان لێی پرسیوە: (ئەی هاوسەرەکەی خۆم چی بەسەرهاتووە؟)، کوڕەکە گوتوویەتی: (ئەویش مردووە)، لوقمانیش گوتوویەتی: (ئەوا پێخەفەکەشم نوێ دەکەمەوە-بە مانای ژنێکی تر دێنم-). ئینجا لێی پرسیوە: (ئەی خوشکەکەم هەواڵی چۆنە؟) گوتوویەتی: (مردووە)، (لوقمان) لەوبارەیەشەوە هەر گوتوویەتی: (ئەوا ئیدی

ئابڕوشم پارێزراوە). دواجار لە کوڕە نەوجەوانەکەی پرسیوە: (ئەی براکەم چی بەسەر هاتووە؟) ئەویش پێی گوتووە: (براکەشت مردووە)، بەڵام (لوقمان) سەبارەت بەم هەواڵەی دوایی گوتوویەتی: (ئاخ.. پشتم شکا).

١٧- هەروەها لە بەشێکی تری ئامۆژگارییەکانیدا، (لوقمان) بە کوڕەکەی خۆی گوتووە: (کوڕم، لەلای زانایان دانیشەو، لەسەر هەردوو ئەژنۆ لەبەردەمیاندا چۆك دادە، چونکە بێگومان خوا دڵە مردووەکان بە نووری حیکمەت زیندوو دەکاتەوە، وەك چۆن زەوی مردوو بە بارانێکی بەخوڕی ئاسمان زیندوو دەکاتەوە).

١٨- هەمدیسان گوتوویەتی: (سێ کەس لە سێ جێگادا دەناسرێن:

١/ مرۆڤی بەئارام لەکاتی توڕەبووندا، ٢/ مرۆڤی ئازا لەکاتی جەنگدا، ٣/ براکەشت لەکاتی هەبوونی پێویستییەکتدا پێی).

١٩- هەر لە ئامۆژگارییەکانی تریدا بۆ کوڕەکەی، پێی گوتووە: (کوڕم، ئامان خۆت لە قەرزاری بپارێزە، چونکە قەرزاری لەکاتی ڕۆژدا ماتیو سەرشۆڕییەو، لە شەویشدا خەمو خەفەتە).

٢٠- هەروەها پێی گوتووە: (کوڕم، تکاو داواکارییەکی وەها لەخوا بکە، کە جورئەتی سەرپێچی کردنەوە لە فەرمانی خوات بۆ نەڕەخسێنێت، بەشێوەیەکی وەهاش لەخوا بترسە کە لە ڕەحمەتی خوا نائومێدت نەکات)[1].

بەم بیست حیکمەتو وتانە ڕادەوەستینو هەر هێندەش بەسە بۆ دیاریکردنیان لەم بەشەدا، جارێکی تریش دووپاتی دەکەینەوە، کە ئێمە ئەم وتەو پەندانە لە دەرووی خستنە پاڵ (لوقمان)ەوە نەهێناوەتەوە -چونکە ئێمە لە ئاست مەسەلەی دانانیاندا بە وتەی (لوقمان) هەڵوێستە دەکەین-، بەڵکو تەنها لە دەرووی نایابیی وتەکانو واتاو مانا وردەکانیدا دیاریمان کردوون.

١) بۆ ئەم پەندو حیکەتانەش، بڕوانە الدر المنثور /٦: ٥١٢-٥٢٠ .

# چەند لایەنێکی شارراوە لە چیرۆکی لوقمان دا

لە چیرۆکی (لوقمان)دا چەند مەسەلەیەکی شارراوەو نەزانراو هەن‌و، ناکرێت پێ لەسەر ڕوونکردنەوەیان داگیرێت، هەروەك هیچ سودێکیش لە تێداڕۆچوونیان نیە، لەبەر ئەمە لەسەر باری نەزانراوی یەکانیان دەیهێڵینەوە. هەندێك لەو لایەنە شاراوانەش، ئەمانەن:

١- بنەچەو ڕەچەڵەکی (لوقمان)و هۆزو تیرەکەی، نازانین ئاخۆ ئەو (حەبەشی) بووە، یان (عەرەب) بووە، یاخود لە (بەنی ئیسرائیل) بووە. ناشزانین ناوی باوکی‌و باپیرەی چی بووە" هەروەك نازانین جەستەو ڕەوتی ئاکارو سیفەت‌و ڕەنگ‌و ڕووی چۆن بووە.

٢- ئەو سەردەمەی کە لوقمان تێیدا بووەو، ئەو دەسەڵاتدارەش کە لەژێر حوکمیدا ژیاوەو، ئەو شارەش کە تێیدا نیشتەجێ بووەو، ئەو کارەی ڕۆژانەیەش کە هەیبووە.

٣- ناوی ئەو کوڕەی کە ئەو -وەك باوکی- ئامۆژگاریی دەکردو، نادیاریی هەواڵی ئەوەی کە ئایا بەدەم ئامۆژگارییەکانیەوە چووە، یان سەرپێچیی کردووە؟!

٤- ئەی ئاخۆ کۆتایی ژیانی‌و مردنی چۆن بوویێت؟!

٥- ئایا (لوقمان) پێغەمبەر بووە، یان نا؟ چونکە سەلماندنی پێغەمبەرێتیی یەکێك لە کەسانی پێشین ئاتاجی بە بەڵگە دەبێت، بەڵگەش یان ئایەتێکە یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئێمەش لێرەداو لەباسی (لوقمان)دا هیچ بەڵگەیەکمان لەسەر پێغەمبەرێتیەکەی نیە، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانین دانی پیادا بنێین کە پێغەمبەر نەبووەو جەختیشی لەسەر ناکەین کە گوایە پێغەمبەرێك نەبووە، ئەمەش لەبەر ئەگەری ئەوەی نەوەك پێغەمبەرێك بێت. هەر بۆیەش هەڵوێستی ساغ‌و دروست ئەوەیە کە لە ئاست ئەم بابەتەو لایەنە

شارراوەو نەزانراوەکانیدا بێ‌دەنگ بین.. هیچ هۆکارێکیش بۆ ڕۆچوون لەو مەسەلە نادیارو وردەکارییانەدا نیەو تەنانەت هیچ زانیاریو سوودو کەڵکیشی لەسەر هەڵناچنرێت، ئەگەر خواش لە ڕوونکردنەوەی ئەو مەسەلە نادیارو شاراوانەدا سوودو خێرێکی بۆ بەندەکانی تیا بەدیی بکردایە، ئەوا ڕوونی دەکردنەوە.

ئێمەش هیچ شتێکی دی لەبارەی چیرۆکی (لوقمان)ەوە نازانین، تەنها ئەوەندە نەبێت، کە ئایەتەکانی ئەم چیرۆکە باسی کردوون. ئەرکی سەر شانیشمان تەنها ئەوەیە، کە لە ئایەتەکان وردبینەوەو شیکاریان بکەین‌و، ئەو چەند وانەو ڕێنماییی‌و واتاو پەندانەی لێ وەرگرین، کە لە ژیان‌و ڕەوتی کردارمان‌و خواپەرستیماندا سوودمان پێ دەگەیەنن، ئەمە باشترە لە جیاتی ئەوەی هەواڵ‌و کات‌و عەقڵمان لە کارێکدا بەفیڕۆ بدەین، کە هیچ سوودو بەرژەوەندییەکی تیادا نەبێت.

## واتای چەند وشەیەکی پڕ مانای نێو ئایەتەکان

١/ ٱلْحِكْمَةَ : زانستو زانیارییەك کە کردەوەی پڕاوپڕی لێ ڕەنگ بداتەوە.

٢/ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ : لاوازیی لەدوای لاوازیی، واتە قۆناغ لەدوای قۆناغ لە کاتەکانی بە سك هەڵگرتنو ژانی منداڵ بون دا ئەو بێهێزیو لاوازییانە).

٣/ وَفِصَـٰلُهُۥ: شیرپێدانی منداڵ.

٤/ أَنَابَ إِلَيَّ : گەرایەوەو هاتەوە بۆ لای خۆم.

٥/ مِثْقَالَ حَبَّةٍ : کێشی دەنکێك.

٦/ مِّنْ خَرْدَلٍ : لە خەرتەلە، کە ڕووەکێکی ناسراوەو دەنکەکەی لە بچووکترین جۆری دەنگە ڕووکی یەکانی ترە.

٧/ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ : ڕووت لارمەکەرەوە بەنیازی خۆ بە زل دانانو بەخۆوە نازینو شانازیی.

٨/ مَرَحًا : بە گاڵتەوگەپو بێباکیو خۆهەڵکێشانو شێواندنەوە.

٩/ مُخْتَالٍ فَخُورٍ : لووتبەرزی خۆبادەر.

١٠/ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ : بەبێفیزییو، بەوپەڕی سادەو ساکاریشەوە، بەڕێگادا مەڕۆ.. بە مانای میانڕەو بەو نە بە شێوازێکی خۆ بەزل دانانو نە بە شێوازێکی لاوازیو خۆبچووك کردنەوەشەوە، هەنگاو مەنێ.. ئەمەش هەمووی مانای (اقصد) دەگەیەنێت کە لە (قصد)ەوە هاتووە.

١١/ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ : لە دەنگت کەم بکەرەوەو هێواشو نزمی بکەرەوە.

# لوقمان وەك گێڕەرەوەی عەقیدە

بێگومان قورئانی پیرۆز (لوقمان)ی وا دیاریی کردوە، کە وەك گێڕەرەوە (راوی)یەك بێتو، چەندین بنەمای باوەڕداریو، تایبەتمەندییەکانی عەقیدەو، مەسەلەی خوا بەیەك دانانو ڕۆژی دواییو، ڕێنماییەکانی ئاکارو کردارە جوانەکانمان بۆ بگێڕێتەوە.. ئەم واتاو چەمکانەشی لە بواری ئەو ئامۆژگارییانەوە خستۆتە ڕوو کە ئاڕاستەی کوڕەکەی کردوونو، وەك ئەوەش وایە کە تەنها دەرسی کوڕەکەی دانادات، بەڵکو لە ڕۆژی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتانەوە تا هاتنی ڕۆژی دوایی دەرسی موسڵمانانی پێدەدات، ئەمەش لە بواری ئامۆژگاری کردنو، دەرس دادانی کوڕەکەیەوە.. کاتێکیش دەبینین جەخت دەکاتە سەر مەسەلەی باوەڕداریەتیو، خوا بەیەك گرتن، دەگاتە سەر (دەلالەت کردنە سەر یەکێتیی عەقیدەو بیروباوەڕ لەلای گشت پێغەمبەرانو پیاوچاکانو بانگەوازکارانی ڕێی خوا. هەروەها قورئانی پیرۆز کاتێك (لوقمان)ی هەڵبژاردووەو دیاریی کردووە، وای دەبینێت کە گرنگیی چیرۆکەکەیو، گرنگیی گێڕانەوەکەشی گێڕاوەتەوە، ئەمەش لەوەدا کە ئامرازێکە لە ئامرازەکانی خستنەڕووی عەقیدەو مەسەلە تیۆری یەکان. دایارە ئەمەش ئاسەوارێکی گەورەی هەیە لە جێگیربوونی بابەتو ماددەی چیرۆکەکە لە دەروون دا.

# لوقمانی داناو، دانایی

(لوقمان) به دانایی (حیکمەت) ناودار بووەو، نازناوی دانا(حکیم)یشی پێوه لکاوه، وادیاره هەر لەبەر ئەمەشه، که گەلێك حیکمەتو دانایی ی خراوەته پاڵ، یاخود لەسەر زاری دانراوه تاکو لەلای خەڵکی زیاترین هۆی پەسەندکردنی هەبێت.

قورئانیش باسی ئەوەی کردووه، که بێگومان خوا حیکمەتی به (لوقمان) داوه، وەکو فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾.. جا داخۆ مانای حیکمەت له قورئاندا چی بێت؟

لەم ڕووەوه مامۆستای پێشەوا (راغبی ئەسفەهانی) له کتێبی (مفردات)دا گوتوویەتی:

"(حَكَمَ)- ڕیشو بنچینەی له (منع منعاً لأصلاح)ەوەیه، واته (بەشێوەیەك ڕێی لێ گرت بۆ چاکردنی).. که دەشڵێین: (حكمتُ الدابة) واته (بەحیکمەت ڕێم له گیاندارەکه گرت). شاعیرێکیش گوتوویەتی: (أَبني حنيفة أَحكِمُوا سُفهاءكم) واته: ئایا -نەوەو خێڵی- حەنیفه ڕێیان له گەمژەو گێلەکانیان گرتووەو فشاریان خستوونەته سەر؟!)

حیکمەت (الحكمة)ش واته: پێکانی حەق به زانستو عەقڵ.

حیکمەت له خواشەوه/ واته: زانینی شتەکانو، بەدیی هێنانیان لەسەر ئەوپەڕی تۆکمەکاریو بەهێزکردن.

حیکمەت له مرۆڤیشەوه: واته ناسینی ئەو شتانەی له وجودانو، واته کردنی کاری چاکەو خێرخوازیی.

ئەمەشه، که (لوقمان)ی پێ وەسف کراوه له فەرمایشتەکەی خوادا: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾. بەکۆی ماناو دەلالەتیشی بەم ڕستەیه وەسفی پێکراوه. جا

ئەگەر دەربارەی خوا بگوترێت کە ئەو دانایە (حیکم)، مانای وایە کـە پێـچەوانەی وەسفی کەسێکی دیە، واتە دانایی خوا جودایە لە دانایی مرۆڤـ[1]".

کەواتە حیکمەت لەسەر بنچینەی -زانیـاریی‌و ڕاسـت پێکـان‌و قەدەغـەکردن‌و کردار- وەستاوە، شیکاری ئـەم چـوار بنـچینەیەش (زانیـاری‌و، ڕاسـت پێکـان‌و، قەدەغەکردن‌و، کردار) بەم ڕەنگەیە:

١- زانیاریی/ لەڕێی بەگەڕخستنی عەقڵ‌و، بەدەست هێنانی زانست‌و، پێکهێنانی تێڕوانین‌و، مەشق پێکردنی فیکرو بیـریاریی‌یەوە دێتە کایە.

٢- ڕاست پێکان‌و ڕاستخوازیش لە بەروبوومەکانی حیکمەتە، چونکە خاوەنەکـەی بەرەو وتەی ڕاست‌و، بێژەی ڕاست پێکی‌و، کرداری ڕاست پێکان‌و، بیرکردنەوەی ڕاست‌و فێربوونی دروست دەبات.

٣- هەروەها دانایی‌و حیکمەت بەروبوومێکی تری گرنگی هەیە کە قەدەغەکاری‌و ڕێ‌گرتنە، واتە ڕێگای خراپەو شەڕخوازیی لە خاوەنەکەی دەگرێت، سا ئـیتر لـە بواری گوتار، یان کردار، یان هەڵس‌وکەوت، یان ڕەفتـاردا بێـت، یـان لـەبواری نەخشەکێشان‌و بیـرکردنەوەدا بێت، چونکە مەحکەم‌و پتەوی دەکات‌و، حـوکم‌و بڕیاردانی چاك دەکات‌و، بەرەو چاکەو خێرخوازیی جڵەوی دەگرێت‌و، لـە شـەڕو خراپەشی لادەدات.

٤- جا ئەگەر حیکمەت گرنگییـەکی نالـەبار (سـلبی)ی هـەبێت، کـە ڕێ‌گرتنـی خاوەنەکەیەتی لە خراپەو شەڕخوازیی، ئەوا بریتی (بدیل)ێکی لـەباری کردەیـی بۆ دیاریی دەکات، کە هانی دەدات بۆ کاری چاك‌و، چاکەکردن لەگەڵ خـەڵکی، چ لە زمان‌و دەست‌و هەڵس‌وکەوت‌و بوارەکانی تری ژیان.

هـەموو ئـەم واتایانـەش، فەرمایـشتەکەی خـوا ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾ ئاماژەی بۆ دەکات.

---

١) المفردات فی غریب القران، للراغب الاصفهانی، تحقیق محمد سید کیلانی، ص ١٢٦-١٢٧ باختصار.

# دانــایی لە قورئانــدا

دانایی (الحکمة) لە قورئاندا بیست جار هاتووە. جا کاتێك سەرنج لەو ئایەتانـە دەدەین کە وشەی (حیکمەت)یان تیادا هاتووە، ئەوا لە ئاست چەند مەسـەلەیەکی نەستەق دا هەڵوێستە دەکەین، وەك:

١/ بێگومان دانایی (حیکمەت) تەنها لـە خواوەیـەو هـەر خـواش بـە خاوەنـانی حیکمەتی دەگەیەنێتو پێیـان دەبەخـشێتو پێیـان دەدات، لـەم ڕووەوە چـەند ئایەتێك دیاری دەکەین:

- ﴿...وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ... ﴿٢٣١﴾ البقرة﴾.
- ﴿...وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ... ﴿٢٥١﴾ البقرة﴾.
- ﴿...وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٦٨﴾ يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗاۗ... ﴿٢٦٩﴾ البقرة﴾.
- ﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ آل عمران﴾.
- ﴿..فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾ النساء﴾.
- ﴿..وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُ..ۚ ﴿١١٣﴾ النساء﴾.
- ﴿...وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا لُقۡمَٰنَ ٱلۡحِكۡمَةَ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِلَّهِۚ... ﴿١٢﴾ لقمان﴾

جا لەبەر ئەوەی (حیکمەت) تەنها لە خواوە نەبێت نابێـتو، لەبـەر ئـەوەی

خواش زاناو دانایە (علیمو حکیم)ە، ئەوا خـوای پـاكو بێگـەرد خۆیـشی ئـەم حیكمەتە بە هەموو كەسێك نادات، تـەنها بەوانـەی كـە شـایانی حیكمـەتو زانایینو، بەچاكی كاری پێدەكەنو سەوداو ئالۆیریو هەڵسوكەوتی پێدەكەنو، سوودیشی لـێ وەردەگرن، هەروەها خوا ئەم حیكمەتە تەنها بە كەسانی چـاكو گوێڕایەڵی فەرمانەكانی خۆی دەبەخشێت.

٢/ بۆ ئەوەی وەڵامێكیش بێت بۆ ئەوانەی كە ئیدیعای ئەوە دەكەن گوایە كەسـانی داناو بە حیكمەت (فەیلەسـوفەكانن)و گوایـە حیكمـەت فەلـسەفەیەو، گوایـە مرۆڤیش بە داناو حەكیم دادەنرێت تەنانەت گەر باوەڕداریش نەبێت.

بێگومان قورئانی پیرۆز هیچ كەسێكی لـەبێباوەڕان، یـان سـتەمكاران بـە (دانا) وەسف نەكردوە، چونكە ئەوە وەسفێكی ڕێزلێنانو سـتایش كردنـە، ئـەم وەسـفەش تـەنها بـۆ بـاوەڕداران دەشـێت. هـەروەها قورئـانی پـیرۆز تـەنها پێغەمبەران، یان باوەڕدارە چاكەكانی بە حیكمەتو دانایی وەسف كردووە.

بۆیە پێویستە فەیلەسووفەكان لەم نازناوە (واتە لە نازناوی داناو حـەكیمان) داماڵینو بەو سیفەتە خۆشەویستەی (حیكمەت) وەسفیان نەكەین، چونكە ئەمە تەنها لەخواوە وەك خەڵاتو بەخششێك بە كەسانی باوەڕدار دراوەو بۆ كەسـانی غەیری باوەڕدارانی چاكەخواز، ناشێت.

٣/ حیكمەتو دانایی، وەسفێكە بۆ ئەو پەیامو فەرمایشتانەی كە لەلایـەن خـواوە هاتوونەتە خوارەوە، چونكە فەرمایشتی خـوا هـەمووی حیكمەتـەو، هـەروەها چونكە هەمو كتێبەكانی خواش دەفـری حیكمـەتو مەڵبەنـدی وجوودیـەتی.. ئەمەش هەندێك لەو فەرمایشتانەی خوایە:

- ﴿...وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ.. (١١٠)﴾ المائدة.

- ﴿..وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ (١١٣)﴾ النساء.

- ﴿ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ... (٣٩)﴾ الإسراء.

- ﴿ ...قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِالْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ...﴿٦٣﴾ الزخرف ﴾.
- ﴿ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ص ﴾.
- ﴿ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ...﴿٣٤﴾ الأحزاب ﴾.

٤/ لەبەرئەوەی خوا حیکمەتی بە پێغەمبەران داوەو، لەبەر ئەوەش، کە فەرمایشتی خوا (حیکمەتە)، بۆیەش خوا یەکێك لە ئەرکەکانی پێغەمبەرانو لە فەرمانەکانی ئەوانی وا داناوە، کە شوێنکەوتوانی خۆیان فێری کتێبی خواو حیکمەت بکەن، ئەمەش مانای وایە کە حیکمەت بە فێرکردنو وەرگرتن پەیدا دەبێتو بەدیی دێت، حیکمەتیش تەنها بە فێربوونی فەرمایشتی خواو شەرعو حوکمەکانی پەیدا دەکرێت.

جا لەگەڵ ئەوەدا، کە پێغەمبەران هەموویان-سڵاوی خوایان لێ بێت- شوێنکەوتوانی خۆیان فێری حیکمەتو دانایی کردووە، قورئانی پیرۆزیش بە تایبەتیو خوا لە هەموویان پێغەمبەری خوای ﷺ بە زیکری فێرکردنی باوەڕداران جیاکردۆتەوەو، حیکمەتی داوەتە پاڵیو یەکێك لە ئەرکەکانی وا داياريي کردووە، کە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوایە بەسەر باوەڕداران داو، دەروونیان پاك دەکاتەوەو، کتێبی خواو حیکمەتیان فێر دەکات.

ئەم چەند ئایەتەی خوارەوەش نموونەی ئەم واتایەن:

- ﴿ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ...﴿١٢٩﴾ البقرة ﴾.
- ﴿ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ

وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ...﴿١٥١﴾ البقرة ﴾.

- ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ...﴿١٦٤﴾ آل عمران ﴾.

- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ...﴿٢﴾ الجمعة ﴾.

٥/ دوای ئەوەی پێغەمبەران، شوێنکەوتوانی خۆیان فێری حیکمەت دەکەن، شوێنکەوتوانیشیان ئەرکی خۆیان لە بانگەواز بۆ ڕێی خوا بەجێ دەگەیەننو، ئەو حیکمەتەشیان کردۆتە توێشوویەك بۆ خۆیانو، شێوازێکی سەرکەوتوویان لە شێوازەکانی بانگەوازو، ئامرازێك لە ئامرازەکانیشیان گرتۆتە بەر.

بێگومان خوا فەرمانی بە گشت موسڵمانێك کردووە کە بانگەواز بۆ خوا بکاتو، لەم بوارەش دا دوو ئامراز لە ئامرازەکانی بانگەوازی پیشان داوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ...﴿١٢٥﴾ ﴾، واتە: بانگەواز بکە بۆ ڕێگای خوای پەروەردگارت بە حیکمەتو پەندو ئامۆژگاری جوانو بە چاکترین شێوازیش گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە.

جا ئەگەر مرۆڤی باوەڕدارانە ڕەفتار بکات ئەوا بێگومان سوودی لەو حیکمەتە بەخشیوە، کە خوا پێی بەخشیوەو، کە پێغەمبەریش فێریی کردووە، یان لە پێغەمبەری وەرگرتووە، بەمەش لە کارکردنە سەر خەڵکیدا سەرکەوتووبووە..، چونکە حیکمەت گرنگترینو بەهێزترینو بەسودترین ئامرازە بۆ بەدیهێنانی مەبەست.

## دانـــایی و... ســــوپاس

ئایەتەکەی ئەم چیرۆکە دانایی‌و سوپاس (الحکمە والشکر)ی پێکەوە بەستۆتەوە، وەك خوا تێیدا فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ لقمان﴾.

بێگومان حیکمەت، سوپاسکردنی خوایە، چونکە بە فـەرمانی (ان اشـکر لله) تەفسیر کراوە، لەم ڕستەیەدا (أن اشکر لله) ئـامرازی (أن) بـە (أن- ی تەفـسیری) لەلایەن زانایان تەفسیر کراوە. هەر لەم باسەشـدا پێـشتر مانـای (حیکمـەت)مـان زانی، ئێستاش هەوڵ دەدەین مانای سوپاس (شکر) بزانین.

ئیمام (راغب ی ئەسفەهانی) گوتوویەتی:

"سوپاسگوزاریی‌و شوکرانەبژێریی، تێڕوانینە لە نیعمەت‌و دەرخستن‌و باسکردنی ئەو نیعمەتەیـە. بـۆ نمونـە گـوتراوە (هـو مقلـوب عـن الکـشر) واتـە ئـەوە لـە دەرخستنەوە پیشاندراوەتەوە، وشەی دژی سـوپاس(شـکر)یـش، واتـە پێـچەوانەی (کفرو داپۆشین)ە، چونکە بەو نەریتە نیعمەتەکە لەبیر دەکرێت‌و دادەپۆشـرێت. بـۆ نموونە هەر لە زمانی عەرەبیدا گوتراوە (دابە شکور) بە مانای گیاندارێکی قەڵـەوە کە بە دەرخستنی قەڵەوی یەکەی شایەتیی سوپاسگوزاریی بـۆ خاوەنەکـەی دەدات کە چۆن خزمەتیی کردووە.. گوتراویشە: ڕیشەو بنچینەی (شکر) لە وشەی (عـین شکری)یەوەیە کە مانای کانی یەکی لێواولێوو پڕ دەگەیەنێت.

سوپاسکردن (شکر علی هذا) بە مانای پڕبـوونی -ئـەو کەسـەی کـە سـوپاس دەکات- لە سوپاسکردن‌و یادکردنی خاوەن نیعمەتەکە.

هەروەها سوپاسگوزاریی‌و شوکرانەبژێریی، سێ جۆری هەیە:

- سوپاسی دڵ/ کە تێڕوانین‌و ڕەچاوکردنی نیعمەتەکەیە.

- سوپاسی زمان/ ستایش کردنی خاوەن نیعمەتەکەیە.
- سوپاسی سەرجەم ئەندامەکانی تری جەستە/ خەڵاتکردنی نیعمەتەکەیە بەپێی ڕادەی شایستەیی خۆی.
جا ئەگەر خوا بە (سوپاس)ەوە وەسف بکرێت، ئەوە مانای وایە کە (نیعمەتی ڕژاندووە بەسەر بەندەکانیداو، پاداشتی ئەو بەندایەتیو خۆپەرستی یانەشیانی داوەتەوە کە ئەنجامیان داوە[1]".

جا ئەگەر حیکمەت تەنها لەلایەن خواوە بێت، ئەوا سوپاسیش تەنها بۆ خوا دەکرێت، لەبەر ئەمەش شوکرانەبژێرییەکەی بۆ خۆی گەڕاندۆتەوە کە دەبێت بەندە سوپاسی خوا بکاتو، بۆ ئەم مەبەستەش ئەو فەرمانەی تری، واتە فەرمانی (ان اشكر لله)ی داوەتە پاڵ. تەفسیرکردنی حیکمەتیش (بە سوپاسگوزاریی)، واتە (بێگومان سوپاسگوزارییو شوکرانەبژێریی بەروبوومێکی سروشتیو ئاسایی حیکمەتەکەن، چونکە بێگومان هەموو کەسێکی داناو بە حیکمەت سوپاسگوزاری خوای گەورەیە. جا ئەگەر دیمان هەرکەسێك خۆی بە داناو حەکیم دادەنێتو بەڵام باوەڕی بە خواش نەهێناوەو سوپاسگوزاریشی نیە-وەك زۆربەی خەڵکی وای بۆ دەچن-، ئەوە بێگومان ئەو کەسە داناو حەکیم نیەو، هیچ حیکمەتیشی پێ نیە، چونکە حیکمەت بەبێ سوپاسکردنی خوا هیچ بارێکی ڕاستیو هیچ سوودێکیشی نیە. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە فەیلەسوفو بیریارە بێباوەڕەکان لە حیکمەت دابڕاونو، تەنها بیریارانی موسڵمانو باوەڕدار حیکمەتیان هەیە، چونکە هەر ئەوانن کە سوپاسی خوای لەسەر دەکەن.

دیارە ئەوەش لە هزرماندایە کە -سوپاسی ئاماژە بۆکراو لێرەدا- ئەو سوپاسە گشتییەی جەستەیە بە هەرسێ جۆرەکانییەوە، کە (سوپاسی دڵ)و (سوپاسی زمان)و (سوپاسی ئەندامەکانی تری جەستە)و هەر بەم سێ جۆرەی سوپاسەوە

١) المفردات : ١٦٥-١٦٦ بە کورتی.

جەستەی مرۆڤ ڕووی سوپاسگوزاریو شوکرانەبژێریی دەکاتە خواو دەیانکاتە چەند ئامرازێکی ستایشو مەدحی خواو خۆشەویست کردنی سوپاس لەلای خەڵکی.

پێشەوای (قومی) کە خەڵکی (قوم)ەو بە ئیمامی (نەیسابوری قومی) ناسراوە، سەبارەت بە فەرمایشتەکەی خوا (أَنِ ٱشۡكُرۡ لِلَّهِۚ) گوتوویە: "زانایان لەم بارەیەوە گوتوویانە کە ئەمە فەرمانێکی پێکهێنەرو دروستکارە، واتە (وامان لێ کرد سوپاسگوزار بێت/ جعلناه شاكرا) بەڵام لە فەرمانی ڕاسپاردن (تكليف)دا (نەدان)و (دانا) یەکسانن‌و، هۆشداریی‌و ئاگادارکردنەوەی تێدایە لەسەر ئەوەی کە سوپاسی ڕاستەقینەی خوا -واتە گەر بە ڕاستو بە حەق سوپاسی خوا بکرێت- ئەوە بێگومان لوتکەی هەموو عیبادەتو بەندایەتی یەكو ترۆپکی حیکمەتو داناییشە. سوودی ئەم کارەش بۆ خودی عەبدەکەیە نەك بۆ خوای معبودو پەرستراو، چونکە بێگومان خوای بەرزو بێهاوتا، بێباکە لە سوپاسی سوپاسگوزارانو، بەڵام شایستەی حەمدو ستایشە[1]".

لە ڕستەی (أَنِ ٱشۡكُرۡ لِلَّهِۚ)دا کە ڕستەیەکی زیادکراوە بۆ ڕستەی پێشوو، ئەم زیادکردنە بۆ تایبەتکاری (تخصيص)ە، چونکە بەڕاستی (سوپاسکردن) تەنها دەبێت بۆ خوا بێتو هەر تەنها سوپاسی خوا بکرێت لەسەر ئەو نیعمەتی حیکمەتو داناییە. دوای ئەمەش کە فەرموویەتی(وَمَن يَشۡكُرۡ/ هەرکەسێك سوپاسی خوا بکات) ئەوا (فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ/ بێگومان سوپاسی خۆی دەکاتو سوودی خۆی تێدا دەبێت)، ئەم ڕستەیەی دواتریش (فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ) بۆ دیاریکردنی مەبەستەکەو خستنەپاڵی ئەو سوودەیە، بەمانای (ئەو کەسەی کە سوود لەو سوپاسگوزارییو شوکرانەبژێرییە وەردەگرێت، تەنها ئەوەیە کە سوپاسەکە دەکاتو هەردەم خوای لەیادە).

---

١) غرائب القرآن/ ٢١: ٤٩

# ئامۆژگـاری باوك بۆ كوڕەكـەی

(لوقمان) نموونەی كردەیی بۆ باوكان لـەبواری مامەڵـەیان لەگـەڵ كوڕەكانیـانو لەبارەی ئامۆژگاری كردنیشیانەوە داناوە، ئەمەش لـە كاتێكـدا كـە ئامۆژگـاریی كوڕەكەی خۆی كردووە: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ...﴿١٣﴾ لقمان﴾، واتە: كاتێك لوقمان ڕووی گوتاری كردۆتە كوڕەكەیو ئامۆژگاریی كردووە..

وشەی (وعظ) لێرەدا (دەرس دانەكە بە ترساندن تێكەڵ كرابێت)، دیارە ئێمەش هیچ شتێك لەبارەی كوڕەكەیەوە نازانین، نازانین ناوی چـی بـووە، نـازانین تەمـەنی چەند بووە لەكاتی ئامۆژگـاریكردنو دەرسـدانەكەیدا. نـازانین چ عەقیدەیەكیـشی هەبووە.. ئایا خوای ناسیوەو باوەڕی پێ‌هێناوە، یان شیركو هـاوەڵی داوەتـە پـاڵ؟ هەروەك ناشزانین ئایا كوڕەكە بەدەم پەندو دەرسدادانەكەی باوكییەوە چووەو كـاری پێ‌كردووە یان نا؟

بێگومـان (لوقمـان) ئـەركی بـاوكی بەرامبـەر كوڕەكـە ڕاپەڕانـدووە. ئـایینی ئیسلامیش ئەو ئەركەی خستۆتە سەر باوكان كە دەبێت ئامۆژگـاریی كوڕەكانیـان بكەنو ڕێنماییو دەرسو پەندیان بخەنـە بەرچـاو، وەك خـوا لـە جێگایـەكی تـری قورئانـدا فەرموویـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ...﴿٦﴾ التحريم﴾، واتە: ئەی ئـەو كەسـانەی باوەڕتـان بـەخوا هێنـاوە، خۆتانو كەسوكارو منداڵو خێزانتان بپارێزن لە ئاگرێك، كـە سـووتەمەنی یەكـەی خەڵكو بەردە.

لەوانەشە كوڕ بەدەم ئامۆژگاریو ڕێنماییەكانی باوكییەوە بچێت، ئەگەر ئاكاری خێرو چاكەو وەفا لە كوڕەكەدا بەرامبەر بـاوكی هـەبێت، جـا ئەگـەر بـەدەم ئـەو ئامۆژگارییانەی باوكییەوە بچێت، ئەوا بێگومـان كوڕەكـە هـەر خـۆی سـوودمەند دەبێتو خێروبێری چنگ دەكەوێتو، چاوی باوكیشی ڕۆشن دەبێت. بەڵام لەوانەشە

بەدەم ئامۆژگاریەکانیەوە نەچێتو کاریان پێ‌نەکات، لەم کاتەشدا کوڕەکە خراپە دەرهەقی خۆی دەکات، هەرچەندە باوکیشی بەوە دڵتەنگ دەکات. کوڕی چاكو بەئاکار مایەی چاوڕۆشنیی باوکیەتیو، باوکە چاكو ساڵحەکانیش هەمیشە داوا لەخوا دەکەن کە کوڕانی چاكو بە ئەمەکیان پێ ببەخشێت، وەك خوا لەسەر زاری ئەوان فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ...﴿٧٤﴾ الفرقان﴾، واتە/ خوایە هاوسەرانو کوڕانو نەوەکانمان ساڵح بکەیتو ببنە مایەی دڵخۆشیو چاوڕۆشنیمان.

بەڵام کوڕی لاسارو سەرپێچی کار مایەی سزاو نارەحەتی یە بۆ باوکیو ژیانی لێ ئاڵۆز دەکات. کەچی وێڕای ئەوەش لە باوك خوازراوە کە ئامۆژگاریی کوڕەکەی بکاتو پەندو دەرسی دابکاتو ئاڕاستەی کات بۆ کرداری چاكو، لەم ئاقارەش دا باوك نابێت بێزار بێت، بەڵکو دەبێت لەگەڵی بەردەوام بێت هەر کاتێك دەرفەتی هەبوو، هەروەك ناشبێت کە باوك بڕوبیانووی ئەوەی هەبێت گوایە کوڕەکەی گوێی لێ ناگرێتو بە قسەی ناکاتو پەیڕەویی ئامۆژگارییەکانی ناکات، چونکە خوا ئەوەی لە باوك نەخواستووە کە دەبێت کوڕەکە بەدەم ئامۆژگارییەکانیەوە بچێت، تەنانەت پاداشتی ئەوەش بەو بەدەمەوەچوونەی کوڕەکەیەوە گرێ نەداوە، بەڵکو خوا تەنها بەو پەندو وتەو ئامۆژگارییانە پاداشتی باوکەکە دەداتەوە. دەنا ئەگەر باوك ئامۆژگاریی کوڕەکەی نەکات، ئەوا لە ڕۆژی قیامەت دا خۆی دەخاتە بەر لێپرسینەوەو سزای خوا.

# ئامۆژگارییەکانی لوقمان بۆ کوڕەکەی

وەك تێبینی دەکرێت کە ئامۆژگارییەکانی (لوقمان) بۆ کوڕەکەی خۆی چەند پەندو ئامۆژگارییەکی گشتی بوونو، پەلیان بۆ چەند مەسەلەیەکی باوەڕداریو بەندایەتیو ئاکارو بانگەواز هاویشتووە، وەك:

١/ فەرمانی بە کوڕەکەی کردووە بە (خوا بەیەك ناسین)و (باوەڕهێنان بە خوا)و ڕێگای شیركو هاوەڵ بۆ خوا دانانو بێباوەڕیشی لێگرتووەو، مەترسیو زیانی ئەو شیركو هاوەڵ بۆ خوادانانەشی بۆ ڕوون کردۆتەوەو پێی گوتووە: ﴿... يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾لقمان.

٢/ بەوەش ڕایسپاردووە کە لەگەڵ باوكو دایكیدا چاكو نەرمو نیان بێت، بەتایبەتیش کە دایكی بەجیا بۆ باس کردوەو داواشی لێکردوە، کە لەگەڵیاندا چاكو بەئەمەك بێتو، چاكەو خزمەتیان بکاتو گوێڕایەڵی فەرمانیان بێتو بە ئاکاری جوانو لەخۆبوردووییەوە لەگەڵیاندا بژی. لەبواری ئەو ئامۆژگارییانەشەوە ئەو بنەما گشتگیرە ئیسلامییەی دەربارەی چاکە لەگەڵ باوكو دایکدا بۆ دیاریی کردووین کە ئەگەر تەنانەت (باوكو دایك) دوو کەسی کافرو بێباوەڕیش بن دەبێت چاکەیان لەگەڵدا بکرێتو لە دنیاشدا بەچاکی لەگەڵیاندا بژیین، بەڵام نابێت لەکاتی -بانگەوازییاندا بۆ کفرو بێباوەڕیی- بەدەمیانەوە بچین: ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ١٤ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٥﴾لقمان، واتە: هەروەها ئێمە فەرمانمان بە مرۆڤ کردووەو پابەندمان کردوە بەوەوە کە ئاکاری چاك لەگەڵ

دایــك‌و باوكیــدا بنوێنێــت. بەتایبــەتیش كــە دایكــی بــە لاوازیو ئــازارو نارەحەتییــەكی زۆرەوە لــەكاتی هــەڵگرتنی بــە پێــستی ســك‌و لــەكاتی منداڵبوونیــشدا زەحمــەتی پێــوە كێــشاوە، هــەروەك كــە دوو ســاڵیش شــیری پێدەداتو دوای ئەوەش لەشیر دەیبڕێتەوە، بۆ ئەمە فەرمامان بە مرۆڤ كـردووە كە ئەی مرۆڤ دەبێت تۆ سوپاسی منو دایــك‌و باوكـت بكـەیتو هــەر بــۆ لای خــواش دەگەڕێیتــەوە. ئــەی مــرۆڤ ئەگــەر دایــك‌و باوكـت بەوپــەڕی هــەوڵ‌و كۆششیانەوە وایان لێ كردیت كە هاوەڵ بۆ من دابنێیت بێئەوەی هیچ بەڵگــەو زانیاری یەك لــەو ڕووەوە هــەبێت، ئــەوا گوێڕایــەڵییان لــەوەدا مەكــەو بــەدەم فەرمانەكەیانــەوە مەچــۆ، بــەڵام هەمیــشە لــە دنیــادا بەچــاكیو گوێڕایــەڵیو خزمەتگوزارییەوە لەگەڵیاندا بژیو لە هەمان كاتیشدا ڕێگەی ڕاستی ئەو كەسە بگرەبەر، كە بە دڵسۆزیو خواپەرستییەوە بۆ لای من گەڕاوەتەوە، لە دواییــشدا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منەو هەواڵی هەموو ئەو كارو كردەوانەشتان پێدەدەم، كە لە دنیا ئەنجامتان داوە.

هەروەها تێبینی ئەوەش دەكرێت، كــە ئــەم وەســیەتو ڕاســپاردەیە بــۆ كــوڕ بەرامبەر باوك‌و دایكی، ڕاسپاردەیەكی ڕەوشتمەندییو كۆمەڵایەتییە، هەر لــەم ڕووەشەوە، چەندین كەس لە زانایانی تەفسیر وای بۆ دەچن، كە ئــەم ڕاســپاردەو ڕێنماییانە سەبارەت بە باوك‌و دایك لــە -خــودی (لوقمــان)ەوە بــۆ كوڕەكــەی- نەهاتوون، بەڵكو ئەمە بڕیارو ڕێنمایی خوایەو لەخواوە هاتوونو، لەچوارچێوەی ڕاسپاردەكانی لوقمان بۆ كوڕەكەی دا دانــراون، چــونكە بــۆ لوقمــان گونجــاوترو شایستەترن-وەك كەسێكی دی-، پاشان هەر ئەو زانایانەی تەفسیر ڕایان وایــە، كە ئەم ئایەتانە دەربارەی بارودۆخی (سعد كوڕی ابــو وقــاص) لەگــەڵ دایكیــدا هاتوون، كە ئەوەبوو كاتێك دایكی (سەعد) داوای لە (سەعد)ی كوڕی كرد، كە لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوەو لەسەر ئەوە سووریش بووو، تەنانــەت هەڕەشــەی لــە (سەعد) كردو ئازارایشی دابوو، بەڵام (سەعد) لەسەر ئیسلام جێگیرو دامەزراو بوو بەسەر هەڕەشەكانی دایكیدا زاڵ بوو.

٣/ (لوقمان) خوا به کوڕەکەی خۆی دەناسێنێتو ڕێنمایی دەکات بۆ زانینی هەندێك سیفەتی خوا، هەروەها عەقیدەی زیندووکردنەوەو لێپرسینەوەی ڕۆژی دواییشی بۆ بڕیار دەداتو، وێنەیەکی گرنگو سەرسوڕهێنەری لەسەر زانستی هەمەلایەنەو گشتگیری خوا پیشان دەدات، که خوا زانیاریو زانستی لەسەر هەموو شتێك هەیەو ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکیشەو، هیچ شتێکی بچووکی لێ ون نابێت، تەنانەت گەر بچوکترینو وردترین شت بێت، وەك پێی گوتووە: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ١٦ لقمان﴾، واتە: ئەی کوڕی خۆم، ئەگەر گوناهێك هێندەی تۆوی دەنکە خەرتەلەیەك -کە بچووکترین شتی بەچاوبینراوە- هەبێتو لەنێو بۆشایی بەردێکدا حەشاردرابێت، یان له ئاسمانەکاندا، یاخود له شوێنێکی دیاری زەویدا بێت، خوا هەر دەیزانێتو ئاگاداریەتیو دەیهێنێته بەرچاو، بێگومان خواش زاناو ئاگادارە.

(سید قطب) دەڵێت: "ئایا سەنگی دەنکە خەرتەلەیەك چیه؟ بەڕاستی بەقەد گەردیلەیەکی ئەو تەپو تۆزەیه که له خاكو خۆڵ بەرزدەبێتەوەو که هیچ سەنگێکی ئەوتۆی نیه. ئیدی ئەم دەنکە خەرتەله بچووكو ون بووەی نێو گاشەبەردێکی ڕەقو تەق که تێیدا بلاوبۆتەوە، یان پێوەی نووساوە، پێوەی دیار نیەو، تەنانەت له ئاسمانه پانو فراوانەکانیشدا که ئەستێره گەورەن تێیدا وەك چەند خاڵێکی سووراوەن، هەر دیار نیه، یاخود وەك ناوکێکی بزربوونی نێو زەوییه که لەنێو خۆڵو چەوەکەیدا ون بووە. ئا ئەم دەنکە خەرتەلەیەش-یان ئەم ناوکە خەرتەلەیەش- خوا دەیهێنێته پێش چاوو ئاگاداریەتیو زانستی لەسەریەتیو، لەدەست تواناشی دەرناچێت[1]".

١) في ظلال القرآن/٥: ٢٧٨٩

ئەو کەسەش ڕاستی گوتووە، کە خوا گوێبیستو بینەری خشەی پێی مێرووڵەی ڕەشە لەنێو بەردێکی ڕەقداو لە شەوێکی تاریکدا.

ئەو شاعیرەش ڕاستی پێکاوە، کە لەکاتی پاڕانەوەی خوادا گوتوویەتی:

(يا من يرى مدّ البعوض جناحها
في ظلمة الليل البهيم الأليل
ويرى نياط عروقها في نحرها
والمخ في تلك العظام النحل)

واتە: ئەی ئەو خوایەی، کە مێشوولە دەبینێت لەکاتی کردنەوەی باڵیداو لە تاریکایی شەوێکی دەیجووری ئەنگوستەچاودا.. ئەی ئەو کەسەی، کە ڕەگەکانی شادەماری خوێنینی نێو سینەی مێشوولەکە دەبینێت، کە مێشکیشی لەنێو ئێسکە هەرە تەنكو لاوازەکانیدا دەبینێت.

٤/ (لوقمان) دوای ڕێنماییەکانی لە بواری عەقیدەو باوەڕداری دا، کوڕەکەی بە خواپەرستیو عیبادەت ڕادەسپێرێت: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ کوڕم بەردەوام نوێژ بکە. ئەمەش بەو پێودانگەی کە خواپەرستی لەدوای عەقیدەوەیە، واتە دوای ئەوەی خوای ناسیو باوەڕی پێ هێنا، ڕوودەکاتە خوا بەو ڕێو ڕەسمی بەندایەتیو خواپەرستییانەی، کە لەنێو نوێژەکەدا ڕەنگ دەدەنەوە. ڕێنمایی (لوقمان)یش بۆ کوڕەکەی لەسەر نوێژ، بەڵگەیە لەسەر گرنگیو بایەخی نوێژو، لەمەڕ فەرزبوونیشی لەسەر گەلانی پێشوو، چونکە نوێژ پەیوەندییە لەنێوان عەبدو خوای پەروەردگاریدا.

٥/ فەرمانی بە کوڕەکەی کردووە کە لەڕێی -فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە- وە بانگەواز بۆ ڕێبازی خوا بکات. -ئەم ڕاسپاردەی تری لوقمان بۆ کوڕەکەی- بەڵگەیە لەسەر فەرزبوونو پێویستبوونی -بانگەوازو فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە- لەسەر گەلانی پێشین وەك چۆن لەسەر ئێمەش فەرزو پێویست بووە.

لەمەشدا هیچ نامۆییەك نیە، چونکە هیچ ئاینێك بڵاونابێتەوە تەنها لەڕێی بانگەوازەوە نەبێت. خەڵکیش پێوەی پابەند نابن تەنها لەڕێی ئامۆژگاریی‌و ڕێنماییەوە نەبێت. مرۆڤی چاك‌و ساڵحیش قایل نابێت بەوەی، کە تەنیا خۆی چاك‌و ساڵح بێت، بەڵکو سوور دەبێت لەسەر گەیاندنی چاکەو خێرو سوود بە کەسانی دی.

قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بۆ پێویستبوونی بانگەواز لەسەر کەسان‌و گەلانی تر کردوە، وەك لەم فەرمایشتەی خوادا هاتووە، کە فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ هود﴾، واتە: ئەرێ -ئەی محمد-، ئەوە بۆچی لەنێو ئەو گەل‌و نەتەوانەی پێشوودا، کە لەنێومان بردن کۆمەڵێکی تیا نەبوو، کە پاشماوەیەك لە عەقڵ‌و شوێنەوارێك لە ڕێی ڕاست‌و ڕێنماییان مابێت تاکو ڕێگای خراپەو تێکدان لە خراپەکارانی سەر زەوی بگرن، مەگەر کەسانێکی کەم نەبێت لەوانەی ڕزگارمان کردن‌و بەدەم بانگەوازی خەڵکەوە هاتن، ئێمەش ڕزگاربوونمان بۆ نووسین، بەڵام سەرپێچیکاران‌و یاخییە ستەمکارەکان گوێیان بۆ ڕانەگرتن‌و بەدەم حەقەوە نەچوون، بەڵکو زیاتر لە زوڵم‌و گومڕاییدا ڕۆچوون‌و لەسەرتاوان‌و ستەمکاریی بەردەوام بوون. خوای پەروەردگاریشت، کە کاروباری هەر بە دادپەروەرییە، هەرگیز خەڵکی ئەو شارو دێهاتانەی بە ستەم لەناونەبردووە، لەکاتێکدا دانیشتوانەکانیان چاکەخوازو باوەڕدا بووبن، بەڵکو دوای ئەوەی لەنێوی بردوون، کە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خۆی بۆ ناردوون‌و ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان خەریك بووە، بەڵام ژمارەیەکی کەم نەبێت، زۆربەیان باوەڕیان پێ نەهێناوە.

هه‌ر ده‌رباره‌ی باسی - فه‌رمان به‌چاكه‌و ڕێگرتن له‌ خراپه‌- له‌دوای به‌جێهێنانی نوێژ، سه‌رنجێكی جوان هه‌یه‌و ئه‌وه‌یه‌، كه‌ مرۆڤ كاتێك به‌هۆی نوێژه‌وه‌ په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ خوای په‌روه‌ردگاریدا ده‌به‌ستێت، هێزو وره‌و خۆڕاگریی لێوه‌ چنگ ده‌كه‌وێت. هه‌ر به‌هۆی نوێژیشه‌وه‌یه‌، ئه‌و توێشووه‌ باوه‌ڕدارێتییه‌ی ده‌ست ده‌كه‌وێت، كه‌ ڕاگیری ده‌كات له‌سه‌ر كاری بانگه‌وازو ئامۆژگارییكردنی كه‌سانی دی. هه‌ر به‌نوێژیش مرۆڤ وای لێ دێت، كه‌ كاری خراپه‌و به‌دكرداریی په‌سند نه‌كات‌و پێی ڕازیی نه‌بێت‌و، له‌دژیشی بوه‌ستێت. هه‌ر به‌هۆی نوێژیشه‌وه‌یه‌ مرۆڤ حه‌زی له‌كاری چاكه‌و كرداری جوانه‌و فه‌رمانی كردنیشیان پێ ده‌كات.. جا كاتێك نوێژ له‌سه‌ر شێوازه‌ ڕاست‌و دروسته‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به‌جێ ده‌هێنرێت، ئه‌وه‌ باشترین ئامرازو ڕێ‌و شوێنه‌ بۆ به‌جێگه‌یاندنی ئه‌ركی بانگه‌واز بۆ خوا، چونكه‌ ئه‌گه‌ر نوێژی مرۆڤی موسڵمان به‌روبوومی بانگه‌وازو ئامۆژگاریی له‌لای خاوه‌نه‌كه‌ی نه‌بێت، ئه‌وه‌ بێگومان نوێژێكی ساردو سڕه‌و، ته‌نها چه‌ند جووڵانه‌وه‌یه‌كی ده‌ره‌كی‌و ڕواڵه‌تییه‌.

٦/ (لوقمان) ڕێنموونیی كوڕه‌كه‌ی بۆ ئارامگرتن له‌سه‌ر ڕووداوو كاره‌ساتیش كردووه‌، وه‌ك پێی ده‌ڵێت: (وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ)، باسی (ئارامگرتن)یش له‌دوای فه‌رمان به‌چاكه‌و ڕێگری له‌ خراپه‌، ئاماژه‌یه‌كه‌ بۆ -ڕاستیه‌كی به‌ڵگه‌نه‌ویستی قورئانی-و ئه‌وه‌یه‌ هه‌ركه‌سێك بانگه‌واز بۆ ئایینی خوا بكات‌و، ئامۆژگاریی خه‌ڵكی بكات‌و، فه‌رمانیان به‌چاكه‌و، ڕێگرییان له‌ خراپه‌ بكات، ئه‌وه‌ بێگومان ده‌كه‌وێته‌ به‌ر ئازاردان‌و تاقیكردنه‌وه‌و، هه‌ندێك كه‌س گاڵته‌ی پێده‌كه‌ن‌و سووكایه‌تیی پێده‌كه‌ن‌و، به‌درۆی ده‌خه‌نه‌وه‌و، ده‌یچه‌وسێننه‌وه‌و، ئازاریی ده‌ده‌ن‌و، لێی ده‌ده‌ن‌و، تۆمه‌تباری ده‌كه‌ن‌و، له‌وانه‌یه‌ له‌ هه‌ندێك حاڵه‌تدا بیشیكوژن.

جا ئه‌گه‌ر بۆ ئه‌و ڕووداوانه‌ توێشووی ئارام گرتنی هه‌ڵنه‌گرتبێت، ئه‌وا له‌سه‌ر ڕێگاكه‌ی خۆی جێگیرو دامه‌زراو نابێت‌و، ئه‌ركی خۆیشی بۆ ڕاناپه‌ڕێنرێت‌و،

ئامۆژگاریی خەڵکیشی پێناکرێت، بەڵکو زیاتر حەزی لە سەلامەتیو بێوەیی و پشووداندو گۆشەگیریی دەبێت.. بێگومان ئارام گرتن چەکێکی کاریگەرە لەدژی شتی پووچەڵو ناهەقو، لەدژی شوێنکەوتوانی ناهەق، هەروەك توێشوویەکی باوەڕداریی خواییەو، خوا خۆی پێمان دەبەخشێت، هەروەها ئامرازێکیشە بۆ ئەوەی، کە هەر دەبێت ئەو ئەرکەی، کە خوا فەرمانی ڕاپەڕاندنی پێمان سپاردووە، بەجێی بگەیەنین. جا ئەگەر - لە ڕاسپاردەکەی (لوقمان)دا بۆ کوڕەکەی- بۆ مەسەلەی (فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە) بڕوانین، ئەوا تێبینی دەکەین لە قۆناغێکی ناوەندیی دایەو کەوتۆتە نێوان دوو کارەوە، کاری یەکەمیان (نوێژکردنە) کە پێشی کەوتووە، کاری دووەمیشیان (ئارامگرتنە)، کە لەدوایەوە هاتووە. ئەمەش مەبەستێکی دانراوە، چونکە بێگومان (نوێژ) هۆکاری (فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپەیە)و، ئارامگرتنیش (مەرجە) بۆ بەردەوامیی ڕاپەڕاندنی ئەو فەرمانە.

٧/ (لوقمان) چەند ڕێنماییەکی ڕەوشتمەندیی (اخلاقی)ی خستۆتە بەرچاوی کوڕەکەی، ئەم ڕێنماییە ڕەوشتمەندییانەش گەلێك پێویستن بۆ ڕاپەڕاندنی فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپەو، دیسان بۆ پەسندبوونی وتەو گفتاری لەلای خەڵکیو، تا بتوانێت کاریان لێبکات: ﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (١٨) وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ (١٩) لقمان ﴾.

لێرەدا یەکەیەکە مانای ئەم ڕێنماییە قورئانییانە بەم ڕەنگە لێك دەدەینەوە:

أ- ( وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ): ڕووت لە خەڵکی وەرمەگێڕە.. بە مانای خۆت لە ئاست خەڵکیدا بەگەورە دامەنێ، چونکە تۆ بانگەوازی خەڵکی دەکەیتو، دەتەوێت بەدەم بانگەوازەکەتەوە بێن، ئەوانیش تەنها گوێ لەوانە دەگرن، کە

نزیکن لێیانو، کە لەخۆبوردوون لەگەڵیانداو، کە بانگەوازو ئاینو بیروباوەڕی خۆی بە خۆشەویستیو سۆزو لەخۆبوردنەوە پێیان دەگەیەنێت. بەڵام ئەو کەسەی خۆی لەئاستیاندا بەگەورە دادەنێتو بە گەورەییو بەخۆنازینەوە خۆی بەسەریاندا بادەداتو بە لووتبەرزییەکی بێزراوەوە سەودایان لەگەڵدا دەکاتو ڕووی خۆی لە ئاستیاندا وەردەگێڕێتو، بەچاوی سووکو بێڕێزییەوە بۆیان دەڕوانێت، ئەوا بێگومان ئەوانیش پەسندی ناکەنو تووڕی دەکەنو پشتی تێدەکەن.

ب- (وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا) بەبێ باکیو لەسەر نووکی پێ بەسەر زەویدا مەڕۆ.. ئەم جۆرە جموجووڵەش هاوتاو هاوڕەوتی هەڵسوکەوتی ڕوو وەرگێڕانە لە خەڵکی بەو پێودانگەی، کە هەردوو هەڵسوکەوتەکە لە نەریتی خۆبەزل زانیو بەخۆنازینو خۆبادانەوە سەر هەڵدەدەن. ڕۆیشتنی بێباکانەو بەخۆنازین بەسەر زەویدا ئەو جۆرە ڕۆیشتنەیە، کە خۆی زۆر بە گەورەو نازدارو فووتێکراو دەگرێتو کەم بایەخیشە بە خەڵکی. ئەمەش جمو جووڵێکی بێزراوەو خوا ڕقی لێیەتیو، خەڵکیش ڕقیان لێیەتی. هەروەك دەربڕی هەستێکی ناساغە بە خود(ذات)، کە لە ڕۆیشتنی بەنازو فیزەوە هەناسە وەردەگرێت.

ج- ( وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ ) لە ڕۆیشتندا میانگیر بە.. بە مانای با ڕۆیشتنەکەت مامناوەندیو ئامانجدار (مقصود)و ڕێکوپێك بێت، نە بەو ڕەنگە بێت، کە لە ڕۆیشتنی کەسێکی خۆ بەزل زانو بێباكو فووتێکراو بچێت، نە بەو جۆرەش بێت کە لە ڕۆشتنی کەسێکی لاوازی بێدەسەلاتی ساردو سڕ بچێت، بەڵکو لەنێوان ئەم دوو جۆرە ڕۆیشتنەدا ڕۆیشتنێکی مام ناوەندیو ڕێكو پێك، - باشترین کاریش هەمیشە مام ناوەندییەکەیەتی-.

(سید قطب) دەڵێت: "( وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ ) ئەوەشە، کە دەبێت ڕۆیشتنەکە ئامانجدار بێت، نەك بێهودەو سەرەڕۆیی بێت، یاخود بۆ نیازو مەبەستێکی چاك بێت، چونکە هەموو کاروبارو هەڵسو کەوتێکی مرۆڤی موسڵمان تەرخان

كراوە بۆ ئەو ئامانجو مەبەستەی، كە موسڵمان خۆی گرتویێتییەبەر، لەبەر ئەوە هەرچی هەیەتیو هەرچیش دەیكات تەرخانی دەكات بۆ مەبەستو ئامانجی خۆی، جا ئیتر ڕۆیشتنەكەشی ئامڕازێكە بۆ ئامانجەكەی، بۆیەش ئەم ڕۆیشتنە مەبەستدارو ئامانجبارە.

د- (وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ) دەنگت كزو هێواش، كە.. كزكردنی دەنگ ئەدەبو متمانە بەخودو، دڵنیابوون لەڕاستیی گفتارو لەهێزی گفتارەكەشی تێدایە، هیچ كەسێكیش هەراو هوریاو دەنگی بەرز پیشان نادات، تەنها كەسانی كەم ئەدەب نەبێت، یان كەسێك كە گومانی لە بەهای قسەكانی خۆی هەیە، یان گومانی لە كەسایەتی خۆی هەیەو، دەیەوێت ئەو گومانە بە هەراو هوریاو دەنگی بەرز بشارێتەوە.

شێوازی قورئانییش ئەم كردارە بو پووچو ناشیرین دادەنێتو بەدیمەنێكی بێزاركەرو بێنرخو ناشیرینی لەقەڵەم دەدات، ئەمەش لەو فەرمایشتەی خوادا، كە تیشك دەخاتە سەر دیمەنەكەو وەسفی دەكات بە: (إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ) بێگومان ناشیرینترین دەنگ دەنگی گوێدرێژەكانە.. بەم وەسفەش دیمەنێكی پێكەنین هێن وێنا دەكات كە دەبێتە مایەی گاڵتەپێكردنو سوكایەتی، هەروەك دەبێتە هۆی توڕەبوونی خەڵكیو، دەبێتە دیاردەیەكی نالەبار. هەموو كەسێكی خاوەن هەستو هۆش، كاتێك ئەم دیمەنە پێكەنینانییە لەپێش ئەم وەسفو گوزارشتە نایابەوە لە هزری خۆیدا تەبەننی دەكات، حەز ناكات نەختێك -یان بەشێك لەو دەنگی گوێدرێژانە-ی لێوە دەرچێت[1]".

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٧٩٠ .

# چەند سەرنجێك لەسەر ئایەتەكانی چیرۆكەكە

لێرەدا كاتێك چەند سەرنجێك له ئایەتەكانی تایبەت به چیرۆكی لوقمان دەدەین، گرنگترین شت كه لێیانەوە تۆمار بكەین، ئەم چەند پەندو دەرسو ئامۆژگاریو ئاماژەو ڕێنماییە سرووش بەخشانەیە كه لەم چەند خاڵەدا پوختیان دەكەینەوە:

١- له فەرمایشتی خوادا: (وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ) ئاماژەیەك هەیە بۆ ئەوەی كه حیكمەت تەنها لەلایەن خواوەیەو، خوا بەخواستی خۆی دەیدات به هەندێك له بەندەكانی، هەر كەسێكیش خوا حیكمەتی پێ ببەخشێت، ئەوا خێرو سودێكی زۆری پێبەخشیوە، هەروەها (حیكمەت) دەكرێت مرۆڤ به هەوڵو كۆششو -به خواستو ڕێنمایی خوا- پەیدای كات.

٢- دەشێت حیكمەت بەم جۆرەش پێناسه بكرێت: (وتەیەكی گونجاو)ی (كەسێكی گونجاو)ە له(كاتێكی گونجاو)داو (بەڕادەیەكی گونجاو)و (به شێوازێكی گونجاو).

٣- له فەرمایشتی خوادا: (أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ) تەفسیری حیكمەت به سوپاسكردن كراوە، ئەمەش مانای وایه كه سوپاسكردنی خوا بەرێكه له بەروبوومەكانی حیكمەت، هەروەها سوپاسكردنی خوا له پێداویستیەكانی باوەڕهێنانە، چونكه هیچ كەسێكی داناو حەكیم له دنیادا نیه تەنها باوەڕدار نەبێت، هیچ كەسێكیش دانا نیه تەنها كەسێكی باوەڕداری سوپاسگوزاری خوا نەبێت، هەروەها هیچ كەسێكیش دووبارە داناو حەكیم نیه تەنها ئەو كەسە نەبێت كه هەموو ژیانی بۆ خوا تەرخان كردووە.

٤- له فەرمایشتەكەدا (وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ) به (صیغە)ی فەرمانی ڕانەبردوو (مضارع) گوزارشتی له (سوپاسگوزاریی) كردووە، وەك زانراویشە فەرمانی ڕانەبردوو فەرمانێكی زیندووی بكەر (فاعل)ێكی ساغو

نوێکراوەیە، کە نوێکردنەوەو بەردەوامێتیی خۆش ویستووە. واش دیارە حیکمەت لە دەربڕینی سوپاسگوزارییەکە بە فەرمانی ڕانەبردوو بۆ ڕێنموونیکردنی مرۆڤی باوەڕدارە تاکو هەمیشە سەرلەنوێ سوپاسی خوای پەروەردگار بکاتەوە، واتە -بۆ ئەوەی لە گشت سات و چرکەو سەعاتێکی ڕۆژیدا سوپاسی پەروەردگاری بکات، چونکە نیعمەتەکانی خواش هەمیشە سەرلەنوێ پێی دەنەخشرێت و هیچ ساتێك نە لە شەوداو، نە لە ڕۆژدا لێی نابڕێت. نیعمەتیش سوپاس دەخوازێت، بە سوپاسیش نیعمەتەکان بەردەوام دەبن و زۆریش دەبن، وەك خواش لە سوورەتێکی تردا فەرمووبەتی: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ...﴿٧﴾ إبراهيم﴾. واتە: بەدڵنیاییەوە خوای پەروەردگارتان هەواڵی پێداون- یان سوێندی خواردووە- لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر سوپاسی خواتان بکەن و سوپاسگوزار بن، ئەوا منیش نیعمەتەکانتان بۆ زیاد دەکەم..

٥- ئایەتەکانی ئەم چیرۆکە دوو بواریان لە بوارەکانی (سوپاسگوزاریی) دیاریی کردووە:

بواری یەکەم/ سوپاسکردنی خوا (سوپاس بۆ خوا) وەك لە فەرمایشتەکەی (أَنِ اَشْكُرْ لِلَّهِ).

بواری دووەم/ سوپاسکردنی باوك و دایك، دوای سوپاسکردنی خوا (أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ).

لەم فەرمایشتەی دواییشەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە دەشێت سوپاسی ئەو مرۆڤانەش بکرێت، کە سوودو چاکەیان بۆ کەسانی دی هەیە. هەر بۆیەش بەپێی دەقی ئایەتەکە سوپاسکردنی باوك و دایکیش فەرزە لەسەر ڕۆڵەکان. بەڵام لەڕاستیدا سوپاس هەر تەنها بۆ خوایەو، سوپاسکردنی کەسانی

چاکەکاریش هەر سوپاسی خوا دەگەیەنێت، چونکە بێگومـان هـەر خوایـە کـە ئیلهامی چاکەکردنیانی دەرهەقی مرۆڤەکان پێبەخشیون، هەر بۆیەش مرۆڤ لـە بواری سوپاسکردنی کەسانی چاکەکارەوە -سوپاسی خوا دەکات-.

سوپاسکردنی باوكو دایکیش، هەر سوپاسکردنی خوایـە، چـونکە ئەگەرچـی بەڕواڵەت سوپاسەکە ئاڕاستەی باوكو دایك بکرێت، بەڵام لە بنجو بناواندا هەر سوپاسکردنی ئەو خوایەیە، کە هەردوکیانی کردۆتە هۆیەوە بۆ وجودی مـرۆڤو، سۆزو بەزەیی‌و ڕەحمەتی بەرامبەر ڕۆڵەکانیان پێداون.

٦- لەبەر ئەوەی هێشتا لەسەر باسی سوپاسـگوزاری‌و شـوکرانەبژێریی دەدوێـت، تێبینیی ئەوەش دەکەین، کە وشەکە چوارجار هاتووە: دوو جاریان لـە شـێوازی فـەرمانی داخـوازی (فعـل أمـر)دایـە: (أَنِ اشْـكُرْ لِلَّـهِ) لەگـەڵ (أَنِ اشْـكُرْ لِـي وَلِوَالِدَيْكَ)، ئەمەش لەبۆتەی ڕاسپاردندا بە سوپاس‌و شـوکرانەبژێریی‌و، دیـاری کردنی ئەو لایەن‌و بەرامبەرەی، کە ڕووی سوپاسگوزاریی تێ دەکرێت.

دوو جاری تریش لە شێوازی فەرمانی ڕانەبردوودایە وەك: (وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ)، ئەمەش لە بۆتەی بەجێگەیاندنی ئـەرکی سوپاسـگوزاریداو، دیاریکردنی لایەنی سوودمەند لە سوپاسەکە، چونکە تەنها خاوەنی سوپاسـەکە -واتە مرۆڤی سوپاسگوزار- خێرو سوودی لێ دەبینێت.

٧- ئایەتەکەی تایبەت بە فەرمانی داخوازیی سوپاسگوزاریی بە فەرمایشتی (وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ) کۆتایی پێهێناوەو لـە ناوەکـانی خـواش، هـەردوو ناوی (الغـني، الحميد)ی هەڵبژاردووە، ئەم کۆتایی پێهێنانـەش لەگـەڵ بابـەتی ئایەتەکەدا ڕێك دەکەوێت، چونکە ئایەتەکەی بـەرەو سوپاسـگوزاریی ئاڕاسـتە کردووەو، فەرمانی بە مرۆڤی باوەڕداری داناش کردوە، کە سوپاسی خوا بکات. پاشان تاکو هیچ کەسێکی گوماندار گومانی نەبێت لەوەی، کە گوایە خوا خۆی سوود لە سوپاسکردنی خەڵکی وەردەگرێت، هەر بۆیەش لـە ئایەتەکـەدا نـاوی

(الغني) هاتووە، واتە (دەوڵەمەندو بێپەروا لەوە)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە خوا بێباکە لە سوپاسکردنی خەڵکی، سا ئیتر خەڵکی سوپاسی بکەن یان نەیکەن، چونکە بەوە هیچ شتێك بۆ خوا زیاد نابێت.

هەروەها ناوی (الحمید)یش هاتووەو ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە خوا شایستەی حەمدو سوپاسکردنە، تەنانەت گەر هیچ کەسێکیش سوپاسی نەکات، هەر بۆیەش سوپاسکراوەو (حمید)ە، ئەگەرچی خەڵکیش بێباوەڕو کافر بن‌و بە فەزڵ‌و چاکەی نەزانن. ئەمەش وەك ئەوە وایە، کە ئایەتەکە پێمان بڵێت: (هەرکەسێك سوپاس بکات، ئەوا سوپاسی خۆی دەکات، چونکە خوا لەوە بێباکەو پێویستی پێی نیە).. هەرکەسێکیش بێباوەڕو سپڵە بێت، ئەوا ئەو حاڵەتەی بەدەستی خۆی بەسەر خۆیدا هێناوە، چونکە خوا خۆی (حمید)و سوپاسکراوە.

٨- ئامۆژگاری (لوقمان) بۆ کوڕەکەی (وَهُوَ يَعِظُهُۥ) ڕێنموونییەکی بۆ باوکانیش تێدایە، کە ئەو کاری ئامۆژگاریکردنی ڕۆڵانەیان، ئەرکێکەو فەرزە لەسەریان‌و دەبێت ئامۆژگارییان بکەن، تەنانەت گەر، ڕۆڵەکانیان بەدەم ئامۆژگارییەکانیشیانەوە نەچن.

٩- یەکێکی دی لە ئامۆژگارییەکانی (لوقمان) بۆ کوڕەکەی ڕێگرتنیەتی لە شیرك‌و هاوەڵ بۆ خوا دانان (لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ) لەمەشدا ئاماژەیەك هەیە بۆ پێویست بوونی پەلهاویشتنی ئامۆژگارییەکان بۆ گشت مەسەلەو بابەتەکانی ئیسلام وەك ئیمانداریتی‌و، بانگەوازو، یاساو ڕێساو حوکمە شەرعییەکان‌و کرداری جوان‌و ئاکاری بەرز. جا ئەو پەندو ئامۆژگارییەش، کە لوقمان ئاڕاستەی کوڕەکەی کردووە ئامۆژگارییەکی ئیمانداریتی‌و باوەڕدارانەیە.

١٠- ئایەتەکە (شیرك‌و هاوەڵ بۆ خوا دانان)ی بە ستەمێکی گەورە داناوەو، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو ئایەتەی سوورەی (الانعام): ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ

يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ ﴿٨٢﴾. وا تەفسیر کردوه، کە ستەمەکە شیركو هاوەڵا بۆ خوادانانە. ئەوەبوو لەکاتی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتانەدا هاوەڵان گومانیان وابوو، کە مەبەست لە ستەم (الظلم) سەرپێچیو گوناهـ کردنە، بەو پێودانگەی کە ئەوان دەکەونە بەر گوناهو سەرپێچی، ئەوا هیچ کەسێك سەلامەتو پارێزراو نیە، هەربۆیەش مەسەلەکە لەسەریان گرانو ئاڵۆز بووو گوتیان: جا ئاخۆ کێمان ستەم لەخۆی ناکات؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((**لَيْسَ هُوَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لاِبْنِهِ: يَا بُنَيَّ لا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ**))[1]، واتە: بەوجۆرە نیە، کە ئێوە بۆی دەچن، بەڵکو وەك ئەو حاڵەتەیە کە (لوقمان) بە کوڕەکەی گوتبوو: کوڕم هاوەڵ بۆ خوا دامەنێ، چونکە هاوەڵ بۆ خوا دانان (شیرك) ستەمێکی گەورەیە.

١١- له زۆر شوێنی دیکەشدا قورئانی پیرۆز گوزارشتی لە هاوەڵ بۆ خوادانانو بێباوەڕبوون (شیركو کفر)ی بە ستەمو زۆرداری کردووە، وەك لەم ئایەتەی سوورەتی (البقرة)شدا کافرانی بە ستەمکاران داناوە: ﴿...وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾.

جا لەبەر ئەوەی ڕێڕەوی بوونی (کفرو شیرك) بە ستەمە، بەم پێیە مرۆڤی کافرو هاوەڵ بۆ خوا دانەریش بەوە ستەمکار دەبێت، چونکە (ستەمو زۆرداری) دەسدرێژییو لە سنوردەرچوونەو، پشتگیری کردنی ناهەقی یەو، خۆ دابڕین لە هەقو، شاردنەوەی ڕاستییەو، ئیدی مرۆڤی (مشرك)و هاوەڵ بۆ خوا دانەر ستەمکار دەبێت.. بێگومان مرۆڤی هاوەڵ بۆ خوا دانەر ستەم لە خۆیشی دەکات. ئەمەش لەبەرئەوەی خۆی بە ڕێگای ناهەق (باتڵ)و سزاو ئاگردا دەبات. هەروەها ستەم لە حەقیقەتیش دەکات، لەبەرئەوەی حەقیقەت تێدەپەڕێنێتو لە سنووری دەردەچێتو خۆی لێ پەنا دەدات، هەروەك کە ستەم

---

١) (کتاب الإیمان) ٥٦ باب صدق الإیمان، حدیث ١٩٧.

لە باوەڕدارانیش دەکات، چونکە لەگەڵیاندا نیەو، شان بەشانی ئەوان پشتگیریی لە هەق نەکردووەو دژایەتیی ناهەقی نەکردووە، تەنانەت ستەم لە کافرانیش دەکات، چونکە پێشڕەویانە لە کفرو بێباوەڕیداو یارمەتیدەریانە لەسەر ناهەقیو ڕێبازە پووچەڵەکەیان.

بەڵام -لەلایەکی دیيەوە- هەموو ستەمێك کفر یان شیرك نیە، چونکە لە هەندێ شوێنی تردا قورئان وشەی (ستەمو زۆرداریی) بۆ سەرپێچیو گوناه کردن بەکارهێناوە، بۆ نموونە ڕێدەکەوێت، کە مرۆڤی موسڵمان بەهۆی سەرپێچیو گوناهکردنەوە ستەمکار بێت، بەڵام هەر تەنها بەهۆی یاخی بوونو گوناهکارییەوە کافر نابێت.

١٢- لەم فەرمایشتەشدا (وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ ...) سەرنجێکی جوان هەیەو، ئەوەیە بێگومان خوا کەسانێك ڕادەسپێرێتو وریادەکاتەوە، کە لە خانەی دریغی کردنو خراپەکردن دان، جا داخۆ کێ بن، ئەوانەی دەرهەقی کەسانی دی سستیو دریغی دەنوێنن، ئایا باوکانو دایکانن، یان ڕۆڵەکانن؟! بێگومان ڕۆڵەکانن. هەر لەبەر ئەمەشە خوا ڕایسپاردوون بەوەی، کە لەگەڵ باوكو دایکیاندا چاكو بە ئەمەك بن. بەڵام خوا لە قورئاندا باوانو دایکانی ڕانەسپاردووە بەوەی لەگەڵ ڕۆڵەکانیاندا چاك بن، چونکە خۆیان هەر چاکن لەگەڵیانداو ئاتاجیان بەو ڕاسپاردەیە نیەو، بەڵکو تەنانەت زۆر سوورو ڕژد(حريص)ن لەسەر ڕۆڵەکانیانو ئەم خەسڵەتەش هەر بە سروشتو فیترەت لە ناخی باوکانو دایکاندا هەیە، کە هەمیشە لەپێناوی سوودو بەرژەوەندیی ڕۆڵەکانیان دا هەڵس وکەوت دەکەن. لەبەر ئەمە تەنها ڕۆڵەکان ئاتاجیان بەم ڕاسپاردەو فەرمانەی خوا هەیە، چونکە ڕۆڵەکان زۆرجار تەماشای بەردەمی خۆیان دەکەن، بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندییانو دابینکردنی ئایندەیانو بەدیهێنانی سوودو قازانج بۆ مندالآنی خۆیان، هەر بۆیەش ڕۆڵەکانیان زۆرجار ئاوڕ بۆدواوە نادەنەوە-واتە بۆ باوكو دایکیان-، تەنانەت هەر خەریکە ئاوڕێك

بۆ ئەو دایكو باوکە نەدەنەوە، کە ژیانیان بەسەر دەچێتو لەسەر لێواری بەجێهێشتنی ئەم دنیایەن. جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییەدا ئایەتەکەی ئەم چیرۆکەش (وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ ...) داوا لە مرۆڤ دەکات، کە ئاوڕێك لە پشتەوەی خۆی بداتەوەو، چاکە لەگەڵ ئەو دوو کەسەشدا بکات، کە ژیانی خۆیان بۆ ئەو تەرخان کردبووو، هەموو هەوڵو کۆششێکیان لە پێناوی بەختەوەریی ئەودا خستبووە گەڕ.

١٣- لە فەرمایشتەکەی خوادا (حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ) حەقیقەتێکی بڕندە (قاطع)و بەڵگەنەویست تۆمارکراوە، ئەوەیە دایك هەمیشە بەبێهێزو لاوازو ماندوو دەمێنێتەوە، لێرەدا (وهن) مانای (ضعف/ لاوازیی) دەگەیەنێت، کە بەدرێژایی ماوەی سکپڕیی (حمل) لاوازەو، لە سەرەتای سکپڕییو دووگیانی (حمل)ەوە دەست پێدەکات، ئەمەش لە نەخۆشییەکانی بێزووکاریو دڵتێکچوونو ڕشانەوەی ناوبەناودا ڕەنگ دەداتەوە، ئەم حاڵەتانەش بەردەوام دەبێت، تاکو (حمل)ەکەی دادەنێت -منداڵی دەبێ-، تەنانەت ئەم بێهێزییەی، تاکو ماوەکانی دوای منداڵبوونیش بەردەوام دەبێت. دیارە ئەم حیکمەتەش لە کۆکردنەوەی لاوازییەکەوە لەگەڵ لاوازییەکی تردا سەرچاوەی گرتووە، چونکە لاوازییەکەی هەمیشەییو بەردەوامە بە درێژایی ماوەی سکپڕیی، بەڵام ئایەتەکە ئەم لاوازییەی دایکانی بە وێنەیەك لە وێنەکانەوە وابەستە نەکردووە، بەڵکو گشتگیرو ڕەهای کردووە، تاکو هەموو وێنەکانی لاوازییو حاڵەتەکانو ئاسۆکانی تری بگرێتەوە، بۆ نمونە ئەمە لاوازییەکە لە جەستەدا، لاوازی یەکە لە دەروونداو، لاوازییەکە لە هەستو نەست داو، لاوازییەکە لە هێزداو، لاوازییەکە لە کارو ڕاپەڕاندنی کاروبارداو، لاوازییەکیشە لە ئاکارو کردارداو، لاوازییەکە لە پەیوەندیو مامەڵەداو لاوازیشە لە هەستکردنو هەستەوەرییدا، جگە لە بوارەکانی تر.

جا لەگەڵ ئەو لاوازی یە بەردەوامو چەندان هێندەو دووبارەبوانەدا، هێشتا لەلای ئافرەت ئەم حاڵەتی لاوازییە خۆشویستراوەو، بەردەوام لەلایشی خوازراوو ویستراو دەبێت، چونکە ئەگەر ئافرەت (ژن) کاتێك منداڵی نیەو تووشی سکپڕیی نابێت، هەوڵ دەدات سکی پڕ بێتو هەموو موڵكو سامانێکیشی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی سکپڕیی بەسەردا بێت، جا چاکیو بێگەردیی بۆ ئەو خوایەی، کە چێژو لەزەتی لەسەر لاوازیی پێبەخشیوەو، وای لێکردووە داوای ئەو حاڵەتە بکاتو حەزیشی لێی بێت.

١٤- لە فەرمایشتی خوادا (وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ) ئاماژەیەك هەیە بۆ ماوەی شیردانی سروشتی، کە شێوازێکی زۆر گرنگو پێویستە بۆ منداڵ، کە دوو ساڵە، خۆ ئەگەر لە دوو ساڵ کەمتر بێت ئەوا بڕی پێداویستیی خۆی لە شیری سروشتیی زەروریی وەرناگرێت-واتە لەشیری دایکی-. خۆ ئەگەر لە دوو ساڵ زیاتریش شیری پێبدرێت، ئەوا سوودی لێ نابینێتو هیچ کەڵکێکی نابێت، بگرە دەبێتە بارێکی قورس لەسەریو لەسەر لاشەو ئاکاری منداڵەکەو، وای لێدێت منداڵێکی زۆر بەنازو خاووخلیچكو بە لەنجەولار دەردەچێت.. واش دیارە ڕازو نهێنی لە نەخۆشییەکانی منداڵانی ئەم سەردەمەدا لەوەدا بەند بێت، کە شیردانی سروشتییان نیە -واتە شیری دایکیان پێ نادرێت-، بێگومان شیری دایك زۆر پێویستە بۆ ساغیو سەلامەتیی منداڵ، لە ڕووی تەندروستیو دەروونیو ڕەوشتمەندییەوەو، بۆ نەشونمای جەستەشیو ساغیی ئەندامە هەستدارەکانی. چونکە دایك هاوکات لەگەڵ شیردانیدا بە منداڵەکەی، خۆشەویستیو سۆزو بەزەییو ڕەحمو ئەوینیشی پێدەدات. جا ئایا چەند دایك هەیە، کە بۆ ماوەی دوو ساڵ شیر بدات بە منداڵەکەی؟!

١٥- ئەم ئایەتانەی نێو ئەم چیرۆکە ڕێسایەکی مسۆگەرو دابینکراوو هاوسەنگ کراوی بۆ ڕۆڵەکان لە بواری پەیوەندییاندا بە دایكو باوكو چاکە لەگەڵ کردنیاندا خستۆتە ڕوو، ڕێساکەش ئەو ڕاسپاردەیەی تری خوایە لەم فەرمایشتەیدا:

﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ ﴾.

بێگومان چاکه لەگەڵ دایكو باوك ئەرکێکی پێویست (فەرز)ەو له هەموو حاڵەتێکیشدا لەسەر ڕۆڵەکان فەرزە، سا ئیتر دایكو باوك خراپەیان دەرهەقی ڕۆڵەکه کردبێت یان چاکه، هەروەها سا ئیتر به سۆزو خۆشەویستییەوه لەگەڵ ڕۆڵەکەیاندا جووڵابنەوە، یاخود بەڕەقیو توندییەوە.. ئەم چاکەکردنەی ڕۆڵەش لەگەڵ باوكو دایکداو بەچاکی ڕەفتارکردن لەگەڵیاندا لەسەر ڕۆڵەکان لاناچێت، تەنانەت گەر باوكو دایکەکه گوناهیشیان دەرهەقیان کردبێت، هەمدیسان ئەرکی بەچاکی ڕەفتارکردن لەگەڵیاندا لەو حاڵەتەشدا -که دایكو باوکەکه بێباوەڕ بن، یان هاوەڵی بۆ خوا دابنێن) هەر لەسەر ڕۆڵەکه لاناچێت، واته دەبێت هەر چاکەیان لەگەڵدا بکات، وەك خواش دەفەرموێت: ﴿وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ ﴾.

بەڵام بێگومان گوێڕایەڵیی ڕۆڵەش بۆ باوكو دایك، دەبێت لەسەر بەرچاوڕوونیو هۆشیاریی بێت، بەمانای دەبێت لەو کاروبارانەدا گوێڕایەڵیان بکات، که خوا پێی ڕازییه، نەك له کارێکدا، که جێی تووڕەییو ناڕەزایی خوایه، گوێڕایەڵی بکرێن. بەڵکو کاتێك گوێڕایەڵییان دەکات، که فەرمان به خواپەرستی پێبکەن. دەنا لەکاتێکدا فەرمان به گوناهو سەرپێچی پێ بکەن، نابێت گوێڕیەڵییان بکات. هەروەها له کاتێکدا، که داوای بێباوەڕبوونو هاوەڵ بۆ خوا دانانی لێ بکەن، نابێت گوێڕایەڵییان بکات. چونکه گوێڕایەڵیی هیچ مەخلوقێك له سەرپێچیکردنی خالق ناکرێت ((**لا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ**)).

ئەو ئایەتەش ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ ﴾ جیاوازیی لەنێوان دوو مەسەلەی گرنگی

وەك (ڕەفتاری چاك لەگەڵ باوكو دایك)و (گوێڕایەڵی)دا كردوە، بۆ نموونە چاكەو ڕەفتاری چاك لەگەڵ باوكو دایكدا لە هەموو حاڵەتێكدا لـە ڕۆڵـەكان خـوازراوە، تەنانەت گەر باوكو دایك دوو كەسی بێباوەڕیش بن، بەڵام گوێڕایەڵی (الطاعة) بەستراوە بە گوێڕایەڵیی فەرمانی خواوە، هەر بۆیەش لە كاتێكدا فەرمانـەكانی باوكو دایك دژی فەرمانەكانی خوا بوون، ئەوا گوێڕایـەڵیی ئـەو فەرمانانـەیان ناكرێت. بەڵام وێڕای ئەو حاڵەتەش ڕەفتاری چاكو مامەڵەی جوان لەگەڵ دایكو باوكدا هەر پێویستەو لە ڕۆڵەكان ئەوە خوازراوە، كە چاك بن لەگەڵیانداو هـەر بـە چـاكەو ئاكـاری جـوانو چـاكە لەگـەڵ كردنیـان سەرپێـچی لـە فەرمانـە ناشەرعییەكانیان بكەن، واتە كاتێك باوكو دایك فەرمانی ناڵەبار بـە ڕۆڵـەكان دەكەن، نابێت ڕۆڵەكەشیان بەجنێودان یان نـەفرەتكردن وەڵامـی فەرمانەكـەیان بداتەوە، بەڵكو تەنها بە سەرپێچی كردنو ئەنجامنەدانی فەرمانەكە بجووڵێتەوەو لە هەمان كاتیشدا مامەڵەی جوانو چاك لەگەڵ باوكو دایكەكەدا بنوێنێت.

١٦- ئایەتەكان وێنەیەكی سەرسوڕهێنی جوانو پەسندیان لەسـەر زانـستی خـواو پەهلایشتنی ئـەو زانـستە بـۆ وردو درشـتی شـتەكان، پیـشان داوە، وەك خـوا تیایاندا دەفەرموێت: ﴿...إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ...﴿١٦﴾ لقمان﴾.

بێگومان زانستی خوا گشتگیرەو هەموو شتێك دەگرێتەوە، هیچ شتێكیش لە خوا ون نابێت، بۆ نموونەش ئەو دەنكە خەرتەلەیەی -كە نمونەی بچووكترین شتە- خوا خۆی دەزانێت لە چ شوێنێكی ئەم سەرزەمینە فراوانەو، ئەو ئاسمانـە پـانو بەرینانەدایەو، هەر خواش خۆی بەتوانایە لەسەر هێنانو خستنەبەرچاوی بیسەر.

مەسەلەی بایەخدارو گرنگیش لەم وێنە ڕەسم كـراوەدا ئەوەیـە، كـە كـارایی لەسەر دەروونی بیسەر هەبێتو، بەدوای زانستی خوادا بگەڕێتو هەسـتی پـێ بكاتو ئاگاداری بێتو لەو حەقیقەتەشدا بژی، كە بێگومـان خـوا دەیبینێـتو

بۆی دەڕوانێت‌و، ئاگاداری هەمو جم‌وجوولێکیەتی. ئەمەش پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئەوەی کە خۆی بۆ خوا پوخت‌و یەکلا بکاتەوەو بەچاکی بیپەرستێت‌و، شەرم بکات لە کرداری سستی‌و دریغی نواندندا بەرامبەر مافی خواو پابەندیی بە حوکمەکانی‌و، دوورکەوتنەوەش لە سەرپێچی لە فەرمانەکانی خواو یاخی بوون.

١٧- خوا ئەو ئایەتەی، کە وێنەی زانستی خۆی‌و توانی خۆی تیادا کێشاوە، بە دیاریکردنی دوو ناو لەناوەکانی خۆی، کۆتایی هێناوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾. ئەم کۆتایی پێ‌هێنانەش هاوڕێکە لەگەڵ بابەت‌و مەسەلەی نێو ئایەتەکەدا.

(إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ) بێگومان خوا خاوەن زانستێکی پەهاویشتووە بۆ هەموو شتێك‌و لە هەموو شتێکیشدا ئەم زانستە هەیەو ڕاپەڕێنراوەو، هیچ شتێکیش بەڕوویدا ناوەستێت‌و، هیچ شتێکیشی لێ ئالۆزو (عاصی) نابێت، چونکە بێگومان زانستی خوایەکە کە ئاگاداری هەموو شتێکە، پاشان خوا (خَبِيرٌ)یشە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾، (خبیر)یش، کە لە وشەی (خبرة)ەوە هاتووە لێرەدا هەر مانای زانست‌و زانیاریی دەگەیەنێت، واتە لە هەموو شتێکدا زاناو زانیارو شارەزایە.

١٨- لەکەشێکی باوەڕداری‌و ئیمان هێنان بەخواداو، کاتێك ڕۆڵەش بەو وێنە پیشان دراوەی زانست‌و توانای خوا کارتێکراوە، لەو کەشەدا باوك کوڕەکەی خۆی بە عیبادەت‌و خواپەرستی ڕادەسپێرێت‌و، فەرمانی پێ‌دەکات، کە هەمیشە نوێژ بکات‌و فەرمان بەچاکەو ڕێگریش لە خراپە بکات.. ئیدی لەو جۆرە کەش‌و ساتە گرنگانەدا - فەرمان پێکردن‌و ڕاسپاردن- ماناو گیان‌و زیندوێتیی خۆی دەبێت، چونکە بەڕاستی دڵێکی پڕ لە باوەڕو ئیمانداریێتی بە خواو بە گەورەگرتنی خوا، بە هەموو ڕاسپاردەو فەرمانێکەوە پابەند دەبێت.

١٩- ئەو فەرمانانەی کە لوقمان ئاڕاستەی کوڕەکەی خۆی کردوون، شەش فەرمانن لەگەڵ سێ ڕێگریی(نهی)، شەش فەرمانەکەش ئەمانەن:

- نوێژ بکە (أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ).
- فەرمان بە چاکە بکە (وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ).
- ڕێ لە خراپە بگرە (وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ).
- لە بەرامبەر ڕووداوو کارەساتدا خۆڕاگربە (وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ).
- بەنەرمو نیانیو مامناوەندییانە بەڕێگادا بڕۆ (وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ).
- لەدەنگت نزم کەرەوە (وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ).

هەروەها سێ فەرمانە ڕێگرییو قەدەغەکارییەکانیش کە ئاڕاستەی کردوون، ئەمانەن/

- هاوەڵ بۆ خوا دامەنێ (لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ).
- ڕووت لە خەڵکی وەرمەگێڕە (وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ).
- بەنازو دەعیەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ (وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًا).

هەموو ئەم مەسەلانەش چەند ڕەهەندو مەودایەکی بەندایەتییان هەیە، بۆیەش دەشێت بە بەندایەتیو کارەکانی خواپەرستی (عیبادات) ناودێر بکرێن، مرۆڤی باوەڕداریش لەبواری پابەندبوونییەوە بە فەرمانەکان خوا دەپەرستێت، سا ئیتر بابەتەکانی ئەو فەرمانانە هەرچییەك بن، هەروەها لەبواری خۆلادانیشیەوە لە کارە قەدەغەکراوەکان، خوا دەپەرستێت، سا ئیتر بابەتی ئەوانەش هەرچی یەك بن. بێگومان بەجێهێناوی فەرمانەکانیش هەر خواپەرستیو بەندایەتی کردنن بۆ خوا، وەك چۆن وازهێنانی حەرامکراوەکانیش بەندایەتین بۆ خوا. پێویستە ئێمەش چەمك (مفهوم)ی بەندایەتی فراوان بکەینو، هەر تەنها لەڕێو ڕەسمە عیبادییەکاندا بەندی نەکەین. چونکە بەندایەتی (العبادة) پەل دەهاوێت بۆ هەموو مەسەلەو کاروبارێکی مرۆڤی موسڵمانو، هیچ ساتێکی لە

ساتەکانی لە بەندایەتی بەدەر نیە، بۆ نمونە کە لە ڕێو ڕەسمە عیبادییەکاندا خواپەرست بێت، ئەوا لە مەسەلەکانی یاساداناو مامەڵەکردنیشدا هەر خواپەرست بێتو بەندایەتی خوا بکات، بە هەمان شێوە لە نواندنی ئاکارو کرداریداو لە مامەڵەو سەوداو ئالۆێریی لەگەڵ خەڵکیشدا هەر خواپەرست بێتو خوای لەیاد بێت.

مرۆڤی موسڵمان بە فیکرو عەقڵ خوا دەپەرستێت، بە ئیمانو دڵ، بە جەستەو بە ئەندامەکانی، هەروەها لەنێو ماڵیشداو لە مزگەوتیشدا خوا دەپەرستێت، لە فەرمانگەو شوێنی کاریداو لەکاتی کارکردنیداو، لە شەوو ڕۆژیداو لە بێداریو نوستنیشیدا هەر عەبدی خوایەو خوا دەپەرستێت. هەمدیسان خواپەرستە لە نوێژو ڕۆژووداو، لە ئاکارو کرداراو، لە سەوداو گفتارداو، لەماڵو سامانو ئابووریداو، لە سیاسەتو فەرمانی ڕەسمییداو، لەکاتی یاریو کاری هونەرو، تەنانەت لەکاتی خەیاڵ کردنیش دا هەر خواپەرستەو، دەبێت خوای لەیاد بێت.

٢٠- ئایەتەکە کۆتایی کارە خواپەرستیو عیبادییەکانی بە دەستەواژەی ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾ هێناوە، (عزم)یش واتە سازکردنی دڵ لەسەر بەجێگەیاندنی کار[1]. بە مانای بەردەوامی نوێژکردنو فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپەو خۆڕاگرتن لەسەر ئازارو ناڕەحەتی. هەموو ئەمانەش چەند کارێکن، کە ئاتاجیان بە ورەو وزەی دڵو سازکردنیو هیممەتو تێکۆشانی دڵ هەیە. ئەمانە چەند ئەرکێکی قورسنو هەموو کەسێك لە خەڵکی دەرەقەتیان نایەتو توانایان بەسەریاندا ناشکێت، هەر بۆیەش زۆر کەس پشتگوێیان دەخەن، لەبەر ئەمە تەنها کەسانی بە ورەو بەجەرگو جوامێر ئەم ئەرکانە بەجێ دەگەیەننو، تەنها خاوەن عەزمو دڵە بەتینەکان توانایان لەسەریان هەیە. وەك شاعیرێکیش

---

١) المفردات : ٣٣٤ .

گوتوویەتی:

وإذا كانــت النفــــوس عظامـــاً
تعبت في مرادها الأجســــــــام

٢١- ئایەتەکە بەرستەی (إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ) کۆتایی بەکارە قەدەغەکراوەکان هێناوە، چونکە بەخۆن نازین‌و خۆبەزل دانان‌و خۆهەڵکێشان، چەند ئاکارێکی بێزراون‌و خوا خۆشیی ناوێن‌و، ئەنجامدەرانیشیانی خۆش ناوێت. ئەوەش بانگەوازێکە لەلایەن قورئانەوە بۆ وازهێنان لەو ڕەوشتە ناپەسندانە. هەروەها قورئانی پیرۆز هانی خەڵکی دەدات بۆ ئاکارە جوان‌و ستایشکراوەکان‌و، داوا لە باوەڕدارانیش دەکات، کە پابەند بن پێیانەوە، ئەمەش هەمووی بە دەستەواژەی (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ ...)، جا هەرکاتێکیش مرۆڤی باوەڕدار گوێی لە وشەی (يحب) دەبێت، خێرا سوور دەبێت لەسەر زانینی وشەکانی دوای ئەوە، تاکو ئاکاری جوان پیشان بدات، چونکە دەزانێت، کە ئەوە ڕێبازی خۆشەویستیی خوایە. هەمدیسان قورئانی پیرۆز خەڵکی لەئاکارە ناشیرین‌و بێزراوەکان دووردەخاتەوە، ئەمەش بە ڕستەی (إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ ...) جا هەرکاتێك مرۆڤی باوەڕدار وشەی (لا يحب) دەبیستێت، خێرا سوور دەبێت لەسەر زانینی وشەکانی دوای ئەوە، تاکو خۆی لەو کارانە بەدوورخات، کە خوا پێی خۆش نیەو، کە ئەنجامدەرانیشی خۆش ناوێن. چونکە ئەمە لە خۆشەویستیی خوا بێبەشی دەکات.

جا ئایا ئایەتەکانی (إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ...) کۆدەکەینەوە، تاکو بەو سیفەتە جوانانەوە وابەستە بێت؟ ئەی ئایا ئایەتەکانی (إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ...)ش کۆدەکەینەوە، تاکو واز لەو سیفەتە بێزراوانە بێنین، کە لەدوایەوە هاتوون؟!

# چیرۆکی شەشەم

## چیرۆکی سەبەء

چیرۆکەکە لە قورئاندا ئاوا هاتووە، کە خوا تیایدا فەرموویەتی:

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ
وَاشْكُرُوا لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ
وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ
جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي
بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾
فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ
مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ
فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن
يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ سبأ﴾.

ماناى ئايەتەكان بە كورتى:

بێگومان لە هۆزی (سەبەء) لە وڵاتو نیشتگەی خۆیاندا بەڵگەو نیشانەیەکی خوا هەبوو، ئەویش دوو باخی گەورە بوو لەلای ڕاستو لەلای چەپی ناوچەکەیانەوەو، بەوەش ڕاسپێررابوون کە ئێوە ئەی خەڵکی (سەبەء) لەو هەموو رزقو رۆزییەی خوای پەروەردگارتان بخۆنو، سوپاسی بکەن.. ئیدی وڵاتێکی خۆشو ئاوەدانو، خوایەکی لێبوردەو میهرەبانتان هەیە.. بەڵام ئەوان لەجیاتی سوپاسی خوای پەروەردگاریان ڕوویان وەرگێڕاو بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون. لەبەر ئەوە ئێمەش -دوای ئەوەی تەواو یاخی بوون- لافاوێکی هێجگار بەگوڕو وێرانکەرمان بۆ ناردن کە بووە هۆی وێران بوونی باخو بێستانە پڕ بەروبومەکانیانو ئیدی لەجیاتی ئەو دوو باخە خۆشو گەورەیە، دوو باخی پڕ لە دڕكو داڵو بەروبوومی تاڵو درەختی بێبەری وەك دارگەزۆمان پێدانەوە لەگەڵ کەمێك لە درەختی (سیدر)، کە بەروبوومێکی کەمی هەیە. ئێمە بەو ڕەنگە بۆیە سزامان دان لەبەر ئەوەی بێباوەڕو سپڵە دەرچوون، جا ئایا ئێمە سزای کافرو سپڵەکان نادەین؟! پاشان لەنێوان ئەوانو ئەو شارو دێهاتانەی تردا، کە خێرو بەرەکەتمان بەسەریاندا ڕژاندبوو، دێهاتو ئاوەدانیی دیارو ئاشکرامان (وەك دێهاتەکانی نێوان یەمەنو شام، کە وڵاتی ئێستای حیجاز دەگرێتەوە) هێنابووە ئاراوە، کە بەبێ ماندوبوون لەنێوان هەردوو ناوچە ستراتیژییەکەی یەمەنو شامدا هاتوچۆو سەفەریان دەکردو، ماوەی نێوان دێهاتەکانیان بەبێ ماندوبوون دەبڕیو پێمان ڕاگەیاندبوون، دە ئیتر بۆ خۆتان چەندەها شەوو ڕۆژ بە ئارامیو بەبێ ترسو دڵەڕاوکێ بڕۆنو سەفەرو بازرگانیی خۆتان بکەن.. کەچی ئەوان لەو هەموو خێرو بەرەکەتو نیعمەتەش بێزار ببونو گوتیان: خوایە ڕێگای هاتوچۆو سەفەرەکانمان بۆ لەیەك دوور خەرەوە.. دیارە ئەوان بەم داخوازیە ستەمیان لەخۆیان کرد، ئێمەش کردمانن بە پەندو داستانو قسەو باسی سەر زاری خەڵکیو بەهۆی خراپیو نالەباریی خۆیانەوە پەرتەوازەمان کردن.

جا بێگومان لەم بەسەرهاتو ڕووداوانەدا چەندەها بەڵگەو نیشانەو پەند هەیە بۆ گشت کەسو هۆزێکی ئارامگرو سوپاسگوزار. دیارەو بەبێگومان سەبارەت بە (سەبەء)و خەڵکە گومڕاکەی، لەملاوە ئیبلیس (شەیتان)یش نیازی خۆیان لەسەر گومڕاکردنیان بەدیی هێنا، کە پێشتر بەخوای گوتبوو (زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نین)، ئەوەبوو کەسانێکی گومڕاو بێباك لە خەڵکدا شوێنی کەوتن، تەنها کۆمەڵێك لە باوەڕداران نەبێت. بەڵام وەنەبێت ئیبلیس دەسەڵاتێکی بەسەریاندا هەبێت، بەڵکو ئێمە خۆمان ویستوومانە ڕوون بێتو بزانرێت، کە کێ باوەڕی بەڕۆژی دوایی هەیەو کێش لە شكو گومان دایە.. جا دڵنیا بە ئەی پێغەمبەر، کە خوای پەروەردگارت چاودێرو ئاگاداری هەموو شتێکە.

## شیکاری چەند وشەیەکی گرانو نامۆی نێو ئایەتەکان

١- لِسَبَإٍ / (سەبەء) ناوی هۆزێکی بەهێزی دانیشتووی (یەمەن) بووەو، شارستانیەتێکیان تێدا دامەزراندووە.

٢- ءَايَةٌ / پەندو عیبرەت: بە مانای لەچیرۆکی ئەواندا پەندو عیبرەتو وانە بۆ کەسانی دی هەیە.

٣- جَنَّتَانِ / دوو باخو بێستانی گەورەو فراوان.

٤- فَأَعْرَضُواْ / بێباوەڕ دەرچوونو لە ستەمدا ڕۆژچونو زۆردار بوون.

٥- سَيْلَ ٱلْعَرِمِ / لافاوە گەورەکە: مەبەست لەمە بەنداوی (مەئرەب)ە، کە دوای وێرانبوونی هەڵی گرتوونو سەرتاپای داپۆشیون.

٦- جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ / دوو باخی تایبەت بە بەروبوومی پێگەیشتوو، کە بۆ خواردن دەست دەدات. وشەی (ذواتی) لێرەدا (مثنی-ی مؤنث)ە، واتە بۆ دوانەیەکی مێیینەیەو، وشەی نێرینەی (ذو)ی لە بەرامبەر دایە.

٧- أُكُلٍ خَمْطٍ / وشەی (خمـط) بۆ درەختێکی بیابانییە کە تاڵەو دڕکی هەیـەو ناخورێت.

٨- وَأَثْلٍ / جۆرێکە لە درەختەکانی بیابانو بە (طرفاء) ناودەبرێت.

٩- سِدْرٍ / جۆرێکی سێیەمە لە درەختەکانی بیابـانو دڕکـی هەیـەو بـە (نَبَـق) ناودەبرێت.

١٠- ٱلْقُرَى ٱلَّتِي بَـٰرَكْنَا فِيهَا / ئەو دێهاتانەی خێرو بەرەکەتمان بەسەردا ڕژانـدن (واتە ئەو دێهاتە بە پیتو بەرەکەتو پیرۆزانەیە، کە لە فەلەستینو دەوروبـەری دا بوون).

١١- قُرًى ظَـٰهِرَةً / ئەو دێهاتانەی نێوان یەمەنو شامە، کە وڵاتی حیجازە.

١٢- وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ / وامان دانابوو کە هات وچۆیەکی بەڕادە دانـراوو دیـاری کراو بێتو بەپێی چەند قۆناغێکی زانراو بێت.

١٣- فَجَعَلْنَـٰهُمْ أَحَادِيثَ / واتە: دوای ئەوەی لەناومان بردنو وڵاتیانمان وێران کـرد، کردمانن بە چیرۆكو بەسەرهاتێك کە خەڵکی لە کۆڕو کۆمەڵەکانیانـدا باسـیان بکەن.

١٤- وَمَزَّقْنَـٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ / واتە: لە وڵاتی عەرەبو شامو عێراقو میسردا بڵاومان کردنەوەو بەش بەشو پەرتەوازەمان کردن.

١٥- صَبَّارٍ شَكُورٍ / صیغەی مبالغەی (صبر وشکر)ن، بە مانای زۆر بـە ئـارامو زۆر دەم بە شوکرانەو سوپاسگوزارییین.

١٦- صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ / ئیبلـیس (شـەیتان) نیـازو ئامـانجی خـۆی لەسـەر گومڕاکردنو لەڕێ لادانیان، بەدیی هێنا.

# وتەیەك لەسەر چیرۆكی سەبەء

شارەزایانی چیرۆكو بەسەرهاتەكانو، مێژوونووسانیش باسێكی درێژیان لەسەر چیرۆكی (سەبەء)و سەرەتای موڵكو سامانیانو، زۆربوونی نیعمەت لەسەریانو، سەرەتاكانی كردنەوەی بەربەستی ئاوەكە بەسەریانداو، ئەو ڕوداوەش بەسەریاندا هاتووە، دیاری كردووە. لێرەشدا ئاماژە بۆ هەندێك لەو باسانە دەكەینو، دەیانخەینە ڕوو، بەڵام نەك بەو پێودانگەی، كە بڕوای پێبكەینو دان بە ڕاستیو دروستییەكەیدا بنێینو پەسندی بكەین، بەڵكو تەنها بۆ ئاگاداركردنی خوێنەرانلێیانو ڕاسپاردنیشیان بەوەی، كە تەنها هەڵوێستەی لە ئاستدا دەكەینو هیچیشی، لەسەر ناڵێینو بەڕاستیش یەكلای ناكەینەوە، هەروەك كە ڕەتیشی ناكەینەوەو بە نادروستیشیان دانانێین، هەر بۆیەش وەستانو هەڵوێستەكردن لە ئاستیاندا، ساغترین هەڵوێستەو، زیاتریش لەگەڵ زانستو لێكۆڵینەوەكەیدا ڕێك دەكەوێت، ئەمەش لەبەر نەبوونی چەند ئامرازێكی زانستیانەی ڕاستو دروست، كە بتوانین بەهۆی ئەو ئامرازانەوە پاك لە پیس جیابكەینەوەو، جیاوازیی نێوان ڕاستیو درۆكەشیان پێبكەین. هەروەها ئەمە لەو دەرووەش دایە، كە هیچ سوودێكی زانستیی لەسەر هەڵناچنرێتو، نەزانینو لێ بێئاگابوونیشی هیچ زیانێكمان لێ نادات، دیسان هیچ شتێكیشمان لەدەست ناچێت، لەكاتێكدا هەڵوێستەی لەئاستدا دەكەینو هیچ شتێكی لە خۆمانەوە لەسەر ناڵێین.

ئەو مێژوونووسو چیرۆكنووسانە گوتوویانە: (سەبەء) یەكەمین پادشای یەمەن بووەو، ناوی (عبد الشمس بن یشجوب بن یعرب بن قحطان) بووە، بۆیەش ناونراوە (سەبەء)، چونكە یەكەم پادشای عەرەب بووە، كە دوژمنانی بەدیل گرتووە. هەروەها (رائیش)یشی پێگوتراوە، چونكە ئەوماڵو سامانەی، كە لە جەنگدا (بەدەستكەوت) پەیدای دەكرد، دەیدا بە گەلەكەی. عەرەبەكانیش بە ماڵو سامانیان گوتووە (ریش) یان (ریاش).

هەروەها دەربارەی (سەبەء) گوتوویانە: خەڵکی (سەبەء) لە نیعمەتێکی زۆرو هەمەچەشندا بوونو، خوا لە هەموو شتێك پێی بەخشیبوون -وەك لە ئایەتەکاندا دەرکەوتووە-، شارستانیەتێکی پێشکەوتووشیان بنیات نابووو توانیبوویان ئاوی شیوو دۆڵەکان کۆنترۆڵ کەن، کۆبکەنەوەو بەنداوێکی قاییمی لەلای شاری (مەئرەب)ەوە لێ دروست کەنو ناوی (بەنداوی مەئرەب)ی لێ نرابوو، کە لەنێوان دوو چیادا بوو، ئاوی بەنداوەکەشیان بۆ مەبەستی ئاودێریی زەوی یەکانیانو ئاودانی بێستانەکانیان بەکارهێناوە. هەروەك توانیویشیانە چەندین باخو بێستانی گەورەش بنیات بنێنو، چەندەها دارودرەختی تێدا بڕوێننو، چەندەها بەروبوومو بەرهەمی تری لێ بچننەوە.

گوتوویانە: هۆزی (سەبەء) دوو باخیان لەنێوان دوو چیادا هەبووەو بەروبوومیان ئەوەندە زۆر بووە، کە بۆ نمونە ئەگەر ئافرەتێك زەمبیلەکەی لەسەر سەری دابنایەو بەنێو ئەو باخانەدا بڕۆیشتبایە، زەمبیلەکەی بەو میوانەی، کە لە درەختەکانەوە دەکەوتنە خوارەوە، پڕ دەبوو -بێئەوەی کەسێك لێی کردبنەوە-.

گوتووشیانە: لە ولاتەکەیاندا هیچ جانەوەرێکی زیانبەخشی وەك مێشو مەگەزو مێشوولەو زەرەزیڕەی لێ نەبووە، یان هەر جانەوەرێکی تری زیانبەخشی هاوشێوەیان، ئەمەش بەهۆی خۆشیو ستارگرتنی کەشو هەواو، ساغیو تەندروستیی میزاجیانو بایەخدانی خوا پێیان، تاکو خوا بپەرستنو خوا بەیەك دانێنو خواوەندو هاوەڵی بۆ دانەنێن.

یەکێك لە پادشاکانیشیان (بەلقیس)بووە، کە ئافرەتێك بووەو لەگەڵ(سولەیمان) پێغەمبەری خوادا، چیرۆکێکی هەیەو بە ئیسلام بوونی خۆیو چوونە سەر ئایینی سولەیمان، کۆتایی بە چیرۆکەکەی هاتووە، وەك لە سوورەتی (نمل)دا هاتووە.

بەڵام خەڵکی (سەبەء) دوای مردنی (بەلقیس) پاشگەز بوونەتەوەو بێباوەڕ بوونو، هاوەڵی تریان بۆ خوا داناوەو سەرەڕۆو ستەمکارو زۆردار بوون. ئیدی کەوتوونە بەر لێپرسینەوەی خواو سزای توندی داونو بەو ڕەنگە بووە، کە بەنداوی

(مەئرەب)ی بەسەردا وێـران کـردوونو هـەر ئـاوێکی تێیـدا بـوە بـەری داوەتـەوە بەسەریان داو، بێگومان لافاوێکی هێجگار گەورەو وێرانکەریشی خولقاندووە، کـە قورئان بە (سیل العرم) ناوی بردووە (واتە ئەو لافاوە بەگوڕو بـەهێزەی، کـە هـیچ توانایەك لە ئاستیدا نیە).

ئـەم لافـاوەش هـەموو بـاخو بێستانەکانی بـۆ سـەرنگووم کـردنو، هـەموو دارودرەختو بەروبوومەکانیشیانی لەناو بردو، بەم پێیە خوا ئەو نیعمەتە زۆرانـەی لەسەر لابردن بەهۆی ئەو ئاکارو ڕەفتارە خراپانەیانەوە.

هەمدیسان مێژوونووسانو شـارەزایانی بـواری چـیرۆكو بەسـەرهاتەکان چـەند باسێکی تریان دەربارەی سەرەتا وێران بوونی بەربەستەکەو، دەرچوونی بە تـەوژمی لافاوە بەهێزەکە، دیاریی کردووەو، پوختەی باسەکەشیان ئەوەیـە، گوایـە خـەڵکی (سەبەء) -وەك کاهینو جادووگـەرەکانیان هـەواڵیان پێـدابوون- زانیبوویـان، کـە هۆکـاری وێرانبـوونی بەنداوەکـە، چـەند جرجێـك بـووەو، ئـەوانیش لەسـەر هـەر شوێنێکی بەنداوەکە پشیلەیەکیان بۆ پاسەوانێتی داناوە. بەڵام کاتێك فەرمانی خوا بۆ سزادانیان شایستە بووە، جرجەکان بەسەر بەنداوەکەدا باڵادەست بوونو هـەموو پشیلەکانیان بەزاندو ڕاوناوە.

یەکێك لە سەرکردەکانی (سەبەء) کە (عەمری کوڕی عامیر) بووە، ئەو دیمەنەی بینیوەو بەبێ دوودڵی زانیویەتی ئەوا (لەناوچوون) نزیـك بۆتـەوە، بۆیـە بـیری لـە دۆزینەوەی ئامرازێك کردۆتەوە، کە نرخـی زەویو زارو موڵـكو سـامانەکانی پـێ وەربگرێت، بۆ ئەم مەبەستەش برازاکەی خۆی بانگ کردووەو پێی گوتووە: (لەکاتی سەرەتای شەودا -وەختێك من لەنێو کۆڕو کۆمەڵی گەلەکەمدا دادەنیـشم- تـۆش خێرا وەرە ژوورەوەو بە گەرمی لێم بپرسەو بڵێ: لەسەر چیە، کە تۆ ماڵو سـامانی خۆمم لێ زەوت دەکەیت؟ منیش پێت دەڵێم: هیچ مـاڵو سـامانێکت لـەلای مـن نیەو، باوکیشت هـیچ شـتێکی لـەدوای خـۆی بـەجێ نەهێـشتووە، بۆیـە تـۆ درۆ دەکەیت.. جا ئەگەر ئاوا بەدرۆم خستیتەوە، تۆش بەدرۆم بخەرەوەو هەرچی یەکیشم

پێ‌گوتیت، تۆش پێم بڵێرەوە.. جا ئەگەر ئاوا بجووڵێیتەوە، ئەوا من لـەو کاتـەداو لەنێو خەڵکی دیوەخانو کۆڕو کۆمەڵەکەدا جنێوت پێ‌دەدەم، تۆش خێرا جنێوم پێ بدەرەوە، جا ئەگەر جنێوت پێدامەوە ئـەوا مـشتەکۆڵەیەك دەکێـشم بـە دەمتـاو، تۆش هەستەو مشتەکۆڵەیەکم پێدا بکێشەوە..

دوای ئەم وتانەی، برازاکەی پێی دەڵێت: ئاخۆ مامەگیان، مـن حەزناکـەم ئـاوا ڕوبەڕووت بوەستم!.. مامیشی-واتە ئەو سەرکردەیەی (سەبەء)- پێی دەڵێت: نـا، هەردەبێت ئاوا ڕەفتار بکەیت، چونکە من بەو هۆیەوە دەمەوێت سەلامەتی خۆتو خانەوادەت بپارێزم.. برازاکەشی قایل دەبێتو دەڵێت: باشە بەقسەت دەکەم..

ئیدی لەکاتی سەرەتای شەو-واتە لەدوای بانگی شێوانو نـان خـواردنی ئێـوارە کە کۆڕو کۆمەڵی دیوەخان ڕێکخراوە- برازاکەی چۆتە ژوورەوەو، ئـەو تەمـسیلو نەخشەیەی مامی جێبەجێ کردووەو فەرمانەکەی بەجێ گەیاندووە تا گەیشتوونەتە سەر ڕووداوی مشتەکۆڵەکەو، کاتێـك مـامی مـشتەکۆڵەیەکی تـێ سـرەواندووە، ئەویش تێی سرەواندۆتەوە، ئنجا مامی هەستاوەو سەیری پیاوماقوڵانی گەلەکـەی کـردووەو پێـی گوتـوون: ئـەی هـۆزی فـلان، ئـەها مـن لەنێوتانـدا مـشتەکۆڵەم پیادەدرێت؟! دە ئیدی من هەرگیز لەمەولا لە وڵاتێك دادانانیشم، کـە فلانەکەسـم تیایدا مشتەکۆڵەم پیا بکێـشێت. لەبەرئـەوە کـێ هەیـە خانوەکـانو زەویو زارو موڵکەکانم لێ بکڕێتەوە؟!

جا دوای ئەوەی زانییان، کە بەڕاستی لەسەر ئەو نیازە سوورە، هەموو موڵـكوماڵێکیان لـێ کڕییەوە. ئەویش کـە پـارەوپوولی موڵکـەکانی هـەڵگرتو خـۆیو خانەوادەو کەس‌وکاری سازو ئامادە دەکرد بۆ دەرچوونو سەفەرکردن، هـاواری لـە گەلەکەی کردو پێی گوتن: هۆ خەڵکینە، بەڕاستی سزاو کارەسات بـاڵی بەسـەردا کێشاونو لەناوچوونتان نزیك بۆتەوەو، هاکا هیچتان نەما، جا هەرکەسێك لە ئێوە خـانووێکی تـازەو جێگەیـەکی نـوێو حوشـترێکی تونـدی دەوێـت وبەتـەمای سەفەرکردنە، با بگاتە (عومان)، هەرکەسێکی تریشتان خوازیاری مەیو شـەرابو

هەویرو دۆشاوە با بگاتە (بوصرا).

هەرکەسێکیشتان خوازیاری درەختە ڕەگ داکوتاوەکانی نێو قوڕو لیتاوو، خۆراك بەخشەکانی نێو زەوی وشکانیو بێباران‌و ڕواوەکانی نێو ئاوی گەمیشە، با بگاتە شاری یەسریب، کە دارخورمایەکی زۆری تیادایە.

کۆمەڵێکیان گوێڕایەڵییان کردو بڵاوبوونەوە:

(ئەزدەکان) بۆ عومان ڕۆشتن.

(غەسانەکان)یش بۆ (بوصرا) دەرچوون.

هەردوو تیرەی (ئەوس‌و خەزرەج)و خێڵی (بنو کعب کوڕی عەمر)یش بۆ شاری مەدینە(یەسریب) دەرچوون.

جا کاتێك گەیشتبوونە نێو باخێکی تازەی دارخورماوەو، پێش ئەوەی بگەنە مەدینە خێڵی (کەعب) گوتیان: ئەم ناوچەیە جێگەیەکی باشەو بەهیچ شوێنێکی دیکەی ناگۆڕینەوە، ئیدی لەوێدا لایانداو تیایدا نیشتەجێ بوون، لەبەر ئەوە بە تیرەی (خوزاعە) ناوبران، لەبەر ئەوەی لەوانی دی جیابوونەوە، وشەی (خزاعە) لە عەرەبیدا مانای (انفصال/ جیابوونەوە) دەگەیەنێت. جا ئەوانیش لە هۆزو تیرەکانی دی جیابوونەوە.

بەڵام ئەوس‌و خەزرەج لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون، تا گەیشتنە یەسریب‌و لەوێ لایاندا.

تەنها هۆزی (سەبەء)ی تێدا مایەوە، کە خوا ئەو لافاوە گەورەیەی بەنداوەکەی بۆ ناردن‌و، جرجەکان توانییان بەنداوی (مەئرەب) ببڕن‌و، ئیدی ئاوی لافاوە بەهێزەکەش، هەموو باخەکانی داگرت‌و داپۆشیو، هەموو دارودرەخت‌و بەرهەمە کشت‌وکاڵییەکانی تری بۆ لەناوبردن. بەم ڕەنگە ئەو شارستانیەتییە نەماو لەناوچووو قڕی تێکەوت، بەهۆی کوفرو بێباوەڕیو سەرەڕۆییو بێپەرواییانەوە ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا ۖ وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾ سبأ﴾؟!

هەر دەربارەی گەلی (سەبەء)یش شاعیری یەك چاو (یان شەو كوێر): (میمون بن قیس) گوتوویەتی:

(وفـي ذاك للمؤتسـي أسـوة
ومأرب عفّى عليهم العـرمُ
رخام بنته لهم حِمـيـر
لإذل جـاء ماؤهم لم يُـرم
فأروى الزروع وأعنابهـا
على شرب طفل إذا ما فطـم)[1]

هەموو ئەو باسو وردەكارییەش كە دەربارەی چیرۆكی (سەبەء)و ڕووداوی وێران بوونی بەنداوەكەو، كۆچكردنی خەڵكەكەی، هێنامانەوە، تەنها بۆ ئەوەیە كە هەڵوێستەی لەئاستدا بكەینو، نە پشتی پێ ببەستینو نە پەسندیشی بكەین، هەر بۆیەش هیچ شتێكی لەبارەوە ناڵێین كە ڕەتی كاتەوە یان جێگیری كات، بەڵكو لە خوێنەری بەڕێزیش داواكارین كە تەنها لە ئاستی دا بوەستێتو، نە بە دڵنیاییەوە پەسندی بكاتو، نە بە یەكجاریش ڕەتیی بكاتەوە.

١) هەر بۆ مەسەلەی ئەو بەسەرهاتو باسی ڕووداوانە، بڕوانە: البداية والنهاية/٢: ١٥٨-١٦٢، تفسير ابن كثير: ٣: ٥٣٠- ٥٣٥، الدر المنثور للسيوطي/ ٦: ٦٨٦-٦٩١.

# شاژنی (سەبەء) لە سوورەتی (النمل)دا

پێش ئەوەی بچینە سەر باسی لێکدانەوەو شیکاری ئایەتەکانی پیرۆزی (سەبەء) وەك لە سورەتی (سەبەء)دا هاتووە، نەختێك لەبەردەم ئایەتەکانی سوورەتی (النمل)دا دەوەستین کە دەربارەی چیرۆکی شاژنەکەی (سەبەء) دەدوێین و، دەربارەی ئەو بەسەرهاتەش کە لەنێوان ئەو ئافرەتەو، پێغەمبەرێکی خوا (سولەیمان)دا -سلاوی لێ بێت- گێڕراوەتەوە.

خوای مەزن لەو چیرۆکەداو دەربارەی ئەو بەسەرهاتە فەرموویەتی:

﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾
لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ
بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً
تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ
لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ
﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا
تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ
مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ
﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ
ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُواْ عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُاْ أَفْتُونِي فِيٓ أَمْرِي مَا

كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ
فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ
أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ
ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَـٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ
أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً
وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ
عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى
عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ
هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى
غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا
جَآءَتْ قِيلَ أَهَـٰكَذَا عَرْشُكِ ۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا
كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَـٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ ۖ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ
لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ ۗ قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ
نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَـٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾ النمل ﴾.

ماناى ئەم ئایەتانە بە کورتی:

(سولەیمان) ڕۆژێکیان دەستی کرد بە گەڕان بەنێو ئەو باڵندانەدا کە خوای بۆی دەستەمۆ کردبوون، لەکاتی بەسەرکردنەوەیاندا بۆی دەرکەوت کە (پەپوسلێمانکە)یان تێدا نیە، بۆیە خێرا پرسی: ئەوە بۆ پەپوسلێمانکە نابینم؟ ئایا لێرە نیە یاخود لە بزرو نادیارەکانە؟ سوێند بێ بەخوا دەبێت سزایەکی توندی بدەم،

یان سەری برِم، یان پێویستە بەهانەو پاکانەیەکی وەها بەهێزی هەبێت لەسەر ئـەو بزربوونەی ئەمڕۆی.. هێندەی پێنەچوو، کە (پەپوسلێمانکە) خێرا هاتـەوەو لـەوێ نیشتەوەو، دەربارەی هۆی بزربوونی ئەو ساتانەی بە سـولەیمانی گـوت: هـەواڵێکم زانیوە، کە تۆ هێشتا پێت نەگەیشتووە، هەواڵەکەش ئەوەیە، کە بەڕاستو دروست لە وڵاتی (سەبەء)ەوە بۆم هێناویت، ئەوەبوو دیـتم لـەوێ ئافرەتێـك پادشـای ئـەو وڵاتـە بـووو هـەموو جـۆرە دەسـەڵاتو توانایـەکی پـێدراوە، هـەروەها تـەختو تاراجێکی گەورەی پادشاییشی هەیە. دیتم خۆیو گەلەکەشـی کڕنـووش بـۆ خـۆر دەبەن، لەجیاتی ئەوەی خوا بپەرستنو کڕنۆشی بۆ ببـەن. شـەیتانیش ئـەو کـردەوە نالەبارانەی بۆ جـوانو ڕازاندوونەتـەوەو بـەو هۆیـەوە لـەڕێی ڕاسـت لای داونو، ئەوانیش ڕێی ڕاستیان نەگرتۆتە بەر. جا بۆیە شـەیتان ڕێی ڕاسـتی لێ گرتـوون، تـاکو کڕنـووش بـۆ خـوا نەبـەن، کـە نهێنـیو شـاراوە لـە ئاسمانـەکانو زەوی دەردەهێنێتو دەشزانێت ئەوە چی دەشارنەوەو چی ئاشکرا دەکەن. خاوەن تـەختو عەرشی گەورەیەتی... دوای تەواوبوونی وتەکانی (پەپوسلێمانکە)، (سولەیمان) پێی گوت: ئێمەش لەو وتانەت دەکۆڵینەوە، کە ئاخۆ ڕاست دەڵێیت، یان لە درۆزنانیت. جا مادام وایە، برِۆ ئەم پەیامەی من بەسەریاندا بەردەرەوە، پاشـان لـە شـوێنێکی پەنهانیدا خۆتیان لێ بشارەوەو، بڕوانە چی دەڵێنو چ پرسو ڕایەك لەگـەڵ یەکـدی دەکەن.. کاتێك (پەپوسلێمانکە) ڕۆیشتو پەیامی سولەیمانی بەسـەردا بەردانـەوە، پەیامەکە بە شاژنی (سەبەء) گەیشتو خوێندییەوەو، هـەموو وەزیـرو ڕاوێـژکارو پیاوماقولانی گەلەکەی بانگ کردو پێی گوتن: بەڕێزان، ئەی پیاوماقوولانی وڵات، ئەوا من پەیامێکی پیرۆزم پێگەیشتووەو بەسەرما بەردراوەتەوە. ئەم پەیامەش لـە (سولەیمان)ەوەیەو سەرەتا (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان) دەست پێدەکـاتو پاشان دەڵێت: (خۆتان بە گەورەو بەرزتر لـەمن دامـەنێنو وەرن موسـڵمان بـبن).. دوای خوێندنـەوەی نامەکـەش، (بـەلقیس)ی شـاژنی (سـەبەء) بـە ئامـادەبوانی کۆبوونەوەکەیانی گوت: بەڕێزان ئێوە دەڵێن چیو ڕاتان چیە؟ خۆ من تا ئێستا هیچ

بڕیارێکی یەکلاکراوەم دەرنەکردووە هەتا بە تەواوەتی ئێوەم لێ ئاگادار نەکردبێتو پرسو ڕام پێ‌کردوون... پیاوماقوڵانی کۆڕەکەی گوتیان: ئێمە خاوەنی هێزو دەسەڵاتینو هێزێکی بەزەبرو توندوتیژمان هەیەو، بەڵام خۆشت سەرپشکیتو فەرمان بەدەست تۆیە، بیربکەرەوەو وردبەرەوە لەوەی چ بڕیارو فەرمانێك بۆ ئەم مەسەلەیە باشەو دەری کەیت -ئێمەش پابەندین پێوەی-... (بەلقیس) دوای بیرکردنەوە گوتی: بێگومان ئەگەر سوپای پادشاکان بچنە سەر هەر شارو دێهاتێك وێرانو خاپووری دەکەنو دەیشێوێننو پیاوماقوولو دەسەڵاتدارانیشیان ملکەچو زەلیل دەکەن، بەڕاستی پادشایان لەکاتی داگیرکردنی وڵاتاندا هەر ئەوە نەریتو پیشەیانە. جا لەبەر ئەوە بڕیارمدا دیارییەك بۆ ئەوان-سولەیمانو حکومەتەکەی- بنێرم، پاشان بزانم نێرراوەکانم دوای گەیاندنی دیارییەکە بەچ هەواڵێکەوە دێنەوە، -واتە ئەگەر سولەیمان پادشا بێت ئەوا دیاری وەردەگرێتو ئەگەر پێغەمبەریش بێت بەو جۆرە شتانە ڕازیی نابێت-.. کاتێك یەکێك لە نێرراوەکانی (بەلقیس) گەیشتە لای (سولەیمان)و باسی دیارییەکەی بۆ کرد، (سولەیمان) پەست بووو پێی گوتن: ئێوە دەتانەوێت بە ماڵو سامان هاوکاریم بکەن؟ بەڵام بێگومان ئەوەی خوا پێی بەخشیوم گەلێك لەوە چاکترو سەنگینترە کە بە ئێوەی داوە. بەڵکو ئێوە هەر خۆتان بە دیاریو ماڵی دنیاتان دڵشاد دەبن -نەك من-.. پاشان بە دەم ڕاستی نێرراوەکانی (بەلقیس)ی گوت: دە تۆش بە خۆتو نێرراوەکانو دیارییەکەتانەوە بچنەوە بۆ لایان -بەلقیسو ڕاوێژکارانی-و پێیان بڵێ: (سوێند بەخوا - مادام باوەڕ بەخوا ناهێنن- دەبێت بە سوپایەکی وەهاو کۆمەڵە سەربازێکەوە هەڵکوتینە سەریان کە هەرگیز سەبازو سوپای ئاوایان نەدیبێتو نەتوانن بەرەنگاریشی ببنەوە، پاشان دەبێت دەریان کەینو بە ڕەزیلیو ڕیسواییانەوە لە وڵات دەرچن.. دوای ئەوە (سولەیمان) کە بە سرووشی خوا دەیزانی ئەم هەڕەشەیەی شوێنەوارێکی گەورە لە دڵی شاژنی (سەبەء)و سەرکردەکانی وڵاتەکەیدا دروست دەکات، دەسبەجێ ڕووی کردە سەرانی حکومەتەکەیو لێی پرسین پێش ئەوەی ئەو گەلە بە شاژنو

دانیشتوانەکەیەوە موسڵمان بن، کێ لە ئێوە دەتوانێت تەختو تاراجی شاژنەکەم بۆ بێنێت؟.. لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کەسێکی هێجگار گەورەو زەبەلاح لە تایەفەی (جن) -کە ئەوانیش ڕامو دەستەونەزەر لە خزمەتی دابوون- هەستاو گوتی: من دەتوانم پێش ئەوەی لەم کۆبوونەوەیت هەستیت ئەو تەختی پادشاییەیت بۆ بهێنم، منیش بۆ ئەم کارە خۆم بە کەسێکی بەهێزو دەسپاك دەزانم.. بەڵام کەسێك لە پیاوچاکان کە زانستو شارەزاییی لە ڕازو نهێنییەکانی کتێبی خوا(تەورات)دا هەبوو وتی: من دەتوانم لەماوەی چاوترووکانێك دا پێش ئەوەی چاو هەڵبێنیتەوە ئەو تەختو تاراجەیت بۆ بهێنم.

جا کاتێك سولەیمان بڕیاری لەسەر وتەی ئەو پیاوچاکەداو، کە ئەو کارەشی بەو سپارد. خێرا کەوتە زیکرو یادو سوپاسی خواو دەستی بە نزاو پاڕانەوە کرد، ئیدی لەناکاودا دیتی، کە تەختو تاراجی پادشایەتیی ئەوانی لەلا دانراوە، لەسەر ئەمەش گوتی: ئەمە لە فەزڵو بەخششی خوای پەروەرگارمە تاکو تاقیم بکاتەوە کە ئاخۆ سوپاسگوزاری دەبم یان ناشکورو سپڵە دەبم، دیارە خوای پەروەردگاریشم لەوە بێباکە، بەڵام هەرکەسێك سوپاسی خوا بکات، ئەوا سوپاسی بۆ خۆیو لە سوودو بەرژەوەندیی خۆیدا کردووە، هەرکەسێکیش سپڵەو پێنەزان بێت، ئەوە دیارە خوای پەروەردگارم بێ پەرواو دەوڵەمەندە لەوەو خاوەنی فەزڵو بەخشی زۆرو نەبڕاوەیە.

دوای ئەوە، (سولەیمان) فەرمانی دەرکردو گوتی: هەندێك گۆڕانکاری بەسەر تەختی پادشاییەکەی دا بێننو ڕەنگو نەخشی لێ بگۆڕنو پاشان بزانین شاژنەکە، تەختو تاراجی خۆی دەناسێتەوە، یان لەوانەیە، کە شوێنی خۆیان نەناسنەوە.. جا کاتێك (بەلقیس) گەیشتە ئەو شوێنە، پێی گوترا: ئەرێ تەختی پادشایەتیی تۆ ئاوایە؟ (بەلقیس)یش گوتی: هەر لەوە دەچێتو وەك ئەوە وایە.. بێگومان ئێمە لەمەوپێش زانیارییمان لەسەر تواناو دەسەڵاتی (سولەیمان) هەبووو پێش ئەوە تەسلیم ببوینو بەتەمای جەنگو کوشتار نەبووین.. بەڵام ئەو شتانەی (بەلقیس)

داینابوون به خواو دەپیەرستن -لەجیاتی پەرستنی خـوا- ببونـه بەربەسـت لـەنێو دەروونیداو هەر خۆیشی لەنێو گەلێکی بێئیمانو کافردا دەژیا. جـا دوای پرسـیار پێی گوترا: بچۆرە نێو ئەو کۆشکەوە، ئەویش بەرەو کۆشکەکە هەنگاوی ناو دیتـی ئاوێك لەبەردەم کۆشکەکەدایە -کە لەڕاستیدا بـە شووشـە سـەرئاوەکە گیرابـوو-، کاتێك بەلقیس ئاوەکـەی بینـی، وای زانـی ئـاوێکی هێجگـار زۆرەو کراسـەکەی هەڵکردو قاچی دەرخست تا تەڕ نەبێت. سولەیمان پێی گوت: پانتایی سەرئاوەکە بە شوشە گیراوەو ترست نەبێت.. ئیدی (بەلقیس)یش سەری سوڕما لەو هەموو سـامو دەسەڵاتو کۆشكو بەخششە ماددیو مەعنەوییانەی، کـە خـوا بـە (سـولەیمان)ی داوە، بۆیە موسڵمان بوونی خۆیشی تێدا ڕاگەیاندو گوتی: (خوایـە بەڕاسـتی مـن ستەمم لەخۆم کردووە، دە ئیتر وا لەمەولا منیش لەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بوومو هاتمە سەر دینی خوا.

## چـەند هێمـاو ئامـاژەیەك لـەو ئایەتانەوە

١- حوکمڕانیی (سولەیمان)-سلاوی لـێ بێت- بۆ مرۆڤو جنو باڵندەو، ملکەچـیو گوێڕایەڵییان بۆیو، باڵندەکانیش بەشێك بوون لە سوپاکەی.

٢- بایەخدانی (سولەیمان) بە سەربازانی، هەرچەندە باڵنـدەش بـوون، وەك لـەوەدا دەردەکەوێت، کە بەنێو کۆمەڵی باڵندەکاندا گەڕاوەو لێیانی پرسیوەتەوە.

٣- پەرۆشو سووربوونی فەرمانڕەوا لەسەر کاروبـاری سـەربازەکانی، ئەمـەش بـۆ ئەوەی پشێویو ئـاڵۆزیی بـەرپا نـەبێت، ئـەوەبوو (سـولەیمان) هەڕەشـەی لـە سەربازێکی خۆی کرد، کە (پەپوسلێمانکە) کە بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی بەبێ هۆیەکی ئاشکرا لە سوپاکەی دیار نەبو.

٤- شیاوبوونی گەیانـدنی سـزا بـە سـەربازی کەمتەرخـەمو دواکـەوتووو نارێـك، ئەمەش بەپێی وتەکەی (سولەیمان): (لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ).

٥- دادگەریی فەرمانڕەوا لەگەڵ کەسانی ژێر دەسەڵاتیداو، ڕێگەدانیشی بە کەسانی کەمتەرخەم بۆ بەرگریی لەخۆکردنو خستنەڕووی بەڵگەو ڕوونکردنەوەکانی. ئەمەش هەر بەپێی وتەکەی (سولەیمان) کە دوای دەربڕینی هەڕەشەکەی، سوێندیشی خوارد کە یان دەبێت پەپوسلێمانکەکە بەڵگەو پاکانەیەکی ئاشکرای لەسەر هۆی بزربوونەکەی هەبێت (أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ).

٦- بوێریو ئازایەتیی مرۆڤی موسڵمانو، دەسپێشخەرییو نواندنی دەسەڵات، جا مادام ئەو لەسەر هەق بێت، بۆچی لاواز بێت یان سەرشۆڕ بێت؟ یان لاواز بکرێتو بترسێنرێت؟ لەم چیرۆکەشدا پەپوسلێمانکەکە هاتۆتەوە بۆ لای (سولەیمان)و بە سەربەرزیو خۆڕاگرییەوە قسەی لەگەڵدا کردووەو پێشی گوتووە: من لە هەواڵێك ئاگادار بووم کە تۆ لێی ئاگادار نیت، من لە گەلی (سەبەء)ەوە هەواڵێکی ڕاستو دروستم بۆ هێناویت( أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ).

٧- هەموو تاکەکەسێکی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی، سوورە لەسەر پاراستنی بەرژەوەندیی ئەو کۆمەڵگەیەو تەرخان کراوە بۆ خزمەتکردنیو، لە پێناویدا هەوڵ دەدات. پەپوسلێمانکەکەش چووە بۆ لای گەلی (سەبەء) تاکو لەوێوە چەند هەواڵو زانیارییەك بۆ مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیو خزمەتکردنی کۆمەڵگەکەی لەڕێی سوپاکەی (سولەیمان)ەوە، بەدەست بێنێت.

٨- بێگومان پێدەچێت فەرمانڕەوای وڵات ئاگاداری سەرجەم مەسەلەو کاروبارەکان نەبێت، تەنانەت هەرگیز ناتوانێت ئاگاداری هەمووی بێتو زانیاری لەسەریان هەبێت، بۆیە لەمبارەیەوە گوێ لە کەسانی دی دەگرێتو، ئەوەی پێی دەگەیەنن، پەسندیی دەکات. ئەو هەواڵو زانیاریەشیان لەسەر ئەو مەسەلانە لێ وەردەگرێت، کە لەخۆی نادیارو پەنهان بوون، هەر بۆیەش پەپوسلێمانکەکە بە سولەیمانی گوتووە: من لە مەسەلەیەك ئاگادار بوومەتەوە،

کە هێشتا تۆ لێی ئاگادار نیت: (أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ).

٩- پێویستە ئەو هەواڵو زانیارییانەی، کە مرۆڤێکی موسڵمان بە کەسێکی کاربەدەستی دەگەیەنێت، ڕاستو ڕوونو ئاشکرا بنو لێیان دڵنیا بێت لەپێش ئەوەدا بیانگەیەنێت، وەك چۆن پەپوسلێمانکەکە بە سولەیمانی گوتبوو: من لە وڵاتی (سەبەء)ەوە هەواڵێکی ڕاستو دروستم بۆ هێناویت: (وَجِئْتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ).

١٠- پەپوسلێمانکەکە لێهاتوو بووە لە دەرخستنی ڕواڵەتی ڕاستەقینەی گەلی (سەبەء)داو، زیرەکیش بووە لە زانینی ڕادەو دیاردەی هێزو سوپاکەیاندا، هەروەك کاراو ڕەوانبێژیش بووە لە خستنەڕووی ڕاپۆرتی ڕاستگۆیانە لەبارەیانەوە، ئەوەبوو پوختەی واقیعی ئەو گەلەی وەها گێڕایەوە، کە ئافرەتێکی تیادا بینیون، کە پادشایاو سەروەریانەو لە هەموو نازو نیعمەتو پلەو دەسەڵاتێکی پێدراوەو، تەختێکی گەورەی پادشاییشیان هەیە: (إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ).

١١- حاکمی (سەبەء) ئافرەت بووە، زۆر کەسیش لە مێژوونووسانو شارەزایان دەربارەی ناوەکەی، وایان دیاری کردووە، کە ناوی (بەلقیس) بوویێت، بەڵام ئەمە بەپێی فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺ ڕانەگەیەنراوە، لەبەر ئەوە ئێمە ڕادەوەستینو دان بەڕاستیو جێگیریی ئەو ناوە دانانێینو، ڕەتیشی ناکەینەوەو نکوڵی لەوەش ناکەین، کە ئەو ناوەی نەبوویێت. بەڵکو وەك تەواوی مەسەلە نەزانراوەکانی تری قورئان مامەڵەی لە ئاستدا دەکەین.

١٢- کورتیی وتەی پەپوسلێمانکەکە لە باسو وەسفی هێزی شاژنی (سەبەء)دا، کە بە کورتی لەوبارەیەوە گوتبووی: (وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ)، واش دیارە ئەمە هەمەلایەنەو گشتگیرەو پەل دەهاوێت بۆ هەموو جۆرە دیاردەو ڕەنگو

شێوەیەکی خێرو بێرو ڕزقو هێزو دەسەڵات، چونکە خوا لە هەموو شتێکدا بڕێکی پێبەخشیبوو، سا ئیتر لە بوارەکانی سیاسەت یان ئابووری، یان کۆمەڵناسیدا بووبێت، یاخود لە بوارەکانی ڕزقو ڕۆزیو درەختو باخچەو میوەو سەوزەو ئاوو بارانو ماڵو سامانو کوڕوکاڵو، دەوڵەمەندیو ئاسایشو هێمنیو هێزو دەسەڵات و... پاشان تەختی گەورەی پادشاییدا.

١٣-بایەخدانی پەپوسلێمانکە بە زانینی ئایینی پادشاکەی (سەبەء)و گەلەکەی، ئەوەبوو بینیبوونی، کە لەجیاتی خوا کڕنووش بۆ خۆر دەبەن، ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکراوەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەوان (خۆر)یان پەرستووە.

١٤- ڕژدیو دەمارگیری پەپوسلێمانکەکە لەسەر خواپەرستیو خوا بەیەکگرتنو ئیمانداریێتیی، لەبەر ئەوە نارەزایی دەربڕیوە لەسەر گەلی (سەبەء) بەهۆی کڕنووش بردنیان بۆ خۆر لەجیاتی خواو، واق وڕمانیشی لە کڕنووش نەبردنیان بۆ ئەو خوایەی، کە دانەوێڵەی لە ئاسمانەکانو زەوی دەردێنێتو، دەشزانێت خەڵکی چی دەکەنو، خواش هەر خۆی پەروەردگاری جیهانییانو پەروەردگارو خاوەنی عەرشی گەورەیە.

بێگومان پەپووسلێمانکەکە بانگەوازکاری ڕێی ئیمانداریێتی بووەو، قەڵاچۆکاری شیرکو کفر بووەو، خاوەنی هەستێکی باوەڕدارانەو دەمارگیرییەکی ئایینداپانەش بووە. موسڵمانانیش لەو هودهودە لە پێشترن، کە ئەو هەڵوێستەو ئەو هەستە نایابەو، ئەو دەمارگیرییە هۆشیارانەیەشیان هەبێت، چونکە خوا لە قورئاندا فەرمانی بەوە پێکردوونو، ئەرکی ڕاپەڕاندنی ئەو فەرمانەشی پێ ڕاسپاردوون.

١٥- هەموو دروستکراوێك لەو گۆشەیەوە لە مەسەلەکان تێدەگات، کە جێی بایەخیەتیو، ئەو چاویلکەیەش دەیانبینێت، کە بەلایەوە گرنگەو، بەو شێوازەش دەیبینێت، کە بەچاکی دەزانێت.. ئا ئەوەش پەپوسلێمانکەکەیە، کە لە بواری پێداویستییەکانی خۆیو، لە بواری مەسەلەکانی جێی بایەخی

خۆیـــشیەوە خـــوا دەناســـێت. خـــواش -بـــەپێی زانیـــاریی‌و ناســـینی ئـــەو پەپوسلێمانکەیە- ئـەو خوایەیـە، کـە دانەوێڵـە لـە ئاسمانـەکان‌و زەوییـەوە دەردێنێت.. وشەی (خبء) لە ئایەتەکەدا ئەو دانەوێڵە شارراوەیەی نێو نـاخی زەوییە، کە ئەویش وەك هەموو باڵندەیەك بایـەخی پـێ‌دەدات‌و بـە دەنـووکی خۆی بەدوایدا دەگەڕێت‌و، دەشزانێت، کە هەر خوایە بۆی دەردەهێنێـت‌و پێـی دەدات، بەڵام دەنووکەکەی تەنها ئامرازێك‌و هۆیەکی ڕواڵەتییە.

١٦- وا دیارە حیکمەت لە ئاماژەی پەپوسلێمانکەکە بۆ (عەرشی گەورەی خـوا)، بانگکردنی خەڵکی بێت بۆ ئەو حەقیقەتەی، کە بە ڕواڵەت‌و باق‌و بریقی ژیانی دنیا تەفرە نەخۆن‌و، لەکاتی بەدەستهێنانی هەندێك شتی دنیـادا لـەخۆبوردوو بن، جا ئەگەر شاژنی (سەبەء) خاوەنی عەرشێکی گـەورە بووبێـت، ئـەوا لـە حەقیقەتدا هاوتای هیچ شتێك نەبووە، چونکە خوای بەهێزو دەوڵەمەنـد هـەر خۆی خـاوەن‌و پـەروەردگاری عەرشـی گەورەیـە، جـا داخـۆ عەرشـی شـاژنی (سەبەء) لە ئاست عەرشی خوادا لەکام جێگەو لەکوێ‌دا بێـت؟!! ئـەی ئـاخۆ گەورەیی عەرشەکەی شاژنی (سەبەء)، بە بـەراورد لەگـەڵ گـەورەیی عەرشـی خوادا، لە چ پلەیەکدا بێت‌و بەچی پێوانە بکرێت؟

١٧- پێویستبوونی دڵنیایی فەرمانڕەوا لە ڕاستی‌و دروستیی ئەو وتەو هەواڵانەی، کە پێی دەگەیەنرێت‌و، کە نابێت خێراو ڕاستەوخۆ پەسـندیان بکـات، چـونکە لەوانەیە گەیەنەری وتەو خاوەنی هەواڵ ڕاستگۆ نەبێت، خۆ ئەگەر ڕاسـتگۆش بێت، لەوانەیە دڵنیا نەبێت لەوەی، کە دەیڵێت. (سـولەیمان)یـش- سـڵاوی لێ بێت- دوای ئەوەی گوێی لە وتەکانی پەپوسلێمانکەکە بووە، پێی گوتووە، کـە ئێمە لەمەولا لەو وتەو هەواڵانەت دەکۆڵینەوە، تا بزانین ئایا ڕاسـت دەڵێیـت، یان درۆ: (قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ).

١٨- پەپوسـلێمانکەکە نێرراوێکـی تایبـەتی (سـولەیمان) بـوو بـۆ لای شـاژنی (سـەبەء)و، پـەیامی ئـەوەی بـۆ هـەڵگرتبوو، بێگومـان هەمیـشە ئـەو

پەپوسلێمانکەیە بۆ بانگەوازی (سولەیمان) هاتوچۆی دەکردو، سووریش بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی. جا ئەگەر باڵندەیەك-کە ئەرکێکی لەسەر نیە-و لەسەر ڕاپەڕاندنی ئەم کارە سوور بێتو، هەوڵ بدات، ئەی دەبێ موسڵمان چۆن بێت، کە خوا ئەو کارە گەورەیەی پێ ڕاسپاردووەو فەرمانی ڕاپەڕاندیشی پێداوە؟!

١٩- (سولەیمان) فەرمانی بە پەپوسلێمانکەکە کرد، کە لەکاتی گەیاندنی پەیامەکەیدا ئاگاداریان بێتو خۆیشیان لێ پەنا بداتو، نەهێڵێت کارەکەشی کەشف بکرێت: ﴿ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ النمل ﴾، بەپێی ئەم فەرمانە، پەپوسلێمانکەکە دەبێت نامەکەی (سولەیمان)یان بەسەردا فڕێداتە خوارەوەو، پاشان نەختێك لێیان دووركەوێتەوەو لە شوێنێکی نزیکیشەوە چاودێرییان بکاتو بیانبینێت، کە ئاخۆ چی دەکەنو، ئنجا بزانێت کە ئەنجامی گفتوگۆو ڕاپرسیی نێوانیان بەچی دەگات؟

٢٠- شاژنەکە، پەیامی (سولەیمان)ی بە پیرۆزو بایەخدار وەسف کردووە (إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ )، واش دیارە حیکمەت لەوەدا ئەوە بێت، کە بەهۆی ئەوەی شاژنەکە پێشتر (سولەیمان)ی ناسیبێتو هەواڵی بیستبێتو، زانیاریی لەسەر هێزو دەسەڵاتیشی هەبووبێت. هەمدیسان ئەم وەسفی پەیامە بە (پیرۆز) ئاماژەیە بۆ هۆشیاریو زیرەکیی شاژنەکەو، بەچاك دانانیو وەرگرتنی پەیامی پادشایان.

٢١- شاژنەکە دەقی نامەکەی (سولەیمان)ی بۆ گەلەکەی خوێندۆتەوە: ﴿... بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ النمل ﴾، ئەم پەیامەش لە هەموو پەیامەکانی دی، کورت ترو کاریگەرتریشەو، وەك بروسکەیەکی کورت کراوەیەو، هەموو وشەیەکیشی بە بایەخەوە هەڵبژێرراوە.

٢٢- سەرەڕای کورتیی پەیامەکەو سەرەڕای سووربوونیش لەسەر نەڕازاندنەوەی پەیامەکە بەو وشە ناسکانەی، کە هیچ پێویستیی و ئاتاجێك بە بوونیان ناکات، بەڵام (سولەیمان)-سڵاوی لێبێت- دەسپێکی نامەکەی بەناوی خوا هێشتۆتەوە، کە نیوەی نامەکەی پێ‌گرتووە. ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ گرنگی دەسپێکی نامەکە بە ناوی خواوەو، کردنەوەی نووسینی نامەکان بەو (بسملە)یە.

٢٣- (سولەیمان) -سڵاوی لێ بێت- یەك داواکاریی دیاریکراوی ئاڕاستەکردوون، کە بە (موسڵمانی) بێنە لای (وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ). ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئامانجی (سولەیمان) لە ڕزگارکردنی وڵاتانو لە جەنگو کوشتاری لەگەڵ بێ‌باوەڕان. بێگومان ئامانجی (سولەیمان) ئەوەیە، کە خەڵکی تەسلیم بە ئایینی خوا بن. (سولەیمان)یش بە جیهادی خۆیو تێکۆشانی ڕێبازی خوا، بانگەوازکارێك بووە بۆ ئایینی خوا.

وادیارە لەمەشدا وەڵامێك هەیە بۆ ئەوانەی، کە ڕوخساری (سولەیمان) دەشێوێننو، وای دادەنێن گوایە، تەنها لەسەر داگیرکردنو بەرفراوان کردنی وڵاتو زەوتکردنی خاکی کەسانو گەلانی تر، بەپێی هەواو ئارەزووی حوکمو دەسەڵاتەکەی، سووربووە.

٢٤-حوکمو فەرمانڕەوایی لە وڵاتی شانشینی (سەبەء)دا دیموکراسیانە بوو-ئەگەر ئەم دەربڕینە جائیز بێت-، چونکە شاژنەکە هەر خۆی بە تەنیا بڕیارو ڕاسپاردەی دەرنەکردووە، بەڵکو گەورەپیاوانی دەوڵەتەکەشی لەوەدا لەگەڵ خۆی بەشدار کردووەو لە مەسەلەکاندا ڕاوێژو پرسو ڕای پێ‌کردوون ﴿قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ النمل﴾..

واش دیارە ئەمە لەو سەردەمی سەرکوتکارییەی ئەو وڵاتانەدا تاکە شێوازێکی بەدوورگیراوی ڕێساو ڕژێمی حوکمی نێو وڵاتی (سەبەء) بووە، لەکاتێکدا ڕژێمەکانی حوکم، دیکتاتۆریو بەپێی حوکمی تاکەکەس بووە، کە حوکمێکی

ڕەهاو بێسنووری هەبووەو، هەر حاکم خۆیشی بە ئارەزووی خۆی بڕیارەکانی دەرکردووەو، میللەتیش تەنها سەر لەقاندنو ڕاپەڕاندنو قایل بوونی لەسەر بووە. بەڕاستی وادیارە وڵاتی (سەبەء) لە ڕژێمی حوکمەکەیداو بە بەراورد لەگەڵ شێوازی حوکمی ئەو زەمانە، وڵاتێکی پێشکەوتوو بووەو لەپێش ئەوانی ترەوە بووە.

٢٥- سەیریش لەوەدایە، کە پیاوماقووڵانی (سەبەء) لە بیروڕای خۆیانو لە پلەوپایەی کەسایەتیشیان دابەزیونو قایلبوون بەوەی، کە تەنها شوێنکەوتوانی شاژنەکە بنو ڕاپەڕێنەرانی هەر فەرمانێکی بن، کە دەری دەکات، چونکە ئەو شاژنە پرسو ڕای پێکردوونو ئەوانی لە بڕیارو یاسادا بەشدار کردووە، کەچی ئەوانیش گوتوویان: ئێمە خاوەنی هێزو دەسەڵاتو لەشکرێکی توندو بەزەبرین، بەڵام هەر خۆیشت لە بڕیاردا سەرپشکیتو، بڕوانە چی باشەو فەرمان بەچی دەکەیت: ﴿...نَحْنُ أُوْلُواْ قُوَّةٍ وَأُوْلُواْ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ النمل﴾. ئەو وتانەی دوایش لە سروشتو ئاکاری ئەو گەلە بێهێزو لاوازکراوانەیە، کە بە خواستی خۆیان لاوازیو بێدەسەڵاتییان هەڵبژاردووەو سووریش بوون لەسەری، ئیدی گشت بانگەوازێکی تایبەت بە بێداربوونەوەو بەهێز بوونو سەربەرزبوونیان ڕەت کردۆتەوەو، هەر بارودۆخی پاشکەوتەییو سەرشۆڕیو بێدەسەڵاتییان بەباشتر داناوە.

٢٦- شاژنی (سەبەء) لە وتاری خۆیدا حوکمی بەسەر هەموو پادشاکاندا بەوە داوە، کە شێوێنەرنو هەر وڵاتێك داگیر بکەن، تێکی دەدەنو خەڵکە سەربەرزەکەی سەرشۆڕ دەکەنو، ئیدی نەریتی پادشایانی داگیرکەر هەر ئاوایە: ﴿...إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ النمل﴾. بەمەش یەکەم جار مەبەستی لە پادشاو پێغەمبەر (سولەیمان)ە-سڵاوی لێ بێت-، کە بەم ڕەنگەش دیارە سەرزەنشتی دەکات،

نەك ستایشی بکات. بێگومان قسەکەش ڕاست نیەو پەسند نیە کە دەرهەقی سولەیمان وای گوتووە. هەندێك کەسیش ئەم وتەیەی شاژنی (سەبەء) بەگشتی بۆ هەموو پادشایان بەکاردێنن‌و، ئەم ئایەتەش دەکەنە بەڵگەیەك لەسەر فەسادو کاری خراپەو شێواندنیان. بەڵام بەڵگەهێنان بەم ئایەتە شێوازێکی ڕاست نیەو دانیشی پێدا نانرێت. بێگومان لەلایەکەوە لەوانەوە بیانووەکە ڕاست بێت‌و مەسەلەکەش دروست‌و تەواو بێت - ئەمەش لە زۆرجاردا ئاوایە-، چونکە هەموو ئەو پادشایانەی، کە تەواو بە ئایینی خواوە پابەند نین، سوور دەبن لەسەر فەسادو بەدکاری‌و بەکۆیلەگرتنی خەڵکانی ترو سەرشۆڕکردن‌و مل پێکەچ کردنیان بۆ خۆیان.. بەڵام بەڵگە لەم ئایەتەوە لەسەر ئەو حاڵەتە دروست ناکرێت، چونکە ئایەتەکە وتەی شاژنی (سەبەء)ی گێڕاوەتەوە، شاژنی (سەبەء)یش لەکاتی وتنی ئەو قسەیەدا، مرۆڤێکی بێباوەڕ بووەو مەبەستیشی لە (سولەیمان)ی پێغەمبەر بووە-سلاوی لێ بێت-، کە بە خراپەکاری‌و شێواندن وەسفی کردووە، لەبەر ئەمە چۆن وتەی شاژنێکی کافرو بێباوەڕ بکەینە بەڵگە، کە سەرزەنشتی پێغەمبەرێکی دادپەروەری پێدەکات.

بێگومان قورئان وتەی کافرانیشی دیاریی کردووە، لە دەرووی گێڕانەوەی هەواڵ‌و ڕاگەیاندنیەوە، هەندێك جاریش قورئان ئەم وتانەی پەسند کردووەو، لە هەندێك جاری تریشدا بێدەنگ بووە لە ئاستیانداو تیشکی نەخستوونەتە سەر. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا ئەوە ناکرێتە بەڵگە لەسەر مەسەلەیەکی تایبەتی، چونکە قورئان ئەوەی هێناوەتەوەو گێڕاوەتەوە. بێگومان وتەکانی کافران‌و بێباوەڕان، کە قورئان گێڕاونییەوە، بەڵگەیان پێ ناهێنرێتەوە، مەگەر تەنها قورئان خۆی کردبنی بە بەڵگە. وتەی شاژنەکەی (سەبەء)یش بەڵگەیەك نیە لەسەر بەدکرداریی‌و فەسادی پادشایان، بۆیە دەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ئیدیعایە، کە -زۆرجار- ڕاستە بەدوای بەڵگەیەکی وادا بگەڕێین، کە جێی بەڵگە پێهێنانەوە بێت.

٢٧- شاژنی (سەبەء) ڕێگەچارەی جەنگی لەگەڵ سولەیماندا هەڵنەبژارد، بەڵکو دانوستانو ئاشتیو هودنەی هەڵبژارد، لەوانەیە هۆی ئەمەش لەوەدا ئەوەبێت، کە ئافرەت -بەسروشتی خۆی- حەزی لە جەنگو کوشتارو توندوتیژیو خوێن ڕشتن نەبێت. جا ئەگەرئافرەتێك جڵەوی پادشایەتیی گەلێکی بەدەستەوە بێتو ڕووبەڕووی هێرشی دوژمنان ببێتەوە، ئەوا -لە زۆرجاردا- ئەو ئافرەتە خوازیاری کوشتارو پێکدادان نابێت، بەم ڕەنگەش گەلەکەی خۆی لەبەردەم دوژمناندا ملکەچو لاواز دەکاتو لەدەستیان دەدات.

٢٨- شاژنی (سەبەء) ویستی (سولەیمان) تاقی بکاتەوەو، بزانێت ڕاددەی ڕژدییو سووربوونی لەسەر بانگەوازەکەی بۆ ئیسلام چەندەو، ئاخۆ بەو پیاوێکی دڵسۆزی بانگەوازە، یان بازرگانی بە بانگەوازەوە دەکات، هەر بۆیەش دیاریی بۆ ناردو ماڵو سامانی لەو دیارییەدا وەك بەرتیل خستیە بەردەمی تاکو دەست لەوان هەڵگرێتو وازیان لێ بێنێت تا هەر لەسەر بێباوەڕیو شیركو هاوەڵ بۆ خوادانان بمێننەوە.

٢٩- شاژنی (سەبەء) ئەو ماڵو سامانەی کە پێشکەشی (سولەیمان)ی دەکرد بە (دیاری) ناوی بردبوو (وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ)، بەڵام ئایا لە ڕاستیدا ئەوە دیارییە؟ نەخێر، بەڵکو ئەوە بەرتیل دان بووە بە (سولەیمان) تاکو دەستی لێ‌هەڵگرێتو وازی لێ‌بێنێت. بەڵام ناوی بەرتیلەکەی بە (دیاری) بردووە، (سولەیمان)یش ئەو بەرتیلەی ڕەت کردۆتەوەو بە نێرراوەکانیشی گوتووە: (بێگومان ئێوە هەر خۆتان بەو جۆرە دیاریو ماڵو سامانە دڵخۆشن، پێی تەفرە دەخۆن (بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ).

ئەم دیارییەش بە (بەرتیل) دانراوە، چونکە پێشکەش (سولەیمان)ی حاکمو پادشاو پێغەمبەر کراوە، زانراویشە، کە دیاری بردن بۆ فەرمانبەر لە فەرمانگەکەیداو، دەسەڵاتدار لە دەزگای دەسەڵاتدارێتییدا، (بەرتیل)ە نەك (دیاری).

لە قورئانی پیرۆزیشدا وشەی (هدیە) تەنها بە مانای (بەرتیل) هاتوەو، لەو دوو جێگەیەی سوورەتی (النمل)، لەو بەسەرهاتەی سولەیمان لەگەڵ شاژنی (سەبەء)دا هاتووە کە دووجار وشەکە دووبارە بۆتەوە.

٣٠- خۆبەرز گرتنی (سولەیمان)-سڵاوی لێ بێت- لەسەروو ماڵو سامانو لەئاست تەفرەدان بەماڵو ساماندا و، پاشان بڕینی ڕێگای دانوستانو هودنەکارییو، بەفیڕۆنەدانی کات، لە کاری ناردنی نێرراوانو وەفدەکاندا، ئەمەش دەبێتە پێشەنگێك بۆ فەرمانڕەوا موسڵمانەکان لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانیاندا. ئەوەبوو کاتێك نێرراوانی (بەلقیس) هاتنە لای (سولەیمان)و دیارییەکانیشیان هێنابوو، سولەیمان پێی گوت: ئایا ئێوە بە ماڵو سامان کۆمەکم دەکەن؟

﴿...أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ النمل﴾.

٣١- هەر لە وێستگەی چیرۆکەکەدا، ئاماژەیەکی تر ڕەچاو دەکەین، ئەوەیە دوژمنان هەمیشە سوورن لەسەر بەفیڕۆدانی کاتی نەتەوەی ئیسلامی لە دانوستانداو، سووریشن لەسەر خەریککردنی بە شتی بێسودو بابەتی لابەلاو بێنرخ، تاکو لە مەسەلە بنچینەییو گرنگەکان دووریان خەنەوەو لەبیریان بەرنەوە. وەك چۆن شاژنی (سەبەء) ئەو ڕێگایەی گرتەبەر، کاتێك نێرراوانی خۆی بە دیارییەکانەوە بۆ لای (سولەیمان) نارد، تاکو سولەیمان بخاتە سەر خواستی دانوستانو هودنەو سازش. پێویستە کاربەدەستانی ئەمڕۆی نەتەوەی ئیسلامیش، لەم نیازە گڵاوەی دوژمنان ئاگادار بنو، ئامانجەکەیان لێ تێك بدەنو کاتیان پێ بەفیڕۆ بدەنو بەو شت وەکە بێنرخانەشیانەوە خەریك نەبن، کە بە مەبەستی لادانیان لە نیازی بنچینەییان، پێشکەشیان دەکەن.

٣٢- بەڕاستی لەم چیرۆکەدا ئەو هەڵوێستە بەتەوژمو شێلگیرو یەکلاکەرەوەیەی سولەیمان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لەسەر دوژمن هەبوو، ئەوەبوو شاژنی (سەبەء) خۆی بەدەست هێزو دەسەلاتی (سولەیمان)ەوەداو، (سولەیمان)یش بەوەی زانیو، ویستیشی چەند بەڵگەیەکی تر لە لاوازیو تێکشکانی ئەو شاژنە بخاتە بەردەمی. جا نەتەوەی ئیسلامیش لەکاتێکدا بە تەنگژەیەك، یان گرفتێکدا تێدەپەڕێتو، لە کاتێکیشدا ڕوبەڕووی مەترسییەکی وەها دەبێتەوە، کە هەڕەشە لە وجودو ژیانی دەکات، ئەوا پێویستە هەڵوێستێکی توندو بەزەبری هەبێتو، فەرمانڕەوایانیشی- لەوانەی، کە بڕیارو حوکمیان بەدەستەوەیە- دەبێت بەوپەڕی جورئەتو بوێریو خۆڕاگری یەوە ڕوبەڕووی دوژمنان ببنەوەو، بە تەواوی -چالاکیو چەلەنگیو ڕاستگۆییو دڵسۆزیو خۆ بۆ خوا یەکلاکردنەوە- سەوداو ئالۆیریی لەگەڵ مەسەلەکەدا بکەن.

٣٣- (سولەیمان) ویستی ئەو عەرشە گەورەیەی، کە شاژنی (سەبەء) خۆی پێوە هەڵدەکێشا، ئامادە بکاتو بیخاتە بەردەمی شاژنەکە خۆی، تا لاوازیی شاژن بەرامبەر بە (سولەیمان)و، شکستی هێزەکەی لەبەردەم هێزی سولەیمانی پیشان بدات.

٣٤- (سولەیمان) -سڵاوی لێ بێت- کەشێکی پێشبڕکێی لەنێوان داروودەستەکەیو، کەسانی نزیکی چواردەوریدا خولقاندو پێیشی گوتن: کامتان دەتوانن، پێش ئەوەی ئەوان بە حاڵەتی خۆ تەسلیم کردن بە ئایینی خواوە بێنە لام، عەرشی ئەو شاژنەم بۆ بێنن؟.. لەوەشدا هێزو توانا و وزەی ئەو داروودەستەو سەربازانەی لێك جیاواز بوون. سولەیمانیش لەو مەسەلەدا خۆی لەبەردەم دوو سەودادا دیوەتەوە:

سەودای یەکەم: کەسێکی هێجگار کەتەو زەبەللاح لە تایەفەی (جن) خستیە بەردەمیو پێی گوت: (من هێندە بەهێزو دەستپاکم، کە دەتوانم پێش ئەوەی کۆتایی بەم کۆبوونەوەیەت بێنیت عەرشەکەیت بۆ بێنم (أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ

قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ).

سەودای دووەم: ئەو پیاوەی، کە شارەزایی لەسەر کتێبی (تەورات) هەبوو، خستیە بەردەمی‌و پێی گوت: من دەتوانم لەماوەی چاوتروکانێکت دا عەرشەکەت بۆ بێنم (أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ).

٣٥- لەو مەسەلەی (هێنانی عەرشەکەدا بۆ سولەیمان) چەند لایەنێکی نەزانراو هەیەو، نە قورئانو، نە فەرموودەی ڕاست (صحیح)یش، هیچ شتێکیان لەسەر ڕانەگەیاندووە. بۆیە ئێمەش ناشێت، کە لەخۆمانەوە ئەو مەسەلە نەزانراوو شارراوانە ڕوون بکەینەوە، یان بچینە نێو قولایی باس‌و خواسیانەوەو، بە مەبەستی ڕونکردنەوەشیان سەرکەوینە سەر دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییەکان.
بۆ نموونە هەندێك لەو لایەنە نەزانراوانەش، ئەوەیە: نازانین ناوی کەسە بەهێزو زەبەلاحەکەی تایەفەی (جن) چی بووەو، ناشزانین چۆن دەیتوانی عەرشەکە بە سولەیمان بگەیەنێت بەر لەوەی لەو کۆبوونەوەیەی هەستێت، هەروەك نازانین ناوی ئەو پیاوچاکەش چیە کە شارەزاییەکی لەسەر تەورات هەبووەو، ناشزانین فەرمانەکەی لەلای سولەیمان چی بووەو، ئەو زانست‌و شارەزاییەی هەیبووە، چەند بووەو، ئەی چۆن توانیویەتی لە ماوەی چاوتروکانی سولەیمانو پێش کردنەوەی چاویدا عەرشەکەی شاژنی (سەبەء)ی بۆ بهێنێت؟!

بەهەر حاڵ زانینی ئەم لایەنە نادیارو نەزانراوانەی نێو چیرۆکەکەش پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، چونکە هیچ سودێك، یان زانستێکمان پێ نابەخشێت.

٣٦- لەکاری گەیاندنی عەرشەکەدا بە (سولەیمان)، پلەیەکی ڕێزو کەرامەت بۆ ئەو کەسە دانراوە، کە زانست‌و شارەزاییەکی لەسەر کتێبی تەورات هەبووەو، موعجیزەیەکیشە بۆ سولەیمان-سلاوی لێ بێت-و دیاردەیەکە لە توانای خوای بەتواناو، سەرکەوتنێکیشە بۆ هەقو، بەزینە بۆ ئەو ناهەقەی، کە شاژنی (سەبەء) لەسەری بووە.

٣٧- كاتێك سولەیمان عەرشەكەی بینی كە لە بەردەمیدا دانراوە، چیی گوت؟

بێگومان سوپاسی خوای كردو ستایشی فەزڵو بەخششی كرد، كە ئەوە هەڵسەنگاندنی خوایە بۆی تا داخۆ سوپاسی خوا دەكات یان سپڵە دەبێت، گوتی: ﴿...هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ النمل﴾ دیارە ئەو بەهێزی خۆیەوە شانازی نەكردوەو تەفرەی نەخواردووەو، بە سەرگەردانیو گومڕاییو خۆ بە زل زانیو فەسادو بێباكیدا نەبووە، بەڵكو لەبەردەم هێزی خوادا لەخۆبوردووو سەركز بووەو، یادی خوای كردووەو سوپاسی چاكەو بەخشی كردووە.

(سولەیمان)-سڵاوی لێ بێت- لەم حاڵەتەشدا دووبارە پێشڕەوو سەرمەشقە بۆ حاكمو فەرمانڕەوایان لە چۆنیەتی هەڵسوكەوتیاندا بەرامبەر هێزو دەسەڵاتو سەركەوتنیان.

٣٨- (سولەیمان) ویستی چەند ڕووداوێكی سەیرو كتوپڕیی پیشانی شاژنەكەی (سەبەء) بداتو، مەبەست لەوەش دەرخستنی لاوازیو هەڵەو نەزانیی شاژنەكە بوو، ئەو ڕووداوە سەیرو لەناكاوانانەش، ئەمانە بوون:

أ/ هێنانی عەرشەكە لە سەبەئەوە دوای دەرهێنانی بۆ لای (سولەیمان)و دانانی لەبەردەمی شاژندا لەكاتی چوونە ژوورەوەیدا.

ب/ گۆڕینی عەرشەكە بە هەندێك ئاڵوگۆڕ لە شێوەو دیمەنە ئاساییەكانیدا: ﴿قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ النمل﴾.

ج/ دانانی كۆشكێك لەبەردەمیدا تاكو بەسەریا تێپەڕێتو لێی تێپەڕ بێت، كە ڕاڕەوێكی شووشەیی بۆ دروستكرابووو وادیاربوو كە ئاو لەژێریەوەیەتی، تا بیخاتە سەر ئەو خەیاڵەی كە ئەو دەچێتە ناو ئاوەكەوەو پیایدا دەڕوات.

٣٩- شاژنی (سەبەء) لەبەردەم ئەو پرسیارەی كە دەربارەی عەرشەكە لێی كرا

زیرەك بوو، ئەوەبوو کاتێك لێی پرسرا: ئایا ئەمەیە عەرشەکەت؟ ئەویش کە دیتی بەدڵنیاییەوە دانی پێدا نەنا کە ئەوە نیە، چونکە بە تەواوەتی لەو عەرشەی خۆی دەچوو! هەروەها نەیشی سەلماند کە ئەوەیە، چونکە لەپاش خۆی بەجێی هێشتبوو، جا ئاخۆ چی ئەمەی گەیاندۆتە ئەو شوێنەو لەبەردەمی داینراوە، هەر بۆیەش کەوتە حاڵەتێکی واق وڕمانەوەو، تەنها زیرەکیو عەقڵی خۆیشی لەو حاڵەتەی دەرباز کرد، هەر بۆیەش لە وەڵامیدا گوتی: وەك ئەوە وایە کە عەرشەکەی من بێت.

ئەم وەڵامەش بۆ هێڵێك پاشگەزی (خط الرجعة) بووە، چونکە نە نکوولّی لێکردو نە دانیشی پێدانا.

٤٠- کاتێك پێی گوترا: بچۆرە نێو کۆشکەکەوە.. شاژن ئەوەی بە شوێنێکی پڕ لە ئاو هاتە بەرچاو، هەر بۆیەش نەختێك کراسەکەی بەرزکردەوەو هەردوو پێی دەرخست تا خۆی بۆ ڕۆیشتن بەنێو ئاوە زۆرەکەدا ئامادە بکات، ئەم جموجووڵەش بە ساویلکەیی لێکدرایەوە، هەر بۆیەش بەسەریا هاتنو گاڵتەیان پێکردو پێشیان گوت: ئەمە کۆشکێکە لە شوشەی ڕوونو لووس بنیات نراوە.

لەلایەکی ترەوە بانگەشەچییانی ئەفسانەو شتە سەیرو سەمەرەکانی (ئیسرائیلییات) لێکدانەوەیەکی سەیرو نامۆیان بۆ حاڵەتی قاچ دەرخستنی شاژنەکە هێناوەتەوەو، وای دەگەیەنن گوایە شاژنی (سەبەء)-کە ناوی (بەلقیس)یان لێ ناوە- لە دایکێکی (جن) بووە، هەر بۆیەش دوو قاچی وەك قاچەکانی (جن)ی هەبووە، کە لەقاچی مەڕ دەچوون، جا گوایە (سولەیمان) ویستویەتی لەوە دڵنیا بێت، هەر بۆیەش زەمینەی کۆشکەکەی لە تەختێکی بنیات نراو لە شووشە کە ژێرەکەی ئاو بووە، بۆ شاژنەکە ڕێکخستووەو، ئیدی کاتێك هەردوو پێی بینیوە، وەك دوو پێی جوانی مرۆڤ هاتوونە بەرچاوی.. بێگومان ئێمەش نابێت قورئانی پیرۆز بەو شتە سەیرو نامۆو پووچەڵانە تەفسیر بکەین.

٤١- شاژنی (سەبەء) هەستی بە هەڵەی خۆی کردو زانی کە هیچ شتێکی وای بە بەراورد لەگەڵ هێزی (سولەیمان)دا نیەو زانیشیی کە شکستو دەستەوسانە لە کاری بەرەنگاربوونەوەیدا، هەروەك زانیبووشی کە ئەو خۆی لەسەر ڕێبازێکی نابەجێو پووچەڵە، چونکە هاوەڵی بۆ خوا دادەناو، پەیی بەوەش بردبوو کە (سولەیمان) لەسەر هەقەو هەر ئاینەکەی ئەویش ڕاستو دروستەو، خواش باوەڕی خستبووە نێو دڵییەوە، لەبەر ئەوە شاژنەکە بەڕاشکاوی گوتی: خوایە بەڕاستی من ستەمم لەخۆم کردووەو، ئەوا منیش لەگەڵ (سولەیمان)دا خۆم تەسلیم بە ئایینی خوای پەروەردگاری جیهانییان کرد" ﴿...رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٤﴾ النمل﴾.

٤٢- دوای ئەو خۆ تەسلیم کردنەی شاژنی (سەبەء)، قورئانی پیرۆز بێدەنگ بووە لەسەر هەواڵو بەسەرهاتی تری شاژنی (سەبەء)و (سولەیمان)، لەبەر ئەوە هەر پرسیارێك لەسەر حاڵەتەکانی دوای ئەوە بکرێت ئەوا پرسیارەکان بەبێ وەڵامێکی ڕاستو متمانەدەر دەمێننەوە.

هەندێك لەو پرسیارانەش کە خولقێنراون" وەك ئەوەی ئایا سولەیمان ئەو ژنەی خواستووە بۆ خۆی یان نا؟ ئەی ئایا ئەو شاژنە لە وڵاتی (سولەیمان) نیشتەجێ بووە، یان گەڕاوەتەوە بۆ (سەبەء)؟ ئایا گەلەکەشی باوەڕیان بەخوا هێناوەو چوونەتە سەر ئایینی (سولەیمان) ؟.. ئایا (سولەیمان) بووە بە پادشای یەمەنیش یان نا؟ پەیوەندیی نێوان (بەنی ئیسرائیل)و (دانیشتوانی سەبەء) چۆن بووە دوای مردنی (سولەیمان)و مردنی شاژنی (سەبەء)؟

هەموو ئەم پرسیارانەش، هیچ وەڵامێکیان لە قورئاندا نیە، چونکە سەرچاوە ڕاستو دروستەکانیش هیچیان لەبارەوە نەوتووە. لەبەر ئەوە ئێمەش دەبێت لە ئاست ئەو سەرچاوانەدا بێدەنگ بینو، بۆمان شیاو نیە کە بچینە سەر دەقە

ناڕاستە ئیسرائیلییەکانو شتە پوچەڵەکانو ئەفسانەکانیان بە مەبەستی ئەوەی گوایە وەڵامی ئەم پرسیارانەیان لێ دەربێنین.

بەڕاستی ئەو وێستگەی کۆتایی پێهێنانەی بەسەرهاتی (سولەیمان) لەگەڵ شاژنی (سەبەء) لە سوورەتی (نمل)دا کۆتایی پێهێنانێکی ئیماندارانەی ئامانجدارانەیە، چونکە دوایین دیمەنی ئەو بەسەرهاتە تەسلیم بوونی شاژنی (سەبەء)و چوونە نێو ئایینی خواو توڕدانی شیرك‌و کفرو، خۆ سپاردنی لەگەڵ (سولەیمان)ی بانگەوازکارو پێغەمبەردا بەخوای پەروەردگاری جیهانییان.. هەر ئەو کۆتاییەی بەسەرهاتەکەش ئامارە بۆ ئامانجی باسکردنی چیرۆك دەکات کە بانگەوازکردنی بانگەوازکارانە بۆ شوێن پێهەڵگرتنی پێغەمبەری ئازیز (سولەیمان) -سلاوی لێ بێت- لە مەسەلەی بانگەوازکاری دا کە بانگەوازەکەیان بکەنە ئامانجو پێویستە بانگەوازکراوانیش بەرەو ئیسلام ئاڕاستە بکەنو بەکردەوەش وابەستەو پەیڕەوکاری بن.

## پوختەی بەسەرهاتی سولەیمان لەگەڵ شاژنی (سەبەء)دا

لەکۆتایی ئەم باسەماندا پوختەیەك لەسەر چیرۆکی سولەیمان لەگەڵ شاژنی (سەبەء)دا دیاری دەکەین، کە ئەمەیە:

بێگومان دانیشتوانی (سەبەء) لەسەردەمی فەرمانڕەوایی شاژنەکەیاندا گەیشتبوونە قۆناغێکی پێشکەوتوو لە هێزو دەوڵەمەندیو خۆشگوزەرانیو نیعمەتی زۆردا (وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ)، بەم ڕستە گشتگیرو هەمەگیرەش گوزارشتی لەو هەموو لایەنە دیارو پێشکەوتووە کردووە، شاژنەکەشیان لە کاروباری فەرمانڕەواییو حوکمیدا ڕاوێژو پرسو ڕای بە گەلەکەیو پیاوماقووڵانی گەلەکەی کردووە. بەڵام وادیارە ئەو گەلەو پیاوماقووڵانیشیان تەنها شوێنکەوتەو گوێڕایەڵی بوونو ئامادەی ڕاپەڕینی فەرمانو ڕاسپاردەکانی بوون. جا کاتێك (سولەیمان)یش لەرێی پەپوسلێمانکەکەوە بەو حاڵەتەی زانیوە، بانگەوازی کردووە بۆ ڕێی ئیمانداریتیو باوەڕهێنانو چەند دیمەنێکی سەرسوڕهێنو کتوپڕیی بۆ ئامادەکردووەو، شاژنەکەش بەو دیمەنانە هەستی بە لاوازیو شکستیو نەفامیی خۆی کردووەو، بە دڵنیاییشەوە هەستی بە ڕادەی هێزو پێشکەوتنی لەشکری سولەیمان کردووەو، هۆی ئەمەشی بۆ ڕاستیو دروستیی دینەکەی گەڕاندۆتەوە، هەر بۆیەش چۆتە سەر دینی (سولەیمان)و خۆی بە خوای پەروەردگاری جیهانییان سپاردووە.

# باسی چیرۆكه‌كه‌ له‌ سوره‌تی (سه‌به‌ء)دا

ئێستاش ده‌گه‌ڕێینه‌وه‌ بۆ سووره‌تی (سه‌به‌ء) تاكو چه‌ند ئاماژه‌و په‌ندو وانه‌ی لێ ده‌ربهێنین، له‌مه‌شدا له‌و باسه‌وه‌ ده‌ست پێ‌ده‌كه‌ین، كه‌ ده‌رباره‌ی چیرۆكی (سه‌به‌ء) هاتوه‌..

بێگومان پێشتر باسی به‌سه‌رهاتی (داود)و (سوله‌یمان)ی كوڕی-سلاویان لێ بێت- هاتووه‌، به‌و پێودانگه‌ی دوو پادشای دادپه‌روه‌رو باوه‌ڕدارو سوپاسگوزاری خوابوون. پاشان چیرۆكی (سه‌به‌ء) به‌دوایاندا وه‌ك نموونه‌یه‌ك له‌سه‌ر بێباوه‌ڕیو سته‌مكاریو بێ‌په‌روایی هاتووه‌.

مامۆستای پێشه‌وا (سید قطب) له‌سه‌ر ئه‌م چیرۆكه‌و په‌یوه‌ندی به‌و به‌سه‌رهاته‌ی نێوان سوله‌یمان‌و شاژنی (سه‌به‌ء) له‌ سووره‌تی (النمل)دا، گوتوویه‌تی:

"له‌ چیرۆكی بنه‌ماڵه‌ی (داود)دا لاپه‌ڕه‌ی باوه‌ڕهێنان به‌خواو سوپاس له‌سه‌ر فه‌زڵو به‌خششه‌كانیو، ڕه‌فتارو مامه‌ڵه‌ی جوان له‌سه‌ر نیعمه‌ته‌كانی، پیشان ده‌دات. لاپه‌ڕه‌ی به‌رامبه‌ریشی لاپه‌ڕه‌ی چیرۆكی (سه‌به‌ء)ه‌. له‌ سوره‌تی (النمل)دا به‌سه‌رهات‌و ڕووداوه‌كانی نێوان شاژنی ئه‌و گه‌له‌و، نێوان (سوله‌یمان)ی باس كردوه‌.

لێره‌شدا له‌م سووره‌تی (سبأ)دا هه‌واڵیان له‌دوای چیرۆكی (سوله‌یمان) هاتووه‌. ئه‌مه‌ش وا ده‌گه‌یه‌نێت كه‌ ئه‌و ڕووداوانه‌ی له‌م چیرۆكه‌دا هه‌یه‌ دوای سه‌رده‌می به‌سه‌رهاته‌كانی نێوان شاژنه‌كه‌و (سوله‌یمان) هاتووه‌. ئه‌وه‌ی زیاتر ئه‌م گریمان‌و بۆچوونه‌ش به‌هێز ده‌كات، ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌م چیرۆكه‌ لێره‌دا- له‌م سوره‌ته‌دا- ده‌رباره‌ی بێباكیو نه‌زانین به‌ نیعمه‌تی خوایه‌و، له‌ناوچوونی ئه‌و نیعمه‌تانه‌یه‌و، په‌رته‌وازه‌بوونیانه‌ له‌دواییداو به‌ هه‌موو شێوه‌یه‌كیش پارچه‌پارچه‌و به‌ش به‌ش ده‌بن، له‌كاتێكدا له‌ سه‌رده‌می ئه‌و شاژنه‌ی، كه‌ به‌سه‌رهاته‌كه‌ی له‌ سوره‌تی

(النمل)دا هاتووه لەوپەڕی دەسڕۆیشتوویی و دەوڵەمەندییداو لە خێرو بێرێکی هەمەجۆریشدا بوون.

ئەمەش بەپێی گێڕانەوەکەی پەپوسلێمانکە بۆ (سولەیمان): ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةً تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ٢٣ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ... ٢٤ النمل﴾، بێگومان دوای ئەم گێڕانەوەیەش باسی بەسەرهاتی ئیسلام بوونی شاژنەکە هاتووه کە هاوکات لەگەڵ سولەیماندا ئەویش خۆی تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانییان کردووه.

لێرەشدا ڕووداوەکانی چیرۆکەکە لەدوای ئیسلام بوونی شاژنەکەو خۆ تەسلیمکردنی بەخواو ئایینی خوا، هاتوونە ئاراوەو ئەو کارەساتانەش دەگێڕێتەوە، کە بەهۆی بە سپلەدەرچوونیانو بەدکارییەکانیانەوەو سوپاس نەکردنی خوا لەسەر ئەو هەموو نیعمەتەی پێی دابوون بەسەریاندا هاتوون[1]".

---

١) سيد قطب: في ظلال القرآن/ ٥ : ٢٩٠٠ .

# فەرموودەیەکی صحیح لەسەر چیرۆکی (سەبەء)

له (ابن عباس)ەوه -خوایان لێ ڕازی بێ- گێڕراوەتەوه، کە پیاوێك دەربارەی (سەبەء) پرسیاری کردووه له پێغەمبەری خوا ﷺ که ئایا (سەبەء) پیاوێك بووه، یان خاکێك بووه؟ پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەیەوه فەرموویەتی: **((بَلْ هُوَ رَجُلٌ وَلَدَ عَشَرَةً فَسَكَنَ الْيَمَنَ مِنْهُمْ سِتَّةٌ وَبِالشَّامِ أَرْبَعَةٌ، فَأَمَّا الْيَمَنِيُّونَ فَمَذْحِجٌ وَكِنْدَةُ وَالأَزْدُ وَالأَشْعَرِيُّونَ وَأَنْمَارٌ وَحِمْيَرُ، وَأَمَّا الشَّامِيَّةُ: فَلَخْمٌ وَجُذَامُ وَعَامِلَةُ وَغَسَّانُ))**[1].

واته: (سەبەء)، پیاوێك بوو کە دە کوڕی بووه، شەشیان لە یەمەن نیشتەجێ بوون و چواریشیان لە شام، ئەوانەی لە یەمەن بوون: (مەذحیج)و (کینده)و (ئەزد)و (ئەشعەرییەکان)و (ئەنمار)و (حیمیەر) بوون، ئەوانەش کە لە شام بوون: (لەخەم) (جوذام)و (عامیله)و (غەسسان) بوون.

دەربارەی مانای ئەم فەرموودەیە[2]، (ابن کثیر) گوتوویەتی: "مانای ئەو ڕستەیەی نێو فەرموودەکە (ولد له عشرة من العرب) ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو دە کەسەن کە لە وەچەی خۆی بوون و، ڕەچەڵەکی هۆزە عەرەبەکانی یەمەن دەچێتەوە سەر ئەوان، بەڵام هەمو کوڕەکان لە پشتی خۆی نەبوون، بەڵکو هەندێکیان لە پشتی خۆیو هەندێکی تریشیان لە کوڕانی ئەو یان لە نەوەکانی تری بوون و لەنێوان ئەوان و (سەبەء) خۆیدا دوو پشت یان سێ پشت، یان کەمتر، یان زیاتر هەبووه.

---

١) رواه أحمد والطبراني والحاكم وقال عنه ابن كثير ان اسناده حسن. وقال أحمد شاكر في تحقيق احاديث ابن عباس في مسند أحمد: اسناده صحيح... بڕوانە مسند أحمد بتحقيق احمد شاكر (٤: ٣٢٢) حديث رقم (٢٩٠٠).

٢) ئەم فەرموودەیەی (ابن کثیر) لەسەری دواوه بەم شێوەیەیە: **((رَجُلٌ وَلَدَ لَهُ عَشَرَةً مِنَ الْعَرَبِ، فَتَيَامَنَ مِنْهُمْ سِتَّةٌ وَتَشَاءَمَ مِنْهُمْ أَرْبَعَةٌ))** رواه ابوداود. واته: پیاوێکە دە کوڕی عەرەبی هەبووه، شەشیان بەرەو یەمەن چوون و چواریان بەرەو شام چوون.

دەربارەی مانای ڕستەی (فتيامن منهم ستة وتشاءم منهم أربعة) واتە: لەدوای ئەوەی خوا لافاوە بەهێزەکەی ناردۆتە سەریانو، هەندێکیان لە ولاتەکەی خۆیان نیشتەجێ بوونو، هەندێکی تریشیان لەوێوە دەرچوون بۆ ولاتانی تر[1]".

## (سەبەء) بەڵگەیەکە

خوا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ ...﴾ (١٥) سبأ.

لەم فەرمایشتەدا وشەی (ءَايَةٌ) مانای بەڵگەو نیشانەیەکی دیارو، دەلالەتێکی ڕۆشنو، پەندێکی کاریگەر دەگەیەنێت، هۆکارو ڕووبەندی (بوون بە بەڵگەو ئایەتو بوون بە پەند)یشیان لەوەوە بووە کە بێگومان خوا نیعمەتو خێروبێرێکی فرەو زۆریی بەسەریاندا ڕژاندبوو، داوای خواپەرستیو شوکرانەبژێریی لێ کردبوون، بەڵام ئەوان سەرپێچییان کردو، بە سپڵەو بێباوەڕو ستەمکارو زۆردار دەرچوون. خواش سزای خۆی پێگەیاندنو، فەرمانی خۆی بەسەردا جێبەجێ کردنو، یاسای خۆی لەسەر پیادەکردنو، ئیدی هەموو نیعمەتو خێر وبێرێکیان لەناوچوو. بەم ڕەنگەش بوون بە نموونەیەکی کردەییو واقیعی بۆ هەرکەسێك کە لە فەرمانەکانی خوا هەڵگەڕێتەوەو نیعمەتەکانی خوا لەسەر ئاقارو ڕووبەندێکی تر بەکار بێنێت.

بێگومان قورئانی پیرۆز خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە- بەتایبەتی دەوڵەمەندو خواپێداوان- لەوەی کە نابێت ڕێبازی (سەبەء) بگرنە بەرو، نابێت وەك ئەوان بن، تاکو هەمان سزا کە بەوان گەیەنرا، بەمانیش نەگەیەنرێت. بەڕاستی لە گەلی (سەبەء)دا ئایەتو بەڵگەی خوا هەیە، بەڵام کێن ئەوانەی سوودی لێ دەبینن؟!

---

١) تفسير ابن كثير/ ٣: ٥٣٢ .

کێن ئەوانەی پەندو عیبرەتی لیٚ وەردەگرن؟ دیارە هەر باوەڕدارانی خاوەن هۆش‌و عەقڵن کە خاوەنانی دڵە زیندووەکانیان‌و تیڕوانینە ڕاست‌و دروستەکانن.

وەلێ کەسانی کۆیلەبووی ماڵ‌و سامان‌و هەواو ئارەزووبازی، هیچ پەندو عیبرەت‌و ئامۆژگارییەك لەو چیرۆك‌و ڕووداوانە وەرناگرن، چونکە ئەوان جۆرە دڵێکیان هەیە کە پێی تیٚناگەن‌و بیرناکەنەوەو، جۆرە چاوانێکیان هەیە، کە پیٚیان نابینن‌و جۆرە گویٚیەکیشیان هەیە، کە پێی نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵان وان‌و بگرە لە ئاژەڵانیش گومڕاترن، لەبەر ئەمە دەبینیت، ئا ئەوانە ئاوڕ لە ئایەت‌و بەڵگەو نیشانەکانی خوا نادەنەوە.. ئەی داخۆ چەند ئایەتی دیکەو چەندەها بەڵگەو نیشانەی ڕوون‌و ئاشکرای تر لە ئاسمان‌و زەویدا بەدیی بکەن‌و چاویان پێدا تێپەڕێنن‌و کەچی ڕویان لیٚ وەربگێڕن؟!

## نیعمەتەکانی خوا بۆ گەلی (سەبەء)

قورئانی پیرۆز بەدرێژیی باسی ئەو هەموو نیعمەت‌و بەخششە زۆرانەی نەکردووە، کە خوا بە گەلی سەبەئی دابوو، بەڵکو بە ڕستەیەکی کورت خستویێتییە ڕوو، کە خوا تیایدا فەرموویە: ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾ دوو باخی گەورەو پڕ میوەو خۆراکی هەمەجۆر لەلای ڕاست‌و لەلای چەپیانەوە.

ئەمەش یەك ڕستەیە، بەڵام ڕستەیەکی بیٚوێنەو موعجیزەدارو وێنەکێشە، کە وێنەیەکی هونەریی ئەو نیعمەتانە بۆ خوێنەر دەکێشێت‌و، سێبەری ڕادەو ڕێژەی زۆریی نیعمەتەکانیشی دەخاتە سەر، بەمەش ئاتاجی بەهیچ شیکارو لێکدانەوەیەکی درێژ نابێت. چونکە بێگومان نیعمەتە خواییەکان لە دوو باخی گەورەو پڕ بەروبوومدا ڕەنگی داوەتەوە، باخێکیان لەلای ڕاستیانەوەو، ئەوی تریش لەلای چەپیانەوە (عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ). ئەمەش هێمای بەپیتی‌و زۆریی بەروبووم‌و خۆشگوزەرانی‌و شت‌ومەکی جوانە.

ئیدی مرۆڤ لە دنیا لەوە زۆرتر چیی دەوێت، کە هەمیشە بەنێو باخانی پڕ لە بەروبوومو دەوڵەمەندی لای ڕاستو لای چەپی ناوچەکەیدا بگەڕێت؟!

لەم ئایەتەشدا هەڵبژاردنی وشەی (جنّة) بۆ باخەکان ئاماژەیە بۆ ئەو هەموو دەوڵەمەندیو تێرو تەسەریو نیعمەتی هەمەجۆرو بەروبوومە زۆرەی، کە خوا پێی بەخشیبوون. ئەمە بەهۆی ئەو ئاوەشەوە بو، کە خوا شارەزایی هەڵگرتنو بەندکردنو بەکارهێنانو پاوانکردنی ئەو ئاوەی پێدابوون، لە کاتێکدا کۆنترۆڵیان کردبووو ئەو دوو باخە پڕ لە خێرو بەرەکەتەیان پێ دروست کردبوو.

## باخی بێباوەڕان لە دنیادا بڕاوەو لەناوچووە

قورئانی پیرۆز بۆ گوزارشت لە نیعمەتەکانی بێباوەڕان لە دنیادا، زاراوەی (جنّة) یان (جنّتین) یان (جنّات)ی داناوە، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەو نیعمەتو خێرو خۆشی یەی، کە لە دنیادا تیایدا دەژین هەر ئەوە بە بەهەشتی خوازراوی خۆیان دادەنێن، ئیدی باوەڕ ناهێنن بە هەبونی بەهەشتێك، کە هاوتای بەهەشتەکەیانە، جگە لەوەی چەندان هێندەش فەزڵو بەرەکەتی هەیە. وەك تێبینیش دەکرێت قورئانی پیرۆز دوای باسی ئەو جۆرە باخو بەهەشتە دنیاییانەی کافرانو، دوای باسکردنی لەناوچوونی نیعمەتەکانیان، باسی وێران کردنی باخەکانیانو نەمانیشیان کردووە، کە لەسەر زەویدا نەهێڵراونەتەوە، وەك لەو چیرۆکانەی تردا چەند ئایەتێکیان لەسەر هاتووەو خوا ئاماژەی بۆ کردوون، بۆ نموونەش:

١/ ئەوەتا گەلی (سەبەء)، خوا نیعمەتێکی گەورەی پێدابوون، کە لە هەردوو لای ڕاستو چەپیانەوە بووو، هەموو نیعمەتو بەروبوومێکی خۆشیان لێ دەچنییەوە، بەڵام کاتێك سپڵەو پێنەزانو بێباوەڕ سو ستەمکار دەرچوونو، ڕوویان لە سوپاسگوزاریو خواپەرستی وەرگێڕا، خواش ئەو دوو باخە پڕ لە میوەو گەورەو فراوانەی بۆلەناوبردنو، بۆی گۆڕین بە دوو باخی پڕ دڕكو داڵو بەروبوومی تاڵو درەختی بێبەر، لەگەڵ چەند درەختێکی کەمی (سیدر).

٢/ ئەوەش خاوەنی هەردوو باخەکەیە، کە لە سورەتی (کهف)دا چیرۆکەکەی گێڕراوەتەوەو، کە خوا پێشتر دوو باخی لە ترێو دەورگیراو بە دارخورماو لەنێوانیشیاندا کشتوکاڵی پڕ لە خێرو بەرەکەت هەبوو، هەردوو باخەکەش بەروبوومی خۆیان هەبوو، هیچ کەموکورپییەکیشیان نەبوو، ئەمە جگە لەوەی رووبارێکیش بە نێوانیاندا ڕاکێشرابوو ﴿...جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا (٣٢) كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا (٣٣) الكهف﴾.

بەڵام دوای ئەوە چیی بەسەر هاتووە؟ بەهۆی کفرو بێباوەڕیی خاوەنی هەردوو باخەکەو بێباکیو بەخۆنازیینو لەخۆبایی بوونیەوە، بەروبوومو باخەکانی لەناو براوەو، کابرای خاونیشیان هەردوو دەستی بەیەکدا داوەو تووشی حەسرەتو پەژارەیەکی زۆربووە بەهۆی ئەوەی، کە دیوێتی هەردوو باخو ماڵو سامانەکەشی ڕووخاون بەسەر زەویداو کەپرو ساباتەکانیشی ڕووخاونو لەناوچوون" ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا (٤٢) الكهف﴾.

٣/ ئەوەش خاوەنانی باخەکە لە سوورەتی (قلم)دا: ﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ (١٧) وَلَا يَسْتَثْنُونَ (١٨) فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ (١٩) فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ (٢٠) القلم﴾.

٤/ ئەوەش گەلەکەی فیرعەون، کاتێك بەدەم بانگەشەو پروپاگەندەی فیرعەونەوە چووبوونو دژایەتیو بەربەرەکانیی (موسا)یان کردبوو، سڵاوی لێ بێ-و لە کاتێکدا بە (موسا) گەیشتنەوە، خوا لەگەڵ فیرعەوندا سەرنگوومی کردن، بەم پێیەش لە هەموو باخو باخاتو کانیاوێکی خۆیانی دەرپەڕاندنو لە هەموو

گەنجینەو ماڵو موڵكو پلەو پایەیەكیشی دابڕینو، بەمیرات گەیاندنی بە نەوەی ئیسرائیل" ﴿فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾﴾ الشعراء.

٥/ ئەوەش گەلەكەی (هود)ە، كە پێغەمبەرەكەیان وریای كردنەوە لە نەمانی باخو بێستانەكانیان" ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾﴾ الشعراء.

جا كاتێك بێباوەڕو سپڵەو ستەمكار دەرچوون، خواش لەناوی بردوونو هەموو باخو بێستانو كانیاوەكانیشیان لەناوبردووە.

٦/ ئەوەش (صالح) -سەلامی لێ بێت-، كە هەمان وریاكردنەوەی بۆ گەلی (سەمود) ئاڕاستە كردووە: ﴿أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾﴾ الشعراء.

٧/ هەروەها قورئان گشت كەسێك لەوانەی بێباوەڕو سپڵەو ستەمكار دەردەچنو، نیعمەتەكانی خوا لەبواری خراپەكاریدا بەكار دێنن، ئاگاداركردۆتەوە، كە ئایا حەزدەكەن هەر یەكێك لە ئێوە باخێكی لەناوچێتو بسوتێت؟ ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾﴾ البقرة.

بێگومان هەموو باخو بەهەشتو سامانێكی كافران لە دنیادا بەرەو وێران بوون بڕانەوە دەچێت، ئەمەش سوننەتو یاسای جێگیری خوایە.

## (کـلوا واشـکروا)

هەر لەو چیرۆکەدا خوا فەرمویە: ﴿كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ﴾ واتە: لـە ڕزقی خوای پەروەردگارتان بخۆنو سوپاسی بکەن.. ئەم فەرمانەش لە ئەنجامی ئـەو نیعمەتانەدایە کە خوا پێی بەخشیبوونو لە ئەنجامی خواردنی هەر بەرهەمێکدایـە لە بەرهەمەکانی هەردوو باخەکە. خواردنیش ئەو مەبەستەیە کە لە پێناویدا بـاخو بێستانەکان دروست کراونو درەختو کشتوکاڵی تری بـۆ ڕوێنـراون. لەکاتێکیـشدا سەرنج لە هەردوو فەرمانە داخوازییەکەی (كُلُوا۟)و (وَٱشْكُرُوا۟) دەدەیـن، هەنـدێك سروشو ئاماژەیان تیادا بەدیی دەکەین، وەك:

١- فەرمانی داخوازیی تایبەت بە خواردن (كُلُوا۟) بۆ ڕێپێدانە، نەك بـۆ پێویـست کردنو بە فەرز دانان.

٢- ئامرازی (مـن) کە لەدوای (كُلُوا۟) هاتووە، بۆ هێندکردن (تبعـیض)ە، بـەمانای هەندێك لـە ڕزقـی خواتـان بخـۆن، لەوانەیـە لەمـەدا ئاماژەیـەك هـەبێت بـۆ کەمکردنەوەی خواردنو، تەنها هەندێکی لێ بخورێت، نـەك هـەمووی، چـونکە مەبەست لە خواردن، پڕکردنەوەی پێویستییەکانی جەستەیە. مرۆڤیش بۆ ئـەوە دەخوات تاکو دەگاتە ڕادەی قەناعەت نەك پڕکردنو سك هەڵاوسان.

٣- خستنەپاڵی ڕزق بۆ لای خوا مانایەکی باوەڕداریو پـەروەردیاریی هەیـە، ئـەم خستنە پاڵەش بۆ تایبەتکارییە، چونکە ڕزق تەنها لەلایەن خوا خۆیەوەیـەتیو، ناشێت کە بدرێتە پاڵ غەیری خوا تـەنها لـە دەروازەی بـەهۆدانان (سـببیە)ەوە نەبێت، ئەوەش بە پێودانگەی کـە هۆیـەکی ماددیانەیـە بـۆی، دەنـا هۆکـاری ڕزقدەر تەنها خوایە.

٤- هەڵبژاردنی وشەی پەروەردگار (الرّب) لەو جێگایەدا بۆ مەبەستێکەو، ئەوەیـە

هەر خوا خۆی پەروەردیارو پێگەیەنەرو بەخێوکارەو، بەندەو کۆیلەکانیش بە نیعمەت بەخێو دەکاتو، ئەو هەموو نیعمەتو خۆراکەیان بۆیە پێ دەبەخشێت تاکو بیپەرستنو سوپاسی بکەن.

٥- بەستنەوەی (فەرمانی سوپاسکردن) بە (فەرمانی خواردن) بەو پێودانگەیە کە سوپاسکردنی خوا بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی خواردنی ڕزقەکەیو، بەرەنجامێکی ئەو خواردنەشەو، مەرجێکیشە بۆ سوودوەرگرتن لە خواردنەکەو، بەردەوامیی ئەو ڕزقو ڕۆزی یەشە. تەنانەت با بڵێین: بێگومان سوپاسکردنی خوا نرخێکی ئەو خواردنەیەو خواش دەیەوێت کە بخۆرەکە نرخی خۆراکەکە بدات، نرخەکەشی ئەو سوپاسگوزارییەیەتی بۆ خوا لەسەر نیعمەتەکانی.

٦- بێگومان سوپاسکردنی خوای ڕۆزیدەرو نیعمەت بەخش بەڵگەیەکە لەسەر نەریتەکانی چاکەخوازیو باشیو باوەڕداریتیی مرۆڤی خاوەن باوەڕ، هەروەك بەڵگەیەکیشە لەسەر چاوتێریو دڵفراوانیو دەسڕۆیشتوویيو بەخشندەیی. جا ئەگەر مرۆڤ سوپاسی ئەو خوای پەروەردگارو نیعمەت بەخشەی لەسەر ڕزقو ڕۆزییەکەی نەکات، ئەوە دیارە بەڵگەیەکە لەسەر چاوچنۆکیو پیسکەییو لەبیرچوونی نیعمەتەکانی خواو یاخی بونیو گومڕابوونی.

٧- هەر لە ڕستەی بەستنەوەی (سوپاس) بە (خواردن)ەوە، ئاماژەیەکی دی هەیە، ئەوەیە بێگومان سوپاسکردنی خوای خاوەن نیعمەت هۆیەکە بۆ بەردەوامیی ڕزقو زیادبوونیشیو، بەهرەمەند بوون بە خواردنیان، وەك لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ إبراهيم﴾، واتە: خوای پەروەردگارتان بڕیاری داوەو پێی ڕاگەیاندوون کە ئەگەر سوپاسی بکەن لەسەر ڕزقو نیعمەتەکان، ئەوا بۆتان زۆرترو زیاتر دەکەم، خۆ ئەگەر سپڵەو پێنەزان بن، ئەوە بێگومان سزای من زۆر توندوتیژە.

سوپاس نەكردنی خواش هۆیەكی نەمانی نیعمەتو، بڕانی ڕزقو ڕۆزیو، بێبەش بوون لە خۆراك، وەك چۆن بەسەر گەلی (سەبەء)دا هات. وەك زانراویشە بێگومان سوپاسكردنی خوا تەنها بە زمان نابێت، بەڵكو بە هەموو قەوارەی هۆشو ماددی مرۆڤەوە، واتە بە زمانیشو بە دڵو بە عەقڵو سەرجەم ئەندامەكانی جەستە. پاشان دەبێت سوپاسگوزارییەكی كردەیی(عملی)ش بێت، كە تێیدا ئەو نیعمەتانە لە بواری گوێڕایەڵی كردنی خواو سوودی بەندەكانیدا بەكاربهێنرێت.

٨- تێپەڕاندنی (سوپاس)ەكە بە پیتی(لام)، لە فەرمایشتی خوادا (وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓ)، كە نەیفەرمووە (واشكروه) لەبەر ئەوەیە، كە پیتی (لام) لێرەداو لەرووی زمانەوانی یەوە (لام)ی بەهێزكردن (لام التقویه)یە، چونكە گەیشتنی (فعل)ەكەی بۆ (مفعول بە) بەهێزكردووەو، ئاوەڵناو(ضمیر)ەكەش لە جوابەوەیەتیو بە (لفظ) (مجرور)ەو لە (محل)ی خۆیشیدا (منصوب)ە.

هەروەها دەشێت ئەم پیتی (لام)ە بە (لام- ی اخلاص)یش ناو ببرێت، بە مانای سوپاسكردنەكە تەنها بۆ خوا دەبێتو، مرۆڤی سوپاسگوزاریش بە سوپاسەكەی تەنها بۆخوا ساغو خاوێنو دڵسۆزە.

دیسان دەشێت ئەم (لام)ە بە (لام- ی استعانه)ش ناوببرێت، چونكە مرۆڤی سوپاسگوزار لە دەرووی ڕزقو نیعمەتەكانی خواوە لەسەریی، سوپاسی خوا دەكاتو، ئەو ڕزقەش لە گوێڕایەڵی كردنی خوادا بەكار دەهێنێتو بەم پێیەش داوای كۆمەكو پشتیوانی خوا دەكاتو پەنا دەباتە بەر خوا.

زۆربەی فەرمانەكانی سوپاسگوزاری (أفعال الشكر) لە قورئاندا بە (لام) تێدەپەڕێنرێت، وەك (لام التقویة)و (لام الإستعانة)و (لام الإخلاص)، خواش هەر خۆی زانایە.

## " فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا "

خوا فەرمانی بە گەلی (سەبەء) کردوە، کە لە ڕزق‌و ڕۆزییەکەی بخۆن، هەروەك فەرمانی ئەوەشی پێ‌کردوون کە سوپاسی بکەن، لە هەمان کاتدا ئاماژەی بۆ ئەو شارو ولاتە خۆشەشیان کردوە، کە لەگەڵ ئەوەشدا خوایەکی میهرەبان‌و لێبوردەیان هەیە، وەك دەفەرموێت: (بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ وَرَبٌّ غَفُورٞ)، ڕیشەی وشەی (طیب) وەك پێشەوا (راغب) دەڵێت: "ئەوەیە کە ئەندامە هەستەوەرەکانی مرۆڤ چێژی لێ‌دەبینن‌و، دەروونیش چێژو تامی خۆی لێوە دەست دەکەوێت. لە شەرعیشدا خواردنی چاك‌و خۆش (الطعام الطیب) ئەوەیە کە لە ڕووی شیابوونیەوەو بەگوێرەی ڕادەی شیابوونی‌و، لەو شوێنەشیەوە کە لێوەی دەشێت، بەکاردێنرێت‌و دەخورێت. لەبەر ئەوە هەرکاتێك لەو ڕووانەوە شیاو بوو ئەوا بە خۆراکێکی خۆش‌و چاك دادەنرێت‌و زوو بێت یان درەنگ نیگەرانیی لەسەر دروست ناکرێت‌و قێزی لێ ناکرێتەوە، بەڵام ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتی‌و بە پەلە سازکرابێت ئەوە هەر لەو ماوە دیاریکراوەی خۆیدا چاك‌و خۆشەو، دوای ئەو ماوەیە گۆڕانی بەسەردا دێت‌و بە خۆشی (طیب) نامێنێتەوە[1]".

بەڵام گەلی (سەبەء) لەئاست ئەو فەرمانانەدا چییان کردو چۆن هەڵسوکەوتیان بە نیعمەتەکانی خواوە کرد؟ بێگومان ڕوویان وەرچەرخاند ( فَأَعۡرَضُواْ ) بە مانای بێ‌باوەڕو سپڵە دەرچوون‌و، خواپەرستی‌و سوپاسگوزارییان بۆ خوا ڕەت کردەوەو، گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خوایان نەکرد، بەڵکو ڕێبازی هەوەس پەرستی‌و هەواو ئارەزوویان هەڵبژاردو، دوای شەیتان کەوتن‌و، نیعمەتەکانی خوایان لە سەرپێچی کردن‌و یاخی بووندا بەکارهێنا. بەم ڕەنگەش ڕێساو سوننەتی خوایان لەسەر

---

١) مفردات-ی راغب/ ص٣٠٨ .

شایسته بوو، چونکه هەر نەتەوەیەك باوەڕ بەخوا نەهێنێت‌و سپڵەو پێنەزان بێت‌و، نیعمەتەکانی خوا له کفرو فەسادیدا بەکار بێنن، ئەوا سزای خوایان تووش دەبێت‌و، نیعمەتەکانیان لێ‌دەسێنرێتەوەو، کارەساتی تیاچوون‌و نەمانیشیان بەسەردا دێنێت.

ئەوانیش هەرزوو سزای خوا ڕووی تێ‌کردن، وەك له پیتی (ف)ی سەرەتای ڕستەکەدا ئاماژەی بۆ دەکات (فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ). ئەم پیتی (فاء)ەش بۆ ڕێکخستنی دیمەنەکانه لەگەڵ بەدواداچوونی خێرادا.

بێگومان هەر لەم ڕستەیەی ( فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ )دا ڕێسایەکی هەمیشەیی خوایی هەیه که هەرگیز جیاوازی‌و ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت‌و، حوکمی هەموو گرۆی بەشەریەتیشی پێ دەکات له هەر شوێن‌و وڵاتێك بن. بێگومان ڕوو وەرگێڕان له شەرع‌و دینی خوادا، سزاو تۆڵەی خوای بەدوادا دێت، ئەو ڕوو وەرگێڕانەش ڕێگای لەناوچوون‌و وێران بوونه.

هەر له قورئانی پیرۆزدا چەندەها ئایەتی تر لەسەر ئەو سوننەت‌و ڕێسا خوایی یه هەیەو لێرەدا دیاریکردنی تاکه نموونەیەك لەو ئایەتانه بەسه، که بیکەینه بەڵگە، که خوا تیایدا دەفەرموێت: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا قَرۡيَةٗ كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا مِّن كُلِّ مَكَانٖ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١١٢﴾ النحل ﴾.

واته: خوا نموونەیەکی دەربارەی ناوچەیەکی ئاوەدانیی هێمن‌و ئارام هێناوەتەوە، ئەم ناوچەیه لەکاتی هێمنی‌و ئارامیدا ڕزق‌و ڕۆزیی زۆرو بەرفراوانیان پێ‌درابوو له هەموو لایەکەوه پێیان دەگەیشت، بەڵام ئەوان سوپاسی خوایان نەکردو شوکرانەبژێری خوا نەبوون، بەڵکو کافرو سپڵه دەرچوون، خواش بەرگی برسێتی‌و ترس‌و بێ‌ئارامیی پێ لەبەرکردن، ئەمەش بەهۆی کفرو بەدکاری‌و کردەوه نابەجێکانیانەوە.

## ئامرازی لەناوبردنی گەلی (سەبەء)
## بە نیعمەتێکی پێدراویان بوو (بە لافاوی بەنداوەکە)

خوا گەلی (سەبەء)ی بە ئاوەکە لەناوبرد (فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ). لەم ڕستەیەشدا (سَيْلَ الْعَرِمِ) بەنداوی (مەئرەب)ە کە ئاوەکەی تێدا کۆبووبۆوەو ببوە بەربەستێك بۆ خۆیان. بەڵام خوا کونی کردە ئەو بەنداوەو، ئاوەکەشی بە لافاوێکی توندوتیژو ماڵ کاولکارەوە ناردە سەریان کە هەموو باخ‌و بێستانەکانیانی داپۆشی‌و ژێراوژێری کردو بۆی لەناوبردن.

سەبارەت بە مانای وشەی (العرم)، (راغب) گوتوویەتی: "لە چاوگی (العرامة)وەیەو وشەی (عرامة)ش مانای توندی‌و دڕندەیی‌و ئاڵۆزیی لە ئاکاردا دەگەیەنێت‌و، لە کرداریشدا دەردەکەوێت. بۆ نموونە دەگوترێت: (عرم فلان، فلان عارم) بە (عرم)ەش واتە بەوە ئاکارو ڕەوشتی وەرگرتووە. فەرمایشتی خواش (سَيْلَ الْعَرِمِ) بە مانای ویستوویەتی‌و ئیرادەی خوا وابووە کارێکی توندوتیژو ئازاربەخشیان بەسەردا بێنێت[1]".

مرۆڤی باوەڕداری چاوڕۆشنیش لایەنێك لە ئایەت‌و بەڵگەکانی خوا لەڕووی لەناوبردنیاندا بەدیی دەکات، ئەوەیە کە خوا ئەوانی بە (ئاو)و (بەنداو)و (لافاو)ی بەهێز لەناوبردوە. بێگومان خوا نیعمەتێکی گەورەی وەك (ئاو)ی پێدابوون‌و کردبووشی بە ئامرازێك بۆ خۆشگوزەرانی‌و چاندن‌و پیت‌و بەرەکەت‌و پێشکەوتن‌و گەشەکردنیان، هەروەها ڕێنموونیشی کردبوون کە بە شارەزایی ئاوەکە بەکاربێنن‌و هەڵسوکەوتی پێوە بکەن، لە بەرامبەر ئەوەشدا داوای لێکردبوون سوپاسی بکەن.

---

١) المفردات/ ٣٣٢ .

بەڵام ئەوان کاتێك بەدەم ئەو داوایەوە نەچوونو ڕوویان لێ وەرگێڕا، خواش نیعمەتەکەی بۆ گۆڕین بە نیقمەتو خێرو بێریشیانی گۆڕی بە شەڕو ئازار.

بێگومان فەرمانەکەی خوا وەك خۆی مایەوەو نەگۆڕا، بەڵام کارایی و شوێنەواری تیایاندا گۆڕا، چونکە خوا ویستی وابوو کە بۆ لایەنێکی دیکەی بگۆڕێت، ئەمەش لە ئاکامی لە ستەمدا ڕۆچوونیانو بێباوەڕبوونیان.

بەڕاستی (ئاوەکە) نیعمەتێك بووە بۆیانو، باخو دارستانو کێڵگەکانیان پێ بنیات ناوەو، لە پشت بەنداوەکەشەوە بەندیان کردووەو هەڵیان گرتووەو، هەر بەو ئاوەش کامەرانو بەختەوەر ژیاون. هەمدیسان (ئاوەکە) خۆی، خوا کردبووی بە نیعمەتو بە سزاش، ئەوەبوو ئاوی نێو بەنداوەکەی بە لافاوێکی توندو بەگوڕەوە نارده سەریان، هەر بەم ئاوەش باخەکانیانی وێران کردو، هەموو کشتوکاڵو بەرهەمە چێنراوەکانیشیانی تەفروتوونا کرد.

ئەمەش لە ئایەتو بەڵگەو نیشانەکانی خوایە، کە بە ئاو باخو بێستانی خۆیان دامەزراندووەو پاشان هەر بە ئاوەکە ئەو باخانە وێران بوون، هەر بە ئاوەکەش پێشتر بە دەوڵەمەندیو بەختەوەریی ژیاونو، هەر بەو ئاوەش دواتر سەرشۆڕو ڕیسواو هەژار بوون.

پاشان بۆ ئەوەی ئەمە ببێتە وانەیەك بۆ نەتەوەکی دی، کە خوا نیعمەتی پێداون تاکو خوا بپەرستنو سوپاسی بکەنو، هەر لەسەر ئەو نیعمەتانەش بمێننەوە، دەنا بە پێچەوانەوە هەمان ئەو نیعمەتانەیان لێ دەبێتە نیقمەت.

ئەی داخۆ چەند کەسی دی هەبن لەوانەی بەهۆی کفرو فەسادییانەوە نیعمەتیان لێ دەبێتە نیقمەت؟ ئەی چەند نەتەوەش هەیە، کە بەهۆی نیعمەتەوە هیوای بەختەوەرییان بۆ دەخوازرا، کەچی لێیان بوو بە نقمەتو بەدبەخت بوون بەهۆی بەکاریی خۆیانەوە.

خـــواش ڕاســـتی فـــەرمووە: ﴿فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ۝٥٥﴾ التوبة.

واتە: سەرسام مەبە بە ماڵو سامانی کـافرانو بـە کوڕوکاڵیـانو بـە کـارێکی باشو گرنگی مەزانە بۆیان لە ژیـانی دنیـادا، چـونکە خـوا دەیـەوێت هـەر بـەو دیاردەی ماڵو سامانو کوڕو منداڵانە لە ژیانی دنیادا سزایان بدات.. بـۆ ئـەوەش کە گیانی بە کافریو حاڵەتی بێبڕواییەوە لەسەریان دەرچێتو بەو حاڵەتەوە بمرن.

## جـێگـرەوەی تـــاڵ

دوای ئەوەی خوا لافاوە بەهێزەکەی ئاوی بەنداوەکەی بۆ (سەبەء) ناردو هـەردو باخە گەورەکەی بۆ لەناوبردن، لە قورئان دا ئاماژەی بۆ جێگرەوەیەکی تاڵ (البدیل المر) کردوە، کە جێگـەی ئـەو دوو باخـە خـۆشو گەورەیـەی بـۆ گرتوونـەوە، وەك فەرموویـــــە: ﴿وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَيۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ﴾ بەمانای ئەو دوو باخە خۆشەی پێشوو، وەك دوو باخ - لە ڕواڵەتـدا نـەك بەڕاستی- مابوونـەوە، بـەڵام دارو درەخـتو بەروبوومـەکانیان نـەمابوونو، خـوا لەجێی ئەوانەدا چەند دارو درەختێکی تاڵو دڕکاویی بیابانیی تێدا ڕوانـدبوو، کـە لاوازو وشكو بێکەڵك بوون، تەنانەت چەندەها درەختیان تێـدا بـوو کـە هـەمووی یەك پارچە دڕك بووو بەروبوومەکەشی هێجگار تاڵو شێواوو بۆگەن بوو.

(راغب) لەبارەی مانای (خمط)ەوە گوتوویەتی: "وەختێك کەسێك توورە دەبێت، دەڵێت: (تخمطّ) یان کە دەگوترێت (تخمط الفحل) بە مانـای (هـدر) واتـە بەفیـــڕۆ چوو[1]".

---

١) المفردات/ ص١٥٩.

ئەمەش مانایەکی نایابە، واتە وەك ئەوە وایە کە ئەو درەختە جێگرەوە تازەیە، لە گەلی (سەبەء) تووڕە بووبێت بەهۆی بێباوەڕیو ستەمکارییانەوەو، خۆراکێکی نالەبارو بێکەڵكو تاڵو شێواوی بۆ بەرهەم هێنابن.. یان واتە وەك ئەوەش وایە کە درەختەکان لە خەڵکانی بێباوەڕ زویر بووبنو ڕقیان لێ یان هەستابێتو ئەو خۆراکەی کە شایستەی ئەوانە-واتە خۆراکی خراپو نالەبار-یان بۆ بەرهەم بێنن.

یەکێك لەو درەختانەش (أثـل) بوو، کە درەختێکی بیابانییەو ناوی (طرفاء)ەو زوو گڕ دەگرێتو، هەرکاتێك ئاگری لێ نزیك بێتەوە دەسووتێت تەنانەت گەر سەوزو تەڕیش بێت.

سەبارەت بە مانای ئەم درەختەش، پێشەوا (راغب) گوتوویەتی: "(أثـل).. درەختێکی ڕەگ داکوتاوی جێگیرەو لەشوێنی خۆیدا بەهۆی جێگیربوونیەوە وەستاوە[1]".

یەکێکی دی لە درەختە جێگرەوەکانیان کە لە ئایەتەکەدا ناوی هاتووە، درەختی (سیدر)ە کە بەرهەمی کەمەو هیچ شتێك تێر ناکاتو، بچووکیشەو بەشی هیچ ناکات، هەر ئەم درەختەشە کە ناوی (نَبق)ی لێنراوە. سەبارەت بە مانای ئەم جۆرە درەختەی تریش پێشەوا (راغب) گوتویەتی: "(سیدر)، درەختێکە لەکاتی خواردنیدا برسێتی لانابات[2]".

ئەمانە بوو ئەو جێگرەوەیەی کە لە جیاتی هەردوو باخە گەورەو خۆشو پڕ لە میوەکەیان دەستیان کەوت، بەڕاستی جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەو خێرو خۆشیو نیعمەتەی تێیدا بوونو، لەنێوان ئەو حاڵەتی نەگبەتیو سزاو هەژاری یەی کە تێی کەوتن.

---

١) المفردات/ ص١٠.
٢) المفردات/ ص٢٢٧.

پێشەوا (ابن كثیر) لەمبارەیەوە گوتوویەتی: "ئەمەبوو ئەو ئاكامەی، كە ئەو دوو باخە گەورەیەی تێكەوت، لەدوای بەروبومی تەڕو پێگەیشتووو، لەدوای دیمەنە جوانو دڵ ڕفێنەكانیانو، لەدوای سێبەرە گەورەو قووڵەكانیانو، لەدوای ڕووبارە پێدارِۆشتووەكانیان، گۆڕان بۆ دارودرەختی بیابانیو وشكو بێبەرو سیدرو درەختە پڕ دڕكو داڵەكانو كەم بەروبوومەكان"[1].

مامۆستای پێشەواش (سید قطب) لەمبارەیەوە گوتوویەتی: "ئەوان ڕوویان لە شوكرانەبژێرییو سوپاسكردنی خوا وەرگێڕاو، ڕوویان لە كاری چاكو هەڵسوكەوتی جوان بەو نیعمەتانەی خواوە، وەرگێڕا. ئەمەش بووە هۆی لەدەستچوونی ئەو یانە خۆشو نایابەیان كە تێیدا بوون، خواش ئەو ئاوە بەندكراوە توندەی بۆ بەردانەوە، كە لەگەڵ خۆیدا بەردیش (العرم)ی دەبرد، بەهۆی توندیی دەرچوونو فیچقەكردنییەوە، ئیدی بەربەستەكەی شكاندو ئاوەكە تەقیو دەرپەڕیو سەرتاپای باخەكانی گرتەوەو ڕایماڵینو سەرنگومی كردن. پاشان دوای ئەوە ئاوێكی ئەوتۆیان بۆ نەمایەوە كە هەڵیبگرن، هەربۆیەش باخەكانیان وشك بوونو سووتانو، ئەو بەهەشتە خۆشو سێبەرییە، بوو بەو بیابانەی، كە چەند درەختێكی وشكی ڕەقنی تیادا پەیدا ببوو"[2].

---

١) تفسیر ابن كثیر/ ٣: ٥٣٣.

٢) فی ظلال/٥: ٢٩٠١ .

## سزادانیان بەهۆی ستەمکاری و بێباوەڕییانەوە بووە

سەبارەت بە کەلاوەکانی بەنداوی (مەئرەب) ئاسەواری وێرانکاری و لەنێوچونەکە، قورئانی پیرۆز تیشکی خستۆتە سەر کارەساتەکەو، حیکمەتی ئەو ڕووداوەی بەسەر گەلی (سەبەء)دا هاتووە بەم ڕستەیە ڕوون کردۆتەوە، کە خوا تێیدا دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا ﴾، ڕستەی (جَزَيْنَاهُم) لە (جزاء)ەوەیە، لەمبارەیەوە ئیمام (راغب) گوتویەتی: "(الجزاء) واتە (الغناء والكفاية)، هەروەها (ما فيه الكفاية، من المقابلة) بە مانای: (جزاء) لە هاوتایی و بەس بوونەوەیە، ئەوەی کە پڕ بە پێستی خۆیەتی، هەروەها لە بەرابەرکاری (مقابله)وەیە. (ان خيرا فخير، وان شرا فشر) ئەگەر کاری خێری کرد ئەوا جەزاو پاداشتی خێری لەبەرامبەردا دەدرێتەوەو، ئەگەر کاری خراپەی کرد ئەوا جەزاو پاداشتی خراپەی لە بەرامبەردا دەدرێتەوە.. بۆ نمونە دەگوترێت (جزيته كذا، وجزيته بكذا) پاداشتم ئاوا دایەوە، یان پاداشتم بەوە دایەوە.. خواش فەرموویەتی: ﴿ وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَىٰ ... (٨٨) الكهف ﴾. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ... (٤٠) الشورى ﴾. دەشگوترێت (جزيته بكذا)و (جازيته بكذا) کە هەمان مانای پێشوویان هەیە. بەڵام لە قورئاندا تەنها وشەی (جزى) هاتووە لەجیاتی (جازى)، چونکە (جازى) چاکەکەی (مجازاة)ە، مانای (مكافأة/ خەڵاتکردن) دەگەیەنێت. ئەمەش بەرابەرکارییە لە هەرتاکە پیاوێك لە دوو پیاودا. خەڵاتکردنیش بەرابەرکردنی نیعمەتێکە بە هاوتای خۆی، واتە (هاوتا/كفؤ)یەتی.

نیعمەتی خواش لەوەوە نیە، لەبەر ئەمە وشەی (مكافأة) بۆ کاری خوا

دانانرێت[1]".

لەم چیرۆکەشدا وشەی (جزاء/ لە جزیناهم)دا مانای (عقاب/ سزادان) دەگەیەنێت، بە مانای (عاقبناهم ببغیهم/ بە ستەمی خۆیان سزامان دان)). لەو فەرمایشتەی خواشدا (بما کفروا) پیتی (ب) بە (باء السببیة/ بائی هۆداری) دادەنرێت، واتە بەهۆی ستەمو بێباوەڕبوونیانەوە سزامان دانو جەزامان دانەوە.

وەك زانراویشە (وشەکانی دوای (بای )سببی هۆکاری بەدیی هاتنی حاڵەتی پێش خۆیانن، یان ئەوەی لەدوایەوە دێت ڕێگاو دەربازێکە بۆ ڕوودانی کارەساتی پێش خۆیان. خوای مەزن دەربارەی حاڵەتی کافران لە ئاگری دۆزەخدا فەرمویەتی:
﴿لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابٗا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمٗا
وَغَسَّاقٗا ﴿٢٥﴾ جَزَآءٗ وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا
﴿٢٨﴾ النبأ﴾، واتە: بێگومان دۆزەخ چاوەڕوانی بێباوەڕانەو جێی ئەو کەسانەیە کە لە دنیادا سەرکێشو ستەمکار بوون، ئەوان هەزاران ساڵ لە دۆزەخدا دەمێننەوەو هیچ فێنکیو حەسانەوەیەكو هیچ شتێکی خواردنەوەی وایان دەست ناکەوێت کە تینوێتییان بشکێنێت. ئەمەش لە هەمبەر کردەوە نالەبارەکانیان دا کە ئاوا سزا دەدرێن. ئەوان لە ژیانی دنیادا بە تەمای لێپرسینەوە نەبوونو وایان دەزانی لێ یان ناپرسرێتەوە، هەر بۆیەش بەڵگەو ئایەتو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانیو بەو شێوازە بەدرۆیان دەخستەوە.

بێگومان قورئانیش هۆی ئەو ڕووداوەی کە بەسەر گەلی (سەبەء)دا هاتووە، لێکداوەتەوەو حیکمەتەکەیشی ڕوون کردۆتەوەو، لەمەشدا قورئان سوورە لەسەر دیاریکردنی یاسای دادگەریی لە کردارەکانی خواداو، دەرخستنیشی لەبەرچاوی

---

١) المفردات/٩٣ .

خەڵکدا، تاکو شەیتان خورپەو وەسوەسەیەکی وایان لەدڵدا دروست نەکات بەوەی گوایە گومانێکی ستەمکاری لەسەر خوای پاكو بێگەردو دادپەروەر لەلایان دروست بکات. لەبەر ئەوە قورئان بەچاکی ڕوونی دەکاتەوە کە خوا بۆیە گەلی (سەبەء)ی سزاداوە بەهۆی ستەمکاریی خۆیانەوەو لە ئاکامی بێباوەڕیو پێنەزانینان بە نیعمەتی خواوە. سزاش (الجزاء) لە ڕەگەزی کارەکە (جنس العمل)ە، کارەساتەکانیش بەسەر زۆردارو ستەمکاراندا دێت.

لە ڕستەی (جزيناهم ببغيهم)دا پیتی هۆکاریی (الباء السببية) ئاماژە بۆ ڕێسایەکی بڕندە (قاطع)ی خوایی دەکات، ڕێساکەش ئەوەیە" (هەرکەسێك کارێکی چاك، یان خراپ بکات، ئەوا لە دوای کارەکەوە خواش پاداش (جزاء)ی چاك بە چاکەو، خراپیش بە خراپەکەی دەداتەوە، چونکە پاداشت دانەوە لە ڕەگەزی کارو کردارەکەیە.

## " وَهَلْ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ "

قورئانی پیرۆز لەکاتی باس کردنو تیشك خستنە سەر ئەو کارەساتەی بەسەر گەلی (سەبەء)دا هاتووە، پرسیارێکی بەدوادا کردووە کە خوا تێیدا دەفەرموێت: ﴿وَهَلْ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴾ ئایا ئێمە پاداشتی کافرو بێباوەڕان نادەینەوە؟

لێرەدا پرسیارکردنەکە بۆ دان پێدانانو سەلماندنە کە خوا بە دڵنیاییەوە دەیسەلمێنێت کە تەنها پاداشتی خراپی کافران دەداتەوە..

مانای (نجازي) کە لە چاوگەی (مجازاة)ەوەیە لێرەدا مانای (معاقبة)و (تعذیب)/ (سزادان)و (ئەشکەنجەدان) دەگەیەنێت، چونکە سزاو ئازاری خوا تەنها بە (کافر)ی (کفور) دەگات، (واتە بەبێ باوەڕی سپڵەو خاوەن کرداری بێباوەڕانە دەگات).

بەڵام (مرۆڤی باوەڕداری سوپاسگوزارو گوێڕایەڵی فەرمانی خوا) لە سزاو ئازار بەدوورو پارێزراوە. ئیمام راغب سەبارەت بە جیاوازیی لەنێوان زاراوەکانی (کفر)و (کفران)و (کفور) دەڵێت: "(کفر) لە ڕاستیدا، واتە شاردنەوەو داپۆشینی شتێك، (کفر النعمة وکفرانها)ش کە پێنەزانینی نیعمەتو نکوولّی لێکردنی دەگەیەنێت، ئەوەیە شتەکە بەو ڕەنگە داپۆشرێت، کە سوپاسی لەسەر نەکرێت. گەورەترین حاڵەتی (کفر)یش نکوولّی کردنە لە یەکیەتی (وحدانیە)ی خوادا، یان بە شەریعەتەکەیدا، یان بە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەردا ﷺ.. سەبارەت بە نکوولّی نیعمەتیش زۆرترین وشە، کە لە عەرەبیدا بۆی بەکاردێت، وشەی (کفران) (کوفران). لە (دین)یشدا (کفر) زۆر بەکاردێت، وشەی (کفور)یش بۆ هەمو حاڵەتەکان بەکاردێت[1]".

---

١) المفردات: ٤٣٣-٤٣٤ بە کورتی .

ئەمە لە ڕووی چاوگی وشەکەوە، بەڵام لە ڕووی ئەو وشە داتاشراوو داڕێژراوانەیەوە کە لایەوە پەیدا بون، ئیمام ڕاغب لە ڕووی شێوازی هاتنیانەوە لە قورئاندا، جیاوازیی لە نێوانیاندا کردوە، لەم ڕووەشەوە گوتوویەتی: "(کافر) بە بارە ڕەهاکەیدا ئەوەیە، کە لەلای خەڵکی زانراوەو ئەو کەسەیە، کە نکوولّی لە خواناسینو خوا بەیەك گرتن بکات، یان لە پێغەمبەرایەتییان لە شەریعەتو ئایینی خوا یاخود لە هەرسێکیان پێکەوە.

(کفور)یش ئەو کەسەیە، کە زۆر زۆر لە سپڵەییو پێنەزانینی نیعمەتدا ڕۆچووە. لە فەرمایشتی خواشدا: ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا ۖ وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾﴾؟ ئەگەر لەم فەرمایشتەشدا پرسیار بکرێتو بگوترێت: چۆن مرۆڤ بە (کفور) وەسف کراوەو خواش تەنها بەوە دابین بووە، کە (ئەلفو لام)یشی بۆ دڵنیاییو چەسپاندن لەسەر وشەکە داناوە؟

وەڵام/ بێگومان ئەمە ئاگادارکردنەوەو بەبیرهێنانەوەیەکە لەسەر ئەو حاڵەتی (بە نیعمەت نەزانین)ەی، کە مرۆڤ دوچاری دەبێت لەگەڵ حاڵەتی کەمیی ڕاپەڕاندنی فەرمانی سوپاسگوزاری، هەر بۆیەش لەجێیەکی تری قورئاندا خوا دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ ﴿١٧﴾ عبس﴾، واتە: ئەی بەکوشت چێت مرۆڤ، چەند سپڵەو پێنەزانە!!

هەروەها خوا فەرمووشیەتی: ﴿...وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴿١٣﴾ سبأ﴾، واتە: کەمن ئەو بەندانەی، کە بە زمانو دڵو ئەندامانی جەستەیان سوپاسگوزارن.

وشەی (کفّار)یش لە وشەی (الكفور) قووڵترو پڕ ماناترە"[1].

لێرەشدا تێبینی ئەوە دەکەین، کە قورئان دوو بێژە (لفظ)ی هاو بەرامبەری لە سوورەتی (سبأ) داهێناوە، کە (شکور)و (کفور)ن، بۆ نموونە هەر لەم سورەتەداو

١) المفردات: ٤٣٤ بە کورتی .

لەپێش ئەم چیرۆكەی گەلی (سەبەء)دا وشەی (شكور)ی بۆ وەسفی پێغەمبەری خوا (داود)-سلاوی لێ بێت- بەكارهێناوە. (شكور)یش (صیغه مبالغه)یەو لە (شاكر)ەوە دارێژراوە. وشەی (كفور)یشی بۆ تیشك خستنە سەر لەناوبردنی باخەكانی (سەبەء) هێناوە كە وەسفی مرۆڤی (سەبەئی)ی پێكردوە. ئەمەش (صیغه مبالغه)یە، كە لە (كافر)ەوە دارێژراوەو (صیاغه) كراوە.

هەروەها تێبینیی ئەمەش دەكەین كە كۆتایی تیشك خستنە سەر كارەساتەكەی گەلی (سەبەء)یشی بەوە هێناوە كە سیفەتو ڕەوشتی ئەو كەسانەشی ڕوون كردۆتەوە كە پەندو وانە لەو كارەساتانە وەردەگرن، ئەمەش لەو فەرمایشتەی دوایی خوادا كە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ واتە: لەم كارەساتانەدا چەند بەڵگەو نیشانەیەك-چەند هێماو پەندو ئاماژەیەك- بۆ گشت كەسێكی بە ئارام لەسەر عیبادەتو سوپاسگوزار هەیە.

لە بڕگەكانی داهاتووی ئەم چیرۆكەدا نەختێك لەسەر ئەم ڕستانەی دوایی ئایەتەكان دەدوێین..

## سەبەئی یەكان پەندیان لە كارەساتەكەیان وەرنەگرت

خوا-وەك باسمان كرد- ئەو لافاوە بە گوڕەی بەسەر باخەكانی گەلی (سەبەء)دا هەستاندو، ئەو باخانەی بۆ وێران كردن تاكو پەند وەربگرنو ژیرو تەمێ ببنو، پاشان بچنەوە سەر ڕێبازی خوا، بەڵام بەرچاویان گیرابووو، دڵیشیان مۆری تێنەگەیشتنی لێ درابوو، لەبەر ئەوە نەیاندەویست پەندی لێ وەرگرنو وانەو ئامۆژگاریی لێ فێربن. خواش دەربارەی حاڵەتی ئەو گەلە لە دوای وێران كردنی بەنداوەكەیان، فەرموویە: ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ

أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ سبأ ﴾.

مامۆستای پێشەوا سید قطب دەربارەی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتانەو، حاڵەتی ئەو گەلەش لە دوای وێرانبوونی بەنداوەکەیان، گوتوویەتی:

"ئەوان، تا ئەو کاتە هێشتا لە گوندو شارۆچکەو ماڵەکانیاندا مابوون. خواش رزق و رۆزیی لێ کەم و بەرتەسك کردنەوەو، لەجیاتی ئەو خۆشگوزەرانیو نازو نیعمەتەش، خستنیە نێو نارەحەتیو ژیانی کولەمەرگییەوە. بەڵام پەرتەوازەو بەش بەشی نەکردبوونو ئاوەدانیش هێشتا لەنێوان خۆیانو شارو دێهاتە پڕ خێرو بەرەکەتەکانی چواردەورەیاندا مابووو پەیوەندییان لەگەڵیاندا هەبوو، ئەوە بوو (مەککە) لە ناوچەی جزیرەدا بووو (بيت المقدس)یش لە شامدا.. وڵاتی یەمەنیش بە ئاوەدانی لە باکوری وڵاتی (سەبەء)دا مابووەوەو پەیوەست بوو بە دێهاتە ئاوەدانو پڕ خێرو بەرەکەتەکانی، ڕێگاش(ڕێگای هاتوچۆ) لەنێوانیاندا ڕێگایەکی خۆشو تەخت کراوو بەرنراوو پڕ لە هێمنیو ئارامی بوو" ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَۖ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ سبأ ﴾.

هەر لەم ڕووەوە گوتراوە: گەشتیارێك لە دێیەکەوە دەردەچووو، دەچوو بۆ دێیەکی دی بەر لەوەی تاریکایی شەو دابێت، سەفەرکردنیش بەنێویاندا لە چەند ڕێگاو ماوەیەکی دیاریکراودا بووەو بۆ سەفەرکارو گەشتیارەکان ئارامو هێمن بووەو، هۆکاری حەسانەوەش بەزۆریی لە ئارادا بووە، ئەمەش لەبەر نزیکیی ئاوەدانیو ماڵەکان لە یەکدییەوەو، بەهۆی نزیکیی وێستگەکانی سەفەریش لە ڕێگادا لە یەکترەوە.

بەڵام بەدبەختییەخەی بە گەلی (سەبەء) گرتو سوودیان لـە ڕوداوە ترسـێنەرو وریاکەرەوەکەی یەکەم جار وەرنەگرت (واتە لە ڕووخانی بەربەستو دەرچوونی ئاوی بەنداوەکەو وێرانبوونی باخەکانیان)، بەهۆی ئەم کارەساتەوە ڕوویان نـەکردە خـواو پەشیمان نەبوونەوە تاکو ئەو بەخۆداچـوونەوەیەیان نـەختێك لـە حاڵـەتی خۆشـیو بەختەوەرییان بۆ بگەڕێنێتەوە، بەڵکو سزایەکی وایان لەلای خوا کرد، کە هـەر لـە نزای گەمژەو نەفامەکان دەچوو، ئـەوەبوو لـە نزاکەیانـدا گوتیـان: (رَبَّنَا بَٰعِدۡ بَيۡنَ أَسۡفَارِنَا) خوایە گەشتو سەفەرەکانمان لەیەکتر بۆ دوور خەرەوە، بـە مانـای داوای سەفەری دوورو درێژو لێك دوورخراوەی وەهایان دەکرد، کە بە درێژایی سـاڵ یـەك جار سەفەری ئاوا دەکرێت، یان چەند جارێکی کەمی لەیەك دوور. نەك ئەو سەفەرە کورتو ئاسانانەی پێشوو، کە خانەو جێو ڕێیەکانیان پێکەوەو بەیەکدا چوو بوو، کە چێژو تامی گەشتی دوور تێر ناکات. دیارە ئەو داواکارییەی نێو نزاکەشیان لـە بێباکیو غەفڵەتی دڵیـانو لـە سـتەم لەخۆکردنیـشەوە بـووە، وەك دەفـەرموێت: ﴿وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾. ئیدی خواش ئەو نزایەی گیراکردنو داواکاری یەکەیانی پەسند کرد، بەڵام بەو ڕەنگە پەسندی کرد، کە (لەدەمەوەچوونی بانگو هاواری بێبـاکی) دەیخوازێـت، بۆیـەش لەوەلامـدا دەفـەرموێت: ﴿فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ کردمانن بە قسەوباسی خەڵکیو بنشێتەخۆشەی ناودەمی خەڵکانی ترو، دەربەدەر بوونو پارچەپارچەش بـون.. ئـەوەبوو بـە هـەموو سەرانـسەری دورگـەی عەرەبدا –کە بە جزیرە ناسراوە- بڵاوبوونەوەو خاووخێزان لێك ترازان، بەم ڕەنگەش بوونە قسەوباسی نێو کـۆڕو کۆمـەڵی خـەڵکانی تـرو لێـرەو لـەوێ بەسـەرهاتیان دەگێڕرانەوەو، هەمیشە چیرۆکی سەر زارو دەمی کەسانی دی بوون، ئەمـەش دوای ئەوەی، کە نەتەوەیەکی خواپێداوو دەسڕۆیشتوو بوونو قەوارەی خۆیـان لـە ژیـانی سەر زەویدا هەبوو. هـەر ئـەم ڕوداوەش، چـەندەها پەنـدو ئامۆژگـاریو ئایـەتو

بەڵگەیە بۆ گشت کەسێکی خۆڕاگرو سوپاسگوزار ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾، لەم ڕستەیەدا خوا (ئارامگرتن)ی لە تەنیشت (سوپاسگوزاری)یەوە باس کردووە. ئارام گرتن لەسەر نارەحەتیو سەغڵەتی، سوپاسگوزاریش لەسەر خێرو خۆشیو نیعمەتەکانی خوا. ئیدی لە چیرۆکی (سەبەء)دا چەندین ئامۆژگاریو بەڵگەو نیشانە بۆ ئەوانو ئەمان (بۆ ئارام گران)و (بۆ سوپاسگوزاران) هەیە.

ئەمە تێگەیشتنێکە لە ئایەتەکە، دیارە بۆچوونو تێگەیشتنی تریشی لەسەر هەیەو، لەوانەیە مەبەست لە فەرمایشتی ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً﴾ ئەو گوندو ئاوەدانییانەش بێت، کە دەسەڵاتدارو بەهێز بوون، لەکاتێکدا سەبەئییەکان بەهۆی ئەو کارەساتەوە بێدەسەڵاتو هەژار بوونو، لە ژیانێکی بیابانیی وشكو ڕەقدا دەژیانو، سەفەرو گواستنەوەو هاتو چۆی ئەملاولایان بەدوای (مێرگو لەوەڕگاو سەرچاوەکانی ئاودا) زۆر ببووو، ئارامیشیان لەسەر بەڵاو کارەساتەکە نەدەگرت، لەجیاتی ئەوەش داواکارییان لەلای خوا ئەوەبوو، کە سەفەرو ڕێگای گەشتەکانیان بۆ دوور خاتەوە لە یەکدی (رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا) مانایەکی دیاری ئەم وتەیەشیان ئەوەیە، واتە: خوایە ژمارەی سەفەرەکانمان بۆ کەم بکەرەوە، چونکە بێگومان بەدەست سەفەرو هات وچۆی زۆرەوە ماندوو بووین.. ئەوان لەم نزایەیاندا مەبەستیان بەدەمەوەچوونی بانگەوازی خواو گەڕانەوە بۆ سەر دینی خوا نەبوو، تاکو شیاوبونی نزاکەیان تیا ڕەنگ بداتەوەو شایستەی بەزەیی خوا بن، بەڵکو پێشتر کە لە ئاست نیعمەتی خوادا بێبەرواو پێنەزان بوونو، دواتریش ئارامیان لەسەر مەینەتیو کارەساتەکەش نەگرت، خواش ئەم دۆخەی تری بەسەردا هێنانو، بە هەموو لایەکدا بڵاوی کردنەوەو بەش بەشو پارچەپارچە بوونو، وەك شوێنەوارێکی چاو لەدوایان لێ هاتو، بوونە قسەو باسو چیرۆکی سەرزاری خەڵکیو (بە کورتی بوون بە

پەندی زەمانە).. هەر بۆیەش لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی کۆتایی ئایەتەکە بۆ ئەو حاڵەتەیان بەم دێرە خراوەتە ڕوو (إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ) بێگومان لەو کارەساتەدا چەندین بەڵگەو نیشانە بۆ گشت کەسێکی ئارامگرو سوپاسگوزار هەیە..

ئەم دێڕەی دوایی تەواو گونجاوە بۆ باسی کەمیی سوپاسگوزارییان لەسەر نیعمەتە زۆرەکانی خواو، لەسەر کەمیی ئارامگرتنیشیان لە ئاست مەینەتیو کارەساتی ڕۆژگاردا.

من خۆم – واتە، کە هێشتا لە وتەکانی سید قطب داین- ئەم ئاقاری تێگەیشتنە لەسەر ئایەتەکە هەیەو، خواش هەر خۆی لە مەبەستو نیازەکانی خۆی ئاگادارەو هەر خۆی زاناو شارەزای ماناکانیەتی[1]".

جا سەرەڕا ئەوەی، کە بۆچوونو ئاقاری تێگەیشتنی یەکەم —کە سید قطب- بە دیاری خستووە، ماقووڵترو لەپێشترو نزیکترە، کە کۆمەڵی زانایانی تەفسیریش ڕایان لەسەریەتی، بەڵام بۆچوونو تێگەیشتنی دووەمیش لەو ئایەتانە نامۆ نیەو ڕێی تێدەچێت.

---

١) سید قطب/ في ظلال القرآن، ٥: ٢٩٠١- ٢٩٠٢ .

# سەبەئی یەکان بوون بە پەندو قسەوباسی خەڵکی

خوا نیعمەتەکانی لەسەر گەلی (سەبەء) لابردو، سزای خۆی پێگەیاندن، ئەمەش بەهۆی زوڵمو بەدکاریو بێباوەڕییانەوە. بەو هۆیەشەوە بە هەموو لایەکدا پەرت پەرتو بڵاوی کردنەوەو، ئیدی بوونە قسەوباسی نێو خەڵکی: ﴿فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدۡ بَيۡنَ أَسۡفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍۚ ...﴿١٩﴾سبأ﴾.
لەم ڕستەیەی ئایەتەکەشدا (فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ) کردمانن بە قسەوباس، وشەی (أَحَادِيثَ) کۆ(جمع)ی (حدیث)ە. (امام راغب) دەربارەی وشەی (حدیث) دەڵێت: "(حدیث) هەر وتەیەکە، کە بگاتە مرۆڤ لەڕێی گوێچکە، یان سرووش (وحی)یەوەو لەکاتی بێداربونی، یان نووستنیدا[1]". هەر سەبارەت بە مانای (بوون بە قسەوباسی نێو خەڵکی)یش، (امام راغب) دەڵێت: "بەمانای ئەوان بوون بە چەند هەواڵو دەنگو باسێك، کە وەك – نمایش- بە تەمسیل کراون[2]".

جیاوازیش لەنێوان هەردوو حاڵەتەکەدا ڕوونە. جیاوازییەکی دوور هەیە لەنێوان حاڵەتی سێیەکەدا، کە تێدابوونو زەوییان ئاوەدان دەکردەوەو نیعمەتیان لەخێرو بێرەکانی زەوی دەچنییەوەو، لە ژیانێکی تێرو تەسەلیشیاندا بوونو، خەڵکی هەواڵی ئەو خێرو خۆشیو ئاوەدانی یەیانی بۆ یەکدی دەگێڕایەوەو، باسی ئەوەیان دەکرد، کە لە چ خۆشگوزەرانیوماڵو سامانو دەسەلاتێکدا دەژیانو، چ پلەو پایەو کامەرانیو سامانێکیان هەبووو، ئیدی ستایشی حاڵو بارودۆخی ئەو کاتە یانیان دەکردن.. (جیاوازییەکی دوور) لەنێوان ئەم حاڵەتەو، ئەو حاڵەتە تازەیەی تریاندا هەیە، کە تێی کەوتن، واتە لە هەژاریو دەردەسەریو نەبوونیو نەداریدا،

---

١) المفردات: ١١٠ .
٢) المفردات: ١١٠ .

کە لاوازو بێدەسەڵات بوونو پەرتەوازەو بەش بەشو پارچەپارچە بونو لێکـدابڕان. ئیدی خەڵکی لـە قـسەوباسەکانیاندا جیـاوازیی نێـوان ئـەو دوو حاڵەتـەیان بـاس دەکردو، هەڵوێستەیان لەئاست باری جیاوازیی نێوان هەردوو حاڵەتەکـەدا دەکـرد. بەم شێوەیە سەبەئی یەکان لە گـەلێکی خواپێـداوو دەسڕۆیـشتووەوە -کـە گـوێو چاوی خەڵکی دەوروبەریان لەو بارەیەوە پڕ کردبوو- بوون بـە گـەلێکی لەناوچـووو قەلاچۆکراوو، بوونە پەندی زەمانـەو نموونـەیان لەسـەر دەهێنانـەوەو بـە هـەواڵو دەنگو باسی گەلانی پێشین دانرانو، لە کۆڕو کۆمەڵەکانیاندا باسـیان دەکـردنو، (قسەوباسی دیوەخانو بابەتی گاڵتەوگەپ بوون).

عەرەبەکانیش چەندین پەندی بەناوبانگو نەمریان لەسـەر دارشـتوون، یـەکێك لەو پەندە ناودارانەش ئەوەیە کە دەڵێن: (تفرقـوا أیـدي سـبأ)، ئـەم پەنـدەش لـەو حاڵەتەوە وەرگیراوە کە سەبەئی یەکانی تێکەوتو، هەمیشە ئەم پەندە دەڵێنـەوەو دەیکەنــە نموونــە بــۆ هــەر نەتــەوەو کۆمــەڵو تیرەیــەك کــە بارودۆخیــان لــە دەوڵەمەندییــەوە بــۆ هــەژاریو، لــە ســەربەرزییەوە بــۆ سەرشــۆڕیو، لــە دەســەڵاتدارێتییەوە بــۆ بێدەســەڵاتیو، لــە تــەبایيو پێکــەوە گونجانــەوە بــۆ پەرتەوازەییو لێکدابڕان، بگۆڕێت.

بەڵام ئایا ئەم جۆرە کارەساتە تەنها تایبەتـە بـە گـەلی (سـەبەء)؟ یـان ئاسـا سوننەتو ڕێسایەکی گشتییەو هەموو نەتەوەو گەلو هۆزێك دەگرێتەوە؟!

بەڕاستی ئەمە سوننەتو ڕێسایەکی گشتییە بۆ گشت گەلێك لە هەر جێیەکدا بنو لە هەر ناوچەیەکدا بژین، چونکە هەر گەلێك یان هەر نەتەوەیـەك، یـان هـەر تیرەیەك نیعمەتی خوا بە کفرو پێنـەزانین بگـۆڕنو ژیانیـشیان بـە زوڵـمو سـتەمو بەدکاریو بەدڕەفتاریو لێك هەڵوەشانی ئەخلاقی بەرنەسەر، خواش ئەو نیعمەتەیان لـێ دەسێنێتەوەو، سزاو ئـازارو سـووکایەتییان پـێ دەچێژێتو، لـە زەمینـەی کاریگەرییو بەرهەم هێنانەوە، دەکەونە گۆشەی پشت گوێخستنو لەبیرچـوونەوەو،

تەنها لە بۆتەی قسەوباسی نێو دیوەخانو، هەواڵەکانی حیکایەتخوانەکاندا مانـەوە. قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەو ڕاستییە کـردوە، کـە خـوا فەرموویـەتی: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ۖ كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ ۚ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ ۚ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ المؤمنون ﴾. واتە: لەدوای لەناوبردنی گەلانی پێشوی وەك (گەلی سەمودو عادو ئەوانی دی) پێغەمبەرانی ترمان یەك لەدوای یەك بـۆ لای گـەلانی دوای ئەوان ناردووەو، هەر پێغەمبەرێکیشیان بۆ لای گەلێکیان چووبێتو پـەیامی خـوای پێگەیانـدبن، بـەدرۆیان خـستۆتەوە، ئیـدی ئـەو گەلانـەی دواتریـشمان هەنـدێکیان لـەدوای هەنـدێکیان لـەناوبردووەو کەسـیان لێ نەماوەتـەوە، پاشـان کردوومانن بە پەندو قسەوباسی گەلانی تر کە خەڵکی لە کـۆڕو کۆمەڵـەکانیان دا بە خۆشیو گاڵتەپێکردنەوە هەواڵیانی گێڕاوەتەوە.. وە ئیتر هەر بـە کوشـت چـنو لەناوچنو دووربن لە ڕەحمەتی خوا ئەو گەلو کەسو کۆمەڵانەی کە باوەڕ بە خـواو پەیامەکەی ناهێنن.

مێـژووی مرۆڤایـەتیش هـەمووی باسـی سـەلماندنی ڕاسـتیی ئـەم حەقیقەتـە قورئانییە دەکات، چونکە حاڵەتی نەتـەوەکانی تۆمـارکردووە کاتێـك لـەنێو نـازو نیعمەتی خوادا دەژیانو، بەڵام بەهۆی (کفری نیعمـەت)و بێباوەڕییانـەوە بوونەتـە قسەوباسی سەر زاری خەڵکی.

سەبەئی یەکان چییان لێهات؟ ئەی گـەلانی عـادو سـەمود؟ ئـەی فیرعـەونو هامانو قاروون؟ ئەی فینیقی یەکانو بابلی یەکانو ئاشـووری یـەکانو فارسـەکانو هیندەکان؟ ئەی یۆنانی یەکانو ڕۆمانەکان؟ ئەی مەغۆلەکانو خاچپەرستەکان؟ ئەی ئەڵمانیا؟ ئەی بەریتانیی مەزن؟ ئەی فلان گەلو فلان ئیمبراتۆریەتی تر چییان لـێ بەسەر هاتو لە کوێن؟!

بێگومان خوا هـەموویانی کـرد بـە هـەواڵو دەنـگو بـاسو، پـەرت پـەرتو پارچەپارچەی کردن.. دەی هەر لەناوچن گەلی بێباوەڕو ستەمکار.

# له‌ چیرۆكی سه‌به‌ء دا چه‌ند به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه‌ك هه‌یه‌

قورئانی پیرۆز وای ڕاگه‌یاندووه‌، كه‌ بێگومان له‌ چیرۆكی (سه‌به‌ء)دا چه‌ندین به‌ڵگه‌و ده‌لاله‌تو، په‌ندی كاریگه‌ر هه‌یه‌.. بۆ نموونه‌ش هه‌ر له‌ سه‌ره‌تای لێدوانی قورئان له‌سه‌ر بارودۆخه‌ (سه‌به‌ء)ه‌وه‌ باسی ئه‌وه‌ ده‌كات، كه‌ بێگومان له‌ وڵاتو نیشتگه‌ی (سه‌به‌ء)دا به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه‌ك هه‌بوو: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ ...﴿١٥﴾ سبأ﴾، له‌ كۆتایی چیرۆكه‌كه‌شداو له‌ باسی ئه‌و حاڵه‌تی ده‌وڵه‌مه‌ندیه‌و پاشان كاره‌ساته‌كه‌و په‌رته‌وازه‌بوونیشیاندا ده‌فه‌رموێت، كه‌ بێگومان له‌ هه‌موو ئه‌وانه‌دا، چه‌ند به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه‌ك هه‌یه‌ (إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَـٰتٍ ).

ئه‌وه‌ی لێره‌شدا ڕامان ده‌گرێت، ده‌ربڕین (تعبیر)ی تایبه‌ت به‌ هه‌ردوو حاڵه‌تی سه‌ره‌تاو كۆتایی كۆ (جمع) هاتووه‌: (آیات).. له‌وانه‌شه‌ حیكمه‌ت له‌مه‌ دوو لایه‌نی هه‌بێت:

لایه‌نی یه‌كه‌م/ گونجانی له‌گه‌ڵ ئه‌و بابه‌ته‌دا، كه‌ لێی ده‌دوێت، له‌به‌رئه‌وه‌ی گه‌لی (سه‌به‌ء) كاتێك له‌نێو نیعمه‌ته‌كانی خوادا ده‌ژیانو به‌خته‌وه‌رو كامه‌ران بوونو، هه‌مووشیان پێكه‌وه‌ ده‌ژیانو كۆكو ته‌با بوون، وه‌ك ئه‌وه‌ی هه‌موویان یه‌ك لاشه‌و یه‌ك كه‌س بن، له‌و كاته‌دا واگونجاوه‌، كه‌ به‌ تاك (مفرد) گوزارشت له‌ به‌ڵگه‌دارێتیی حاڵه‌ته‌كه‌یان بكرێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ ...﴿١٥﴾ سبأ﴾. پاشان ئایه‌ته‌كه‌ش له‌گه‌ڵ ژینگه‌كه‌دا گونجاوه‌، چونكه‌ یه‌ك ژینگه‌ بووه‌و، ئایه‌ته‌كه‌ش تاك (مفرد) بووه‌. به‌ڵام دوای وێرانكردنی به‌نداوه‌كه‌و، په‌رته‌وازه‌بوونیان به‌ هه‌موو لایه‌كداو، بڵاوبوونه‌وه‌یان به‌ وڵاتانی تردا، نه‌ته‌وه‌كه‌ (الامة) گۆڕاوه‌ بۆ چه‌ند نه‌ته‌وه‌یه‌ك (امم)، تیره‌ش (القبیلة) بۆ چه‌ند تیره‌یه‌ك (قبائل). ژینگه‌كه‌ش (المسكن) بۆ چه‌ند ژینگه‌یه‌ك (مساكن). بۆ ئه‌م دابه‌شكاریو په‌رته‌وازه‌كردنه‌ش وا گونجاوه‌، كه‌ به‌كۆ (جمع)

گوزارشتی لـێبکات. ئیدی بەڵگەو نیشانە تاکەکەی کە پێـشتر بەسـەر یـەك گەلی پێکەوە ژیاودا ناوزەد دەکرا، بوو بە چەند بەڵگەو نیشانەیەك تاکو هەر بەڵگەیەکیان بەر هەر تاقمو ژینگەو تیرەیەك بکەوێت. والله اعلم.

لایەنی دووەم/ بێگومـان بەڵگـەکان (الآیـات) هەریـەك ئایـەتو بەڵگـە (الایـة) دەگرێتەوە، چونکە چیرۆکی (سەبەء) بەڵگەیەکە لەسەر دەسەلآت پێدانی خوا بە خەڵکیو بەڵگەیەکیـشە لەسـەر دەسـتەبەرکردنی خۆشـگوزەرانیو خێـرو خۆشی بۆ خەڵکی، هەروەها بەڵگەیەکە لەسەر سـتەمکاریی خـەڵکیو کفـرو بەدکارییانو بـەکارهێنانی نیعمەتـەکانی خـوا لـە بـواری نـاڕەزایی خـوادا. بەڵگەیەکیشە لەسەر بێئاگایی چەند کەسێك کـە پەنـدو عیـبرەت وەرنـاگرن لەسەر ئەو کارەساتانەی بەسەریاندا هاتووە، هەروەها بەڵگەیەکە لەسـەر ئـەو ڕاستییەش کە هەر مەینەتی یەك بەسەر خەڵکی دا بێت بەهۆی کارو کرداری نارەوای خۆیانەوەیە. پاشان بەڵگەیەکە لەسەر پـەیڕەوبوونی یاسـاو سـوننەتە خوایی یەکان بەسەر خەڵکی تری هەر سـەردەمو ناوچـەیەکی تـردا. هـەروەك بەڵگەیەکیشە لەسەر بەدیهاتنی ئەنجامەکان لەسەر سەرەتاکان. بەڵگەیەکیشە لەسەر تۆڵە سەندنی خوا لە ستەمکارانو ئازاردانی کافرانو، سزادانی سەختی لووتبەرزانو دەسەلآتدارانی بە زەبرو خۆ بـەزل زان. دیـسان بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کە هەر خێرو خۆشیو ڕزقو ڕۆزی یەك ڕوو لە نەتەوە دەکـات بـەهۆی فەزڵو بەخشندەیی خواوەیەو، هەر برسێتیو هەژاریو نەداری یەکیش ڕوویان تێدەکات بەهۆ بـەدکرداریو نالـەباریی خۆیانەوەیـە. بەڵگەیەکیـشە لەسـەر ڕاستیی بۆچوونو لێکدانەوەی مێژویی هۆیەکانی گەشەکردنی گـەلو نەتـەوەو دەوڵەتەکانو، هۆیەکانی لەناوچوونو پەرتەوازەبوونیان.. بەهەر حـاڵ بەڵگـەو نیشانەیە لەسەر چەندەها حاڵەتی تر.. لەبەر ئەمـە لـە چـیرۆکی (سـەبەء)دا چەندین ئایەتو بەڵگەو نیشانە هەبووە، چەندین بەڵگەی وەهان کـە خـەڵکی هەڵوێـستە لـە ئاسـتیاندا بکـاتو چـەندەها هێمـاو دەلالـەتو پەنـدو ئامۆژگارییان لێ وەربگرێت.

# بەڵگەکان بۆ هەموو ئارامگرو سوپاسگوزارێکن

له چیرۆکی (سەبەء)دا چەند بەڵگەیەك (آیات) هەیه..

بەڵام ئایا هەموو کەسێك له خەڵکی پەی بـه زانینـی ئـەو بەڵگـەو نیـشانانه دەبەن‌و، بەچاکی سەوداو ئاڵوێریی لەتەکدا دەکەن‌و، لێیان تێدەگەن‌و، ئەو مانـاو پەندو وانانەشیان لـێ وەردەگرن که ئاماژەیان بۆ دەکەن؟ ڕاسته که ئایەت‌و بەڵگەو نیشانەکان ئاراستەی هەموان کـراوەو لاپەڕەیـەکی کراوەیـه لەبـەردەم هەموانـدا، هەروەها بانگەوازێکی تایبەتیه بۆ گشت مرۆڤێك تا لەبەردەمیا بوەستێت‌و لێـی بێدار بێتەوە. بەڵام کەسـانی بێئاگـاو، بێبـاوەڕو، سـتەمکارو، فریـودراوو، ڕوو لـێوەرگێڕ، لێی تێناگـەن، واته ئەو کەسانەی که خوا لەبارەیانەوە فەرمووییـەـه: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ یوسف﴾. واته: ئای چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا له ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیـەو چاوی بەسەردا تێدەپەڕێنن‌و، ڕووی لێ وەردەگێڕن.

قورئانی پیرۆز ئەو ڕاستییه جـێگیر دەکـات کـه خـەڵکی سـوود لـه بەڵگـەو نیشانەکان وەرناگرن تەنها کەسانی به ئارام‌و سوپاسگوزار نەبێت، هـەروەها تـەنها کەسانی به ئارام‌و سوپاسگوزار لێی تێدەگـەن‌و دەرس‌و پەنـدو ئامۆژگارییـان لێ وەردەگـرن، وەك خـوا لـەم چیرۆکەدا لەبارەیانـەوە دەفـەرموێت: ﴿...إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ سبأ﴾.

(الصبار): (صیغه مبالغه)یه له (صبر)ەوەو ئەو مرۆڤه ئـارام گرەیـه کـه نـەك هەر تەنها ئارامگرو لەسەرخۆیه، بەڵکو زۆر زۆر به ئارامەو هەمیـشەو بـەردەوام ئارام دەگرێت‌و زیاد له ڕادەش له ئارام گرتن دایەو، (کـورد واتـەنی ئـارامگرتنی کردووە به پیشه).

(الشكور)یش (صیغة مبالغة)یە لە (شكر)ەوەو، ئەو مرۆڤە سوپاسگوزارەیە، کە نەك هەر تەنیا سوپاسگوزارو شوکرانەبژێریی خوایە، بەڵکو زۆر زۆر سوپاسگوزارەو هەمیشەو بەردەوام لە سوپاسکردنی خوادایەو، جێگیرە لەسەری‌و زیاد لە ڕادەش سوپاس دەکات.. ئیدی بۆچی تەنیا مرۆڤی ئاوا بە ئارام‌و مرۆڤی ئاوا سوپاسگوزار نەبێت کەسی دی سوود لەو ئایەت‌و بەڵگەو نیشانانە نابینن؟ بۆچی ئارام گرتن‌و سوپاسگوزاری زۆر زۆر پێویستن بۆ تێگەیشتن لە بەڵگەو پەندو ئامۆژگارییەکان‌و بۆ دەرس وەرگرتن لێیان؟!

چونکە خۆڕاگرتن‌و ئارامگریی (الصبر) مانای تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن دەگەیەنێت، بە مانای مرۆڤی ئارامگر پەی بەو حاڵەتە دەبات کەوا خوا لە ژیانیدا تاقی دەکاتەوە بە بەڵاو مەینەتی لە هەر نیعمەتێکدا، کە پێ‌ی دەبەخشێت‌و، لە هەر شتێکی تردا، کە پێ‌ی دەدات، هەر تاقی دەکاتەوە. جا کاتێك مرۆڤی ئارامگر پەی بەمە دەبات، مانای وایە ئەو نیعمەت‌و بەخشانەی لە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانی خواداو، لە بەدەست هێنانی سۆزو خۆشەویستی‌و ڕەزامەندیی خوادا بەکارهێناوە. هەر دەشبێت ئارامگرتن لە مامەڵە لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا لە ئارادا هەبێت‌و، هەر دەشبێت کاروانی ئەم ژیانە ببڕێت. ئارامگرتنیش بە هەموو دیاردەو ڕەنگ‌و شێوەو بوارەکانیەوە.. ئارامگرتن لەسەر نیعمەت.. ئارامگرتن لەسەر دەوڵەمەندیی، ئارام گرتن لەسەر هێزو دەسەڵات، ئارام گرتن لەسەر خۆشگوزەرانی‌و دەسڕۆیشتوویی، ئارام گرتن لەسەر ماڵ‌و سامانداریتی، ئارام گرتن لەسەر دەردو بەڵا، ئارام گرتن لەسەر مەینەتی‌و فیتنە.. ئارام گرتن لەسەر کارەسات‌و ناخۆشی.. ئارام گرتن لەسەر پیاهەڵشاخان‌و تەمێ‌کردن.

جا هەرکەسێك بە ئارام گرتن‌و هێمنی یەوە سەوداو مامەڵە لەگەڵ هەموو ئەو دیاردەو حاڵەت‌و بوارانەدا بکات، ئەوە بێگومان ئارامگر (صبّار)ەو، لە بەڵاو تاقیکردنەوەدا سەرکەوتووەو، سوپاسی خوای لەسەر نیعمەتەکانی کردوەو، ئەو نیعمەتانەشی لە بوارەکانی ڕەزامەندیی خوادا بەکارهێناوە.

هەروەها ئارام گرتن جڵەوی دەگرێت بەرەو سوپاسگوزاریو شوکرانەبژێریی. بۆیە گشت ئارامگرێك شوکرانەبژێریشە. جا کاتێك مرۆڤ سوپاسی خوا دەکات، خواش نیعمەتەکانی بۆ بەردەوامو، زیاتریش دەکات، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ...﴿٧﴾ إبراهيم ﴾.

قورئانی پیرۆز بەراوردی لەنێوان (صبّار)و (شكور)دا وەها کردوە، کە لە هەر جێگایەکدا ناوی (صبّار)ی هێنابێت، ناوی (شکور)یشی لە تەنیشتدا هێناوە، بەشێوەیەك کە بوونەتە دوو سیفەتی پێکەوەلکاو تاکو (صبر)و (شکر)/ ئارامگریی‌و سوپاسگوزاریی بە خاوەنەکەیانەوە بلکێنن‌و ببنە دوو (صيغة مبالغة) بۆ (صبر)و (شکر).

وشەی (صبّار) چوار جار لە قورئاندا باسکراوە، لە هەر چوار جارەکەشدا بە وشەی (شکور)ەوە لکێنراوە، بۆ نموونە:

١- لە جاری یەکەمدا، خوا فەرمان بە موسا دەکات، کە رۆژگاری نیعمەتی خوایان بەیاد بێنێتەوەو، پێی دەفەرموێت: ﴿ ...وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ إبراهيم ﴾.

٢- لە جاری دووەمدا خوا هەندێك لە بەڵگەو نیشانەکانی خۆیمان پێ دەناسێنێت، وەك دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ آيَاتِهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ لقمان ﴾.

٣- ئەوەش گەلی (سەبەء)، کە لەم چیرۆکەدا بە درێژیی باسی هەردوو سیفەتەکە کراوە: ﴿ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ سبأ ﴾.

٤- لە سورەتی (شوری)شدا، خوا ئەو ڕاستییەی جێگیرکردووە، کە بێگومان

پاپۆڕەکان بە نیعمەتێکی خوا لە دەریادا دەڕۆن، لەمەشدا چەند بەڵگەو نیشانەیەك بۆ گشت کەسێکی ئارامگرو سوپاسگوزار هەیە: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ الشورى﴾.

مرۆڤی (الصبار الشكور) واتە: زۆر بە ئارامو زۆر شوکرانەبژێر، هۆشیارو ژیرو زیرەکە لەم دنیایەدا، چونکە دەزانێت چۆن سەوداو مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بکاتو، لە ژیان تێگەیشتووەو، لەگەڵ ئەو بڕە نیعمەتەش، کە خوا لە دنیادا پێی دەدات هەر بە ئارامگریی‌و سوپاسگوزاریی مامەڵە دەکات. هەر ئەنجامێکی هەستیاری جەستەیشی دەبێتە پشتیوانێکی لەسەر ئارامگرتن‌و سوپاسگوزاریی، هەر گەردیلەیەکیش لە قەوارەی خۆی‌و هەر لایەنێك لەلایەنەکانی کەسێتیشی، یارمەتی دەدەن لەسەر ئەوەی ببێتە کەسێکی (ئارامگرو سوپاسگوزار). ئەو کەسە ئارامگرو سوپاسگوزارانەش لەم ژیانەدا کەمن، چونکە زۆربەی خەڵکی بێئاگاو هەڵخەڵەتاون. هەر لەبەر ئەمەش لە سورەتی (سبأ)دا فەرمایشتی خوا لەسەر کەمی ژمارەی بەندە سوپاسگوزارەکان هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿...ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ سبأ﴾. واتە: ئەی بنەماڵەی داود، بە گوێڕایەڵی‌و پەیڕەوکردنی فەرمانەکانی خوا سوپاسی خوای پەروەردگارتان بکەن، بەڕاستی لەنێو بەندەکانم کەمن ئەوانەی، کە سوپاسگوزار بن.

بێگومان هەر مرۆڤی ئارامگرە، کە سوپاسی خوا دەکات، هەر مرۆڤی سوپاسگوزاریشە، کە ئارام دەگرێت، هەر بۆیەش لە بەندەکانی خوادا، کەسانی ئارامگرو سوپاسگوزار کەمن..

# ئیبلیس توانی گەلی (سەبەء) فریو بدات

قورئان له كۆتایی چیرۆكی (سەبەء)دا هەڵسەنگاندنێكی بۆ واقیعی دوای كارەساتەكەو خوێندنەوەی ئاكاری ئەو گەله خستۆته ڕو، پوختەی ئەو تیشك خستنەسەرەش، ئەوەیه كه خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَـٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْـَٔاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ۗ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾سبأ ﴾، واته: لەملاوه ئیبلیس(شەیتان)یش نیازی خۆیان لەسەر گومڕاكردنیان بەدیی هێنا كه پێشتر بەخوای گوتبوو (زۆربەی خەڵكی سوپاسگوزار نین)، ئەوەبوو كەسانێكی گومڕاو بێباك له خەڵكدا شوێنی كەوتن تەنها كۆمەڵێك له باوەڕداران نەبێت. بەڵام وەنەبێت ئیبلیس دەسەڵاتێكی بەسەریاندا هەبێت، بەڵكو ئێمه خۆمان ویستوومانه ڕوون بێتو بزانرێت، كه كێ باوەڕی بەڕۆژی دوایی هەیەو كێش له شكو گومان دایه.. جا دڵنیا به ئەی پێغەمبەر كه خوای پەروەردگارت چاودێرو ئاگاداری هەموو شتێكه.

واتای فەرمایشتی ( وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ) واته: ئیبلیس ئامانجو نیازو پەیامی خۆی تیادا پیاده كردنو، توانیو سەركەوتوو بوو له فریودانیانو گومڕاكردنیانو دوورخستنەوەیان لەڕێی ڕاست.

پەیامی (ئیبلیس) كه ژیانی خۆی بۆ وەقف (تەرخان كردووه)و، نیازیشی لەم ژیانەیدا ئەوەیه، كه به نەریتێكی بەخۆنازینو خۆبادانەوه له وەڵامی خوادا گوتی: ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَـَٔاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَـٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـٰكِرِينَ ﴿١٧﴾الأعراف ﴾، واته: شەیتان گوتی: خوایه بەهۆی ئەوەی لەبەهەشت دەرت كردمو سزات دام به گومڕایی، ئەوا

دەبێت منیش لەسەر ڕێگا ڕاستەكەی تۆ بۆسە(كەمین) بۆ بەندەكانت دابنێمو لەو ڕێیەی تۆ لایاندەم، پاشان لە هەموو لایەكەوەو بە هەموو شێوەیەك — لەپێشیانەوەو، لە دوایانەوەو لەلای ڕاستو لای چەپیانەوە- بۆیان بچمو گومڕایان بكەم، ئیدی ئەو جۆرە عەبدانە زۆربەیان پێنەزانو سپڵە دەبن.. لە وەڵامدا خواش پێی فەرمووە: ﴿ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ الإسراء﴾. واتە: دەبڕۆ بەلای كارو نیازەكەتەوەو، هەركەسێكیش لە وەچەو نەوەی ئادەمو لە ئادەمیزاد گوێڕایەڵییت بكات، ئەوا دۆزەخ سزای تۆو ئەوانیشە، كە سزایەكی پڕ بە پێستی كردارەكانتانە. هەروەها تۆ ئەی شەیتان، چەندە دەتوانیت سوور بە لەسەر لەڕێلادانیان بە دەنگی بانگەشەكاریت بۆ سەرپێچی لە فەرمانی خواو، هەرچی لە فڕوفێڵو تەڵەكەبازی یەك كە دەیزانیتو دەتوانیت بۆیان بخەرە گەڕو، هەر سوارو پیادەیەك بن لە سەرپێچكاریو شوێنكەوتنی تۆدا، پاشان لە ماڵو سامانی حەرامو بێباوەڕكردنی كوڕو نەوەیانو فریودانیاندا بۆ فەساد هاوبەشیان بەو بەشدارییان بكەو، ئنجا بەڵێنی درۆو پووچەڵیشیان پێ ڕاگەیەنە.. بەڕاستی شەیتان هەر بەڵێنێك بخاتە دڵو دەروونی گوناهكارو یاخی بوانەوە، تەنها فریودانو ڕازاندنەوەی كردارە نابەجێكانیانە. ئەی شەیتان دڵنیابە، كە بێگومان هیچ دەسەڵاتێكت بەسەر عەبدە ساڵحو چاكەكانم دا نیە، چونكە ئەو عەبدانە كاتێك بەڕاستی خوا دەپەرستن، هەر خوایان بەسە، كە پشتو پەناو پشتیوانیان بێت.

هەروەها خوا ئێمەی لە شەیتان ئاگادار كردۆتەوەو، دوژمنایەتی شەیتانیشی بۆ ئێمە روون كردۆتەوەو، داوایشی لێكردووین، كە شەیتان بە دوژمن دابنێین، تاكو

سەرکەوتوو نەبێت لە فریودانماندا و، تاکو ئەو گومانە خۆیشی لەسەرمان بەڕاست دەرنەچێت و، نیازو ئامانجیشی لەسەر ئێمە بەدیی نەهێنێت، وەك لە شوێنێکی تردا خوا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ۝٦﴾ فاطر.

چەند زیانمەندن ئەوانەی خۆیان تەسلیمی شەیتان دەکەن و، جڵەوی خۆیانی پێ دەسپێرن و، وەسوەسەو خورپەکانی بۆ جێبەجێ دەکەن و، بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانە زەرەرمەندو لەنێوچووو ئازاردراوی نێو دنیاو ڕۆژی دواییشن.

ئەوەش گەلی (سەبەء) چییان بەسەر هات.. ئەوە دەرەنجامی خۆ تەسلیم کردنیان بە شەیتان. هەر نەتەوەیەکیش خۆیان بە شەیتان بسپێرن تەنها ئەو بەرەنجامە دەچنێتەوە، کە گەلی (سەبەء) چنییانەوە. هەر مرۆڤێکیش خۆی بە شەیتان بسپێرێت هەمان سزای بەر دەکەوێت، کە هەر تاکە کەسێکی نێو گەلی (سەبەء) بەری کەوت. بەڕاستی ئەو کەسانە گەمژەو گێل و دەبەنگن، کە دوای شەیتان دەکەون، چونکە ئەگەر ئەم کەسانە نەبن، ئەوا شەیتانیش نیازو ئامانجی خۆی بەدیی ناهێنێت و، گومانەکەی خۆیشی ناباتە سەر.

زۆر بەداخەوە دەبینین زۆرکەس لە خەڵکی لە هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودا قایل دەبن بەوەی، کە ئیبلیس ئەرکی خۆی بەسەریاندا ڕاپەڕێنێت و، سەرکەوتوو بێت لە بەدیهێنانی نیازەکەیدا و، ئەوانیش هاوڕێبازی بن و دوای هەنگاوەکانی بکەون، ئیدی نابینین زۆربەیان سوپاسگوزار بن.

بەڵام ئایا ئەم جۆرە کەسانە بەزۆر ناچار کراون، کە بەدەم بانگەشەی شەیتانەوە بچن؟ ئایا زۆریان لێکراوە، کە دوای هەنگاوەکانی شەیتان بکەون؟ ئایا شەیتان دەسەڵاتێکی توندو بە زەبری لەسەریان هەیە؟! نەخێر هیچ دەسەڵاتێکی لەسەریان نیە.

لەبەر ئەمە ئەو کەسانە هەر خۆیان لێپرسراون لە شوێنکەوتنی شەیتان‌و، هەر خۆیشیان لێیان دەپرسێتەوە لەسەر بەدەمەوەچوونی بانگەشەکەی، چونکە بە خواستی ئازادانەی خۆیان شوێنی کەوتوون‌و، بە قایل بوونی خۆیان بە دەنگیەوە چوون‌و، دڵ‌و هەست‌و نەستی خۆیان بۆ کردەوە.

شەیتانیش، کە شوێنکەوتووە گێل‌و ساویلکەکانی بە بەڵێن‌و هیواو ئاوات، هەڵدەخەڵەتێنێت، لەکاتی پێویستییەکیاندا -کە ئاتاجیان بەو هەبێت- پشتگوێیان دەخات‌و، وازیان لێ دێنێت، تاکو بکەونە بەر یاسای سزادانی خوا، کە تەنها بەر کافرانی سەرپێچیکار دەکەوێت‌و، هەر تەنها ئەوانیش سزاو ئەشکەنجەی توندی خوا دەچێژن، ئیدی شەیتان بە فڕوفێڵ‌و گاڵتەجارییەوە لێیان دووردەکەوێتەوە.

ئەو لە دنیادا پێیان دەڵێت: ﴿...لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ الأنفال﴾، واتە: شەیتان کاتێك کردەوە نابەجێکانی بۆ شوێنکەوتوانی ڕازاندبۆوە، پێی گوتن: ئەمڕۆ هیچ زاڵ‌و سەرکەوتوویەك نیە بۆ ئێوەو بەسەر ئێوەدا لە خەڵکی‌و لەناو ئادەمیدا، من پەنادەرو پارێزەرم بۆ ئێوە، ئنجا کاتێ هەردوو دەستە لەیەکتر نزیك کەوتنەوە بەجۆرێ یەکتریان بینی، پاشەکشێی کردو بەدوای خۆیدا گەڕایەوەو پێی گوتن: بەڕاستی من بەریم لە ئێوە، بەڕاستی من شتێك دەبینم ئێوە نایبینن، من لەخوا دەترسم.

لەڕۆژی دواییشدا شەیتان لەنێو لایەنگران‌و شوێنکەوتوانیدا، لە ناوەڕاستی دۆزەخدا وەك وتاربێژێك ڕوویان تێدەکات‌و سەرزەنشت‌و لۆمەیان دەکات‌و گاڵتەشیان پێدەکات‌و بەچاوی سووك سەیریان دەکات‌و، خۆیشیان لێ بەری‌و

بێتاوان دەکاتو، پێیان دەڵێت: ﴿...إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ إبراهيم﴾، واتە: کاتێك شەیتان دیتی هەموو مرۆڤێك چارەنووسی خۆی دەبینێتو ئەو لایەنگرانەی خۆی لە قیامەتدا دەکەونە بەر لێپرسینەوەو، سزای کردەوەکانیان دەدرێت، پێیان دەڵێت: بێگومان خوا بەڵێنی ڕاستی خۆی پێدانو، ئەوا بەڵێنەکەشی هێنایە دی، منیش بەڵێنی درۆم پێدانو نەمبردە سەرو هیچ دەسەڵاتێکیشم بەسەرتاندا نەبووە، تەنها ئەوەندە نەبێت، کە بۆ ڕێی خراپو بێباوەڕی بانگم کردن، ئێوەش بە دەم بانگاشەکەمەوە هاتن، دە ئیتر سەرزەنشتی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشتی خۆتان بکەن، چونکە نە من فریاگوزاری ئێوەمو، نە ئێوەش فریاگوزارانی منن. من باوەڕم نیە بەوەی، کە ئێوە لە دنیاداو لەگەڵ مندا هاوبەشتان بۆ خوا دادەنا.

بەڕاستی ئیبلیس ئیبلیسەو، شەیتانیش شەیتانە..

گەلی (سەبەء)یش بەدەم شەیتانەوە چوونو، ڕێساو سوننەتی خوایان لەسەر پەیڕەو بووو شایستەیان بوو، ئەو کارەساتی ماڵوێرانیو پەرتەوازەییو لەنێوچوونەشیان تووش بوو، کە تووشی هەر نەتەوەیەکی تر دەبێت، لەکاتێکدا سپڵەو بێباوەڕو ستەمکارو بەدکارو فاسید بووبن. خوا (سەبەء)ی کردە چەندین پارچەو بەملاولادا بڵاوەی پێکردنو، کردنی بە هەواڵو دەنگو باسی سەرزاری خەڵکی.. دەی هەر دوور بن لە ڕەحمەتی خوا، وەك چۆن گەلانو کۆمەڵانی تری پێش خۆیان لە بێباوەڕانی ستەمکار – وەك گەلانی عادو سەمودو مەدیەنو ئەوانی تر- لە ڕەحمەتی خوا دوورخرانەوەو، کەوتنە بەر سزاو تۆڵەی سەختی خوا.

ئەمەش ئاکامێکەو چاوەڕێی هەرکەسێك دەکات، کە بەدەم بانگاشەو

ڕێچکەی شەیتانەوە چووبێت. چیرۆکی (سەبەء)یش لە سورەتی (سەبەء) —کە ناوی سوورەتەکەش بەو ناوەی ئەوانەوەیە- چەندەها بەڵگەو نیشانەو دەرس و دەلالـەتو عیبرەتو ئامۆژگاریی لەخۆ گرتووەو خستوونیەتە ڕوو. بەڵام تەنها کەسانی زۆر بە ئارامو زۆر سوپاسگوزار لەم دەرس و پەندو دەلالەتانە تێدەگەنو لێیـان هۆشیـارو ئاگادارن.. خواش بۆیە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾.

# چیــرۆكی حەوتەم

## چیرۆكی دانیشــتوانی ئاوەدانی یەكــە
## (قصة أصحاب القرية)

چیرۆكەكە لە قورئاندا ئاوا هاتووە كە خوا دەفەرموێت:

﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ
ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا
بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ
إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ
لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ قَالُوا۟ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ أَئِن
ذُكِّرْتُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ
يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ
﴿٢١﴾ وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن
يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى
ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ قَالَ
يَٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِى رَبِّى وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ
قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا
هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يس﴾.

# پوختــەی واتـای ئایەتەکــان بە کوردی

ئەی محمد ﷺ چیرۆکی دانیشتوانی ئەو ئـاوەدانی یـە بـە نموونـە بـۆ کـافرانی قورەیش بهێنەرەوە، کاتێك باوەڕیان بەخوا نـەدەهێناو سـەرقاڵی کفـرو بـەدکاری بوونو، خوا چەند نێرراوێکی بۆ ناردن (یان لەلایـەن عیـسی پێغەمبـەری خـواوە- سلاوی لێ بێت- چەند نێرراوێکیان بۆ چوو) تاکو بانگیان بکەن بۆ باوەڕهێنان بـە خواو بە موعجیزەکانی عیساو، دەست هەڵگرتن لە بتپەرسـتیو هـاوەڵ بـۆ خـوا دانان. ئەوەبوو سەرەتا دوو کەسمان بۆ لایان ناردو ئەوانیش بەدرۆیان خستنەوە، بـۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی ئەو دوو کەسە، کەسێکی سێهەمیشمان بـۆ لایـان نـارد، ئیدی نێرراوان هەموویان بە دانیشتوانی ئەو ناوچەیەیان گوت: بێگومان ئێمـە بـۆ ئەوە بۆ لای ئێوە نێرراوین، تاکو پەیامی خواو یەك خواپەرستیتان پـێ بگەیـەنین. بەڵام خەڵکی ناوچەکە پێیـان گـوتن: ئـاخۆ ئێـوەش وەك ئێمـە مـرۆڤنو، خـوای بەخشندەش هیچ سروشێکی بۆ ئێوە نەناردۆتە خـوارەوەو، هـیچ فـەرمانێکی وای سەبارەت بە کاروباری ئێمە بەسەر ئێـوەدا نـەداوە، تـاکو بیـسەلمێنن، کـە ڕاسـت دەکەن! ئێوە تەنها درۆ دەکەن لە ئیـددیعای نێرراوێتـی خۆتانـدا.. نێرراوەکـانیش گوتیان: خوای پەروەردگارمان شایەتو ئاگادارە، کە ئێمە بۆ لای ئێـوە نێـرراوینو هیچ کارێکی ترمان لەسەر نیە، جگە لە گەیاندنی ئـەو پەیامـە ڕوونو ئاشـکرایە نەبێت، کە بـە بەڵگـە ڕۆشـنەکانەوە دەیخەینـە بـەر چـاوتان.. ئیـدی ئـەو گەلـە سەرکەشو یاخی یە، هیچ قسەیەکی تریـان بەدەسـتەوە نـەما، ئـەوە نـەبێت، کـە ناڕەزاییان لە دەستیان دەربڕیو، پێیان گوتن: ئێمە بەهۆی هاتنی ئێـوەوە تووشـی شوومیو نەگبەتی بووین، ئەگەر پاشگەز نەبنەوەو کۆتایی بەم باسو خواسـانەتان نەهێنن، ئەوا بـەردبارانتان دەکـەینو لـە ئێمەشـەوە تووشـی سزایەکی هێجگـار ئازاربەخشی وەهاتان دەکەین، کە دەگاتە ڕادەی کوشتنتان.. نێرراوەکانیش پێیـان

گـوتن: خەڵکینــە ئێــوە شــوومیو نەگبــەتیو بەدبــەختیتان —بــەهۆی کفــرو بێباوەڕییتان- لە خۆتان دایە، خۆ ئەگەر بەخۆتاندا بچنەوەو پەند وەربگرن، دەزانن کە وایە، بەڵام وادیـارە ئێـوە گـەلێکی ئەوەنـدە بـەدکارو بێبـاوەڕن کـە لـەوەدا سنوورتان بەزاندووە.. دوای ئەو وتەو وێژەش پیاوێك لەوسەری شارەوە بە پەلەو بە هەڵەداوان دەگاتە لایانو ڕوو دەکاتە ئەو گەلەو پێیان دەڵێت: ئـەی گـەلی خـۆم، باوەڕ بە خوا بێننو دوای پەیامی ئەو نێرراوانە بکەون، دوای ئەو کەسـانە بکـەون کە لەسەر ئەم بانگەوازە پڕ لە خێـرو بەرەکەتـە داوای هـیچ کـرێو پاداشـتێکتان لـێناکەنو بە خـۆڕاییو لەخۆبوردوانــە هــاتوونو ئامۆژگارییتــان دەکــەنو، هــەر ئەوانیش ڕێی ڕاستیان وەرگرتووەو ڕێنموونیی ڕاست کراون. منیش چ بەربەسـتێك لە ڕێم دایە ئەگەر ئەو خوایە بپەرستم کە دروستی کردوومو هێناومیەتە بوونــەوەو ڕێی ڕاسـتی پیـشان داوم. ئایـا لــە جیـاتی ئــەو خـوا تـاكو بێهاوەڵــە چـەند خواوەندێکی پەرستراوو دەسکردنی خۆمان بکەمە خوا بۆ خۆم؟ خۆ ئەگـەر خـوای پەروەردگاری خۆم خواستی زیـانو کارەسـاتێکی لەسـەرم هـەبێت ئـەو خواوەنـدە دەسکردانەی خۆمان-بتەکان- هیچ شەفاعەتو سوودێکیان بۆم نیەو نـاتوانن مـن لە هیچ زیانو کارەساتێکی ئاوا ڕزگار کەن. کەواتە گەر باوەڕم بەو بتانـە هـەبێت ئەوا منیش لەسەر گومڕایی یـەکی ئاشـکرام. لەبـەر ئـەوە مـن بـاوەڕم بـەخوای پەروەردگارتان هێناوەو، ئێوەش با گوێتان لەم بڕیارەم بێتو شـاهیدو ئاگـادار بـن کە من باوەڕم بە خوا هێناوە.. بەڵام گەلەکەیان هەر لەسەر بێباوەڕی سوور بوونو ئەو پیاوەشیان بەردباران کردو کوشـتیان، ئـەویش لـەو حاڵەتـەدا گـوتی: خوایـە ڕێنمونی ئەو گەلەم بکرێت.. پێی گوترا: ئەوا بــەم هەڵوێـستە بەرزەتـەوە شـایانی بەهەشت بوویتو بچۆرە بەهەشتەوە.. ئەویش گوتی: خۆزگە گەلەکەم بیانزانیبایـە کە خوای پەروەردگارم لـێم خۆشـبووەو خـستوومیە بەهەشـتەوەو ڕێـزی لێنـاومو کردمی بە یەکێك لە ڕیز لێنراوان... ئێمەش — لەبەر ئەوەی ئەو گەلە بـێ بـاوەڕە لەسەر کفرو بێباوەڕیو کوشـتنی نێرراوانــی خـوا سـوور بـوون- سـزایەکی وەهـا

توندمان دان، سزاکەش ئەوەنەبوو، کە فریشتەو سەربازانی خۆمانیان بۆ بنێرین بە مەبەستی لەناوبردنیان، بەڵکو هەر تەنیا بە هاوارێکی توندی لەناکاو لەناومان بردن، ئەوانیش دەسبەجێ مردنو وەك کۆمەڵە کەسێکی بێدەنگو خامۆشو بێ چرپەیان لێ هات، وەك چۆن ئاگر لە کڵپە دەکەوێتو خامۆشو کپ دەبێتەوە.

## چەند وتەیەکی دەستهەڵبەستی جوولەکەکان (اسرائیلیات) لەسەر ئەم چیرۆکە

جوولەکەکان لە دەقە ئیسرائیلیی یەکانی خۆیاندا چەند وتەو ڕیوایەتێکی دوورودرێژیان لەسەر چیرۆکی دانیشتوانی ئاوەدانییەکە هۆنیوەتەوەو چنیوە، سەیر لەوەدایە لەکاتێکدا حیکایەت خوانو دارێژەرانی ئەفسانەکان ڕوویان تێکردووە، چەند مێژوونووسو تەفسیرنووسێکیش لە کتێبەکانیاندا هێناویانەتەوە.

ئێمەش — وەك چیرۆکەکانی پێشوو- سەرەتا ئاماژە بۆ پوختەی ئەو ڕیوایەتو دەقە چنراوە ئیسرائیلییانە دەکەین، بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەی خوێنەران لێیان. ئەمەش پوختەیەکی ئەو وتەو ڕیوایەتە نادروستەی جوولەکەکانە لەسەر ئەم چیرۆکە:

گوتوویانە: ئەو ناوچەیە، شاری (ئەنتاکیە) بووە کە شارێکی ڕۆمەکان بووەو پادشایەکی ستەمکاری بتپەرست کە ناوی (ئەنتیخوس) بووە، حوکمی تیادا کردوە. (عیسا)ش-سڵاوی لێ بێت- وستوویەتی بانگەوازی دانیشتوانی ئەو شارە بکات بۆ باوەڕهێنان بە خوا. بۆ ئەم مەبەستەش دوو پیاوی لە شوێنکەوتوانی خۆی —لە حەوارییەکان- ناردووە بۆ لایان، کە باسی خواپەرستیو باوەڕ بەخواهێنانی بۆ کردوون. بەڵام ئەو خەڵکە بە درۆزنیان داناونو بڕوایان پێ نەکردوون. ئنجا (عیسا) حەواریی سێهەمی بۆ ناردوون.

گێڕەروان لەنێوان خۆیاندا ناتەبایی یەکی زۆریان لەسەر ناوەکانی هەرسێ نێرراوەکە هەیە، بەڵام ئەوەی زیاتر لەلای کۆمەڵی زانا پێشینەکان بەڕاست تر دانراوە، ئەوەیە کە ناوەکانیان (شەمعون)و (یوحەننا)و پاشان (پۆلس) بێت.

هەر لەمبارەیەشەوە گوتوویانە (عیسا)-سلاوی لێ بێت- دوو نێرراوی خۆی بۆ (ئەنتاکیە) ناردووەو، ئەوانیش سەرەتا بە پیرەمێردێك گەیشتوون، کە چەند بەرخێکی خۆی دەلەوەڕاند، ئەم پیرەمێردەش (حەبیبی دارتاش) بووە، کە بانگیان کردووە بۆ سەر ڕێبازی خواو بۆیشیان ڕوون کردۆتەوە، کە هاوکات لەگەڵ بانگەوازەکەیاندا موعجیزەشیان پێیەو دەتوانن نەخۆشەکان چاك بکەنەوە. ئەویش کوڕێکی شێتی هەبووەو، ئەو دوو نێرراوەی (عیسا)ش دەستیان بەسەردا هێناوەو بەو شێتی یە چاك بۆتەوە، ئیدی پیرەمێردەکەی باوکیشی باوەڕی پێیان هێناوە. پاشان مەسەلەکەیان لەو شارەدا بلاوبۆتەوەو چەند کەسیان لە نەخۆشی چاك کردۆتەوە. پادشا کافرو بتپەرستەکەش هەواڵیانی بیستووەو لێیان پەست بووەو گرتوونیو خستوونیەتە نێو زیندانەوە. کاتێك (عیسا)ش هەواڵی پێگەیشتووە، کە چییان بەسەر هاتووە، پیاوی سێهەمی بۆ شارەکە ناردووە، کە ئەویش (شەمعون) بووە، (شەمعون)یش، تا گەیشتۆتە لای پادشاکە فێڵێکی وای بەکارهێناوە، کە باوەڕەکەی خۆی ئاشکرا نەکردووەو خۆی بە دیندار پیشان نەداوەو، بەم حاڵەتەوە لەگەڵ پادشادا ژیاوەو پلەوپایەی لەلای هەبووە، تا ئەو کاتەی پادشاکە ئەوی لەخۆی نزیك کردۆتەوەو کردویتی بە هاوڕازو ڕاوێژکارو هاوڕێی خۆی.

ڕۆژێك پێی دەڵێت: بیستوومە دوو پیاوت بەند کردووە لەبەر ئەوەی بانگەوازیان بۆ ڕێی خوا کردووە، جا ئایا دەتوانم لە هەواڵیان بپرسم، یان لێیان بپرسم؟ پادشاش دەڵێت: ئێستا بۆ مەسەلەی پرسیار لێ کردنیان ڕقم لێیان نەماوە.. ئەویش دەڵێت: دەی جا ئایا تۆ دەتوانیت بیانهێنیتو بیانبینم؟ کاتێك ئامادەیان کردن، (شەمعون) پێی گوتن: بەڵگەتان لەسەر دینداریتی یەکەتان چیە؟ گوتیان: دەتوانین مرۆڤی کوێرو گول (بەڵەك) چاك بکەینەوە.. بۆ ئەم مەبەستەش

منداڵێکی نەوجەوانیان بۆ هێنان کە شوێنی هـەردوو چاویـشی سـڕابۆوە، شـوێنی هەردوو چاویشی وەك ناوچەوان بوون.. ئەو دوو پیاوە بەندکراوەش نزایان لەلای خوا کردو داوایان لێکرد موعجیزەکەیان بۆ بەجێ بگەیەنێت، خـواش وەڵامـی نزاکـەی دانەوە، کوڕە نەوجەوانەکەش شوێنی چاوەکانی (قلّیشان)و هەردوو چاڵایی چـاوی دروست بوون، پاشان چاوانی کرانەوە وەك چاوساغێکی لـێ هاتەوە.

پادشاکەش سەرسام بوو بەوەی کە دیتنی، بۆیە پرسیارێکی لـە هـەردوو پیـاوە نێرراوە بەندکراوەکە کردو گوتی: هەر لەم شـوێنەدا کـوڕێکی نەوجـەوانی دی، لـە حەوت ڕۆژ لەمەوبەرەوە مردووەو، نەم ناشتووە هەتا باوکی دێت، ئایا خوای ئێـوە دەتوانێت زیندووی بکاتەوە؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ.

ئنجا بە ئاشکرا نزایان لای خوا کردو داوایان لێکرد ئەو کارەشـیان بـۆ ئـەنجام بدات، بەڵام (شەمعون) بە نهێنی نزای کـرد. خـواش کـوڕە مردووەکـەی زینـدوو کردەوەو، کوڕەکـەش هەسـتایەوەو، ڕووی گوتـاری کـردە خـەڵکیو پـێی گـوتن: خەڵکینە من حەوت ڕۆژ لەمەوبەر مردمو، خۆم وا بینییەوە، کە بـە موشـریك لـە قەلەم دراومو، خرامە حەوت دۆڵی ئاگری دۆزەخەوە، لەبەر ئەمە ئێـوەش ئاگـادار دەکەمەوە لەو حاڵەتی هاوەڵ بۆ خوا دانانو بێباوەڕییەی، کە تـێی کـەوتوون، دە ئێوەش باوەڕ بەخوا بێنن.

دوای ئەوە دیتم دەرگاکانی ئاسمان کرانەوەو کوڕێکی گـەنجی قـۆزم بینـی، کـە شەفاعەت بۆ ئەم سێ پیاوە دەکات، شەمعونو دوو هاوڕێکەی، هـەر شـەفاعەتی بۆ دەکردن، هەتا ئەو ساتەی، کە خوا منی زیندوو کردەوەو، منیش شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نیە تەنها (اللّٰه) نەبێتو، عیـساش ڕۆحو ئـیرادەی خوایـەو، ئـەم پیاوانەش نێرراوانی خوان.

تاقمەکەی پادشا لـە کـوڕە مێردمنداڵـە زیندووکراوەکـەیان پرسـی: ئایـا ئـەم (شەمعون)ەش لەگەڵ ئەوان دایە؟ گوتی: بەڵێ لەگەڵیاندایەو چاکترین کەسیانە.

(شەمعون)یش لەوێدا خۆی ئاشکرا کردو خۆی پێناساندن کە ئەویش نێرراوێکی (عیسا)یە بۆ لای ئەوانو، بانگی کردن بۆ سەر ڕێبازی خوا..

گوتوویانە: پادشاکەو کۆمەڵێکی زۆر باوەڕیان بەخوا هێناوەو، ئەوانی تریش کافر بوون.

گوتراویشە: پادشاکە باوەڕی نەهێناوە، بەڵکو زیاتر کافرو سەرکێش بووەو، هەرسێکیانی چەوساندۆتەوەو ئەشکەنجەیانی داوەو، ویستوویەتی بیانکوژێتو کۆتاییان پێ بێنێت، لەو کاتەشدا پیاوێك لەوسەری شارەوە بەهەڵەداوان گەیشتۆتە ئەو جێگایە -کە ناوی حەبیب کوڕی مریو ناسراو بە حەبیبی دارتاش بووە، کە پێشتر هەردوو نێرراوەکە بەلایدا تێپەڕ ببوونو بانگیان کرد بۆ لای خواو کوڕە شێتەکەشیان بۆ چاك کردبۆوە- ئەم پیاوە ڕودەکاتە پادشاو دارودەستەکەیو بانگی کردوون بۆ باوەڕهێنان بە خواو نێرراوانی. خۆیشی باوەڕهێنانی خۆی لەبەردەم هەمواندا ئاشکرا کردوە. پادشاکە لەویش پەست بووەو، فەرمانی بە سەربازانی کردوە کە بیکوژن، ئەوانیش شاڵاویان کردۆتە سەریو دەسبەجێ کوشتوویانە..

گوتراوە: گوایە سەربازەکان بەپێو بە لەقە دایانگرتۆتەوە تاکو ڕیخۆڵەکانی لە کۆمیەوە دەرچووەو مردووە.

گوتراویشە کە بەردبارانیان کردووەو، ئەویش لە ماوەی بەردباران کردنەکەیدا هەر گوتوویەتی: خوایا لە گەلەکەم خۆش بە، چونکە نازانن..

گەلەکەشی ئەویان کوشتووەو هەرسێ نێرراوەکەشیان لەگەڵ کوشتووە.

گوتراویشە کاتێك ویستوویانە (حەبیبی دارتاش) بکوژن، خوا ئەوی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوەو خستوێتیە بەهەشتەوە.

ئنجا جبریل بەو سزایەی خواوە کە دەنگو هاوارێکی هێجگار توندی لەناوبەر (صیحە)یەك بووە، بەوەوە هاتۆتە سەریانو، هەموویانی لەناو بردوە(۱).

---

۱) بڕوانە تەفسیری قرطبی/۱۵: ۱۳-۲۳، هەروەها عرائس المجالس ص:۳٦۳-۳٦٦ .

ئەم دەقە دەستهەڵبەستانە (ئیسرائیلیان)ەو، ڕیوایەتەکانی تایبەت بە درێژەی چیرۆکەکە، هیچیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەگێڕراونەتەوەو لەوەوە نەبیستراونو نەهێنراون. لەبەر ئەوە هەمووی لە بۆتەی گومانو بۆچوونی ناڕاستو مەزەندەکاری دایە. دیارە چیرۆکی گەلانی پێشینیش ئاوا ناگێڕرێتەوە، بەڵکو دەبێت لە فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگیرابێت.

لەبەر ئەمە ئێمە لە ئاست ئەو بەسەرهاتە ئیسرائیلییانەدا ناچارین، کە بێدەنگ بین، واتە نەدانی پێدانێینو، نە نکوولێشیان لێ بکەینو، نە بە پووچەڵی تەواویشیان بزانین.

کاتێك هەندێك لەم ڕیوایەتە ئیسرائیلییانەش دەخەینە ڕوو، بۆ ئەوە نیە، کە گێڕانەوەو دیاری کردنیان بەشیاو بزانین، بەڵکو تەنها لە دەروازەی لێوریابوونەوەو ئاگادارکردنەوەوە باسیان لێوە دەکەین، تا خەڵکی وریابن لێیان.

## چەند لایەنێکی نادیار لە چیرۆکەکەدا

لەو شتە نەزانراوو نادیارانەی لە چیرۆکەکەدا ناویان نەهاتووەو، کە نابێت خۆمان بە هەوڵی دیاری کردنو زانینیانەوە ماندوو بکەین، کە ناشبێت ڕێگە بە کەسانی غەیری خۆشمان بدەین بۆمان دیاری بکەن، بەهۆی ئەوەی هیچ فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح) لەبارەیانەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەهاتووە، هەندێك لەو شتە نەزانراوانە، ئەمانەن:

١- ناوی ئەو ئاوەدانی (قرية)یەی، کە نێرراوەکانیان بۆ ڕەوانە کراوەو، ناوی پادشاکەشیان.

٢- ناوەکانی ئەو سێ کەسە نێرراوەی، کە بۆ ئاوەدانی یەکە ڕەوانەکرابوون.

٣- ناوی ئەو پیاوەی، کە لەوپەڕی شارەوە بەهەڵەداوان هاتبوو.

٤- ناشزانرێت ئاخۆ ئەو سێ نێرراوە، چەند نێرراوێکی خوا بوونو ڕاستەوخۆ لە

خواوه نێرابوون، یان له شوێنکەوتوانی (عیسا)-سلاوی لێ بێت- بوون.

٥- چۆنیەتی گەیشتنیان بۆ ئاوەدانی یەکەو، ئەوەی لەو کاتەدا بەسەریان دا هاتووه.

٦- درێژەی بەسەرهاتی نێوان ئەوانو خەڵکی ئاوەدانی یەکە.

٧- ئەی ئاخۆ له ئاوەدانی یەکەشدا چییان بەسەردا هاتبێت؟ بڵێی ئەشکەنجە درابن، یان نا؟ ئەی ئایا هیچ کەسێك لەو ئاوەدانی یەدا بەدەم بانگەوازەکەیانەوە چوو، یان نا؟

٨- چۆنیەتیی کۆتایی هاتنی ژیانیان له ئاوەدانییەکەدا، ئایا کوژران، یان خۆیان مردوون، یان ئەو ناوچەیەیان بەرەو شوێنێکی دی بەجێهێشتووه؟

٩- چۆنیەتی هاتنی ئەو پیاوەی، که لەوپەڕی شارەوه بە پەلەو هەڵەداوان گەیشتبووه شوێنی گفتوگۆکەو، ئاخۆ ئەو پیاوه چ کاره بووبێت؟

١٠- ئاکامی پشتگیری کردنی پیاوەکه بۆ هەرسێ نێرراوەکە لە شارەکەداو، ئاخۆ هیچ کەسێك گوێڕایەڵیی وتەکانی ئەوی کردبێت؟

١١- چۆنیەتی کۆتایی هاتنی ژیانی ئەو پیاوه، که ئایا کوشتوویانەو، ئەی چۆن کوشتوویانەو، ئەی ئایا بۆ ئاسمان بەرز کراوەتەوه؟

١٢- درێژەی بەسەرهاتی خەڵکی شارەکە، لەدوای وتەکانی پیاوه ئیماندارەکەو، ئاخۆ کۆتایی ئەوانیش چۆن بووبێت؟

مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەربارەی نادیاربوونی ئەو مەسەلانەی نێو چیرۆکەکە، گوتوویەتی: "قورئان ئەوەی بەدیار نەخستووه، کە کێ بوون دانیشتوانی ئاوەدانی یەکەو، کام ئاوەدانی یەش بووه؟ بێگومان چەند وتەو بیروڕایەکی گێڕراوەی لێك جودا لەبارەیەوه هاتوونو، هیچ سوودێکیش لە بەدواداچوونی ئەو ڕیوایەتانەدا نیه. جا کە قورئانیش هیچی لەبارەوه ئاشکرا نەکردوون، ئەوه بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بێگومان دیاریکردنی ناوەکان، یان

جێگەیان هیچ شتێکی دی ناخاتە سەر مەبەستو دەلالـەتو ئاماژەکـانی پـشت چیرۆکەکە. لەوێشەوەو لەمەوەیە کە ئەو دیـاری کردنانـەی پـشتگوێ خـستووەو، چووەتە سەر ناوەڕۆكو کرۆکی پەندو عیبرەتەکە.

ئەو شوێنە ئاوەدانی‌یەك (قرية) بوو —سا ئیتر گوند، یان شارۆچکە یان شـارێك بووبێت-، خوا دوو نێرراوی بۆ ڕەوانە کردوون —وەك چۆن مووساو هاروونی بـرای، سلاویان لێبێ، ناردووە بۆ لای فیرعەونو دارودەستەکەی- خەڵکی ئەو ناوچەیەش، ئەو دوو نێرراوەی خوایان بـە درۆزن دانـاوەو بڕوایـان پـێ نـەکردوون. خـواش بـۆ بەهێزکردنی هەڵوێستو پەیامی ئەو دوو نێرراوە، نێرراوێکی تری سێهەمیشی یـە بەدوادا ناردوون تاکو جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی کـە ئـەم نێـرراوەی سـێهەم چ خۆیو چ ئەو دوانەی پێش خۆیشی، لەخواوە نێرراون، ئیدی سێهەمیان بانگەوازی ئەو دوانەو بانگەوازەکەی خۆیـشی سـەر لـەنوێ بـۆ خـستوونە ڕووو، گوتوویانـە: بێگومان ئێمە بۆ لای ئێوە نێرراوین"[1].

## یادو بۆنەی هـاتنی چیرۆکەکە لە سـوورەتی (یاسین)دا

مامۆستا پێشەوا (سيد قطب) ئاماژەی بۆ مەسەلەی پەیوەستیی نێوان چیرۆکی دانیشتوانی ئاوەدانی‌یەکەو، سوورەتی (يس)و، بۆنەو مناسەبەی دیاریکراوی تێیدا کردووەو، وایشی بەدیارخستووە، کە بێگومان بابەتی نێو سوورەتی (يس)، بابەتی سەرجەم سووڕەتە مەککەیی‌یەکانی ترە بە گشتی، کە بابەتی (عەقیدەو بیروبـاوەڕ بـە گرنگترینـی مەسـەلەکانی یـەوە)، وەك مەسـەلەکانی (خواوەنـدێتی)و (پەرستراوێتی)و (پەیام)و (ڕۆژی دوایی). هەروەها مامۆستا (سيد قطب) دەڵێـت: سورەتی (يس) دەیەوێت سێ ئامانج بەدیی بێنێت:

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦١ .

یەکەم: بنیاتنانی بناغەکانی عەقیدەو، دیاریکردنی شێوازی سرووش (وحی)و ڕوونکردنەوەی ڕاستگۆیی پەیام بۆ ئەم مەبەستەش چیرۆکی هاوەڵانی ئاوەدانی یەکەی هێناوەتەوە، تاکو خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لەسەرەنجامی بەدرۆدانانی سرووش‌و پەیامی خوا، ئەم جۆرە سەرەنجامەشی لەم چیرۆکەدا خستۆتە ڕوو. ئەمەش بەپێی شێوازی قورئان لە بەکارهێنانی چیرۆکەکانی بۆ بەهێزکردن‌و پشتگیریی کردنی مەسەلەکانی.

دووەم: چەق خستنە سەر مەسەلەی زیندووکردنەوەو کۆکردنەوەی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ لێپرسینەوەو پاداشت‌و سزا.

سێیەم: جەخت کردنە سەر مەسەلەی پەرستراویێتی‌و خوا بەیەکگرتن[1]".

دیسان مامۆستا (سید قطب) وای داناوە کە سوورەتی (یس) سێ بەشەو، بەشی یەکەمینیان –ئەوەی کە پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە هەیە- ئایەتەکانی (١-٢٩)یە.

سەبارەت بە بابەتەکەی دەڵێت: "بەشی یەکەم سوێندخواردن بە هەردوو پیتی (یاء، سین)و بە (قورئانی حەکیم) دەست پێدەکات لەسەر ئەوەی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەقەو پێغەمبەریش لەسەر ڕێگایەکی ڕاستە، پاشان دێتە سەر باسی ئاکامی بەدبەختانەی ئەو بێباوەڕە بێئاگایانەی کە پەیامی خوا بەدرۆ دادەنێت. ئەمەش حوکمێکی خوایە لەسەریان‌و لەمەڕ ئەوەی هیچ شێوازێك بۆ هیدایەت‌و ڕێنموونی نادۆزنەوەو هەتا هەتایە ئەو ڕێیەیان لێ وونە. پاشان باسی ئەوە دەکات کە ئاگادارکردنەوە تەنها بۆ ئەوانەیە کە دوای پەیام‌و ئایینی خوا دەکەون‌و بە پەنهانی‌و نادیاریی لە خوا دەترسن‌و، دڵیان سازو ئامادە کردووە بۆ پێشوازی‌و بەپیرەوەچوونی ڕێنیشاندەرەکانی هیدایەت‌و، ئاماژە سوودبەخشەکانی ئیمان.

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٥٦ بە کورتی.

پاشان خوا، پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ بۆ ئەوە ئاراستە دەکات کە چیرۆکی (دانیشتوانی ئاوەدانی یەکە)یان بە نموونە بۆ بهێنێتەوەو، بەسەرهاتی نەریتی بەدرۆدانانی پەیامی خواو، سەرەنجامی بەدرۆخەرەوانیشیان بۆ بگێڕێتەوە. هەروەها سرووشتی باوەڕ لە دڵی پیاوی باوەڕداراداو، سەرەنجامی ئیمانو بڕواپێکردن، دەخاتە ڕوو[1]".

(سید قطب) کاتێك هاتۆتە سەر تەفسیرکردنی ئایەتەکانی چیرۆکەکەش، بەم وتەیە دەسپێکی بۆ داناوە، کە گوتوویەتی:

"دوای خستنەڕووی مەسەلەی سرووشو پەیامو، مەسەلەی زیندووکردنەوەو لێپرسینەوە لەم دیمەنە بڕیارئامێزو پێ‌لەسەر داگیراوەدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم دوو مەسەلەیە لە دیمەنێکی (چیرۆك ئامێزدا) بخاتە ڕوو کە لە دەرگای دڵ دەداتو ئەو هەڵوێستانەی بەدرۆدانانو، باوەڕهێنانو، سەرەنجامی هەردووکیان پیشان دەداتو دەیخاتە بەرچاوانی خەڵکی[2]".

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٥٧ .

٢) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦٠ .

# چیـرۆکـەکە دوو دیمەنــە

دەشێت چیرۆکەکە بۆ دوو دیـمەن دابەش بکەین:

دیمەنی یەکەم/ وتووێژی ڕووبەڕووی نێوان سێ نێرراوەکەو خەڵکی ئـاوەدانی یەکـە، ئەوەبوو نێرراوەکان چوون بۆ لایانو، خۆیانیان پێ ناساندن کە بێگومـان ئـەوان لەلایـەن خـواوە بـۆ لای ئـەوان نێـردراون. بـەڵام خـەڵکی ناوچـەکە بـەدرۆیان خستوونەتەوەو، تیروتوانجیان لە پەیامەکەیان داوەو، گومانو پلاریـان لەسـەری خرۆشـاندووەو، گوایـە بـەهۆی ئـەو نێرراوانەشـەوە نەگبـەتیو شـوومی ڕووی تێکردوون. نێرراوەکـانیش وەڵامـی هـەموو ئـەو قـسەو گومـانو پلارانـەیان داونەتەوە. ئەم دیمەنەش لە ئایەتەکانی نێوان (١٣-١٩)دایە.

دیمەنی دووەم/ هاتنی پیاوە باوەڕدارەکە بە پەلە لەوپـەڕی شـارەوە، وەك لایـەنگرو پـــشتیوانێك بـــۆ نێرراوەکـــانو، وەك بـــاوەڕ پێهێنــــەرێکیانو، وەك ئامۆژگاریکارێکی گەلەکەشیو، وەك بانگەوازکاریان بۆ ئەوەی نێرراوەکـان بـە ڕاسـتگۆ دانـێنو بڕوایـان پێبکـەنو بـاوەڕ بـە پەیامەکـەیان بێـننو، بـەدەم بانگەوازەکەیانەوە بچن. بێگومان هەر ئەم پیاوە باوەڕدارە هەموو ئەو گومانو پلارانەی گەلەکەی خروشاندبویان، پووچەڵ کردەوەو، عەقیدەو ئیمانەکەشی بـە جوانترین شێواز بۆ خستنە ڕووو، لەسەرەنجامی (کفرو بەدرۆخستنەوەی پەیامی خوا)ی ئاگادارکردنەوەو، لەبەر چاوی خۆشیاندا ئیمانداریێتیو باوەڕهێنانی خۆی بەخوا، ئاشکرا کرد. بەڵام وا دیارە خەڵکی ئاوەدانی یەکە، نەك هـەر بـەدرۆیان خستەوەو بڕوایان بەو پیاوەش نەکرد، بەڵکو دەستدرێژییان کردە سـەر گیـانیو گۆشتیانو گیانیان لە لاشەی جیاکردەوە، ئەویش بە (شەهیدیی) بەخوای خـۆی گەیشتەوە، خواش مژدەی بەهەشتی پێدا. ئەویش هیوای ئـەوەی خواسـت کـە گەلەکەی بەو ئاکامە باشەو ئەو پاداشتە گەورەیەیان بزانیایە. ئەم دیمەنەش لـە ئایەتەکانی نێوان (٢٠-٢٧)دایە.

دوای پیشاندانی هـەردوو دیمەنەکـە، قورئـانی پـیرۆز بـە دوو ئایـەت تیـشکی خستۆتە سەر ئەو سزاو ماڵکـاولیو لەنێوچـوونەی، کـە خـەڵکی ئـاوەدانییەکـە بەهۆی کفرو بێباوەڕییانو بەدرۆخستنەوەی نێرراوانی خواوە تووشیان بووە، ئەویش ئەو سەدای هاوارە توندو بەهێزە بوو، کە لوولی کردوونو، وەك ئـاگری خـامۆشو کپ بوویان لێ هاتووە. ئەمەش لە هەردوو ئایەتی (٢٨و ٢٩) ی سوورەتەکەدایە.

## هەڵوێستەیەك لە ئاست مشتومڕی نێوان نێرراوەکانی خواو خەڵکی ناوچەکەدا

گوتمان دیمەنی یەکەم لە چیرۆکەکەدا (مشتومڕی ڕوبەڕووی نێوان نێرراوەکانو خەڵکی ناوچەکە) لەخۆ دەگرێت، ئەوەبوو هەرسێ نێرراوەکـە خۆیـان بـە خـەڵکی ناوچەکە ناساندو، ئەوانیش بە پەیامیانو ئەرکی بانگەوازیانەوە، ناسـییان، بـەڵام بەدرۆزنیان دانانو باوەڕیـان پـێ نـەهێنان. ئێمـەش لـە ئاسـت ئـەم مـشتومڕەدا هەڵوێستەیەکی کورد دەکەینو هەندێك وتەی نەستەقو ئامـاژەو پەنـدو دەلالـەتی نایابی لـێ دەردێنین:

### ١- ئایا هەرسێ نێرراوەکە، ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە نێررابوون؟

قورئانی پـیرۆز هـەواڵی نـاردنی دووکەسـی بـۆ لای خـەڵکی ئـاوەدانی یەکـە ڕاگەیاندووەو، پاشان سێهەم کەسیش بۆ بـەهێزکردنی هەڵوێـستی یەکـەمو دووەم نێرراوەو، وەسفی هەرسێکیشیانی بـەوە کـردووە، کـە بێگومـان ئـەوان نێـرراوان بوونو، وشەی (مرسلون)یش چوار جار لـە ئایەتـەکانی تایبـەت بـەو چـیرۆکە لـە سوورەتەکەدا هاتووەو، بەم ڕەنگە:

١/ ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾.

٢/ ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ﴾.

٣/ ﴿ قَالُوا۟ رَبُّنَا یَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَیۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴾.

٤/ ﴿قَالَ یَـٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلۡمُرۡسَلِینَ ﴾.

زۆرکەسیش لە نووسەرانی تەفسیر پرسیاری ئەوەیان کردووە کە ئاخۆ ئەوانە لەلایەن خواوە نێرراون یان لەلایەن پێغەمبەرێکی خواوە نێررابوون؟

زۆر کەسی تریش لە تەفسیرنووسانو چیرۆکناسان لەو بڕوایەدان کە ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە نەنێرراون، بەڵکو لەلایەن پێغەمبەرێکی خواوە نێرراون، ئەو پێغەمبەرەش (عیسای کوڕی مریەم) بووە-سلاویان لێ بێت-.

لەنێو وتەو بۆچوونەکانی ئەو زانایانەی تەفسیریش دا، وتەیەکی (ئیمامی ڕازی) هەڵدەبژێرین، کە لەم بارەیەوە لە تەفسیرەکەی دا گوتوویە:

"لە فەرمایشتەکەی خوادا ڕستەی (إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ) بە مانای نێرراوەکان هاتن بۆ لای خەڵکی ئاوەدانی یەکە لەو کاتەدا کە ناردبوومانن بۆ لایان، واتە ئەوان لەخۆیانەوە نەچووبوون، بەڵکو بەپێی ئەو فەرمانەی کە پێیان درابوو، چوون.

ئەمەش ئاماژەیەکی نەستەق دەگەیەنێتو، ئەوەیە کە لە چیرۆکەکەدا هاتووە کە بێگومان ئەوان لەلایەن (عیسا)وە نێررابوون، کە ناردبوونی بۆ (ئەنتاکیە)و، وەك ئەوە وایە کە خوا بفەرمونێت: ناردنی (عیسی) ناردنی ئێمەیە، نێرراوی پێغەمبەری خواش کە بە مۆڵەتی خوا ناردبێتی، ئەوە نێرراوانی خواشە. ئیدی ئەی محمد! تۆش نیگەران مەبە لەوەی کە ئاخۆ ئەو نێرراوانە نێرراوانی پێغەمبەرێکی خوابنو تۆش ڕاستەوخۆ پێغەمبەری خوایت، چونکە بەدرۆدانانی پەیامەکەی ئەوانو بەدرۆخستنەوەی خۆیان، وەك بەدرۆخستنەوەی تۆو پەیامەکەت وایە[1]".

کۆمەڵێك لە زانایانی تری تەفسیر ڕایان وایە کە ئەو نێرراوانە، ڕاستەوخۆ لەلایەن خوا خۆیەوە نێرراونو، هیچ نامۆییو مەحاڵ بوونێکیشی تێدا نیە کە

---

١) تەفسیری رازی/ ٢٦: ٥١ .

خوای گەورە دوو نێرراو پێکەوە بۆ گوندێك یان شارێك بنێرێت‌و، پاشان سێهەم نێرراویش بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستیان بەدوایاندا بۆ هەمان شوێن بنێرێت.

سەبارەت بەم ڕایەش مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەڵێت:

"ئەو شوێنە ئاواییەك بووە کە خوا دوو نێرراوی بۆ ناردووە، وەك چۆن مووساو هاروونی برای بۆ لای فیرعەون‌و تاقمەکەی ناردووە، جا خەڵکی ئاواییەکە بەدرۆیان خستونەتەوە، خواش سێهەم نێرراوی بۆ بەتین کردنی پێگەو هەڵوێستی ئەو دوانەی تر ناردووە تاکو جەخت بکاتە سەر ئەوەی کە بێگومان ئەوان هەردوکیان دوو نێرراون لەلایەن خواوە[1]".

لەوانەشە ئەمە ڕای ڕاستتر بێت، چونکە ئەم ڕایە لەگەڵ ڕواڵەتی دەقە قورئانی یەکەدا دەگونجێت، بێگومان قورئان بەو ڕواڵەتە دیارەی دەقە بەرچاوخراوەکەیەوە کاری ناردنی ئەو سێ کەسەی خستۆتە پاڵ خوا: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾. بەم ڕەنگەش قورئان ئەو سێ کەسەی (بە نێرراوان بۆ لای خەڵکی ئاواییەکە) لەقەڵەم داوە. شێوازی بنەڕەتییش لەم ڕووەوە ئەوەیە کە ڕواڵەتی دەقە قورئانی یەکە وەرگیرێت‌و، لەبەر ڕۆشنایی مەسەلە ئاماژە پێدراوەکەیدا وتەو بیروڕا، بدرکێنرێن‌و، لەو ڕواڵەتەوە ڕوو نەکرێتە مەجازو هێنانی قسەوباسی تر، تەنها لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێت، واتە لەکاتێکدا کە نەتوانرێت یان مەحاڵ بێت پشت بە ڕواڵەتی دەقە قورئانییەکە ببەسترێت. ئەمەش ڕێسایەکی ڕاستەوانەو دەرهاوێژراوی ڕێساکانی تەفسیرە. بەڵام لێرەداو لەم چیرۆکەدا هیچ ئاتاجێکمان بە وەرگرتن‌و هێنانی بیروڕاو بۆچوونی دی لەسەر ڕواڵەتی دەقەکە نیە، چونکە ئەوان چەند نێرراوێك بوون کە ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە نێرراون‌و والله اعلم.

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦١ .

## ٢- سووربوون لەسەر ناردن (فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ):

خـوا دەفـەرموێت: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾ مانـای (عززنا: قوينا بثالث) بە سێهەم نێرراو، ئەو دوانەی ترمـان بـەهێز کـرد، ڕستەی (عززنا) دوو خوێندنەوەی تیادایە:

یەکەم: (عززنا) بە سووك کردنی پیتی زای یەکەم، کە مانای (غلبنا)یەو لە وتـەی (عزّ) واتە (غلب)ەوەیە.

دووەم: (عزّزنا) بە توندکردنی پیتی زای یەکەم –کـە شـەددەی لەسـەر بێـت- بـە مانای (قوّينا)و (شددنا) دێت.

بەپێی خوێندنەوەی یەکەم-واتە بە سووك کردنی پیتی زای یەکـەم- ماناکـەی وای لـێدێت کە: (بێگومان هەق بەهۆی نێرراوی سێهەمەوە بەهێزو دەرکەوتووەو سەرکەوتوو بووە، کـە هـەردوو نێرراوەکـەی پـێش خـۆی بـە ڕاسـتگۆ دادەنێـتو پشتگیریی ڕاستیی پەیامەکەیان دەکات).

بەپێی خوێندنەوەی دووەمـیش-کـە تونـدکردنی پیتـی زای یەکەمـە- مانـای ئەوەیە: ئێمە بەڵگەو نیشانەی هەردوو پێغەمبەرەکەی پێشوومان بـە پێغەمبـەری سـێهەم بـەتین کـردو، هەڵوێـستیانمان بـەهێز کـردو، بەڵگـەو نیـشانەی ئـەوەی سێیەمیشیان بـۆ بەڵگـەو نیـشانەکانی هـەردووکیان زیـادکردو بـە هەڵوێـستو تێڕوانینی نێرراوی سێیەم، هەڵوێستو تێڕوانینی ئەو دوانەمان تۆکمە کرد[1]".

هەردوو خوێندنەوەکەش لە ماناکانی لێك نزیكو هاوشێوەن.

بـەڵام ئـەو کەسـەی بـە وردی سـەرنج لـە ڕسـتەی (فعزّزنـا بثالـث) دەدات، وێستگەیەکی جوانی ڕوونکردنەوە ڕادەگرێت، ئەویش لابردنـی بـەکاربراو(مفعـول بە)یە لەدوای کردار(فعل)ی (عززنا)وە.

---

١) حجة القراءات، لأبن زنجلة: ٥٩٧ .

ئیمام (زەمەخشەری)یش لە کتێبی (کشّاف)ەکەی خۆی دا پرسیاری لـە بابـەت حیکمەتی ئەو ڕستەیەوە کردووەو لێی کۆڵیوەتەوەو، پاشان گوتوویەتی:

"مەبەست لە باسی ئەو شتە بەهێزکراوەو، لەو ڕێو شوێنە جوانـەش، کـە بـۆ بەهێزکردنەکە گیراوەتەبەر، بۆ ئـەوە بـووە تـاکو (هـەق) بـەهێزو تۆکمـە بێـتو، (ناهەق)یش بـێهێزو سەرشـۆڕ بێـت. جـا ئەگـەر گوتارەکـە بـۆ مەبەسـتێك لـە مەبەستەکان بەیدەست کرابێت، ئەوا ئاڕاستەو سیاقەکەشی بـۆ تـەرخان کـردووەو ڕوانگەشی بەرەو ئەوەیەو، ئیدی وەها دەردەکەوێت، کە هەرچی لە غەیری ئەوەیە، ڕەت کراوەو تووڕدراوە. هاوتای ئەمەش-بۆ نمونە- وەك ئەو وتەیەتە، کـە بڵێیـت: (ئەمڕۆ سوڵتان بە حەق حوکمیدا)، گرنگ ئەوەیە تۆ لێرەدا مەبەستی ئاڕاستەکراو لە سیاقی وتەکەتدا ئەوەیە، کە ناوی (حەق)ت بردوە، لەبەر ئەوە ڕەتـت کردۆتـەوە کـە نـاوی (حـوکم بـۆدراو)و نـاوی (حـوکم لەسـەر دراو)یـش بـەریت.. گـرنگ حەقەکەیە[(١)]".

جا ئەگەر سەرنج بدەینە حیکمەتی ناردنی دوو نێرراوو پاشان بەهێزکردنیان بـە نێرراوێکی سێیەم، ئەوا دوو ئاماژەی لـێ بەدیار دەخەین:

١) بێگومان (نێرراو) بە نێرراوێکی دی بەهێز دەبێت، دوو نێرراویش بە نێـرراوی سێیەم بەهێز دەبن، وەك چۆن (موسا)ش لـە نزاکەیـدا داوای لـە پـەروەردگار کرد، کە (هارون)ی برایشی بۆ کۆمەكو پشتگیریی لێکردنی لەگەڵ خۆیدا بـۆ لای فیرعەون بنێرێـت: ﴿ وَأَخِي هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ القـصص ﴾. واتـە: مووسـا دوای وەرگرتنی ئەرکی پێغەمبەرێتیو ڕەوانەکرانی بۆ لای فیرعـەون، لـە بەشـێکی تری نزاکەیدا داوای لە خوا کردو گـوتی: خوایـە، هـاروونی برایـشم لەگـەڵدا بنێرە، چونکە ئەو لەکاتی لێـدوانو گفتوگـۆدا لـەمن ڕەوانبێـژترەو بەچـاکی

---

١) الكشاف، للزمخشري/ ٣: ٣١٧-٣١٨ .

مەبەست ڕوون دەکاتەوە، هەروەها تاکو ببێتە پاڵپشتێك بۆ منو بەڕاستگۆم دابنێت لەلای ئەوان.

بێگومان خواش نزاکەی گیراکردو داواکەی بۆ بەجێگەیاندو، لە وەڵامیدا فەرمووی: ﴿قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾ القصص﴾، واتە: ئێمەش بە هاروونی برات بەهێزت دەکەینو دەیکەینە پاڵپشت بۆ تۆو، ئیدی هەردووکتان بەڵگەو نیشانەیەکی وەهاتان پێ دەدەین کە بەهۆیەوە نەتوانن دەستتان بۆ درێژکەنو زیانێکتان لێبدەن، هەروەها بەهۆی ئەو ئایەتو موعجیزە گەورانەمانەوە کە لەسەر دەستی موسا بەدیی دێت ئێوەو ئەوانەش کە شوێنی پەیامەکەتان دەکەونو باوەڕ دێنن سەرکەوتوو دەبن.

٢) بێگومان ناردنی نێرراوی سێیەم، وەڵامدانەوەیەکی خەڵکی ناوچەکەیە لەسەر ئاکاری بەدرۆخستنەوەی هەردوو نێرراوەکە. ئەمەش سووربوونی تێدایە لەسەر (ناردن)و لەسەر (گەیاندن)و، وانەیەکی کاریگەریی بانگەوازییشە. چونکە بانگەوازکارانی ڕێی خوا ڕووبەڕووی خەڵکی دەبنەوەو بانگیان دەکەن بۆ ڕێی ڕاست، لەوانەیە بانگکراوان بەدەم بانگەوازیشیانەوە نەچنو، تەنانەت بەرەنگاریشیان ببنەوە، بۆیە ئەوەی کە لەسەر بانگەوازکاران پێویستە، بەردەوام بوونە لە کاری بانگەوازو، سووربوونە لەسەر ئامۆژگاریو، گەیاندنی پەیامی خوا، لەبەر ئەوە نابێت (بەڕوو وەرگێڕانی بانگکراوان) ئەمان واز لە بانگەواز بێننو، ئەرکەکە پشت گوێ بخەنو پاڵی لێ بدەنەوە.

## ٣- مرۆڤبوونی پێغەمبەرانو، پەیامی ڕۆشن:

هەرسێ نێرراوەکە خۆیان وەها ناساندبوو بە خەڵکی ئاوەدانییەکە، کە پێیان گوتبوون ئێمە بۆ لای ئێوە نێرراوین (إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ). بەڵام خەڵکی ئاوەدانییەکە یەکەمین گومان کە لە بەرەوڕوویان خروشاندیان، گومانی (مرۆڤ

بوونی نێرراوان) بوو، لەسەر بنچینەی ئەم گومانەش بیروڕایەکی هەڵەیان بنیات ناو، ئەوەبوو وایان پێ ڕاگەیاندن گوایە ئەم نێرراوانە درۆزنن‌و، نێرراو نین ﴿ قَالُواْ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴿١٥﴾ یس ﴾.

ئەمەیە ئەو گومانەی کە هەر گەلێك لە بەرەوڕووی پێغەمبەرەکەیاندا دەریان بڕیوەو، بە بەربەستێکی بەردەم بڕواپێکردن‌و باوەڕ پێ‌هێنانیان داناوەو، داواشیان کردووە کە دەبێت پێغەمبەر فریشتەیەك بێت لە فریشتەکان (ملائکة)و، ئیدی باوەڕهێنانیان بە (فریشتەبونی پێغەمبەران)ەوە هەڵپەساردووە.

مامۆستای پێشەوا (سید قطب)یش تیشکی خستۆتە سەر گومڕایی‌و گەمژەیی ئەو جۆرە بۆچوون‌و داواکاری یەو، لەوبارەیەوە گوتوویەتی:

"ئەم بەرهەڵستکاری یە بەردەوام‌و چەند بارەبوانەی خەڵکی لەسەر مەسەلەی (مرۆڤبوونی پێغەمبەران‌و نێرراوانی خوا)، گەمژەیی بۆچوون‌و پەی بردنی تێدا ڕەنگ دەداتەوە، هەروەك نەفامی‌و پەی نەبردن بە ئەرکی پێغەمبەرانیشی تێدا دەردەکەوێت. چونکە خەڵکی هەمیشە لەو بڕوایەدابوون گوایە نهێنی یەکی شارراوە لە کەسێتی‌و ژیانی پێغەمبەراندا هەیەو، لە پشت ئەمەشەوە خەیاڵ‌و ئەفسانەکان هەیە، چونکە – هەر بە ڕای ئەوان- ئایا –ئەو کەسە نێرراوە- ڕەوانەکراوی ئاسمان نیە بۆ سەر زەوی؟ ئیدی چۆن خەیاڵ‌و ئەفسانەکان دەورەیان نەداوە؟ چۆن کەسێتیی پێغەمبەرو نێرراوی خوا کەسێتییەکی دەرخراوو سادەو سانا دەبێت کە هیچ ڕازو نهێنییەکی تێدا نەبێت؟ چۆن کەسێتییەکی سادەو ساکار لە کەسێتییەکانی نێو خەڵکیی بازاڕو ماڵان دەبێت؟!

ئا ئەمەیە گەمژەیی‌و گومڕایی ئەو بۆچوون‌و تێفکرینە، چونکە نهێنی‌و ڕازەکان سیفەتێکی پێوەلکاوی بەردەوامی پێغەمبەرێتی‌و پەیام نین‌و بەم دیمەنە ساویلکەیی یە منداڵانەیەشەوە نین. ڕاستە کە ڕازو نهێنییەکی گەورەو گران لە کاری پێغەمبەرێتییەکەدا هەیە، بەڵام ئەم ڕازو نهێنییە گەورەیە لە ڕاستی‌و

حەقیقەتێکی ساناو واقیعیدا ڕەنگ دەداتەوە کە حەقیقەتی سپاردنی ئامادەباشیی سروشتیو خواکردە کە بەو جۆرە مرۆڤانەی -وەك پێغەمبەران دەسپێررێت تاکو ئامادە بن بۆ وەرگرتنو لە ئەستۆنانی سروشی ئاسمانی، ئەمەش لە کاتێکدا کە خوا هەڵیدەبژێرێت بۆ وەرگرتنی ئەو سروشە سەرسوڕهێنەو، ئیدی لەوەش سەرسوڕهێن ترە کە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوەکە فریشتەیەك بێت -بەگوێرەی داواکاریو پێشنیاری خەڵکەکە-.

پەیامەکەش بەرنامەیەکی خوایی یە، کە گرۆی بەشەریی تێیدا دەچی، ژیانی پێغەمبەرەکەش نموونەیەکی واقیعیانەی ژیانەکەیە بەپێی بەرنامە خواییەکە.. ئەم نموونە واقیعییەی ژیانی پێغەمبەرەکەش داوا لە خەڵکی دەکات، کە بیکەنە سەرمەشقی خۆیان. چونکە خەڵکی خۆیان مرۆڤن. بۆیە هەر دەبێت پێغەمبەرەکەشیان لە مرۆڤو گرۆی ئادەمی بێت، تاکو نموونەیەك لەو ژیانەیان بۆ بەدی بێنێت، کە خەڵکی خۆشیان خاوەنی توانای شوێنکەوتنو چاولێکردنی بن. هەر لەمەشەوە ژیانی دواین پێغەمبەری خواش محمد ﷺ وەك نموونەی راستو دروستی ژیانێکی مرۆڤایەتی خراوەتە بەر دیدەو چاوانی نەتەوەکەی. قورئانیش -کە کتێبی جێگیرو هەمیشەیی خوایە- لایەنە سەرەکییەکانی ئەو ژیانەی -بە بچوکترین باسی ژیاننامەو ڕووداوەکانی ئەو ژیانەوە-و بەو پێودانگەش کە تاکە لاپەڕەو ڕووبەندی پیشاندراوی بەرچاوانی نەتەوەکەیەتی بە درێژایی ساڵانو سەدەکان، تۆمارکردووە[1]".

جا نێرراوەکانیش -لەم چیرۆکەدا- لەئاست ئەو گومانەی سەبارەت بە مرۆڤبوونی پێغەمبەران خروشێنراوەو، لە ئاست ئەو جۆرە تۆمەتبارکردنەی نێرراوانیش بە تاوانی درۆکردن، ئەرکی خۆیان لە خزمەت دانیشتوانی ئاوەدانییەکەدا بەوە دەستنیشان کردووە، کە خوا خۆی ئاگادارو زانایە لە حاڵیانو

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦١.

خوا خۆی دەزانێت کە ئەمان نێرراونو، هیچ ئەرکێکی تریان لەسەر نیە تەنها گەیاندنی پەیامە ڕۆشنو ڕاستو دروستەکەی خوا نەبێت" ﴿قَالُواْ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٧﴾﴾ یس.

ئەمان لە نێرراوانن، چونکە خوای پاكو بێخەوش خۆی ڕەوانەی کردوونو، هەر خۆیشی دەزانێت کە بەڕاستی ئەوان نێرراون، ئیدی تەنها ئەو زانینەی خواو، شاهێدی بۆدانی خوایانو، پشتگیریی خوایان بەسەو، هیچ زیانێکیشیان بەوە لێ ناکەوێت، کە خەڵکی بە درۆزنیان دابنێنو بەدرۆیان بخەنەوەو بەرهەڵستییان بکەن.

ئەرکی ئەوان لەنێو گەلەکەدا گەیاندنی پەیامی ڕۆشنی خواو تێگەیاندنی ڕوونو ئاشکرایە (البلاغ المبين). ئەوان بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوەو بێپێچو پەناو بەم جۆرە دەستنیشانکارییە، ئەرکی خۆیان بەرامبەر گەلەکەیان دیاری کرد.

ئەرکی پێغەمبەرانو ڕەوانەکراوانیش تەنها بەند نیە لەسەر باوەڕ پێهێنانی خەڵکیو بەزۆر ناچارکردنیان بۆ باوەڕهێنان، ئەرکی ئەوان ئەوەش نیە، کە ئیمان بخەنە دڵی خەڵکییەوە، بەڵکو تەنها گەیاندنی پەیامی ڕۆشنو تێگەیاندنی ڕوونو ئاشکرایانە لە پەیامەکەی خوا.

پەیامی خوایان پێدەگەیەننو بەڵگەو نیشانەی گەواهی دان لەسەریان تۆمار دەکەنو، پاشان بەجێیان دێڵن. ئەو گەلەش تەنها هەڵبژاردنی ڕێگاکەیان لەسەرە، هەڵبژاردنی ڕێگایەك بە سەربەستیو خواستی ئازادانەو هەوڵ دانو بەدی هێنان، جا ئیتر، یان ڕێگای باوەڕهێنان بە پێغەمبەرانو ڕێگای شوێنکەوتنیان دەگرنە بەرو، بەم هۆیەشەوە سەردەکەونو سەرفراز دەبن، یاخود ڕێگای بێباوەڕیو بەدرۆخستنەوە هەڵدەبژێرنو لەناو دەچنو سزا دەدرێن، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا هەر خۆیانن، کە ڕێگەکەیان هەڵبژاردووەو هەر خۆشیان دەبێت باری لێپرسراوێتییەکە لە ئەستۆ بگرنو، ئەنجامەکەشی پەسند بکەن.

جا ئەگەر ئەرکی پێغەمبەران لەلای گەلو نەتەوەکان گەیاندنی پەیامی ڕۆشنی

خوا بێت پێیان، ئەوا ئەرکی ئەو بانگەوازکارو ئامۆژگارو چاکسازیخوانەش، کە شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانن، هەر گەیاندنی پەیامە ڕۆشنەکەی خوایە، ئیدی ئەم ئەرکەش لە گەیاندنی پەیامە ڕۆشنەکەدا بەجێ دەگەیەنرێت.

## ٤- نەگبەتی.. لە پێغەمبەران و بانگەوازکارانەوە.. نیە

دانیشتوانی ئاوەدانییەکە لە ئاست پەیامی ڕۆشنی هەرسێ نێرراوەکەدا، وەڵامیان ئەوەبوو، کە پێیان ڕاگەیاندن گوایە ئەمان بەهۆی ئەو نێرراوانەوە تووشی نەگبەتیو چارەڕەشی دێن ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ﴾.

نەگبەتیو بەدبەختبوون (التطیر) لە عەرەبیدا مانای (تشاؤم)یش دەگرێتەوە. بەمانای ئێمە شوومو نەگبەت بووین لە ئێوەوەو، بەهۆی مانەوەی ئێوەش لە نێوماندا چاوەڕێی خراپەو ئازارو زیان دەکەین، چونکە ئێوە هیچ سوودو کەڵکێکتان بۆ ئێمە پێ نیە.

نێرراوەکان بە لۆژیك (منطق)ێکی باوەڕدارانەو متمانە بەخۆکردنێکی ڕوونو ئاشکراوە ڕوبەڕووی ئەو بۆچوونەی گەلەکە وەستانەوەو پێشیان گوتن: شوومیو نەگبەتییەکە لە خۆتانو ئەو حاڵەتی بێباوەڕییەتان دایە، ئەگەر بەخۆتاندا بچنەوەو بیربکەنەوە، بەڵام وادیارە ئێوە گەلێکی دەستبڵاوو سەرەڕۆن لە خراپەکاریدا ﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ١٩﴾یس..

(طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ): واتە شوومیو نەگبەتییەکە لە خۆتان لەگەڵ خۆتاندایەو، ئەو خراپەو ناهەمواریییەش، کە چاوەڕێی دەکەن، بەهۆی ئێمەوە نیە، لەڕاستیدا بەهۆی خۆتانەوەیە.. بەهۆی کردارەکانو بیروڕاو بۆچوونە چەوتەکانتانەوەیە. جا هەر چاکەو خراپەیەکیش تووشی مرۆڤ دەبێت، بەگوێرەی هۆیەکی دەرەکی نیە، تاکو خۆی بە نەگبەت بزانێت لێیەوە، یان پێی شوومو چارەڕەش بێت، بەڵکو لەنێو مرۆڤ خۆیەوەو، لە ناخی دەروونییەوەیەو بەهۆی هەر کارێکی خێر، یان شەڕەوەیە.

جا ئەگەر مرۆڤ بەهۆی کەسانی دییەوە خۆی بە نەگبەت دانـاو شـوومیو بەدبەختیی لێوە بەدیی دەکردن، ئـەوە دیـارە بەرپرسـێتیی ئـەو ئاکامـە نالـەبارە دەخاتە ئۆباڵی خەڵکی دیو، خۆیشی لەو بەرپرسـێتییە ڕادەکـات. لەبـەر ئـەوەش دەبینین ئەوان حاڵەتی شوومیو نەگبەتی لە کەسانی دییـەوە ڕەچـاو دەکـەن، یـان تەنانەت لە دەموچاوو ڕوخساری کەسانی تردا دەیخوێننەوە، یـان لـە جێگاکانـەوە، یاخود لە کاتو زەمەنەکانەوە، یان لە وشەکانو، لە جمو جووڵەکانی خەڵکیشەوە.

لەبەر ئەم مەسەلەیەو بەپێی واتای ئەم ئایەتەیە کـە ئیـسلام شـووم بـوون بـە کەسانی دی، یان سڵ کردنەوە لە شووم بوون بە کەسانی دیی حەرام کردوە، چونکە هەر مەسـەلەو حاڵـەتێکی خێـر یـان شـەڕ، کـە تووشـی مرۆڤـ دێـت، بـەهۆی کردەوەکەیەوەیەتی. هەر ئاکامو سەرەنجامێکیش ڕووی تێدەکات هەر بـەهۆی ئـەو کردەوانەوەیەو، بە ئیرادەی خواو بەپێی سوننەتو ڕێسای خواشە. لەبەر ئەمە ئەو کەسانەی، کە وادادەنرێن گوایە نەگبەتیو شومییان تێدایەو نەگبـەتی بـە خـەڵك دەگەیـەنن، هـیچ دەسـتێکیان لەوەدانیـەو، هـیچ ئاکـامو شـوێنەوارێکیش لـە دوورخستنەوەیاندا بەدیی نایەت.

وتەی هەرسێ نێرراوەکەش بە خەڵکی ناوچەکە، کە پێیان گوتبـوون: (طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ) مانایەکی تـریش دەگەیـەنێت، ئـەویش هەڕەشـەکردنە بـە سـزادان، وەك ئەوەیە پێیان بڵێن: ئەو سزاو لەناوچوونو ماڵوێرانییـەی کـە چـاوەڕێتان دەکـات، بەهۆی بوونی ئێمەوە نیە، بەڵکو بەهۆی ئەو ڕێبازی کفـرو بێبـاوەڕی یەوەیـە کـە ئێوە پەیڕەویی دەکەن.

جا ئەگەر دەتانەوێت ئەو مەترسـیو ڕووداوە خراپـەی کـە چـاوەڕێتان دەکـات لەسەر خۆتان لاببەن، ئەوا لەسەرتان پێویستە ئەوەی لەنێو دڵتان دایـە بیگـۆڕنو، دەست لە کفرو بێباوەڕیتان هەڵگرن.

ماوەتەوە بڵێین کە بێگومان (شوومیو نەگبەتی) خستنە پاڵ نێـرراوان، تـەنها

تایبەت بە خەڵکی ئەو ناوچەیە نیە، بەڵکو ئەوە ڕێسایەکی گشتیی گەلانی دی بووەو هەڵوێستێکی دیاری کراوو دروستکراویش بووە، چونکە هەرگەلێك، پێغەمبەرێکیان بۆ هاتبێت، یەکسەر خۆیان بە شوومو نەگبەت لەوەوە دانـاوەو، بێزاریی‌و نەگبەتی‌و چارەڕەشییان لە ئاست بانگەوازەکەیدا دەربڕیوە.

بۆ نموونە ئەوە گەلی (سەموود)، کە نەگبەتیی خۆیان بەهۆی (ساڵح)ی پێغەمبەریانەوە -سڵاوی لێ بێت- دەربڕیوەو، ئەویش وەڵامی خۆی وەها دەونەتەوە، کە شوومی‌و نەگبەتییەکە لە خۆیان دایەو، هەر بەو هۆیەشەوە تووشی بەڵاو کارەسات دەبن: ﴿ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ النمل ﴾.

گەلەکەی فیرعەونیش، خۆیان بە شوومو نەگبەت دادەنا بەهۆی مووساو ئەوانەی لەگەڵیدابوون، وەك خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾ الأعراف ﴾.

کافرانی مەککەش بە هەمان هەڵوێستی خۆ بە نەگبەت‌و چارەڕەشی، ڕووبەڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوەستان، وەك خوا لەبارەی ئەوانیشەوە فەرموویەتی: ﴿ ...وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ النساء ﴾.

جا ئایا هەڵوێستی نەگبەتی‌و شوومی دەربڕین، تەنها لە دژی پێغەمبەران گیراوەتەبەر؟ نەخێر، بەڵکو ئەمە هەڵوێستێکی هەمیشەیی یە، کە کافران‌و

دوژمنانی گشت بانگەوازکارو پەروەردیارو چاکسازی خوازێك لە گشت کاتو ناوچەیەکدا، دەریانبڕیوە.

ئیمامی (زەمەخشەری)یش هەولّی ئەوەی داوە، کە دەروونی کافرانو ئەو دوژمنانەش شیتەڵ بکات، کە بێزاریی‌و نەگبەتی‌و شوومیی خۆیان لەدەست حەق‌و شوێنکەوتوانی حەق دەربڕیوە، واتە (شیکاری دەروونی)ی تیادا ئەنجام داوەو لەمبارەیەوە گوتوویەتی:

"ئەوان بۆیە ئەو هەڵوێستە نالەبارەیان هەبووە، چونکە ڕقیان لە ئاینەکەیان بووەتەوەو، دڵو دەروونی خۆشیان لێی تەکیونەتەوە. بەپێی دابو نەریتی خەڵکیش، هەر خەڵکە نەفامەکانن، کە هیوا بۆ ئەو شتانەی جێی ئارەزووی خۆیانن، دەخوازنو هەر شتێکیش لەگەڵ سروشتو میزاجی خۆیاندا بگونجێت حەزیی لێ دەکەن. ئەوەش بە شوومو نەگبەتی دادەنێن، کە سڵی لێ دەکەنەوەو پێیان ناخۆشە، جا ئەگەر تووشی نیعمەتێك، یان بەڵایەك بىن، دەڵێن: لەسەر بەرەکەتی ئەمەو، لەسەر نەگبەتیی ئەوە[(١)]."

پێویستە بانگەوازکارانیش وەڵامی کەسانی خۆ بەشوومو نەگبەت بدەنەوەو، ئەوەشیان بۆ ڕوون کەنەوە، کە بێگومان شوومی‌و نەگبەتی بەخۆیانەوەیەو، هەر خراپەو ماڵوێرانیەکیان تووش ببێت، بەهۆی بانگەوازکاران، یان بەهۆی بانگەوازەکانیان، یان بەهۆی گوتارو بانگکردنیانەوە نیە، بەڵکو بەهۆی گومڕاییی گەلەکەو لەڕێلادانیانو گوناهو سەرپێچییەکانیانەوەیە.

پێویستە بانگەوازکاران بەو ڕەنگەی سێ نێرراوەکە لەگەڵ گەلەکەیان، بەرەوڕووی ئەو جۆرە کەسانە ببنەوە، کە خوا لەسەر زاریان فەرموویەتی: ﴿ قَالُواْ طَـٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْۚ أَئِن ذُكِّرْتُمۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ یس﴾.

١) الكشّاف/ ٣: ٣١٨ .

لەم ڕستەیەدا وشەی (مسرفون) -کە مانای سەرەڕۆو لەسنور دەرچوان دەگەیەنێت-، بێگومان ئەوانەن کە لە کفر یا شیرك یان لە فەسادو خراپەکاریدا، یان لە گوناهکاری دا، یاخود لە خۆ بە نەگبەت دانانیدا، یان لە هەڕەشەو گوڕەشەدا، یاخود لە سزاو ئازارداندا، لە سنوور دەرچوون، گرنگ ئەوەیە ئەوان لە سنور دەرچوونو سنووری سروشتیو ئاساییان بەزاندووە.

## ٥- چەکی بەردباران و ئەشکەنجەدان:

خەڵکی ناوچەکە چەکێکی وایان ئاڕاستەی هەرسێ نێرراوەکە کردبوو، کە وایان دەزانی گوایە چەکێکی کوشندەو کاریگەرە، ئەوەش کاتێك پێیان گوتن: ﴿...لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾﴾ یس. بەم چەکەش کافرە لەسنور دەرچووەکانی ناوچەکە پەردەیان لەسەرباری راستەقینەی نەریتو ئاکاریان هەڵدایەوەو، خەشمو بەدکاریو ستەمکاریی خۆیان بێپەردە پیشانداو، شێوازی توندو ڕەقو نامەردانەشیان بەکارهێناو، سەوداو مامەڵەشیان لەگەڵ ئەو نێرراوە ڕێنموونی کارانەدا بە تۆقاندنو شێواندنو چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدان بوو. بێگومان ئەوان بە وجودی ڕێنموونی کارو بانگەوازکاران تەنگەتاو بوونو، حەوسەڵەی دیتنیان نەمابوو، پەسندیان نەدەکرد کە ئەوان لەنێویاندا هەبن. وێڕای ئەوەش دەستەوسانو شکست بوون لە ئاست بەرەنگاربوونەوەی لۆژیك بە لۆژیكو، پووچەڵ کردنەوەی بەڵگە بە بەڵگەو، ڕووبەڕووبونەوەی بیروبۆچوون بە بیروبۆچوون. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو گەلە هیچ لۆژیكو داناییو بەڵگەو نیشانەو بیروبۆچوونێکی ئەوتۆیان پێنەبوو، کە بەهۆی ئەوانەوە بەرەوڕووی لۆژیكو بەڵگەو بیروباوەڕی نێرراوەکان ببنەوە. لەبەر ئەمە پەنایان بردۆتە بەر چەکە سەرەتاییە ئاژەڵییەکە، چەکی هەڕەشەوگوڕەشەو بەردباران کردنو سزاو ئازارو ئەشکەنجەدان.

پەنابردنی کافرانی ئەو ناوچەیەش بۆ بەر ئەو چەکە دڕندانە سەرەتاییە، تاکە هەڵوێستێکی تایبەتیی ئەوان نەبووە بە تەنها، بەڵکو هەمان ئەو چەکەشە کە

هه‌میشه‌و به‌رده‌وام کافران له‌ دژی په‌یامبه‌رانو نێرراوانی خوا په‌نایان بۆ بـردووه‌. ئه‌وه‌بوو کافران له‌ دژی نوحو هودو صالحو ئیبراهیمو لوطو شعیبو موسا-سلاوی خوایان لێ بێت- به‌کاریان هێنا

هه‌ر ئـه‌م چه‌که‌شـه‌ کـه‌ دوژمنـانی سته‌مکارو بـه‌دکارو، ده‌سـه‌لاتدارانی لـه‌ سنوورده‌رچوو، له‌ دژی شوێنکه‌وتوانی پێغه‌مبه‌ران – له‌ بانگه‌وازکارانو چاکسازی خوازان- به‌کاری دێنن. مێژووی ئێمه‌ش گه‌لێك نموونه‌ی له‌م چه‌شنه‌ی له‌خۆ گرتووه‌ سه‌باره‌ت به‌ به‌کارهێنانی ئه‌م چه‌که‌ له‌دژی سه‌ربازانی ئه‌م ئایینه‌. هه‌روه‌ك مێژووی نـوێو هاوچـه‌رخ، کـه‌ زۆر کـه‌س بـه‌ – لوتکـه‌ی گه‌شه‌سـه‌ندنی شارسـتانێتیو مه‌ده‌نیه‌تو پێشکه‌وتن- ی داده‌نێن، چه‌نده‌ها نموونه‌ی ئاشکرای تێدایه‌ سـه‌باره‌ت به‌ به‌کارهێنانی ئه‌م چه‌که‌ دڕندانه‌ سه‌ره‌تایی یـه‌ ئاژه‌ڵیانه‌یـه‌ – چـه‌کی بـه‌ردباران کردنو ئه‌شکه‌نجه‌دانو کوشتن- له‌لایه‌ن ئه‌و زۆرداره‌ لـه‌ سـته‌م ڕۆچـوانه‌وه‌ لـه‌ دژی بانگه‌وازکارانی ڕێی خواو، که‌ چۆن به‌ شێوازێکی به‌ده‌رو دور له‌ خه‌یاڵو بۆچوونی مرۆڤـ له‌ دژی مرۆڤـه‌کان بـه‌کارهێنراوه‌و هـیچ که‌سـێك لـه‌و بـڕواو بۆچوونه‌شـدا نه‌بووه‌، که‌ ئاوا به‌کاری بێنێت. به‌ڵام به‌کاریان هێنـاوه‌و ئـه‌و شـێوازه‌ دڕندانـه‌یان گرتۆته‌ به‌ر. ئه‌مان به‌م چه‌که‌ ویستوویانه‌ ده‌نگی حه‌ق کپ که‌نه‌وه‌و، بانگـه‌واز بـۆ خوا نه‌هێڵنو له‌ناوی به‌رن.. ئه‌ی داخۆ سه‌ره‌نجام چی بووبێت؟!

بێگومـان له‌ ئه‌نجامـدا بانگه‌وازه‌کـه‌ بـه‌هێزتر بـووه‌و تینـی سـه‌ندووه‌و ڕه‌گـی داکوتاوه‌و، به‌رفراوان بووه‌و پێشکه‌وتووه‌و بڵاوبۆته‌وه‌و ته‌شه‌نه‌ی سـه‌ندووه‌، ئه‌مـه‌ هه‌مووی سه‌ره‌ڕای ئه‌و هه‌موو بارگرانیو به‌ربه‌ستو ته‌له‌زگانه‌ی، کـه‌ هێناویانه‌تـه‌ ڕێی بانگه‌وازه‌که‌و، سه‌ره‌ڕای ئه‌و هه‌موو ئـازارو ناڕه‌حـه‌تیو قوربانیدانـه‌ش، کـه‌ شوێنکه‌وتوانی بانگه‌واز به‌رگه‌یان گرتووه‌. چونکه‌ بێگومان بانگه‌واز بۆ ڕێی خـوا ته‌نها به‌ مه‌ینه‌تیو توندوتیـژیو تاقیکردنـه‌وه‌و بـه‌لاو ناڕه‌حه‌تیشـــه‌وه‌ بـه‌هێزو تۆکمه‌ ده‌بێت.

دیاره‌ ئه‌و سته‌مکاره‌ ئه‌شکه‌نجه‌ده‌رو به‌ردبارانکـه‌رو ئازارده‌رانـه‌ش، هه‌میـشه‌

لەدواییدا تووشی شكستو تێشكان بوونو، لەكاتی مردنیشیاندا به نەفرەت كردنو گاڵته پێكردنەوه نێژراونو، كاتێك بۆ لای خواش گەڕاونەتەوه، هەموو جۆره سزایەكی خوایان چەشتووه.

بێگومان هەر بانگەوازێك له ئارادا بووبێت، تووشی چەكی چەوسانەوەو ئازاردان كراوەو، هەر بانگەوازكارێكیش له كایەدا بووبێت -كه بۆ ڕێی خوا بانگەوازی خەڵكیی كردبێت- ڕوبەڕووی چەكی بەردبارانكاریو ئەشكەنجەدان بۆتەوه. هەر دوژمنێكی ئەم ئاینەش له سەوداو مامەڵەی لەگەڵ بانگەوازكاراندا و له دەرووی وتەی خەڵكی ناوچەكه -لەم چیرۆكەدا- كه چیان به نێرراوەكانیان گوتووه، هەر ئاوای به بانگەوازكارانی گەلەكەی خۆیشی گوتووه: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾.

بەڵام ئەو بانگەوازكارانەش، كه شوێن پێی هەرسێ نێرراوەكەیان هەڵگرتووه، بەو وتەی نێرراوەكان، كه ڕووبەڕووی خەڵكی ناوچەكه ببوونەوه، ڕووبەڕووی ستەمكارانی گەلەكەی خۆشیان دەبنەوه: ﴿قَالُوا۟ طَـٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ ۚ أَئِن ذُكِّرْتُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ يس﴾.

## لەگەڵ پیاوە ئیماندارەکە، لە سەرخستنی نێرراوەکان دا

دیمەنی دووەم لە چیرۆکی (دانیشتوانی ئاوەدانییەکە) لەگەڵ نێرراوەکاندا، هاتنی پیاوە باوەڕدارەکەیە بە هەڵەداوان لەوپەڕی شارەوە بە مەبەستی سەرخستنی نێرراوەکانو، داواکردنی شوێنکەوتنیان– کە خەڵکەکە شوێنی ڕێبازەکەیان بکەن-.

(سید قطب)یش هەردوو دیمەنەکەی ڕوون کردۆتەوەو پەیوەندیی نێوان هەردوو بەشەکەی چیرۆکەکەشی دیاری کردووەو گوتوویەتی:

"وەڵامدانەوەی دڵە داخراوەکان بۆ بانگەوازیی پێغەمبەران هەر ئاوا بووە. ئەمەش نموونەیەکە لەمەڕ ئەو جۆرە دڵانەی کە سوورەتەکە لە گەشتی یەکەمدا لێیانەوە دواوەو، وێنەیەکی واقیعییانەی ئەو نموونە بەشەرییە وێناکراوەی ئەوێش بووە. بەڵام ئەو نموونەیەکی تر – لەدڵەکان- کە دوای ئاییینی خوا کەوتووەو بە پەنهانیو لەنادیاریشدا لە خوا ترساوە، ڕێبازێکی تری هەبووەو، بەدەمەوەهاتنێکی تری پێچەوانەی ئەو جۆرە وەڵامدانەوەیەی بێباوەڕانی هەبووە"[(١)].

### لەگەڵ سید قطب لە شیکاری دەروونیی پیاوەکەدا

(سید قطب) لەبەردەم نموونەیەکی چاکەخوازو بە ئاکاری وەك پیاوە باوەڕدارەکەدا، کە بە دەم بانگەوازی نێرراوەکانەوە چووە، هەڵوێستەی کردووەو، دەروونە پاكو خێرخوازەکەی شی کردۆتەوەو، لەبارەیەوە گوتوویەتی:

((بێگومان ئەوە بەدەمەوەچوونی سروشتو فیترەتی ساغی ئەو پیاوەیە بۆ بانگەوازی ڕاستو دروستی حەق، کە ڕاستگۆییو، سادەییو، گەرمیو، جێگیریو ڕێکبوونی پەی بردنی تێدایەو، بەجێگەیاندنی کارلێكو کاریگەریی بەهێزیشە بۆ حەقە ڕوونو ئاشکراکە. ئەم پیاوەش گوێی لە بانگەوازەکە گرتووەو، بە پیری یەوە

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦٢ .

چووه دوای ئەوەی نیشانەکانی حەقو مەنتیقی تێدا بەدیی کردووەو، له وتەکانیدا بۆ گەلەکەی ڕەنگیان داوەتەوە.

جا کاتێك دڵیشی هەستی بە حەقیقەتی ئیمان کردووە، ئەم حەقیقەتە لە ویژدانیدا جوولاوەو، چی دی توانای بێدەنگ بوونی له ئاستیدا نەماوە. ئیدی هەر تەنها لە ماڵی خۆیدا بەو حەقیقەتەوە بە عەقیدەکەیەوە پاڵی لێ نەداوەتەوە، لەکاتێکدا دەبینێت ئەوا گومڕاییو نەفامییو، نکوولی لە حەقو، بەدڕەفتارییش لە چواردەوریدا بڵاوبۆتەوە. بۆیە بەو حەقەوەی، کە لە ویژدانیدا ڕەگی داکوتابووو، کە لە هەستو شعوریشیدا بزوابوو، هەوڵی لەگەڵ گەلەکەیدا، لەکاتێکدا ئەوان نێرراوانیان بەدرۆ دەخستەوەو، نکوولییان لە حەق دەکردو، بەڵێنی سزایان دەداو، هەڕەشەیان دەکرد. ئیدی ئەویش- پیاوە باوەڕدارەکە- لەو سەری شارەکەوە بە پەلەو بەخێرایی هاتووەو هەوڵدەدات تاکو ئەرکی خۆی لە بانگکردنی گەلەکەیدا بۆ لای حەقو لە دەست پێهەڵگرتنیان لەسەر ستەمکاری بەجێ بگەیەنێت، هەروەها لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو دەسدرێژییە بە ناهەقو پڕ لە گوناهەشیاندا، کە خەریك بوو دەیانکردە سەر نێرراوانی خوا. وەك لە ڕواڵەتی بەسەرهاتەکەشەوە دیارە، ئەم پیاوە خاوەنی پلەوپایەو دەسەڵات نەبووەو، لە ئاست گەلەکەشیدا هیچ هێزێك، یان بەربەستێکی وەك بوونی عەشیرەتێکی بەدەستەوە نەبووە. بەڵام تەنها ئەو عەقیدە زیندووەی نێو ویژدانی بووە، کە پاڵنەری بووەو هێناویەتی لەوسەری شارەوە تا ئەمسەر شار[1])).

## لەگەڵ (ئیمامی ڕازی)شدا لە وتە نەستەقو ڕوونکەرەوەکانیدا

ئیمامی (رازی) چەند هەڵوێستێکی جوانو دانسقەی لەئاست (سیاقە قورئانی یەکە)دا هەیەو چەند سەرنجو وتەیەکی نەستەقو نایابی لەسەر دەربڕیوەو، چەند شیکارو لێکدانەوەیەکی قەشەنگیشی تێدا تۆمار کردوە، هەروەها لەو (سیاقە

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦٢-٢٩٦٣ .

قورئانی)یەو لەبارەی پیاوە باوەڕدارەكەی نێو ئەم چیرۆكەی قورئانەوە چەند بیروڕاو تێڕوانینێكی جوانی هەیەو، ئێمەش بە دەسكاریو كورتكردنەوەوە گرنگترینیان دەخەینە بەر دیدی خوێنەران..

١- لە پەیوەستبوونی هەڵوێستی پیاوە باوەڕدارەكە بەو ئایەتانەی پێشتری چیرۆكەكەوە دو ڕووكار هەیە:

ڕووكاری یەكەم: ئەوە بەدیارخستنی ڕێبازێك بووە بەهۆی ئەوەی بە پەیامی ڕۆشن (البلاغ المبين)ەوە هاتوونو، پیاوە باوەڕدارە بەپەلە هاتووەكەش باوەڕی پێیان هێناوە، لەسەر ئەم بنچینەیەو لە فەرمایشتەكەی خواشدا (من أقصى المدينة/ لەوپەڕی شارەوە) ڕەوانبێژییەكی ڕۆشنو پڕشنگدار هەیەو، ئەو مانایە دەبەخشێت، كە بێگومان ئاگاداركردنەوەكەی نێرراوان بۆ خەڵكەكە، گەیشتۆتە ئەوسەری شارەكە.

ڕووكاری دووەم/ بێگومان ناوبردنی چیرۆكی پیاوە باوەڕدارەكە بە (چیرۆكی نێرراوان-المرسلين-) دڵدانەوەیەكی هاوەڵانی پێغەمبەریخواش محمد ﷺ بووە، وەك چۆن باسكردنی هەرسێ نێرراوەكەش دڵدانەوەیەكە بۆ پێغەمبەریش ﷺ.

٢- بە نەناساودانان (تنكير)ی پیاوەكە لەم چیرۆكەدا دوو سوودو دوو حیكمەتی تێدایە:

یەكەم: بۆ ئەوەی وەك بە گەورەدانانێكی كاروباری بێت، واتە پیاوێكی ڕێكوپێك بووە لە پیاوەتیو ئاكاری پیاوانەدا.

دووەم: بۆ ئەوەی وەك سوود بەخشێك بێت بۆ دەركەوتنی حەق لەلایەنی نێرراوەكانەوە، ئەوەبووو پیاوێك لە پیاوان، كە نێرراوەكان هیچ ناسیاویو ئاشنیاتیەكیان لەگەڵیدا نیە، باوەڕی پێ هێناون، لەبەر ئەوە ناگوترێت گوایە ئەوان — واتە پیاوە باوەڕدارەكەو نێرراوان- پێشتر بە پەنهانی ڕێك كەوتوون لەنێوخۆیاندا.

٣- له فەرمایشتەكەی تری خوادا (يَسۡعَىٰ / بەپەلە دێت) بەرچاو ڕۆشنكردنێك بۆ باوەڕدارانو، ڕێنموونییەكیشیان بۆ دانراوە، تاكو له بواری ئامۆژگاریو تێگەیاندنی خەڵكیدا ئەوپەڕی كۆشش بخەنە گەڕو، هەوڵی بەپەلەو گەرمو گوڕی تیادا بدەنو، لەم ئاقارەشەوە شوێن پێی ئەو پیاوە هەڵگرن، كه كۆششی هەبووەو بە پەلە گەیشتۆتە شوێنەكە.

٤- له فەرمایشتەكەی تریشدا (يَـٰقَوۡمِ / ئەی گەلی خۆم) مانایەكی جوان هەیەو ئاماژەیەكه بۆ سۆزو بەزەیی پیاوەكە له ئاست گەلەكەیداو، دانانی بەڵگەیەكی تره لەپاڵ بەڵگەكانی تردا لەسەر ئەوەی، كه ئەو تەنها خێرو چاكەی بۆ ئەوان گەرەكە.

٥- له فەرمایشتەكەی تریشدا (ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ) بانگەوازێك لە پیاوەكەوە ئاڕاستەی گەلەكەی كراوە، كه پێویستە دوای ڕێبازی نێرراوان بكەون. نەیشی گوتووە دوای خۆم بكەون، وەك چۆن پیاوە باوەڕدارەكەی سەر بە بنەماڵەی فیرعەون ئاوای بەوان گوتبوو -كە لە چیرۆكەكەی (غافر)دا چیرۆكەكەی هاتووە-. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەم پیاوە لەوپەڕی شارەكەوە هاتووەو، لەگەڵ نێرراوەكاندا نەبووەو لەنێویشیاندا نەبووە. هەر بۆیەش بانگەوازی بۆ شوێنكەوتنی پەیامی ئەو نێرراوانە كردوە، كه بەڵگەی ڕۆشنی خۆیان پیشانی گەلەكە داوەو ڕێبازەكەشیان بۆ ڕوون كردوونەتەوە.

٦- له فەرمایشتەكەی تریشدا (ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ) دەرخستنی ئامۆژگاریی له فەرمایشتی (ٱتَّبِعُواْ )دا لەگەڵ دەرخستنی ئیمانی له فەرمایشتی (ٱلۡمُرۡسَلِينَ )دا كۆكردۆتەوەو، ئامۆژگاری كردنیشی خستۆتە پێش باوەڕهێنانەكە لەبەرئەوەی له بواری ئامۆژگاریو ڕێنموونیدا ئەوە كاریگەرترە.

٧- له فەرمایشتی دواتریشیدا: ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾

یس ﴾، واتایەکی چاكو جوان هەیەو، بەکارهێنانی باشترین شێوازێکە بۆ گفتوگۆو مشتومڕو قەناعەت پێهێنان. لەمەشدا پلەیەکی بۆ قەناعەت پێهێنانیان دابەزاندوەو، وەك ئەوە وایە پێیان بڵێت: گریمان وای دانێن، گەر ئەوان نێرراوانو ڕێنموونی کارانیش نەبن، بەڵام خۆ ڕێنموونی کراوانی سەر ڕێگای ڕاستنو زاناو ئاگاداری ئەو ڕێگا ڕاستەشن، کە بە حەقیان دەگەیەنێت، پاشان خۆ ئەم نێرراوانە داوای هیچ کرێو پاداشتو ماڵو سامانێکتان لێناکەن، ئەم مەسەلەیەش داواتان لێ دەکاتو بانگتان دەکات بۆ شوێنکەوتنیانو، بەدەمەوەچوونی بانگەوازیان.

٨- لە فەرمایشتەکەی تریشدا: ﴿ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي ...﴿٢٢﴾ یس ﴾ ئەوە چیمەو، بۆچی ئەو خوایە نەپەرستم، کە دروستی کردووم؟!.. لەم فەرمایشتەدا پرسیارکردنێکی بەرهەڵستکارانە هەیەو، ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەو ڕاستییەی، کە مەسەلەکە لەبارەی پەرستنی خوای تاكو تەنهاوەیەو، هیچ پێچو پەنایەکی تێدا نیەو، ئەو کەسەی، کە خوا ناپەرستێت، پێویستە هۆی ڕێگری خواپەرستییەکەی دیاری کات. بەڵام من- پیاوە باوەڕدارەکە- هیچ ڕێگرو بەربەستێك نابینم، کە ڕێگەی خواپەرستیم لێ بگرێت.

٩- لە فەرمایشتی خوادا -لەسەر زاری پیاوە باوەڕدارەکە-: (وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي) سەرنجێکی جوانی دیکەی تێدایەو، ئەوەیە لەم وتەیەیدا لە ئاڕاستەی گوتار بۆ گەلەکەیەوە چۆتە سەر لێدوان لەبارەی خۆیەوەو، حیکمەت لەمەشدا ئەوەیە، کە حاڵی خۆی لەبیر نەکردووەو لێی پەنهان نیە. لەبەر ئەوە هۆکارو بەڵگە لە کەسێکی ترەوە داوا ناکات، چونکە خۆی زاناو ئاگادارترە لە حاڵو بارودۆخی خۆی.

١٠- هەروەها لەم فەرمایشتەدا (وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي)دا، دوو مەسەلەی تری پێکەوە گرێداوە: یەکەمیان نەبوونی هیچ بەربەستێکە، کە ڕێگەی

باوەڕهێنانو خواپەرستی لێ بگرێت (وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ).
دووەم: لە ئارادابوونی ئەو هۆکارەی، کە داوای باوەڕهێنان دەکات، ئەمەش لە فەرمایشتی (ٱلَّذِي فَطَرَنِي)، چونکە خوای خالقو کردگار، خاوەنی موڵکەو بەخشندەی نیعمەتەکانەو، پێویستە لەسەر بەندەکانیش بیپەرستنو سوپاسی بکەن.

١١- (نەبوونی بەربەست لەڕێی باوەڕهێناندا)ی خستۆتە پێش (هۆکاری پاڵنەری باوەڕهێنان)ەوە. ئەمەش لە رستەی (وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي)داو، نەیشیگوتووە (فطرکم)، چونکە خۆی گرنگترە لە بۆتەی مەبەستی نێو باسەکەدا.

١٢- گوتوویەتی (فطرني)و نەیگوتوە (فطرکم) بۆ ئەوەشە، کە لەبارەی خۆیەوە دەدوێت، نەك لەبارەی ئەوانەوە، پاشان بۆ رێکخستنی لەگەڵ وتەی (وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ)، کە لەوێدا کاری خواپەرستییەکەی خستۆتە پاڵ خۆیو، ئیدی واشی گونجاندووەو رێکخستووە، کە لەدروست بوونەکەشیدا -وەك مرۆڤ- هەر باسی خۆی بکات.

١٣- هەروەها لە وتەکەی دواییشیدا (وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ) ترسو هیوا لە (پەرستنی خوادا) لەخۆ دەگرێت، جا هەر کەسێك، کە سەرچاوەی گەڕانەوەو بۆی چوونەوە -کە خوایە- بۆ خۆی بێت، ئەوە خەڵك لێی دەترسێتو هیوای لێ دەخوازێت.

١٤- حیکمەتێکی نایابیش لەو ئاوڕ لێدانەوەیەیاندا هەیە، کە هەر لە وتەکەی (وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ) دایە، تاکو جیاوازیی نێوان خۆیو ئەوان لە گەڕانەوە بۆ لای خوا دیاری بکات، چونکە گەڕانەوەی ئەم پیاوە باوەڕدارە بۆ لای خوا، وەك گەڕانەوەی ئەو گەلە بێباوەڕە نیە.
گەڕانەوەی ئەو بۆ لای خوا، گەڕانەوەی خواپەرستێکی باوەڕدار بەخوایە،

لەبەرئەوە گەڕانەوەی ئەو بۆ ڕێزنانو نیعمەت وەرگرتنە. بەڵام گەڕانەوەی ئەوان، گەڕانەوەی کەسانی کافرو یاخی یە تاکو تووشی لێپرسینەوەو سزاو ئەشکەنجەدان بن، لەبەر ئەوە گەڕانەوەکەیان بۆ سزا وەرگرتنو ڕەنجەڕۆییو سوکایەتییە. بەڕاستی جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە گەڕانەوەیەش هێجگار زۆرو گەورەیە.

١٥- لەو وتەیەی تری پیاوە باوەڕدارەکە: ( ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ) ئاماژەیەك بۆ تەواوێتیی خوا بەیەك گرتن (توحید) هەیە، چونکە وتەی (وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي ) ئاماژەیەکە بۆ بوونی خوا، وتەی ( ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً )ش ئاماژەیەکە بۆ نکوولّی کردن لە شیركو نەپەرستنی شتی تر.

١٦- لە وتەی دوای ئەو ڕستەیەی پێشوشدا (مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ) ئاماژەیەکی نایاب هەیە، دەستەواژەی (مِن دُونِهِۦٓ / بێجگە لەو) بە مەبەست گێڕاوە. جا لەبەر ئەوەی سەلماندی کە (الله) هەر خۆی تەنهایەو پەرستراویشە، ئیدی هەر شتێکی تری غەیری خوا (مِن دُونِهِۦٓ / بێجگە لەو)ن، هەموو ئەمانەش هاوبەشن لەوەی دروستکراوو لاوازنو ئاتاجیشیان هەر بەخوایە، لەبەر ئەوە دەبێت هەموویان عابیدو خواپەرست بن، لەبەر ئەوەی هەموویان (مِن دُونِهِۦٓ / بێجگە لەو)ن، کەواتە هەموویان لە (مِن دُونِهِۦٓ / بێجگە لەوی) بەشدارن. ئیدی چۆن لەنێویاندا پەرستراو (خواوەند) هەڵدەکەون.

١٧- لە وتەکانی تری پیاوە باوەڕدارەکە، وتەی ( إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ )، لەم وتەیەشدا قسە بۆ هەموان دەکات، سا ئیتر لە نێرراوەکان بن، یان لە خەڵکی ناوچەکە، بەڵام لە ڕاستیدا یەکەم ڕوانگەی وتارەکەی بۆ خەڵکی ناوچەکە ئاراستە دەکاتو، بۆیان دەسەلمێنێت کە بێگومان هەر خوا خۆی پەروەردگاریانە.

١٨- لەو وتەی (فَٱسۡمَعُونِ )یشدا دەلالەتە لەسەر ئەوەی، کە ئەم وتەیە دوای تێڕامانو بیر لێ کردنەوە وتراوە، چونکە بگۆ (متکلم) کاتێك دەبینێت کە کۆمەڵێکی بیسەر بۆ وتەکانی هەیە، ئەوا بیری تیادا دەکاتەوە.

هەروەها نیازیشی وایە کە قسەکانی خۆییان پێ ببیستێت، تاکو بەڵگەیان لەسەر تۆمار کات، ئەوەش وەك ئەوەی پێیان بڵێت: ئەوا من هەواڵی کرداری خۆم پێدان، تاکو لەمەولا نەڵێن ئەوە بۆچی ئەو مەسەلەیەت لێ شاردینەوە؟ خۆ ئەگەر بۆت دەرخستینایە ئەوا دوات دەکەوتین.

١٩- مەبەست لە بیستن لە وتەی (فَٱسۡمَعُونِ )دا تەنها بیستنی دەنگەکە نیە، بەڵکو مەبەست لەوە پەسندکردنی بانگەوازەکەو، بەدەمەوەهاتنی دەنگی هەقو، چوونە نێو ئیمانو باوەڕداریتییەوەیە[١]".

## جیاوازیی نێوان ئەم پیاوە باوەڕدارەو، هاوەڵەکەی مووسا

دوو پیاوی باوەڕدار، دوو هەڵوێستی ئیماندارانی شایەتی بۆدراویان گرتۆتەبەر:

یەکەمیان/ هاوەڵەکەی موسا لە سوورەتی (القصص)دا.

دووەمیان/ پیاوە باوەڕدارەکەی نێو ئەم چیرۆکەیە لە سوورەتی (یس)دا.

کاتێك قورئان باسی هەریەکەشیانی کردووە، جیاوازییەك لە دەربڕینو شێوازی داڕشتنی بەسەرهاتەکەیاندا بەدیی کراوە، بۆ نموونە قورئانی پیرۆز باسی بەسەرهاتی ئەو پیاوەی هاوەڵی مووسا بووەو لەوسەری شارەکەوە هاتووە بۆ لای، ئاوا دەگێڕێتەوە:

﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ

---

١) تەفسیری (رازی) بە دەستکاری و کوردکردنەوەوە.. بەرگی ٢٦ ل٥٤-٦٠.

﴿فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ٢٠﴾ القصص، واتە: لەوسەری شارەوە پیاوێك بەپەلە هات بۆ لای موساو پێی گوت: ئەی موسا، ئەوا سەرانو دەسەڵاتدارانی ئەو گەلە کۆبوونەتەوەو ڕاوێژ دەربارەی تۆ دەکەن لەسەر ئەوەی چۆن بتکوژن، تۆش لەم شارە دەرچۆ، چونکە بەڕاستی من یەکێکم لەوانەی کە بە پەرۆشی یەوە ئەم ئامۆژگاریەت دەکەم.

پاشان قورئانی پیرۆز بەسەرهاتی ئەو پیاوە باوەڕدارەی سوورەتی (یس)ی ئاوا گێڕاوەتەوە: ﴿وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٢٠﴾ یس، واتە: لەو سەری شارەوە پیاوێك بەپەلە هات بۆ لای گەلەکەو گوتی: ئەی گەلی خۆم، دوای پەیامی نێرراوەکان بکەون.

لەم گوزارشت (تعبیر)انەی قورئاندا تێبینی ئەوە دەکەین، کە دەربارەی هاوەڵەکەی (موسا) باسی پیاوەکەی پێش خستوەو باسی ئەو شوێنەی دواخستوە، کە لێیەوە هاتووە، کە ئەوسەری شارە. بەڵام دەربارەی پیاوەکەی سوورەتی (یس) باسی ئەو شوێنەی لێیەوە هاتووە پێشخراوەو باسی پیاوەکە دواخراوە.

جا داخۆ حیکمەت لەمە چی بێت؟! بێگومان ڕێکخستنی وشەکانی ڕستەکە لە ئایەتەکەدا بەپێی شوێنی هاتنی ئایەتەکەو مەبەستە دیاری کراوەکەیەتی. بۆ نمونە، لە چیرۆکی (موسا) لە سورەتی (قصص)دا مەبەستەکە ئەوەیە، ئاماژە بۆ هەڵوێستی ئەو پیاوە ئامۆژگاریکارە بکرێت، کە بەپەلە هاتووە بۆ ئەوەی (موسا) ئاگادار بکاتەوەو ئامۆژگاریشی لەسەر بەجێهێشتنی شارەکە پێ بکات. ئیدی مەبەست ئەوە نیە باسی ئەو شوێنە بکات کە لێیەوە هاتووە، چونکە گرنگ نیە، کە ئاخۆ لە کام سەری شارەکەو لەکام لایەوە هاتبێت. لەبەر ئەمەشە ناوی پیاوەکە پێش خراوە... واللە اعلم.

لە چیرۆکی دانیشتوانی ئاوەدانییەکەش (اصحاب القریة) لە سوورەتی (یس)دا، یەکەم جار مەبەستەکە ئەو شوێنەیە، کە پیاوە باوەڕدارەکەی لێوە هاتووە، تاکو

ئاماژه بکات بۆ گەیشتنی بانگەوازی هەرسێ نێرراوەکە بۆ دوورترین خاڵ له شارەکەدا کە ئەوپەڕی شارەکەیە. ئەی بۆچی خەڵکی شارەکەش بەدەم بانگەوازی نێرراوەکانەوە نەچوون لەکاتێکدا نزیکیش بوون لێیان؟! کەواتە هەر لەبەر ئەمەیە باسی ئەو شوێنەی پیاوەکەی بە پەلە لێوە هاتووە خراوەتە پێش وشەی پیاوەکە... والله اعلم.

پێشەوای لێهاتوو (ابن الزبير الغرناطي) لە کتێبە بێوێنەکەیدا (ملاك التأويل) لەسەر ئەم مەسەلەی پێش خستنو دواخستنەی ناوی پیاوەکانو شوێنەکان، گوتوویەتی:

"هاتنی ناوی پیاوەکە لە سورەتی (قصص)دا لەپێش ناوی شوێنەکە ( وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ ) لەسەر بارێکی ئاسایی خۆیەتی، چونکە لە بنچینەدا پلەی بکەر (فاعل) ئەوەیە پێش کەوێتو بکەوێتە دوای فەرمان (فعل)، بەڵام دواخرانی بکەرەکە (الفاعل) لە سوورەتی (يس)داو پێشکەوتنی (مجرور) لە ( وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ ) ئاماژەیە بۆ واتایەکی سەنگینو ڕێزدار، ئەویش ئاکاری بەرزی ئەو پیاوەیە کە پێشبڕکێ دەکات بۆ باوەڕهێنان، هەرچەندە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی زۆر دووریشە لە شوێنی مشتومڕی نێرراوەکانو گەلەکەی، چونکە دووریی ماڵو نیشتگە هیچ زیانێکی بۆی نەبووە، مادام ئەو بەدڵ لە نێرراوەکانەوە نزیکە. لە بەرامبەری ئەمەشدا مرۆڤی بێباوەڕ، هەرچەندە خانەو ماڵی لە شوێنی نێرراوەکانیشەوە نزیك بوبێت، بەڵام نزیکیی جێگاکە سوودێکی پێنەداوە. ئەمەش بەهۆی ئەوەی، کە بێگومان بوونی کفرو بێباوەڕیی لەلای کابرای بێباوەڕ ئەو پلەیە لەنێوان هۆیو نێرراوەکاندا دوور دەخاتەوە..

لەمەشدا ئاماژەیەکی دی بۆ هەردوو حاڵەتی قوڕەیش لە مەککەو پشتیوانان (الانصار) لە مەدینەدا، هەیە. قوڕەیشییەکان هەرچەندە لەڕووی جێومەکانەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نزیك بوون، بەڵام بەدڵ لێی دوور بوون، ئیدی نزیکیی

ماڵو لاشە سوودی پێنەدابوون. بەڵام پشتیوانان (الانصار) هەرچەندە دووریش بوون، کەچی دووریی شارو شوێنی نیشتەجێبوونیان ڕێگریان نەبووە لە نزیک بوونەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و لە چوونە نێو ئاینەکەیەوە.

هەڵوێستی قوڕەیشیەکانیش هاوشێوەی هەڵوێستی دانیشتوانی ئاوەدانییەکەی نێو ئەم چیرۆکەیە، هەڵوێستی پیاوە باوەڕدارەکەش هاوشێوەی هەڵوێستی پشتیوانانی مەدینەیە.

چونکە هاتنی پیاوە باوەڕدارەکە لەوپەڕی شارەوە، نموونەیەکە لەسەر ئەوکەسەی، کە ماڵیشی دوورە، بەڵام ئەوە زیانی لێ نادات و ڕێگری نەبووە لە باوەڕهێناندا، باسی دانیشتوانی ئاوەدانییەکەش، نموونەیەکە بۆ ئەو کەسەی، کە ماڵی نزیك بوەو، بەڵام بانگەوازی ڕاستەوخۆشی درێژەی کێشاوەو، ئیدی ئەو نزیکییە لە شوێنی نێرراوو بانگەوازکارانەوە سوودی پێنەگەیاندووە. هەر بۆیەش لە ڕستەکەی سورەتی (یس)دا وشە (مجرور)ەکان (اقصی المدینة) پێش بکەر (فاعل)ەکە کەوتووە تاکو واتا بە مەبەست گیراوو ئامانجدارەکە بەدیی بهێنێت. کەواتە ئەو پێش خستنە بۆ بایەخ پێدانە[1]".

## وەسف بە (پیاوێتی) بۆ ستایش و بەگەورەدانانە

قورئان ئەو باوەڕدارەی نێو ئەم چیرۆکەی بە پیاوێتی (رجولە) وەسف کردووە. ئەم وەسف کردنەش بۆ ستایشکردنی و ڕێزلێنانی و بەگەورەدانانیەتی.

زانراویشە، کە جیاوازی یەك هەیە لەنێوان (پیاوێتی)و (نێریی)دا. چونکە نێریی (الذكورة) بەرامبەر مێیینەیی (الأنوثة)یە. دوو هاوسەریش نێرو مێکەن.

بەڵام مەرج نیە هەموو کاتێك لەگەڵ حاڵەتی (نێریی و نێربوون)دا (پیاوێتی)یش هەبێت، بەڵکو ئەمە تەنها بۆ مەزەندەکاریی وجودیەتی. بێگومان هەموو

---

١) ملاك التأويل- لابن زبير/ ٢: ٧٥٦- ٧٥٨ بە دەستکاریی و کورتکردنەوەوە.

نێرێکیش (پیاو) نیە. بەڵام هەموو پیاوێك نێرە.

(نێریی) سیفەتێکی جەستەیی‌و لاشەییەو هیچی دی.. بەڵام پیاوێتی‌و پیاوبوون ئاماژەیەکە بۆ هێزو زەبرو بەرگەگرتن‌و ئازایەتی‌و خۆڕاگری، هەروەها ئاماژەیەك‌و نیشانەیەکیشە بۆ سیفەتە دەروونییەکان‌و ئاکارە مەعنەوییەکان‌و، تایبەتمەندییە ڕەوشتییەکان. وادیارە لەبەر ئەم سیفەت‌و نیشانانەیە، کە سیفەتی پیاوێتی‌و بەپیاودانان لە پلەی ستایش‌و مەدح‌و ئاماژە بۆکردندایە، کە خوا فەرموویەتی:

﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ ... ﴿٢٠﴾ القصص﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَجَآءَ مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ يس﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ ... ﴿٢٨﴾ غافر﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ... ﴿٢٣﴾ الأحزاب﴾.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿... يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ... ﴿٣٧﴾ النور﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿... فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ التوبة﴾.

بەڕاستی هیچ کەسێکیش دەرەقەتی پیاوان نایەت، هەر پیاوان نەبێت، هەر پیاوانیش خۆڕاگرو بە سەباتن لەگەڵیاندا..

## حیکمەتێکی دیکە لە بە نەناسراو دانان (تنكير)ی پیاوەکەدا

لەمەوپێش لەگەڵ ئیمامی ڕازیدا دوو حیکمەتمان دەربارەی بە نەناسراودانانی وشەی (رجل) گوتەوە، یەکەمیان بۆ ستایش کردنیەتی، چونکە بە نەناسراو (نكرە)

دانان (واتە بەبێ ئەلفو لامی مەعریفە) بۆ ڕێزلێنانو بەگەورەدانانە. دووەمیشیان بۆ دوورخستنەوەی تاوانە لێی‌و، نکوولّی کردنی ڕێکەوتنی پێشووتری نێوان پیاوەکەو نێرراوەکانە، چونکە ئەم پیاوە باوەڕدارە پیاوێکە لە پیاوانی شارەکەو، پێشتر هیچ ناسیاوی‌و ئاشنایەتییەکی لەگەڵ نێرراوەکاندا نەبووە.

بەڵام ئێمە حیکمەتێکی تریش لە بە نەناسراو دانانی وشەی (رجل)دا بەدیی دەکەین، ئەوەیە: بە (نکرە) دانانی وشەکە لێرەدا بۆ شاردنەوەو کورت کردنەوەیە، نەك بۆ دەستنیشان کردنو دیاری کردنو ڕوون کردنەوە.

ئەم پیاوەش پیاوێکی نادیارە لەنێو پیاوانی ئەو گەلەدا، پیاوێکی دیاری نەکراوو دەستنیشان نەکراوو، ئاماژە بۆنەکراوە. قورئانیش خواستی وابووە، کە دیاریی نەکات. ئیدی پەیوەندیی بەئێمەوە نیە، کە ناوی چی بووە.. هەموو ئەم مەسەلە نادیارو شارراوانەش، قورئان لێیان بێدەنگ بووە. خۆ ئەگەر خوا بیزانیایە کە خێرێك، یان سوودو کەڵکێك لە دیاریکردنی ئەو مەسەلانەدا هەیە، ئەوا دیاریی دەکردنو ڕوونی دەکردنەوە، بەڵام زانیویەتی، کە هیچ سوودو کەڵکێکیان تێدا نیە، لەبەرئەوە لەسەر بارە نادیاریو شارراوەکەیانەوە هێشتوونییەوەو، لەجیاتی بەناسراو دانانو (بە ئەلفو لامی ناساندن-معرفە)یەش، بە (تنوین) واتە (بە تنوینی بە نەناسراودانانو بەنادیارکردن) هێناویەتی.

لەبەرئەوە هەموو ئەوانەی هەوڵی زۆریان داوە لە دیاریکردنو دەستنیشانکردنی ئەو پیاوەدا ئەم ئاماژەیەیان لە قورئان و، بە هزرو ئاسۆی تێگەیشتنندا نەهاتووە، چونکە هەندێك لەوان گوتوویانە، گوایە ئەو پیاوە باوەڕدارە (یوسفی دارتاش) بووەو، هەندێکی تریشیان گوتوویانە (شەمعوون) بووە.. بەڵام ئێمە لەم ئاماژەیەی قورئان هۆشیار بووینەتەوەو تێگەیشتووین، کە مەبەستی لە بە نادیاردانانی ئەو پیاوە چیە، لەبەر ئەمە هەڵمان نەداوە دەستنیشانی بکەینو، لەو ڕووەشەوە هیچ شتێکمان نەگوتووە.

## " إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ "

ساتێکیش لە ئاست ئەو وتەیەی تری پیاوە باوەڕدارەکە دەوەستین، کە گوتبووی: ئەی خەڵکینە ئەوا من باوەڕم بە پەروەردگارتان هێناو، ئێوەش ئەمەم لێ ببیستن ﴿ إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾ یس﴾، ساتێك لە ئاست ئەم وتەیەشدا دەوەستین، تاکو وانەیەکی کاریگەریی ئیماندارانەی لێ وەرگرین، کە ئەمەیە:

بێگومان ئەم پیاوە بەرگریی لە نێرراوەکان کردووەو، داوای لە گەلەکەشی کردووە، کە پەیڕەوییان بکەن، هەروەك ئامۆژگاریشی کردوون، کە پێویستە دەست لەو ڕێبازی بێباوەڕییەی خۆیان هەڵگرن.

پیاوە باوەڕدارەکە، سەرەتا خۆی ئەم وتانەی بە کردەوە جێبەجێ کردوەو، بە هەڵسوکەوتێکی کردەیی‌و واقیعییەوە (باوەڕهێنان‌و شوێنکەوتنی نێرراوان)یشی لە خۆیدا پیشان داوەو ئاشکرای کردوە. داواشی لە گەلەکەی کردووە، کە ئەوەی دەیڵێت، ببیستن‌و، لە حەقیقەتی کردەوەکەشی تێ بگەن.

بێگومان پێشتر سەرنجێکی (ئیمامی ڕازی)مان لەسەر ئەو وتەیەی (فَٱسْمَعُونِ ) هێنایەوە، کە گوتبووی دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی، کەوا وتەی ئەم پیاوە باوەڕدارە وتەی کەسێکی بیریارو تێفکر بووە، نەك لە ئاکامی هەڵچوونێك دا، یان عاتیفەیەك، یان خۆ هەڵقورتاندنێکدا وای گوتبێت. واتای حەقیقەت‌و بنچینەی وتەکەشی (فَٱسْمَعُونِ ) بە مانای: بە دەم داواکەمەوە بێت‌و، بچنە سەر ئەو ڕێبازەی، کە من چوومەتە سەری.. بەڵام ئەوەی لێرەشدا بەلامانەوە گرنگ بێت، تێگەیشتنە لە حەقیقەتی هەڵوێستەکەی‌و، ڕوونکردنەوەی ئاراستەی شوێن پێ‌هەڵگرتنی‌و، بەم ڕەنگە: بێگومان ئەو هەنگاوە کردارییە باوەڕدارییەی پیاوەکە بە مەشخەڵێکی دیار لە مەشخەڵەکانی ڕێگای خواو، بانگەواز بۆکردنی، دادەنرێت. چونکە قەناعەت پێ‌بوونە تیۆرییەکەی (القناعة النظرية)ی خۆی بە

هەڵس‌وکەوتێکی عەمەلی زاخاو داوە، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر وزەو چالاکیو کارایی ی باوەڕەکەی، چونکە قایل نەبووە بەوەی کە ئەو باوەڕهێنانەی تەنها لە بۆتەی زەینی تیۆرییدا بهێڵێتەوە، بەڵکو خۆی لە جیهانی واقیعیشدا جێگیر کردووە. هەنگاوەکەی ئەو پیاوە باوەڕدارە بە هەڵوێستێکی گەورەی باوەڕداریتی دادەنرێتو، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە ژیان بەڕاستی لە چەند هەڵوێستێك پێکدێت.

پیاوانیش بە هەڵوێستەکانیانەوە هەن، نەك بە تەمەنەکانیانەوە. بەڕاستی ئەو لە کات سەختیو ئاڵۆزیو موبتەلابوونو تاقی کرانەوەدا باوەڕی هێناوە بە پەیامی خواو، دوای نێرراوانی کەوتووە لە کاتێکدا ئەو نێرراوانەش لاوازو بێدەسەڵات بوون. بەم ڕەنگەش پیاوە باوەڕدارەکە بەربەرەکانیی هێزە مەتریالی (مادی)یە ستەمکارەکەی کردووەو، باوەڕهێنانی خۆیشی ئاشکرا کردووەو، داوایشی لێکردوون، کە هەواڵی باوەڕهێنانی ببیستن.

ئەمە سەرەڕای ئەو مەترسییەش، کە لە بەردەمیدا بووو لەو بڕوایەشدا بوو، کە تووشی سزاو ئازاری سەخت دەبێتو، ئەم هەڵوێستەشی دەبێتە گیان لەدەست دانیو کوشتنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بە نێرراوەکان هێناوەو ئیمانی خۆی ئاشکرا کردوەو، خۆیشی ئامادەکردوە بۆ لە ئۆباڵ گرتنی ئاکامی هەڵوێستەکەی.

لەوانەیە ئەم هەنگاوەی پیاوە باوەڕدارەکە بەبێ پەروایی دابنرێتو، لەوانەشە ئەو هەڵوێستەشی بە خۆکوشتن (انتحار)و خۆ خستنە نێو تالووکەوە دابنرێت. ئەمە هەمووی لەلای کەسانی خاوەن دیدو بۆچوونی ماددیو بازرگانی، واتە ئەوانەی، کە جیهانی ئیمانداریو بانگەوازیش، وەك جیهانیماڵو سامانو بازرگانی هەڵدەسەنگێنن، کە چەندە قازانجو زیانی تێدایەو، بەپێی ئەم بۆچوونەش پێ ناخەنە سەر کارێك، هەتا قازانجی ماددیی لەم دنیایەدا لێوە مسۆگەر نەکەن.

ئەم جۆرە دیدو بۆچوونەش، لە جیهانی ئیمانو بانگەوازدا ڕەتکراوەو هەڵوەشاوەیە.. چونکە - هەر سەبارەت بە پیاوە باوەڕدارەکەو، هەر باوەڕدارێکی

تریش- ئایا باوەڕی نەهێناوەو بڕوای بەو ڕێبازە نەکردووەو پێی قایل نەبووە؟ ئەی ئیتر بۆچی باوەڕی خۆی ئاشکرا نەکاتو گەلەکەشی بانگ نەکات بۆ هەمان ڕێبازو شوێن پێهەڵگرتنی خۆی؟ ئەی ئایا نێرراوەکانیش ئاتاجیان بە کەسێك نەبووە کە پشتگیرییان بکاتو هاوهەڵوێستیان بێت؟ ئیدی بۆچی لە دەربڕینی ئەو هەڵوێستە بترسین؟! چ ڕێگرێکی لەبەردەم هەڵوێستەکەدا هەیە؟ ئایا ڕێگرەکە مەترسیو ئازاردانو مەینەتیو سزادانە؟ ئەی داخۆ لە کەیەوە ئەم مەسەلانە هۆکاری ڕوو وەرگێڕان بووبنو ڕووی باوەڕدارانیان لە ئاست باوەڕدا وەرگێڕابێت، یان داخۆ لە کەیەوە گرێو بەربەست بووبنو لەبەردەم بانگەوازەکەدا کۆسپو گرێکوێرەیان دروست کردبێت؟

پاشان ئەم پیاوە باوەڕدارە- هەر خۆیەتی کە سوودمەندو سەرکەوتووە لە حەقیقەتەکەدا بەهۆی ئەوەی ڕێگا تازەکەی هەڵبژاردووەو ئاشکراشی کردووەو، کەسانی تریشی بۆشوێنکەوتنی بانگ کردووە. بەم پێیەش هەڵوێستی باوەڕدارانەی ئەم پیاوە، وەك مەشخەڵێکی بەرزو دەرکەوتووی سەر ڕێگای بانگەواز بۆ خوا دەمێنێتەوەو، بەردەوام بانگەوازکارانی دی لەلایەنگرتنی حەقو پێوە پابەندبوونیو بانگەواز بۆکردنیدا، شوێن پێی هەڵدەگرنو دەیکەنە سەرمەشقی خۆیان. زمانحاڵی یەکێك لەوانیش بە کەسانی دی دەڵێت: ( إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ). حەقیش سەرناکەوێتو خەڵکی نایناسێت هەتا ئێمە لەگەڵیدا نەبینو دوای نەکەوینو باوەڕهێنانمان پێی ئاشکرا نەکەینو، دەنگەکانیشمان بەرز نەکەینەوە بۆ گەیاندنی بەگوێی خەڵکانی دیو تۆمارکردنی بەڵگەو نیشانە لەسەریان.

جا ئەگەر ئێمە حەق بەگوێی خەڵکیدا نەدەین، کێی دی پێیان ببیسێتو بەگوێیاندا بدات؟! ئەی ئەگەر ئێمە لە نوێنەرایەتیکردنی دەنگی حەقدا بترسین، ئەوا کێ نوێنەرایەتی بکات؟! ئەی ئەگەر ئەو کارەش نەکەین، چۆن کاری گەیاندنی حەق بە خەڵکی دێتەدی؟ ئەی چۆن حەقیان بخەینە بەرچاو؟ چۆن بەڵگەو نیشانەیان لەسەر تۆمار بکەین بۆ دنیاو ڕۆژی دواییش؟! بێگومان ژیان خۆشو پاکژ نابێتەوە

تەنها بەسەرخستنی حەق‌و بەربەرەکانی کردنی ناحەق (باطل) نەبێت. پیاوانی باوەڕداریش تەنهاو تەنها بە هەڵوێستە ئیمانداریتیەکانەوە دەناسرێن‌و بەرزو پایەدار دەبن. دەبا ئێمەش هەڵوێستی ئەو پیاوە باوەڕدارە بکەینە هەڵوێستی هەمیشەیی ی خۆمان، با هاوارەکەی بکەینە هاواری خۆمان، بیکەینە دروشم‌و ئاگادارینامەی خۆمان ( إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ).

## پیاوەکە، دوای باوەڕهێنانی، چیی بەسەرهات؟!

قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەوەی کە پیاوە باوەڕدارەکە، دوای ئاشکراکردنی ئیمانەکەی، چیی بەسەرهاتووە، بێدەنگ بووەو هیچی لەبارەی دوای ئەو مشت‌و مڕانە نەخستۆتە ڕوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی پیاوەکە بە گەلەکەی خۆی گوتووە: ( إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ) ئەوا من ئیمانم بەخوای پەروەردگاری ئێوە هێناو، ئێوەش بیسەرو ئاگادار بن.

قورئان ئەم بێدەنگییەی لە ئاست هەواڵی دواتری پیاوەکەدا وەك (بۆشاییەکی هونەری) لە ئامێزی چیرۆکەکان‌و نمایشە هونەرییەکەدا، هێشتۆتەوەو، بۆ خەیاڵ‌و ئەندێشەی خوێنەرانی بەجێ هێشتووە تاکو ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە، ئەمەش لە دەرووی بۆچوون‌و مەزەندەکارییانەوە بۆ ئەو بەسەرهاتەی دواتر، کە پیاوەکە تووشی دەبێت.

بەڕاستی ئەوەی بەسەری هاتووە، ڕووداوێکی زانراوەو نامۆ نیە، ئەمەش لە دەرووی ئەو کەش‌وهەوایەوەی، کە تیاییدا دەژیاو، لە سۆنگەی ناسینی ئەو کەسانەوەش، کە لە دەوروبەری دەژیان. دەنا چ ڕووداوێك بۆ پیاوێك چاوەڕێ بکەین کە بیروباوەڕی خۆی لەنێو گەلێکی کافرو بێبڕوادا ئاشکرا کردووەو، ئەو گەلەشی لەوپەڕی ئامادەباشی دان بۆ کوشتاری نێرراوانی خواو پێیان دەڵێن: گەر واز لەو قسەو باسانەتان نەهێنن‌و کۆتایی پێ نەهێنن ئەوا بەردبارانتان دەکەین، یان

سزایەکی سەختو کاریگەرتان لە ئێمەوە تووش دەبێت ﴿... لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ یس﴾.

بەبێ گومان ئەو پیاوە باوەڕدارەش بەردباران دەکەن، کە جورئەتو چەلەنگیی نواندووەو بەربەرەکانیی کردوون، دیارە ئەویش سزایەکی سەختو کاریگەریی لەوانەوە تووش دەبێت. کەواتە ئەم ئاکامە (ئاکامێکی چاوەڕوان کراو) بووە. بەڵام ئێمە هیچ شتێك لەبارەی ئەو ئاکامەوە ناڵێینو، لەخۆمانەوە هیچ ڕووداوو زانیارییان لەبارەیەوە تۆمار کردوەو گوتووشیانە، کە ئاواوئاوا بووەو ئاوای لێبەسەرهێنراوە، بەڵام تاکە بەڵگەیەکی ڕاستو دروست لەسەر ئەو گوتەیەیان نیە، تاکو ئێمەش پشتی پێ ببەستین. هەموو ئەوەی کە، تۆماریان کردوە، تەنها لە ئەفسانەکانو بەسەرهاتی هەڵبەستراوی جوولەکەکان -کە بە دەقەکانی ئیسرائیلیات ناسراون- وەرگیراوە. ئێمەش بە شیاوی دانانێین، کە لەوانەوە وەریگرین، یان لەوانەشە، کەسانی پێشین -لە موسڵمانان- ئەم ڕووداوە نەزانراوانەی دواتری پیاوە باوەڕدارەکەیان، تەنها بەگوێرەی خەیاڵو بازنەی هزری خۆیان تۆمار کردبێت. ئەم خەیاڵو بۆچوونەش، نابێتە باری ڕاستیی ئەو ڕووداوەی، کە لە جیهانی واقیعدا ڕووی داوە.

بۆیە پێویستە لە چوارچێوەو سنووری دەقە قورئانییەکەدا بمێنینەوەو لێی لانەدەین. چونکە پیاوەکە هەرچەندە گەلەکەی ئازاریان دابێتو سزاو ئەشکەنجەیان پێ گەیاندبێت، لەوانەشە کوشتبێتیانو گیانیان لێ دەرهێنابێت، کە قورئان لە فەرمایشتی دواتردا ئاماژەی پێدەکات، کە (پێی گوتراوە بچۆ نێو بەهەشتەوە/ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ) هەرچەندە ئاواشی بەسەرهاتبێت، بەڵام ئێمە هیچ شتێك لەبارەی درێژەو شیکاری بەسەرهاتەکانی دواتر ناڵێین، کە بەسەر پیاوە باوەڕدارەکەدا هاتووەو قورئان بەڕاشکاوی پەنجەی بۆ ڕانەکێشاوە..

## "قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ "

ڕاڤەکاران (مفسرون)ی قورئان لەبەردەم بنچینەی مەبەستی فەرمایشتی (قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ)دا هەڵوێستەیان کردووەو چەند واتایەکی فەرمایشتەکەیان دیاری کردووە. لەم ڕووەوە هەندێکیان وای بۆچوون، کە "بە پیاوەکە گوتراوە (بڕۆ بەهەشتەوە)و فریشتەکان بردوویانەو بەڕاستی خستوویانەتە نێو بەهەشتەوە، ئەویش لە حەقیقەتدا تێیدا دەژی. هەندێکی تریشیان وای بۆچوون، کە ئەو لە ڕاستیدا نەچۆتە نێو بەهەشتەوە، چونکە چوونی باوەڕداران بۆ بەهەشت تەنها لە دوای زیندوو کردنەوەو لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت، دەبێت. بۆیە ڕایان وایە (ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ) مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە هەواڵیان پێداوە لەسەر ئەوەی شایستەی بەهەشت بووە بەهۆی ئەو هەڵوێستە باوەڕدارانەیەوەو، مژدەی ئەوەشی پێدراوە، تاکو هەر زووتر مژدەی پێبدرێت[1]".

ئێمە لەگەڵ وتەی دووەم داین، کە دەڵێن مزگێنیی پێش وەختو زووتری پێگەیەنراوە.. والله اعلم.

بێگومان پیاوە باوەڕدارەکە بەهۆی ئەوەی شایانی چوونە بەهەشت بووە، شایانی ئەو مزگێنی یەش بووەو، لەجێی خۆیدا بووە بۆی‌و، بەهۆی هەڵوێستە باوەڕدارییەکەیەوە بۆی پێویست کراوە. ئەمەش بەهۆی یەکلابوونەوەی خۆی بۆ سەر لایەنی حەق‌و، بەربەرەکانی کردنی ناحەق، شایستەی بووە.

لێرەشدا هەڵوێستەیەك دەکەین، تا بپرسین: ئایا ئەو پیاوە لە هەڵبژاردنی ئەو ڕێگایەو لەو هەڵوێستەیدا زەرەرمەندو ڕەنگ بەخەسار بووە، یاخود سوودمەندو

---

١) بڕوانە تەفسیری (قرطبي) بەرگی ١٥ لاپەڕە ١٩ .

سه‌رکه‌وتوو بووه‌؟ ئه‌ی چ نرخێکی بۆ باوه‌ڕه‌که‌ی داوه‌؟ بێگومان به‌ ژیانیو ته‌مه‌نیو دنیایی، نرخی بیروباوه‌ڕه‌که‌ی داوه‌و ئه‌وانه‌ش هه‌ر به‌خششو به‌شی خوا بوون.

به‌ڵام له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌و نرخه‌دا چیی وه‌ده‌ست که‌وت؟ به‌هه‌شتی ده‌ست که‌وت – که‌ ئاواتو نیازو ئامانجه‌–، به‌هه‌شت به‌ ژیانه‌ هه‌میشه‌یه‌یو نیعمه‌ته‌ نه‌بڕاوه‌کانیو، تامو چێژه‌ نوێبووه‌کانییه‌وه‌ی ده‌ست که‌وت.

جا ئایا ده‌شێت ئه‌مه‌ ناو بنێیت (زیان)؟ بێگومان ئه‌و پیاوه‌ سوودمه‌ند بووو سوودێکی فره‌ی ده‌ست که‌وت، سه‌رکه‌وتووش بوو، که‌ سه‌رکه‌وتنێکی گه‌وره‌ی به‌ده‌ست هێنا. به‌ هه‌موو جۆره‌ ژمێریاریو پێوانه‌و ته‌رازوویه‌ك سوودمه‌ندو سه‌رکه‌وتوو بووه‌، ئه‌ی مه‌گه‌ر به‌هه‌شتی ده‌ست نه‌که‌وتووه‌؟ ئه‌ی مه‌گه‌ر پێی نه‌گوتراوه‌ (ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ)، ئیدی جگه‌ له‌مه‌ چیی تری گه‌ره‌که‌؟! هه‌رکه‌سێکی تریش لایه‌نی حه‌ق هه‌ڵبژێرێتو، لایه‌نگیری ئایینی خواو، سه‌ربازانی خوا بێتو، وابه‌سته‌ی بانگه‌وازی خوا بێتو، به‌رنگاری دوژمنانی خوا ببێته‌وه‌و، زاڵیش بێت به‌سه‌ر ئه‌و کۆسپو ته‌گه‌رانه‌دا، که‌ له‌سه‌ر ڕێبازی خوا تووشی ده‌بنو، نرخه‌که‌شی به‌ ڕه‌زامه‌ندیی خۆیه‌وه‌ دابێتو، باوه‌ڕی به‌ حیسابو پاداشتی خواش بووبێت، به‌ڕاستی ئه‌م جۆره‌ که‌سانه‌ ده‌چنه‌ به‌هه‌شته‌وه‌و، شایانی باسه‌ ئه‌و نیعمه‌ته‌ خۆشو به‌رده‌وامانه‌ی ده‌بنو، فریشته‌کانیش به‌ فه‌رمانی (ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ) مزگێنی پێده‌ده‌ن.

## " قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ "

دوای گەیاندنی مژدەی شایستەبوونی بە بەهەشت، پیاوە باوەڕدارەکە ئەو گەلەی خۆی، کە ئازاریان دابوو، بەبیر دێتەوەو دەڵێت: خۆزگە گەلەکەم بیانزانیایە، کە خوای پەروەردگارم لێم خۆشبوەو کردوومی بە یەکێك لە ڕێزلێنراوان ﴿...قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾ يس﴾. ڕاڤەکارانی قورئان سەبارەت بە بنچینەو حەقیقەتی ئەو هیوا خواستنەی پیاوە ئیماندارەکە، دوو وتەیان هەیە:

یەکەم/ گوتویانە: ئەو پیاوە هیوای خواستووە، کە گەلەکەی بەو حاڵەی دوایی بزانن، تاکو لەو چارەنووسە باشەشی ئاگادار بن.

دووەم/ گوتوویانە: ئەو پیاوە بۆیە ئەو هیوایەی خواستووە، تاکو ئەوانیش بە هەمان باوەڕی ئەوەوە باوەڕیان بهێنایەو، بەو چارەنووسەشی بگەیشتنایە. هەر لەبەر ئەمەشە، کە زانای بەڕێز (ابن عباس)-خوا لێی ڕازی بێت- گوتوویەتی: بەڕاستی ئەو پیاوە بە زیندوویی‌و بە مردوویی ئامۆژگاریی گەلەکەی کردووە[1].

پێشەوا زەمەخشەری ئەگەری دووەمی بە ڕاستتر داناوەو، پشتگیریی (ابن عباس)ی کردووە لە وتەکەیدا، کە لێوەی گێڕراوەتەوە، لەمەشەوە ئاماژەیەکی جوانی دەرهێناوە، کە گوتوویەتی: "لەم ئایەتەدا ئاگادارکردنەوەیەکی سەخت هەیەو، بەڵگەیەکیشی تێدایە لەسەر پێویستیی شاردنەوەی ڕق‌و، خۆڕاگرتن لە ئاست خەڵکی نەفامداو، بەزەیی هاتنەوەش بەوانەدا، کە خۆیان خستۆتە نێو کوورەی بەدکاران‌و خەڵکانی لە ستەمدا ڕۆچووەوەو، هێنانیان بۆ ژێر کەپری

---

١) تەفسیری (قرطبي) ١٥: ٢٠ .

ڕزگاربوونو، سۆزو پەرۆشی نواندنیش بۆ بەرگریو پاراستنیو، بەهۆی ئەمانەشەوە خۆ لادان لە خۆشخاڵ بوون بە کارەساتەکانیانو، یان خۆ لادان لە دووعا لێکردنیان، ئەی مەگەر نابینین چۆن ئەم پیاوە باوەڕدارە هیوای خێرو چاکەی بۆ بکوژانی خواستووە. بۆ ئەو ستەمکارانەی کە هەر خراپەو بەدکارییان دەرهەقی کردبووو لە هەمان کاتدا کەسانی کافرو بت پەرستیش بوون"[1].

بەم ڕەنگە پیاوە ئیماندارەکە، خۆزگەی ئەوەی خواستووە کە گەلەکەشی ئەو ئاکامو سەرەنجامە باشەی بزانن، بەشکم تەسلیم بە ئایینی خوا ببن. ئەو، گەلەکەی خۆی کوشتوویانەو، لەناویان بردووەو، زیانێکی گەورەیان پێ گەیاندووەو، نەشیانزانیوە کە ئەوان بەو کردەوە بەخێرو چاکەو سەرەنجامی باشی بۆ دابین دەکەن. ڕاستە کە ئەوان ناچاریان کرد کە ئەم دنیایە جێ بێڵێت بێئەوەی خۆی ئاخو داخیشی بۆ هەڵکێشێتو، لە خۆشیو تامو لەززەتە بڕاوەکانیو ژیانە کەمو ناتەواوەکەش بێبەشیان کرد، بەڵام چووە نێو ئەو بەهەشتە گەورەو گرانەوە کە نیعمەتی هەمیشەییو ژیانی نەمریی تێدایە.

خێرو چاکەیەکی وەهایان پێشکەش کرد کە خۆیان مەبەستیان ئەوە نەبووو هەرگیز نەشیاندەویست تووشی بێت، لەبەر ئەمەشە کە ئەو پیاوە هیوای ڕێی ڕاستی بۆ خواستوون. ئەوەبوو لە ژیانیدا ئامۆژگاریی کردنو لە مردنیشیدا هەر ئامۆژگاریی کردن.

﴿بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾ يس﴾، کەی خوا لێی خۆش بوو؟ ئەی کەی ڕێزی لێنا؟ بێگومان دوای پشتگیریی کردنی ئایینی خواو، شوێنکەوتنی نێرراوانو، ڕووبەڕووبوونەوەی کافران. خۆ ئەگەر هەر لەسەر بیروڕاو قەناعەتە

---

١) (الكشاف)ی زەمەخشەری، بەرگی٣، لاپەڕە ٣١٩-٣٢٠.. کە لەمەشەوە ڕاڤەکارانی دی هەمان دەقی تەفسیریان وەرگرتوە. بڕوانە (تەفسیری قرطبي) بەرگی١٥ لاپەڕە ٢٠، هەروەها بەراوردی نێوان هەردو تەفسیرەکەش بکە تاکو لە چۆنیەتی ڕونکردنەوەو ڕێککردنەوەی تەفسیرەکان ئاگادار بیت.

تیۆرییەکەی بمابایەوەو، ئەگەر ئەو هەنگاوە عەمەلیو کردەییەی نەنایە، ئایا لێخۆشبوونی خوای دەسگیر دەبووو، بەو ڕێزلێنانەی خواش بەختەوەر دەبوو؟

هەموو بانگەوازکارێکی ڕێی خواش ئاوان، ئەوەی کە پیاوە باوەڕدارەکەی نێو ئەم چیرۆکە تووشی بووە، ئەوانیش تووشیان دەبێت لە پێناوی بانگەوازو ڕێبازەکەیاندا، بەلام کاتێك بانگەوازکاری ڕێی خوا دەزانێت خوا چیی لە بەهەشتو نیعمەتەکانیو لێخۆشبوونو ڕێزلێنان بۆ دەستەبەر کردوە، ئەوا هیوا دەخوازێت، کە گەلەکەشی -کە ئازاریان پێ گەیاندووە- ئەو چارەنووسەی بزانن، بۆیەش خەفەتیان بۆ دەخواتو، بەزەیی پێیاندا دێتەوەو، دڵتەنگ دەبێت بۆ ئەو حاڵو بارودۆخەیانو، هیوای هیدایەتو باوەڕهێنانو پابەندیی بە ئایینی خواوەیان بۆ دەخوازێت، تاکو ئەوانیش بەو خێرو بەرەکەتە هەمەجۆرە بەختەوەر بن.. بەلام جیاوازیی نێوان ئەم دوو هەڵوێستە ئاسمانو ڕێسمانە.

## لەناوبردنی دانیشتوانی ئاوەدانییەکە

دانیشتوانی ئاوەدانییەکە، بانگەوازیان بۆباوەڕهێنان ڕەت کردەوەو بەدەمیەوە نەچوونو، نێرراوەکانیشیان بەدرۆ خستەوەو، ئازاریان دانو، ستەمێکی گەورەشیان لەو پیاوە کرد، کە باوەڕی پێیان هێنا. لەوانەشە نێرراوەکانو پیاوە باوەڕدارەکەشیان کوشتبێت.

جا بەهۆی ئەو تاوانە گەورانەوە خۆیان خستە بەر سزاو تۆڵەی سەختی خواو، سزاکەش بە خێرایی بەریانکەوت. ئەوەبوو خوا هیچ سەربازێکی لە فریشتەکان لە ئاسمانەوەو بە مەبەستی لەناوبردنیان بۆ نەناردن، بەڵکو هاوارێکی توند (صَيحَة) گرتنیو دەسبەجێ لەناوی بردن، وەك خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يس﴾.

بێگومان ئەو هاوارە توندو لەناکاوەی ئاسمان لەناوی بردنو ئەوانیش خامۆشو کپ بوونەوە وەك چۆن ئاگر لەدوای داگیرسانو کڵپە سەندنی دەکوژێتەوەو خامۆش دەبێتەوە، ئیدی هەموویان وەك چەند لاشەیەکی ساردو سڕیان لێهات دوای ئەوەی زەوییان بە جمۆجووڵو هەڵسووڕانو بەدکاریو کفرو فەساد جەنجاڵ کردبوو.

هەروەها خوا چەندان گەلو هۆزی بێباوەڕی تری بەو جۆرە سزایە گەیاندووە:

بۆ نموونە گەلی (سەموود)، کاتێك پێغەمبەری خوا (صالح)-سلاوی لێ بێت- بەدرۆخستەوەو، حوشترەکەیان سەربڕی، وەك لەبارەیانەوە فەرمووییەتی: ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ ... ﴿٦٨﴾ هود﴾. واتە: بە سزای دەنگو هاوارە توندەکە ئەوانەی ستەمکار بوون سزادرانو لەناوبران، ئیدی لەنێو خانەو ماڵی خۆیاندا کپو خامۆش بوونەوەو وەك ئەوەیان لێ هات کە گوایە هەر تێیدا نەژیابن.

گەلی (مەدیەن)یش کاتێك (شوعەیب)یان بەدرۆ خستەوە، هەمان سزایان تووش بوو، وەك خوای مەزن لەبارەی ئەوانیشەوە فەرموویەتی: ﴿...وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ هود﴾، واتە: بە هەمان سزای هاوارە بەهێزەکە ئەوانەی ستەمکارو کافر بوون لەنێوبرانو، وایان لێهات کە لەنێو خانەو ماڵی خۆیاندا بە سەر دەمو چاویاندا تەخت بنو بکەونو ئاوا کپو خامۆش ببنەوەو ئاسەواریشیان نەما، وەك ئەوەی هەر تێیدا نەبووبن. دەی هەر تەفروتونا بن گەلی مەدیەنو دووربن لە ڕەحمەتی خوا، وەك چۆن گەلی (سەموود)یش پێش خۆیان لەو ڕەحمەتە دوور بوونو کەوتنە بەر سزاو نەفرینی خوا.

دیسان گەلی (لوط)یش هەمان سزایان بەرکەوتووە: ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ الحجر﴾.

واتە: هەر لە بەرەبەیانو لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا کەوتنە بەر نەڕەی هـاوارە گـەورەو توندەکەو، بەرزییو نزمیـی وڵاتەکـەیانمان وەك یـەك لێکـردو تـەخت کـردو، لـە ئاسمانیشەوە بەردی تۆکمەی بەئاگر سوورکراوەمان بەسەردا باراندن.

هەروەها دەربـارەی لـەنێوبردنی (عـاد)و (سـەمود)و (قـارون)و (فیرعـەون)و (هامـــان)، خـــوا فەرمویـــە: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَیَّنَ لَكُم مِّن مَّسَـٰكِنِهِمْ ۖ وَزَیَّنَ لَهُمُ ٱلشَّیْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِیلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِینَ ﴿٣٨﴾ وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَیِّنَـٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَـٰبِقِینَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَیْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّیْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِیَظْلِمَهُمْ وَلَـٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ یَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ العنکبوت﴾. واتە: بەبیر خۆتانی بێننەوە چۆن خوا گەلانی (عاد)و (سـەمود)ی لـەناوبرد، ئەمـەش دوای ئـەوەی — وەك لـە دیتنـی ئاسـەواری کەلاوەکانیانو وڵاتە وێرانبووەکانیانەوە دەردەکەوێت- کە خوا نێرراوانی خـۆی وەك بـۆ نـاردنو باوەڕیـان بـەخوا نـەهێناو، شـەیتانیش گوناهو یـاخی بـوونی بـۆ ڕازاندبوونەوە تاکو سووربن لەسەر کفرو بەدکارییو، ئیدی هەر شەیتانیش لـەڕێی ڕاستو ئاینی خوا لای دابوونو دڵو چاوی کوێر کردبوون، لەکاتێکدا ئەوان بەرچـاو ڕۆشن کرابوونو لە حاڵەتی تێگەیشتنو توانـای بیـنینو وەرگرتنـی ڕێبـازی ڕاسـت دابوون، بەڵام حەزیان لە ڕێی ڕاستو تێگەیشتن نەبو. هەروەها ئەی پێغەمبەر ﷺ باسی قارونو فیرعەونو هامانیان بۆ بکە، ئەوەبوو (موسا)-سەلامی لـێ بێـت- لەلایە خواوە نێررا بۆ لایانو، ئەویش بە بەڵگەو نیـشانە دیارەکانمانـەوە چـوو بـۆ لایانو داوای باوەڕهێنان بە خواو، پەیڕەوکردنی ڕێبازە ڕاستەکەی لێکـردن، بـەڵام ئەوان لەسەر زەویدا گەورەو لووتبەرز بوونو سوور بوون لەسەر کفـرو سەرکێـشیو

خۆبەزل زانان، لەم ڕەفتارانەشیاندا نەیانتوانی خۆیان لە سزای خوا دەرباز کەن. ئێمەش هەریەکەیانمان بە پێی گوناهی خۆی سزادا، بۆ نموونە یەکێك لەو گەلانەمان بە گەردەلوولێکی توندو گەرمی پڕ لە وردە بەردی گڵینی سوورکراوە لەناوبردووە وەك گەلەکەی (لوط)، هەندێك گەلی تریشمان بە هەورەتریشقەو دەنگو هاواری توندی لەناکاو سزاداوە وەك گەلەکانی (صالح)و (شوعەیب)و، ئەو گەلە بێباوەڕەی نێو ئەم چیرۆکە، هەندێك کەسی تریشمان بە ناخی زەویدا بردۆتە خوارەوە وەك قاروونو ماڵو سامانەکەی، هەندێك گەلو کەسی تریشمان لەئاودا سەرنگووم کردووەو خنکاندووە وەك گەلی نووحو فیرعەونو گەلەکەی، خواش بەبێ گوناه سزای کەسی نەداوە گەر تاوانێکی نەبووبێتو ستەمی لە هیچ کەسێك نەکردووە، بەڵکو ئەو تاوانبارانە خۆیان -بەهۆی سوربوونیان لەسەر کفرو بێباوەڕییو بەدکارییو باوەڕنەهێنانیان بە پێغەمبەرانیان- ستەمیان لەخۆیان کردووە کە ئاوا خۆیان خستۆتە بەر سزاو تۆڵەی سەختی خوا..

سەبارەت بە خەڵکی ئاوەدانییەکەش -کە لەم چیرۆکەدا بەو شێوەیە لەنێوبران-، ئیمام (زەمەخشەریی) لەسەر هۆو حیکمەتی نەناردنی فریشتەکان بۆ سەریان -وەك چەند سەربازێك کە لەناویان بەرن- پرسیاری کردوە، کە بۆچی تەنها بەو هاوارە توندی لەناوبراون، لەکاتێکدا بۆ یارمەتی دانی دوایین پێغەمبەری خۆی محمد ﷺ لە ڕۆژانی هەردوو جەنگی بەدرو خەندەقدا فریشتەکانی ناردووە بۆ لەنێوبردنی کافرانی قورەیشو تاقمەکانی تر کە بە (ئەحزاب) ناسرابوون؟ ئیمام (زەمەخشەریی) هەر خۆیشی لە وەڵامی پرسیارەکەیدا گوتوویەتی:

"بێگومان خوا کاری لەنێوبردنی هەر گەلێکی بە چەند شێوازێکی جیاجیا ئەنجام داوە، ئەمەش بەپێی حیکمەتی خوازراوی خۆیو بەرژەوەندی یە پێویستەکەش، بووە، مەگەر نابینیتو سەرنج لەو فەرمایشتەی پێشووی خوا نادەیت کە فەرموویەتی: ﴿...فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ

﴿وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ...﴿٤٠﴾﴾العنكبوت. جا ئەگەر بپرسیتو بڵێیت: بۆچی خوا لە جەنگەکانی بەدرو خەندەقدا سەربازانی خۆی —لە فریشتەکان- بۆ لەنێوبردنی کافران ناردووە؟ منیش لە وەڵامتان دەڵێم: بێگومان تاکە فریشتەیەك بۆ ئەو ئەرکە بەس بووە، چونکە بێگومان گوندو شارەکانی گەلی (لوط) بە پەڕێك لە باڵی (جبريل)ی فریشتەی خوا لەنێو براون، وڵاتی (سەمود)یش بە هاوارێکی توندی ئەم فریشتەیە لەنێوچوون، بەڵام خوا فەزڵو ڕێزێکی زۆرتری لە هەموو ڕوویەکەوە بە پێغەمبەری دوایین محمد ﷺ و زیاتر لە پێغەمبەرە گەورەکانی تری خاوەن عەزمەکانیش (اولو العزم) دابوو، لە هۆیەکانی کەرامەتو بەهێزکردنیش هۆی بۆ ڕەخساندبوو، کە پێشتر بۆ کەسی تری نەڕەخساندبوو، یەکێك لەو هۆکارانەش، ناردنی سەربازانی خۆی بوو لە ئاسمانەوە. لەم فەرمایشتەی کۆتایی چیرۆکەکەی نێو سوورەتی (یس)یشدا، کە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾﴾، وەك ئەوە وایە، کە بیفەرموایە: بێگومان ناردنی سەربازان لەو کارە هەرە گەورانەیە، کە هیچ کەسێکی تر —جگە لەخۆت ئەی پێغەمبەر- شایستە نیەو، بۆ غەیری تۆش ئەو کارە ناکەین[1]".

بەڵام پێشەوای زانا (سيد قطب) حیکمەتێکی تری لەسەر (لەناوبردنیان بەو هاوارە بەهێزە)و لەسەر (نەناردنە خوارەوەی سەربازان لە ئاسمانەوە بۆ سەریان) دیاریکردووەو، گوتوویەتی:

"لێرەدا —لەم کۆتاییەی چیرۆکەکەدا- درێژەی بە وەسفی لەناوچوونی گەلەکە نەداوە، ئەمەش بۆ بەکەم گرتنی ئەو گەلە خۆیانو، بۆ بچووککردنەوەی بوونو وجوودیان، هەر تەنها هاوارێکی بەهێز هاتووەو دڵو دەروونی دامرکاندوونەتەوەو

١) الكشاف، للزمخشري/ ٣: ٣٢٠

خامۆشی کردوون. ئیدی پەردە بەسەر دیمەنە پڕ لە دەردەسەری‌و ڕیسوایی‌و زەلیلی یەکەیاندا دادەدرێتەوە"[1].

جا کاتێك بڕیاری خوا -بۆ لەناوبردنیان- دەرچووەو، سزاکەیان پێ گەیشتووە، بێ‌توانا بوون لە بەرەوڕووبوونەوەیداو ئەو هەموو کفرو فەسادو بەدکارییانەیان سوودێکی پێ نەداون‌و، کەسێکیشیان بەدیی نەکردووە، کە لە جیاتی خوا بیانپارێزێت‌و پشتگیرییان بکات. هاوارە توندەکە یەك جار بووەو، دەسبەجێ هەموویان کەوتوون‌و وەك سووتەمەنیی ئاگرێکی کوژاوە ساردو خامۆش بوونەتەوە. ئیدی نە زاڵ‌و سەرکەوتوو بوون‌و نە بەختەوەرو سەرفراز، بەوپەڕی سەرشۆڕی‌و ڕیسوابوونیشیانەوە ئەم دنیایەیان بەجێ‌هێشتووە، لەکاتێکدا پێشتر هەر خۆیان بوون کە هەڕەشەو گوڕەشەی سزاو ئازاردانیان دەکردو بە نێرراوانی خوایان دەگوت: ﴿...لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ يس﴾. ئای چەند لاوازە مرۆڤ..!! ئای چەند بێ‌دەسەڵات‌و دەستەوسانیشە لە ئاست قەدەری خوا کاتێك بەری دەکەوێت.

ئای کافرانیش چەندە گێل‌و نەفام‌و ساویلکەن‌و، وادەزانن گوایە زۆر بەهێزن، کەچی لەبەردەم خوادا لاوازو ڕیسواو سەرگەردان‌و ڕەنجەڕۆن، ئەوان دەستدرێژی دەکەنە سەر بانگەوازی خواو، نکووڵی لە ئایینەکەی دەکەن‌و، نێرراوانی خواو پیاوچاك‌و بانگەوازکارانی ئازار دەدەن‌و، گومانیشیان وایە گوایە لە سزای خوا قوتار دەبن، ئیتر بەو هۆیەشەوە ئاکامی ستەمکاری‌و بەدڕەفتاری‌و تاوانبارییان دەچننەوەو، هەر ئەمەشە سوننەت‌و ڕێسای خوا لەسەر لەناوبردنی گەلی کافران کە بەهۆی لە ستەم ڕۆچوون‌و بێ‌باوەڕبوونیانەوە دەیانگرێت‌و، لە سەرەنجامی ئازاردانی هەڵسوڕاوانی خواو خۆشەویستان‌و پیاوچاکانیشیەوەیەتی.

---

[1]) سید قطب- في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦٤ .

## " يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ "

پێش ئەوەی چیرۆکی دانیشتوانی ئاوەدانییەکە بەجێ بێڵین، چەند ساتێکیش ڕادەوەستین لە ئاست بەدواداچوونی قورئان لەسەر ئەو چیرۆکەو، لەسەر سزادانیان بە دەنگی هاوارە توندەکە، تاکو چەند وانەیەکی هەمیشەیی‌و، پەندێکی کاریگەریی لێ دەرهاوێژین..

خوا لەکۆتایی چیرۆکەکەدا فەرموویەتی: ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٣٢﴾ يس ﴾، واتە: ئای چەند داخێکی گەورەیە لەسەر ئەو عەبدانە کە بە سەرکێشی‌و بەدبەختیی خۆیان پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوەو، هەر پێغەمبەرێکیان بۆ چووبێت سووکایەتی‌و گاڵتەیان پێ‌کردووە.. ئەی ئایا — قورەیش‌و هەموو کافرانی سەر زەمین- نازانن کە ئێمە لە پێش ئەواندا چەندین گەل‌و نەتەوەی ترمان لەنێو بردووە کە وایاندەزانی بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوەو تووشی سزاو لێپرسینەوە نابن.

مامۆستای پێشەوا (سید قطب) دەربارەی ڕوون کردنەوەی ئەم بەدواداچوونە، گوتوویەتی:

"داخ‌و حەسرەت کاردانەوەیەکی دەروونییە لەسەر حاڵێکی مەینەتبارو جێی ئاخ‌و کەسەر، مرۆڤیش هیچ دەسەڵاتێکی لە بەرامبەریدا نیە، تەنها ئەوە نەبێت کە ئاخ‌و حەسرەتەکە هەڵکێشێت‌و لە دەروونیدا ئازار بکێشێت. خوای پاك‌و بێ‌خەوشیش هیچ حەسرەتێك بۆ ئەو جۆرە عەبدانە هەڵناکێشێت، بەڵام بڕیاری وایە، کە حاڵەتی لەناوچوونی ئەو عەبدانە شایستەی حەسرەت کێشانی ئەوانەیە، کە بە بیستنی هەواڵی لەنێوچوونیان ئاخیان بۆ هەڵدەکێشن. ئەمەش بارودۆخێکی

خەمناكو پڕ داخو كەسەرەو خاوەنانی بە چارەڕەشیو بەدبەختیو بەڵای گەورە دەگەیەنێت. ئای کە بەڕاستی حەسرەتە لەسەر ئەو عەبدانە: ئەوان دەرفەتی خۆ ڕزگارکردنیان بۆ ڕەخسێنراوەو، بەڵام ڕوویان لێوەرگێڕاوە، ئەوان بەچاوی خۆیان ئاسەواری لەنێوچوونی گەلانی دوابڕاوی پێش خۆیان دەبینیو کەچی بەوردی سەرنجیان لێ نەدەداو سوودیان لێ وەرنەدەگرت. خواش دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆی —جار لەدوای جار- لەڕێی ناردنی پێغەمبەرانەوە بۆ دەخستنە سەر پشت، کەچی ئەوان خۆیان لە دەرگاکانی ڕەحمەت دوور دەخستەوەو، ڕەفتاری ناشایستەیان بەرامبەر بەخوا دەنواند"(1).

بێگومان کافرانی ستەمکار پەند لەو ڕووداوو کارەساتانە وەرناگرن، کە بەسەر کەسانو گەلانی پێش خۆیاندا هاتووە.. پەند لە مێژوش وەرناگرن، بەوپەڕی ساویلکەییو نەفامیو بێباکییەوە مامەڵە لەگەڵ بانگەوازکارانی ئامۆژگارو چاکەخوازدا دەکەن، ستەمیان لێدەکەنو سزاو ئازاریان دەدەنو، تەنانەت دەیانکوژن. ئیدی سوننەتی خواش لەمەڕ سزادانیان شیاو دەبێتو، خوا دەیانگرێتو لەناویان دەباتو خانەو ماڵو نیشتگەیان بۆ وێران دەکات.

دیارە ئەو کافرە زۆردارو ملهوڕانە بەهۆی ئەو گەمژەییو ساویلکەیەتیانەوە شایانی حەسرەتو بەزەیی پیاداهاتنەوە بە حاڵیانو ئاخو حەسرەت بۆ هەڵکێشانن، ئای چ حەسرەتێکی گەورەیە لەسەر ئەو عەبدانە (يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِ).

کافرانیش هەرکاتێك ڕێبازی ڕاستو شوێنکەوتوانی حەقیان بەدرۆ خستبێتەوە، ئەوە هەمیشە شێوازێکی بەردەوامی کافران بووە لە گشت کاتو سەردەمو ناوچەیەکدا.. دیارە سووکایەتی کردنیشیان بە پیاوچاکانو شوێنکەوتوانی خواش هەر شێوازێکی هەمیشەیی یان بووە. بەڵام پشتگیرییکردنی خواش بۆ شوێنکەوتوانی خۆیو ڕزگارکردنو سەرخستنیان هەر شێوازێکی خواییو

---

1) سيد قطب- في ظلال القرآن/ ٥: ٢٩٦٦- ٢٩٦٧.

پەروەردگارێتیی خۆی بووە، وەك چۆن لەناوبردنی کافرانو وێرانکردنی ناوچەکانیان شێوازو سوننەتێکی تری خوایی بووە.. دەی سا خۆزگە گەلەکەمان دەیانزانی کە لەنێو دەچنو دەشیانزانی کە بانگەوازکارانی ڕێی خوا دەکەونە بەر لێخۆشبوونی خواو ڕەزامەندییو نازو نیعمەتەکانیان پێدەدرێت. ﴿قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ يس﴾.

# چیــرۆکی هەشــتەم

## چیــرۆکی خاوەنــانی چاڵەکــە

## ( اصحـاب الاخـدود )

ئاماژەکانی سوورەتی (البـروج)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَابُ
الْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ
﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٨﴾ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا
فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ
جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ
وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ
الْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ ﴿٢٠﴾ بَلْ
هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾ ﴾.

# پوختەی مانای ئایەتەکانی ئەم سـوورەتە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بە ئاسمانی جێی ئەستێرەکانو، بە ڕۆژی بەڵێن لەسەردراو (قیامـەت)و، بە شاهێدو، شاهێدیی لەسەردراو. بەکوشت چنو نەفرەتیان لـێبێت خاوەنانی چاڵە گەورەکە کە ئاگرێکیان تێدا کردەوە، ئـاگرێکی پـڕ لـە سـووتەمەنیو بلێـسە کـە کۆمەڵێك کەسی خاوەن باوەڕیان تیا دانا بۆ ئەوەی بیانسوتێننو، خۆشـیان لەسـەر کەنارەکانی چاڵەکە دانیشتبوون بۆ دیتنی دیمەنی سوتانی ئیماندارەکانو بەم ڕەنگە سزایان دەدان. ئەم سزایەشیان تەنها لەسەر ئەوە دەدان کـە باوەڕیـان هێنـابوو بـە خوای دەسەڵاتدارو ستایش کراو، ئەو خوایـەی کـە خـاوەنی مـوڵکی ئاسمانـەکانو زەوییەو، هەر خواش شاهیدو ئاگاداری هەموو مەسەلەیەکە. بێگومان ئەو کەسـە زۆردارانەی کە بەو ڕەنگە سـزای پیـاوو ئافرەتـە باوەڕدارەکانیـان دابـووو پاشـان تەوبـەیان نـەکردو پەشـیمان نەبووبوونـەوە، سـزای دۆزەخ چـاوەڕێیانەو، سـزای ئاگرێکی بەتینو سوتێنەر. ئەوانەش کە باوەڕیـان بـەخوا هێنـاوەو کـاری چـاکیان کردووە، بەو بەهەشتە پاداشت دەدرێنەوە کە جۆگەو ڕووبارەکـان بەژێریـدا دەڕۆن، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیانە. بەڕاستی زەبری پەروەردگاری تۆ زۆر توندوتیژە، هەر ئەو خوایەشە کە لە سـەرەتادا یەکـەم جـار مرۆڤـ دروسـت دەکـاتو پاشـان زیندووی دەکاتەوە. هەر ئەویشە لێبـوردەو میهرەبـان. خـاوەنی تـەختو تـاراجی گەورەیەو، خواستی لـە هـەر کـارێکیش بێـت دەیکـات.. ئایـا پێـت گەیـشتووە بەسەرهاتی لەشکرو سەربازەکانی فیرعەونو سەمود، کە چ پاڵەوانو قارەمانێکیان هەبووو، زۆر کەس لـە ترسـی ئـەوان هەڵدەلـەرزی، کـە زۆر لـە ئێـوە بـەهێزترو دەسەڵاتدار تر بوون، بەڵام بەهۆی بەدکاریو بێباوەڕیی خۆیانەوە خوا لەناوی بردن. جا ئەوانەی کافرو بێباوەڕ بوون هەمیـشە لەسـەر ئاکـاری بـەدرۆدانانی پـەیامی خوانو دەیانەوێت قورئانیش بەدرۆ لە قەڵەم بدەن. خواش لە هەموو کاروبارێکیـان

ئاگادارەو بە ئاگاداریو زانستی خۆی چواردەوریانی تەنیوە، -چونکە بەڕاستی ئەم پەیامەی کە ئەوان بەدرۆی دادەنێن، درۆ نیە- بەڵکو قورئانێکی گەورەو بەهادارەو، لە لەوحی پارێزراوی خۆیدا پاراستوویەتی.

## چەند ئاوڕێك لە ئایەتەکانەوە

سوورەتی (البروج) کە سوورەتێکی کورتی مەککەییە، وەك (سید قطب) لەبارەیەوە دەڵێت: "ڕاستییەکانی عەقیدەو، بنەماکانی تێڕوانینی باوەڕدارانە، وەك چەند مەسەلەیەکی گەورە دەخاتە ڕووو چەندین ڕۆشنایی بە شەوقو دوور مەوداشیان لەپشت ماناو حەقیقەتە ڕاستەوخۆو گوزارشت لێکراوی دەقەکانییەوە، دەخاتە سەر، تەنانەت تا وای لێدێت کە هەر ئایەتێك لەم سوورەتە — تەنانەت هەندێك جار هەر وشەیەکیش لە وشەکانی ئایەتەکەی- خەریکە کلاوڕۆژنەیەك لە حەقیقەت لەسەر جیهانێك بکاتەوە کە هەموو پارچەو لایەنەکانی دژ بەیەكو لێك دابڕاون[1]".

ئەم سوورەتەش چیرۆکی خاوەنانی چاڵە گەورەکە (اصحاب الاخدود) دەخاتە ڕوو، کە بابەتی سەرەکیی سوورەتەکەیە. دیارە هەر لەسەر ئەو شێوازە قورئانی یەشە کە چیرۆکەکانی تری پێشینانی پێ خراونەتە ڕوو. بەپێی ئەم شێوازەش — زۆرجار- بە ئانقەست پەل بۆ هەندێك شیکارو وردەکاریی چیرۆکەکە ناهاوێت، بۆ نموونە وەك دیاریکردنیناوی پاڵەوانانی چیرۆکەکەو، شوێنو سەردەمی ڕووداوەکان، دیسان هەر لەو شیکارو وردەکاریو دیمەنو وێستگانەی تری چیرۆکەکە هێندە باس ناکات تەنها بەو ڕادەیە نەبێت کە پەندو ئامۆژگاریی لێوە دەردێنرێت.

سوورەتی (بروج)یش چیرۆکی (خاوەنانی چاڵەگەورەکە)ی بەم ڕەنگە خستۆتە ڕوو، ئێمەش چەند هەڵوێستەیەکی کورتو خێرا دەنوێنین لەئاست ئەو (ئایەتانەی

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٣٨٧١ .

ئەم سوورەتەدا)، كه دەربارەی چیرۆكەكه هاتوونو، پاشان هەندێك لەو ئاوڕدانەوەو ئاماژەو سەرنجه سودبەخشانەی لێ دەردێنین.

## سوێند خواردن له سوورەتەكەدا

١- سوورەتەكه سەرەتای چیرۆكەكەی به دۆخێكی گەورە دەست پێ كردووە، كه دۆخی سوێندخواردنەو، سوێندەكەشی به چوار شت تیادا خوراوە:

أ/ سوێند به ئاسمانی خاوەن كەلو (ئەستێرە/برج)ەكان خواردووە، ناوی سوورەتەكەش لەو وشەیەوە وەرگیراوە، دیارە ((ئاسمانیش هێجگار گەورەو پانو بەرینەو، كەلوو برجەكانیشی گەورەو قەبەن، لەوانەشە مەبەست له وشەی (بروج) ئەستێرە گەورەكان، یان كەشكەڵانە زەبەلاحەكان بێت، یاخود مەبەستی له جێگەو پێگەی ئەو هەسارەو ئەستێرانە بێت، كه له هاتو چۆی نێو پانتایی ئاسمانیاندا لێیانەوە دێنو دەچن. به هەر حاڵ سایەی گەورەییو زەبەلاحیو، جێگەی بایەخ پێدانەكەش، هەردوو تێڕوانینو واتاكەش دەگرێتەوە))[1].

ب/ سوێندی به ڕۆژی بەڵێن لەسەر دراو (اليوم الموعود)یش خواردووە، كه ڕۆژی (قیامەت)ە، كه خوا بەڵێنی به باوەڕداران لەسەری پێداوە.

ج/ سوێندی به شایەتیش خواردووە، لەوانەشە مەبەست له شایەتەكە، پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، كه خوا دەیكاتە شاهێد لەسەر نەتەوەكەی، وەك له سوورەتی (الفتح)دا لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾﴾ الفتح.. لەوانەشە (شاهید) لەم سورەتەدا، هەر شاهێدێكی دی بێت، كه خوا له ڕۆژی قیامەتدا بیكات به شایەتو بەڵگە.

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٣٨٧٣ .

د/ هه‌روه‌ها سوێندی به‌ شاهێدی بۆدراو (یان بینراو/مشهود)یش خواردووه‌، له‌وانه‌یه‌ مه‌به‌ست له‌ بینراوه‌كه‌ش (المشهود) ڕۆژی قیامه‌ت بێت، چونكه‌ هه‌موو خه‌ڵكی بینه‌ر (شاهید)ی ده‌بن و ئاماده‌ی ڕۆژی لێپرسینه‌وه‌كه‌ی ده‌بن، وه‌ك خواش له‌ سووره‌تی (هود)دا له‌باره‌یه‌وه‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿...ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ هود﴾. له‌وانه‌شه‌ مه‌به‌ست له‌و كارو كرده‌وانه‌ بێت، كه‌ شاهیدی له‌سه‌ر مرۆڤ ده‌ده‌ن و، كه‌ خاوه‌نانی كرده‌وه‌كان له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا ده‌یانبیننه‌وه‌.

ئه‌م چوار مه‌سه‌له‌ گرنگ و گه‌وره‌یه‌ش، ده‌بنه‌ سه‌ره‌تایه‌كی باش بۆ لێدوان له‌سه‌ر چیرۆكی (خاوه‌نانی چاڵه‌ گه‌وره‌كه‌)، چونكه‌ به‌ وێناكردنی كه‌شێكی تایبه‌تی ده‌ست پێده‌كه‌ن و ڕێخۆش ده‌كه‌ن، كه‌ ڕووداوه‌كانی چیرۆكه‌كه‌ی تیادا پیشان ده‌درێت.

مامۆستای پێشه‌وا (سید قطب) ده‌رباره‌ی ئه‌و كه‌ش و بارودۆخه‌ی، كه‌ ڕێخۆشكه‌ری پیشاندانی چیرۆكه‌كه‌ن، گوتوویه‌تی:

((هه‌موو ئه‌مانه‌ ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ البروج﴾ پێك ده‌گه‌ن، تاكو گشتیان له‌ دانانی سێبه‌ری بایه‌خدان و كۆڕو كۆبوونه‌وه‌و گه‌وره‌یی‌یه‌كه‌دا پێك بگه‌ن و، سێبه‌ره‌كه‌ش بخه‌نه‌ سه‌ر ئه‌و كه‌ش و بارودۆخه‌ی، كه‌ تێیدا ڕووداوی هه‌ڵكه‌ندنی چاڵه‌ گه‌وره‌كه‌و كاره‌ساته‌كه‌ پیشان ده‌دات. هه‌روه‌ك ئامازه‌ بۆ ئه‌و بواره‌ به‌رفراوان و هه‌مه‌لایه‌نه‌ش ده‌كه‌ن، كه‌ ڕووداوه‌كه‌ی تیادا دانراوه‌و، حه‌قیقه‌ته‌كه‌شی تێدا هه‌ڵده‌سه‌نگێنرێت و، حیساب و لێپرسینه‌وه‌شی تێدا ده‌پاڵێورێت. ئه‌مه‌ش له‌ بواری زه‌وی گه‌وره‌تره‌و، له‌ مه‌ودای ژیانی دنیاو ماوه‌ دیاریكراوه‌كه‌شی دوورتره‌[1])).

---

١) في ظلال القرآن/ ٥: ٣٨٧٣ .

## هەندێك لە سیفەتەکانی دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان

٢- ﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾: (خاوەنانی چاڵە گەورەکە) ئەو ستەمکارە بێباوەڕانەن کە لەسەرە زەوی چاڵە گەورەکەیان هەڵکەندووەو، پاشان ئاگرێکیان تیادا کردۆتەوەو، باوەڕدارانی گەلەکەی خۆیان تێ فڕێداوەو، ئنجا بەسەریانەوە ڕاوەستاونو سەیری ئەو دیمەنەیان کردووە کە ئاگر لاشەکانیانی دەسوتاندو دەخوارد. لەم ئایەتەدا دووعایەکیش لەو ستەمکارانە کراوە —کە دووعای کوشتنە-و دەفەرموێت: هەر بەکوشت چنو بکوژرێن خاوەنانی چاڵە گەورەکە.. ئەم دووعایەش لە خواوە لێیان کراوەو، دووعایەکیش لە خواوە بکرێت هەر بەجێ دەگاتو هیچ دەربازێکی تری نیە. پاشان دووعالێکردنی خوا لەسەر ئەوان —بەکوژران- بەڵگەیەکی دیارە لەسەر دڕندەییو پیسیو چەپەڵیی تاوانەکەیانو، بەڵگەیەکیشە لەسەر زۆرداریو لە ستەمدا ڕۆچوونیان کە بووەتە هۆی تووڕەبونی خواو، ئیدی خواش دووعای کوشتنی لێ کردوون.

٣- ﴿ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ﴾، لەم سورەتەدا وشەی (النّار) لەجیاتی (الاخدود) هاتووە، (ٱلۡأُخۡدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ)، ئەمەش ئاماژە دەکات بۆ گەورەییو زەبەلاحی ی ئەو ئاگرەی کە لە چاڵە گەورەکەدا کردوویانەتەوەو، کە بەڵگەیە لەسەر ڕادەی ڕقو کینەیان لە دژی باوەڕداران، ئەویش بەهۆی کردنەوەی ئاگرەکەو زیادکردنیو کڵپە پێسەندنی تاکو ناحەزانی خۆیانی پێ لەنێو بەرنو، بەوەش ئاسوودە بن.

٤- ﴿إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ﴾، بێگومان ئەو ستەمکارانە لەسەر هەر چوار لێواری ئاگری ناو چاڵە گەورەکە دانیشتبوونو تەماشای دیمەنی ئەو مرۆڤە باوەڕدارانەیان دەکرد کە بە ئاگرەکە دەسووتانو، دانیشتبوون بۆ خۆشیو ئیسراحەتی خۆیانو چێژ وەرگرتن لەو دیمەنە. جا ئایا دیمەنی سووتاندنی باوەڕداران بە ئاگر

هۆکارێکه بۆ دیتنو تەسەلای دڵ؟ ئایا ئەوه جێی خۆشیو ڕابواردنه؟ ئەی چی دەڵێیت لەبارەی ئەم جۆره کەسانەوه؟ ئایا ئەوانه مرۆڤن؟ ئایا هیچ شتێکیان له هەستو سۆزو بەزەیی تیادا ماوه؟ بەڕاستی ئەوان هەموو شتێکیان له دەست داوەو بوونەته چەند ئامرازێکی بێ‌گیانو مردووی وا که هەستو شعوریان لەدەست داوه. بەڵام ئایا ئەو ستەمکارانه هەر خۆیان بوون که سەیری دیمەنەکەیان دەکردو خۆشییان له سووتاندنی باوەڕداران دەبینی. بێگومان ئەوانەی ئەو کردەوەیه دەکەنو، ستەمکارو بەدڕەفتارانی تریش شوێن پێیان هەڵدەگرن، لەم دنیایەدا زۆرن. مێژووش —بەتایبەتی مێژووی هاوچەرخ- چەندین نمونەی دڕندایەتیو تۆقێنەری لەو جۆره ستەمکارانه تۆمارکردووه که له مەیدانەکانو ژوورەکانی ئەشکەنجەداندا دانیشتوونو تەسەلای دڵیان بەوه هاتووه که سەیری دیمەنی ئەشکەنجەدانی وەحشییانەو تۆقێنەرانەی مرۆڤە باوەڕدارەکان بکەن.

٥- ﴿ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴾، بێگومان ئەوان بینەری ڕووداوەکەیان بوونو تەماشای ئەشکەنجەدانی باوەڕدارانو سووتاندنیان به ئاگر کردووه. ئەمەش مانای وایه که لایەنگرانیان له شەللاق لێدەره دڕندەکان تەنها بەڕێ‌پێ‌دانو ڕەزامەندیو قایل بوونی ئەو ستەمکارانه ئەو کردەوانەیان کردووه. بێگومان ئەوان تەماشای ئەشکەنجەدانەکەیان به ڕەزامەندییەوه کردووەو، بەوپەڕی بایەخو گرنگییەوه چاودێریی ماوەی سزادانەکەشیان کردووه.

## وشەی (شهود) له سوورەتی (بروج)دا

وشەی (شهود)و وشه لێ‌داتاشراوەکانی تری، چوارجار له سوورەتی (بروج)دا هاتووه، دووجاریان له (شاهد ومشهود) دایه، که بەپێی مانا گشتییەکەیان هەریەکه له پێغەمبەری خوا ﷺ که شاهیدەکه بێتو هەر شاهیدێکی تریش

دەگرێتەوە، هەروەها ڕۆژی ئامادەبوونی قیامەتو هەر کارو کردەوەیەکی بینراوەو پیشان دراوەی تریش، کە (مشهود)ە دەگرێتەوە.

تێبینی دەکەین، کە وشەی (شاهد) (اسم فاعل)ەو، وشەی (مشهود) (اسم مفعول)ە.

جارێکیش دەربارەی خاوەنانی چاڵەکە هاتووە، کە شاهیدی ئەشکەنجەدانەکە بوون، بینیان چۆن باوەڕدارەکان بەئاگر دەسوتێنرێن" ﴿وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ﴾.

لە جاری چوارەمیش دەربارەی دیتنو ئامادەبوونی خوایە لەو جەنگەو هەر جۆرێکی تری هاوشێوەیدا، چونکە هەر خوایە، کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییەو، بینەرو ئاگاداری هەموو شتێکە.

لەو ئایەتەی دواییشدا مانای (شهید) بۆ خوا ئەوەیە، کە بێگومان شاهیدە لەسەر ئەو تاوانە گەورەیەی ستەمکارانو، شاهیدیشە لەسەر خۆڕاگریی باوەڕدارانی لەسەر ئاینەکەیان، شاهیدیشە لەسەر پاداشت دانەوەی باوەڕدارانو، سزادانی کافرانو ستەمکاران.

## گوناهی باوەڕداران دەرهەقی ئەوان

ئاخۆ گوناهی ئەو باوەڕدارانە چی بێت، کە ئاراستەی سزادان بە ئاگر بوون؟ ئاخۆ تاوانیان چی بێت؟ ئەی بەچی تۆمەتبار کراون؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە لە فەرمایشتەکەی خوادایە: ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٨﴾ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ البروج﴾، بێگومان تاکە گوناهی ئەو باوەڕدارانە لەلای گەلەکەیان

ئەوەبووە، کە باوەڕیان بەخوا هێناوە. جا ئایا باوەڕ بەخواهێنان ئەو گوناهەیە، کە خاوەنەکەی لەسەر لۆمە بکرێت؟ ئەی ئایا مرۆڤی خاوەن باوەڕ گوناهبارە؟ ئەی لە بنجو بناواندا پێناسەی گوناه چیە؟

بێگومان گوناهـ: بێباوەڕیو ستەمکاریو سەرپێچی کردنە لە فەرمانی خوا.

ئەی داخوا چۆن هەموو چەمكو پێوەرو تەرازووەکان لەلای گەلە کافرەکەی (هاوەڵانی چاڵەکە) هەڵگەڕانەوە؟ ئەی چۆن بە چاویلکە مەتریالی (ماددی)یە جاهیلیو لادەرانەیەش بۆ هەردوو چەمکی (ئیمان)و (کفر)یان ڕوانیوە؟

تاکە تاوانی پیاوە باوەڕدارەکانو ئافرەتە باوەڕدارەکان لەم چیرۆکەدا، بەندایەتی کردنیانە بۆ خواو، خۆدانانە بە بەندەی خواو ملکەچ بوونیانە بۆ خواو، خۆ سپاردنیشیانە بە خوا.

(بەلای کافرانیشەوە) ئەمە تاوانێکی قێزەونەو تۆمەتبارکراوانیش شایستەی ئەوەن، کە ئەو چاڵو ژێرزەمینە گەورانەی نێو ناخی زەوییان بۆ هەڵکەندرێتو ئاگریان تیادا بکەنەوەو، بە زیندوویی هەڵیاندەنە ناویان، تاکو لاشەکانیان بسوتێتو گیانیان ئاوا تیایدا دەرچێت.

بەڕاستی وادیارە بەپێی دابو نەریتو ڕێساو یاسای ئەو گەلە کافرە، ئەمە سزایەکی عادیلانەیە لە هەمبەر (ئەو تاوانە دزێوەدا)!!

بێگومان بێباوەڕییو کافربوونی ئەو گەلەو لەڕێ لادانیانو ستەمکاریو بەدکاریشیان وایان لێ کردبوون، کە ڕاستییەکان هەڵگێڕنەوەو، مەسەلەکان بشێوێننو ساختەکارییان تێدا بکەنو، حەق بکەن بە ناحەقو، ناحەقیش بکەن بە حەق، بەم پێوەرە چەوتەش سزای خەڵکی باوەڕدار بدەن لەسەر باوەڕداریو بەندایەتی بۆ خواو، جێگیربوون لەسەر ئیمانو خواپەرستی، هەر بەم پێوەرەشیان پاداشتی بێباوەڕیو گومڕاییو ستەمکاریو بەدڕەفتاریی بدەنەوەو شوێنکەوتوانیان خەڵات بکەن. کافران بەردەوام لەسەر ئەم پێوەرەنو، مێژووی کۆنی مرۆڤایەتیو

مێژووی دوێنێی نزیكو، مێژووی تازەش چەندەها نموونەی دزێویان لەم بارەیەوە تۆماركردووە، كە ئەم جۆرە یاسایانەی تیادا پیادەكراوە. بەڕاستی كەسانو گەلانی باوەڕدار گەلێك دەردەسەریو مەینەتیو كوێرەوەریو بەدبەختییان بەدەست ئەو یاسا كوێرانەیەوە چەشتووەو، چەندەها كەسیشیان بە گیانو خوێنو لاشەوماڵو سامانیانەوە بوونەتە قوربانی.

پاشان ئایەتەكە چەند سیفەتێكی وەك (باڵادەستی خوا- العزیز)و (شایستەیی سوپاسگوزاریو ستایش- الحمید)و (خاوەنداریێتیی موڵكی ئاسمانەكانو زەوی)و (شاهێدیو ئاگاداری لە گشت شتێك) بۆ خوا بەیاد دێنێتەوە، ئەو سیفەتانەی كە مرۆڤە باوەڕدارەكانی ئەو گەلە ئیمانیان پێ هێناوەو كە بەو سزا دڕندانەیەش سزادران لەسەریان. ﴿وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ البروج﴾..

## سزای كافران بۆ سەر باوەڕداران

لەكاتێكدا ئایەتەكە ئاماژە دەكات بۆ ئەو گوناهەی باوەڕدارانو تاوانەكەیان — كە لە دابو نەریتی گەلە كافرەكەیاندا گوناهو تاوانە-و، لە كاتێكیشدا تیشكی خستۆتە سەر هۆكاری ناكۆكیی نێوان هەردوولا، یەك وشەی بۆ ئالیەتی سزاو تۆڵەی كوێرانەی كاربەدەستانی ئەو گەلە دیاری كردووە، كە ئێمەش لە ڕێی ئەو وشەیەوە سروشتو شێوازی ناكۆكیو جەنگ لە دژی باوەڕدارانمان زانیوە، كە ئەویش وشەی (نقموا)ە لە ئایەتەكەدا (وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ..)، ئەمەش ڕوون كردنەوەیەكی سروشتی جەنگەكەو كەشو بارودۆخەكەشیەتی، وێنەگرتنێكی ڕادەی دزێویو دڕندەیی شەڕخوازەكانیشیەتی، هەروەك شیكاری وردی باری سایكۆلۆژی (دەروونناسی)ی كافرانو هەستو نەستی توندڕەوانەشیانە لە ئاقار ململانێكەدا..

جا تۆش -ئەی خوێنەری هێژا-، بەوردی سەرنج بدە لە ڕادەی دڕندەییو دزێویی شەڕەکەو، پیاوە سزادەرو تۆڵەکارەکانی، کە تەنها نەریتی تۆڵەسەندنو ڕقو کینەو پیلانگێڕان دەیانجولێنێتو، جمو جوولّو هەڵسو کەوتیان ئاراستە دەکات. بەڕاستی جەنگی کافران لە دژی ئیمانداران لە چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵەکە)دا جەنگێکی تۆڵەستاندنی پڕ لە ڕقو کینەی کوێرانەو داخ لەدڵانەیە، هەر بۆیەش جەنگێکی هێجگار دڕندانەو دزێوو بێڕەحمانە بووە. هەر تەنها ئەم جەنگەشیان وانەبووە، بەڵکو هەموو جەنگەکانی بێباوەڕان لە دژی باوەڕداران لە گشت سەردەمو ناوچەیەکدا ئاوابووە. خواش لەبارەی کافرانی (خاوەن چاڵە گەورەکە)وە فەرموویەتی: (وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ ..)، سیحربازەکانیش -کاتێك فیرعەون لەسەر باوەڕهێنانیان بە خواو شوێنکەوتنی مووسا (سلاوی لێ بێت) هەڕەشەی لێکردن- پێیان گوت: ﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا بِآيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءَتْنَا ...(١٢٦) ﴾، واتە: تۆ تەنها لەبەر ئەوە تۆڵەمان لێ دەستێنیتو سزامان دەدەیت کە باوەڕمان بەو بەڵگەو نیشانانەی خوا هێناوە کە ئێستا بۆمان دەرکەوتن بەهۆی نێرراوی خوا-موسا-وە.

هەروەها خوا لە قورئاندا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ کردووە -کە بێگومان بۆ ئێمەشە- کە سروشتی دوژمنایەتی ی شوێنکەوتوانی کتێبەکانی دی (اهل الکتاب) -واتە جولەکەو دیانەکان- لە بەرامبەر ئێمەدا، بۆیان دەرخات کە بێگومان هەڵسوکەوتی نالەبارانەی ئەوانی بەرامبەر بە ئێمە لەسەر تۆڵەو ڕقو کینەیە: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ (٥٩) المائدة ﴾.. واتە: ئەی پێغەمبەر، پێیان بڵێ: ئەی شوێنکەوتوانی کتێبەکانی دی، ئێوە تەنها لەسەر ئەوە تۆڵەمان لێ دەستێننو لەکەدارمان دەکەن کە ئێمە باوەڕی ڕاستو دروستمان بە خواو بەو کتێبە تازەیەی دوایی -کە قورئانە- هێناوەو بەوەش کە پێشتر هاتۆتە خوارەوە. بەڕاستی ئێوە

زۆربەتان بەدكارو لەفەرمان دەرچوون.

قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکی تریدا، کە چوارەم جێگەی باسی وشەی (نقمة)یە ڕوونی کردۆتەوە کە هەر ئەو ڕەوشتە نالەبارانەی حیقدو (نیقمەتە)یە کە هاندەرو ڕێنمایکاری پیلانو تاوانو شەڕەنگێزییەکانی دووڕووەکان (منافق)ە لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵی دابوون. وەك خوا لەمبارەیەشەوە فەرموویەتی: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا ۚ وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ ۚ ...(٧٤) التوبة ﴾، واتە: دووڕووەکان سوێند بەخوا دەخۆن کە گوایە وتەیەکی نالەباریان نەدرکاندووە، بەڵام بێگومان ئەوانە درۆ دەکەنو وتەی نالەباری -خۆبێباوەڕکردن-و -کەلیمەی کوفر-یان بەدەم داهاتووە، ئەوان دوای موسڵمان بوونیان کافرو پاشگەز بوونەوەو سەرقاڵی پیلانێك بوون کە بۆیان بەدی نەهات، تەنها یەك شتیش ئەوانی پەستو تووڕەکردووە، ئەوەیە خوا بە فەزڵو بەخششی خۆی، پێغەمبەرەکەیو باوەڕدارانی بەهرەمەند کردووە.

بێگوماند فەرمان (فعل)ی (نَقَمَ) تەنها ئەو چوارجارە لە قورئاندا هاتووە کە دیاریمان کرد، لە هەموو ئەم جێگایانەشدا دەربارەی واتایەك هاتووە، ئەویش دژایەتیی نێوان باوەڕدارانو بێباوەڕانو، ئەو جەنگە دزێوەیە کە بێباوەڕان لەدژی باوەڕداران هەڵی دەگیرسێنن. قورئانی پیرۆز بەم ڕەنگە سروشتو شێوازی (جەنگەکە لە دژی موسڵمانان)مان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە جەنگێکی تۆڵەستاندنی پڕ لە ڕقو کینەیە.

## واتــا و ئەنجـامەکانی ئەو توورەیی و دژایەتییە

کافران ڕقیان لە ئیماندارانەو، تۆڵەیان لــێ دەستێنن، لەبــەر ئەمەشــە شــەڕیان لەگەڵ دەکەن. جا ئاخۆ مانای ئەم ڕق و کینەو تۆڵەستانانە چی بێت؟!

بێگومان قورئـانی پـیرۆز دوژمنــی کـافرو سـتەمکاری بـە مرۆڤـی ئیمانـدار ناساندووەو، لایەنە دەروونییەکەی بۆ شیتەڵ کردووەو، حەقیقەت و بنج و بناوانیشی لە ناواخنی دەروونییەوە بۆ وێنا کردووە. چونکە بەڕاستی دوژمنــی (ئیماندارەکــە) کەسێکی توورەو قین لەدڵ و حەسوود و زۆردارو لــە ستەمدا ڕۆچــووە. هــەر لەبــەر ئەمەشــە بــە هــەموو توانــاو دەروونــە پــڕ لــە قــین و حەســوودی و ســتەمکاری و بەدکارییەکەیەوە دژایەتیی دەکات و، بە فــڕوفێڵ و دڕنــدەیی و ئاکــاری دزێویــشەوە تۆڵەی لــێ‌دەستێنێت.

پاشان ئەو کافرەی کە بەم ڕەوشتە نابــەجێ و کــەم و کورتییانەیــەوە بــەرەوڕووی مرۆڤی ئیماندار دەبێتەوە، هیچ ئەگەرێکی ئەوتۆ نیە کە ئاشتەوایی لەگەڵدا بکات یان لێی بێ‌دەنگ بێت، یان فەرامۆشی بکات یاخود دەست لــە دوژمنایەتییەکــەی هەڵگرێت.

(متنبی)ی شاعیریش ڕاستی پێکاوە کە لەو دێڕە شیعرەیدا گوتوویەتی:

سـوى حسـد الحسّـاد داوٍ فإنـه
إذا دخـل في قلـب فليس يحـول

ئەنجامەکانی ئەو پەستی و تورەییەی کافران لەسەر موسڵمانان لە جەنگەکانیاندا —کە دژی موسڵمانان و ئیمانداران بەرپای دەکەن- و ئاسەواری ئەو ڕق و تورەییــەیان لەسەر ئەو جەنگانەش، دیارو ڕوون و ئاشکران.

ئاخر چ ئاکامێك لە جەنگێك ڕەچاو دەکەیت کە کـافران دنیایـەك ڕق و کینــەو پەستی و ناحەزی و ستەم و فێڵ و دڕندەیی و دزێــویی بــە هــەموو توانایانــەوە تیــادا

بەکاردێنن؟! ئەی ئاخۆ چەندە لەو ڕقو کینەو حەسوودییەیان کار لە موسڵمانان دەکات؟!

خوای پەروەردگار دەربارەی ئەو جەنگەیانو، ڕقو کینەی کافران لەسەر ئیمانداران فەرموویەتی: ﴿ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨﴾ اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا عَن سَبِيلِهِ ۚ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ التوبة ﴾، واتە: ئاخر ئەو کافرانە چۆن وابەستەی وەفاو پەیمان پەروەری دەبن لەبەرامبەر ئێوەدا؟ ئەوان ئەگەر بەسەرتاندا زاڵ بن، ئەوا هیچ پەرژینێکی خزمایەتیو پەیمانداریی ناپارێزن، بەڵکو لەکاتی هێمنیدا- تەنها بە قسەو وتەی سەرزارەکی دەیانەوێت ڕازییتان بکەنو، لە ناخیشیانەوە دڵەکانیان پێچەوانەی وتەکانیانەو لە دڵەوە ڕقیان لێتانە. زۆربەشیان لەڕێلادەر بێپەیمانن. ئەو کافرو هاوەڵ بۆ خوادانەرانە نرخێکی کەمیان-لەخێرو خۆشی دنیا- بەهۆی گۆڕینی ئایەتو بەڵگەو نیشانەکانی خوا دەست کەوتووەو، ڕێی ڕاستی خواشیان لە خەڵکی گرتووە. بەڕاستی ئەوان کارو کرداری خراپ ئەنجام دەدەن. هەروەها ئەوان هیچ سنوورێکی نزیکیو خزمایەتیو پەیمانداریی بۆ ئیماندارێك ناپارێزنو، هەر ئەوانیش دەستدرێژکارو سنوربەزێنن.

بەڕاستی ئەو کافرە دڵ پڕ لە قینانە ڕەچاوی هیچ پەیمانێکی نێوان خۆیانو باوەڕداران ناکەنو، سنووری هیچ خزمایەتیو کەسایەتییەکیش ناپارێزن، ئەمەش لەوەتەی ئەو جەنگە بەردەوامەیاندا لە دژی باوەڕداران.

بۆچی ئاوا ڕەفتار دەکەن؟ چونکە قین لە دڵن، بە دەمو زاری خۆیان قایلتان دەکەنو، دڵیشیان پێچەوانەی وتەکانیانی تێدایەو لە دڵەوە بێزارو ناحەزن. ئەوان بەو هەموو ڕقو کینەو تووڕەیی‌یەی ناخی دڵیانەوە دەجەنگن، هەروەها لە پێناوی زاڵ بوون بەسەر بڕواداراندا، هیچ پەیمانو خزمایەتییەك ناپارێزنو، لە قامووسو

فەرهەنگەکانیشیاندا وشەکانی -دادگەریو، بەزەیییو، سەربەستیو، دیموکراتیو، مافەکانی مرۆڤو، ڕێزی مرۆڤ-یان سڕیوەتەوە، جگە لە سڕینەوەی چەندین وشەی تری هاوشێوەیان..

ئەوان لە جەنگیاندا لە دژی ئیمانداران، ڕێگە لە پیادەکردنی یاساو ڕێساو بنەما شەرعییەکان دەگرنو، دادوەرو پارێزەرو دادگا مەدەنییەکان لە باوەڕداران دوور دەخەنەوەو، حاڵەتی نائاسایی (الطوارئ) ڕادەگەیەننو، هەموو مافە مەدەنیو دادوەرییەکان لەباوەڕداران زەوت دەکەنو، فەرمانەکانی دادگا نائاساییە سەربازییەکانیان بەسەردا پەیڕەو دەکەنو فەرمانە توندە ستەمکارییەکانی ئەو حاکمە عەسکەرییەشیان بەسەردا دەسەپێنن، کە دەست بەسەر هەموو مافو تایبەتمەندییەکی مرۆڤی باوەڕداردا دەگرێت.. جا لەم بارودۆخە نائاسایییە پڕ لە ڕقو کینەدا لە حاڵی بڕواداری مەینەتبار بکۆڵەرەوە، لە مافەکانیو لە سەربەستی یەکەی بکۆڵەرەوەو بەدوایدا بگەڕێ.. بگەڕێ بەدوای فەرمانی ئیدارىو کاروبارو پرۆژەکانیداو، لە ماڵو سامانو دەسکەوتی ڕۆژانەی بکۆڵەرەوە، لە خێزانو خانەوادەی بکۆڵەرەوە، لە حاڵی هاوسەریو منداڵەکانی بکۆڵەرەوە. لە دەروونیو جەستەی بکۆڵەرەوە. لە سەربەستیو ڕێزو کەرامەتی بکۆڵەرەوە، لە دۆخی ئاینەکەیو باوەڕەکەیو، لە ئابڕوو بارودۆخی نێودڵی بکۆڵەرەوە، لە هەستەکانیو ئەنجامەکانی جەستەیو، لە باری سووڕی خوێنو دەمارە خوێنبەرو خوێن هێنەرەکانی بکۆڵەرەوە، لەگیانی -ئەگەر گیانی تێدا مابێت- یان -هێشتا تۆزقاڵێك ژیانی تێدا مابێت- بکۆڵەرەوە..

بێگومان خوا ڕاستی فەرمووە: ﴿لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً﴾.

ئاسەواری جەنگی تۆڵەستاندنی کافرانە لە دژی ئیمانداران، لەو وتەیەی فیرعەونیشدا ڕەنگ دەداتەوە، کە تێیدا هەڕەشەی لەو سیحربازانەی خۆی کردووە کاتێك باوەڕیان بە موسا -سڵاوی لێ بێت- هێنابوو، ئەوەبوو فیرعەون پێی گوتن:

﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ الأعـراف ﴾،
واته: شەرت بێ دەستو قاچی هەریەکەتان ڕاستو چەپ ببڕمو پاشان هەمووتان بەشێوەی لەخاچ دان هەڵواسم..

هەروەها لە سوورەتێکی تردا، کە قورئان بەشێکی ئەو بەسەرهاتەی هێناوە، فیرعەون پێیان دەڵێت: ﴿...فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ طه ﴾، واته: شەرت بێ دەبی ڕاستو چەپ دەستو قاچتان ببڕمەوەو، بە قەدەکانی دارخورمادا هەڵتان واسم، ئەوساش بەچاکی بۆتان دەردەکەوێت، کە کاممان سزای توندو تیژو بەردەواممان هەیە.

شوێنەواری ئەم جەنگەو ئەنجامەکانیشی لەو کردارە دڕندانەیەی کافران لەدژی باوەڕداران لە چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە)دا: ﴿ النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ البروج ﴾.

شوێنەواری ئەم جەنگەو ئەنجامەکانی، کە مێژوو تۆماری کردووە، لەو سزاو ئەشکەنجەدانە ترسناکەش دایە کە ئەو ڕۆمانی یانەی (عیسا-سڵاوی لێ بێت-)یان بە خوا دەزانی، دژی ئەو زاناو ڕاهیبە پیاوچاکانە پیادەیان دەکرد، کە (عیسا)یان بە عەبدو پێغەمبەری خوا دەزانی، بەتایبەتی شوێنکەوتوانی باوەڕداری شەهید (عبدالله ئاریۆس) کە لە (ئەریسی)یە شەهیدەکان بوو.

ئاسەوارێکی تری ئەم جەنگە دڕندانەیە، کە لە مێژوودا تۆمارکراوە، ئەو کارەساتو مەینەتییانەیە، کە لەسەر دەستی خاچپەرستانی سەر بە (دادگاکانی پشکنین) بەسەر موسڵمانانی ئەندەلوسدا هێنراوە.

ئاسەوارێکی دیکەی ئەم جەنگە لەوەش دایە، کە لە سەردەمی نوێو لە ماوەی سەرۆکایەتیی هەردوو سەرۆکی میسر (جمال عبدالناصرو انور سادات)و، ماوەی حوکمی کاربەدەستانی دواتریاندا و (ماوەی دەسەڵاتدارێتیی حاکمە عەلمانییەکانی

تری سەر جیهانی ئیسلامیدا) لە جۆرەکانی ئەشکەنجەدان لە زیندانە بەناو شۆڕشگێڕی (ثوري)یەکانی میصرو وڵاتانی تردا لەدژی موسڵمانانو بانگەوازی ئیسلام بەکارهێنراون[1].

١) لەمبارەیەوە ئەم کتێبانە بخوێنەوە: (البوابة السوداء/ أحمد رائف)، (أيام من حياتي/ زينب الغزالي)، (يوميات سجين في السجن الحربي/ كمال فرماوي)، (رسائل من السجن الحربي- سمير الهضيبي) و ... چەند کتێبێکی دیکەی هاوشێوەیان.

## " ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا "

لە لێدوانو بەدواداچوونی قورئاندا لەسەر چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە)، گوزارشتێکی خاوەن ڕەهەندی کاریگەری دەربڕیوە، ئەوەش لەو فەرمایشتەی دواتری خوای پەروەردگارو باڵادەستدا، کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ (١٠) البروج﴾، واتە: جا بێگومان ئەو کافرە ستەمکارانەی ئەو کارەساتە گەورەیەیان بەسەر پیاوە ئیماندارەکانو ئافرەتە ئیماندارەکاندا هێناو، پاشان لەو ستەمکارییانەدا بەردەوام دەبنو، دەست هەڵناگرنو پەشیمان نابنەوەو تەوبە لەلای خوا ناکەن، ئەوا سزای دۆزەخو ئەشکەنجەی ئاگرە سوتێنەرەکەی، شایستەیانە.

لەم فەرمایشتەدا گوزارشتە خاوەن ڕەهەندە کاریگەرەکە، ڕستەی (ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا)ە، بە مانای: پاشان، دوای ئەو کارە دڕندانەیە، ئەگەر بێباوەڕە ستەمکارەکان پاشگەز نەبنەوەو تەوبە نەکەن..

لەم گوزارشتەدا دەروازەیەك لە بەردەم ستەمکارە دڵ پڕ لە ڕقو کینەکان دەکاتەوە، ئەوانەی باوەڕدارەکانیان سوتاندو کوشتیانو گیانیان لە لاشەیان جیا کردنەوە. لە بەردەمیاندا دەرگای پەشیمانیو تەوبەکردن دەکاتەوەو، داواشیان لێ دەکات لەو دەرگایەوە بێنە ژوورەوەو، سوودی لێ وەرگرنو، دوایین دەرفەت بقۆزنەوە پێش ئەوەی دەرگاکە دابخرێتەوە.

ئەو ستەمکارانەی، -ئەوەی بە ئیمانداران کردیان، کردیان- خوا چی یان لێ دەکات ئەگەر باوەڕ بە خوا بێننو، خۆیان تەسلیم بە ڕێبازی خوا بکەنو، داوای لێخۆشبوونی لەسەر گوناهەکانیان لێ بکەنو، تەوبە لەلای خوا بکەنو، بۆ ڕێگای

خوا بگەڕێنەوەو، له تاوانەکانیان پاشگەز بنەوەو، بۆ ئایینی خوا، پوختو یەکلا ببنەوەو، وابەستەی خواپەرستی بن، ئەگەر وا بکەن خوا چییان لێدەکات؟!! بێگومان خوا تەوبەیان لێ وەردەگرێتو، چاو له هەموو تاوانو بەدکارییەکانیان دەپۆشێتو، دەیانخاته پاڵ سەربازانو شوێنکەوتوانی خۆی.

له هەمان کاتدا، باوەڕدارانیش هەڵوێستی خۆیانو تێڕوانینو مامەڵەو پەیوەندیشیان لەگەڵ ئەوانەدا به ئاقارێکی باشتردا دەگۆڕنو، چییان دەرهەق کردوون، لەبیری خۆیان دەبەنەوەو، چاو له تاوانەکانیشیان دەپۆشن، هەرچییەکیش، که بەدەست ئەو ستەمکارە پەشیمان بوانەوە تووشیان بووە، به پاداشت لای خوا دادەنێنو، ئیدی لاپەڕەیەکی تازەی ژیانیان لەگەڵدا هەڵدەدەنەوە که لەسەر بنەمای خۆشەویستیو برایەتیو سۆزو پەرۆشی بنیات بنرێت.

ئای ڕەحمەتی خوا چەند گەورەو فراوانە ، ئەو خوایەی، که هەرکەسێك به پەشیمانیو تەوبەکاریو موسڵمانێتیو گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانیەوە، بۆلای بگەڕێتەوە، ئەوا تەوبەی لێ وەردەگرێتو، له هەموو ئەو گوناهو تاوانانەشی دەبوورێت، که دژی دینەکەیو هەڵسوڕاوانیو شوێنکەوتوانی ئەنجامی دابێت.

ئای ئەو ئایینەش چەند گەورەیە، که ئەم ڕێساو بیروباوەڕە پاکانەو، ئەو ڕاستییە ڕەسەنانەو، ئەو بەها بەرزانەی تێدایە، که له سەروو هەموو ڕێساو ڕژێمو بنەمامادیی یەکانی گرۆی بەشەری یەوەیە.

چەند به ئارامیشه مرۆڤی ئیماندار، که چاو له هەر کەسێك دەپۆشێت، که خراپەیان دەرهەقی کردووەو، لێ یان دەبوورێتو گەردنیان ئازاد دەکاتو، دەشیانکاته برایانی خۆشەویستی خۆی، مادام ئەوان بەشداریی چێژی خواپەرستیو کار بۆ خوا کردنی لەگەڵدا بکەنو، لەگەڵیدا ببنه سەربازانی دڵسۆزی خوا.

## ئەم ئاگـره له کـوێ‌و ئەو ئـاگره له کـوێ؟

ئەگەر ستەمکاران تەوبە بکەن‌و بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، ئـەوان دەبنـە برایـانی کەسانی باوەڕدارو، لەلای خواش پەسند دەکرێن، بـەڵام ئەگـەر سـوود لـەو هەلـە وەرنەگرن‌و نەچنە نێـو دەرگـای تەوبـەوەو، لەسـەر کفـرو ڕق‌و کینـەیان لـە دژی باوەڕداران بەردەوام بن، ئەوا سزایەکی ترسناك‌و گەورەو پڕ ئازاریان لە پێشەوەیە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ البروج ﴾.

بێگومان ئەو کافرە ستەمکارانە، مرۆڤـە باوەڕدارەکانیـان بـەو ئـاگرە پـڕ لـە سووتەمەنی‌و بڵێسەدارەی نێو چاڵە گەورەکە سووتاندووە، بۆیـە لـە سـوورەتەکەدا دەربارەی ستەمکارەکانیش وا گونجێنراوەو ڕێکەوتووە کە خواش بـە ئـاگر سـزایان بداتو، بە ئاگر بیانسوتێنێت، ئەمەش بەپێی ئەو بنەما ڕاستەوانە دەرهاوێژراوەی کە ڕوونی کردۆتەوە (سزا لە ڕەگەزی کارەکەیە). بۆیە ئەگەر ئەوان باوەڕدارانیان بە ئاگری دنیا سووتاندبێت، جێی خۆیـەتی‌و گونجـاوە کـە خـواش ئـەوان بـە ئـاگرە هەمیشەییی یەکەی دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەتدا بـسوتێنێت، کـە ئەمـەش سـزایەکی پڕاوپڕو پڕ بە پێـستی کـردەوە سـتەمکارییەکانیانە، پەروەردگاریـشت سـتەم لـە بەندەکانی ناکات.

ئەم ئاگرە لەکوێی ئەو ئاگرەدایە؟ ئاگری دنیا لەکوێی ئاگری دۆزەخ دایە؟

(سید قطب) دەڵێت: "بۆ چـەمك‌و واتـای سـزای دۆزەخ وشـەی ئـاگری کـراوە (حریق) بەکاردێنرێت، بەڵام بۆ ئەم کارەسـاتەش درکێنـراوەو بۆتـە دەق لەسـەری، تاکو لە بەرامبەر (حریق)ی نێو چاڵە گەورەکەدا بێتو، بە هـەمان بێـژەو زاراوەش بێت کە دەلالەت لەسەر ڕووداوەکە دەکات.

بـەڵام ئـاخر ئـەو ئـاگرە لـەکوێی ئـەم ئاگرەدایـە، لـە توندوتیـژی یەکـەی‌و،

ماوەکەیدا، (حریق)ی دنیا بە ئاگرێك دەکرێتەوە کە خەڵکی خۆیان هەڵی دەگیرسێنن؟ (حریق)ی ڕۆژی دواییش بە ئاگرێك دەکرێتەوە کە خوای خالقی خەڵکی هەڵیدەگیرسێنێت.

(حریق)ی دنیا چەند ساتێکەو، کۆتایی پێ دێت، بەڵام (حریق)ی ئاخیرەت چەندین زەمانی دوورو درێژ دەخایەنێتو کەس نازانێت ماوەکەی چەندە، تەنها خوا نەبێت.

لەگەڵ ئاگرەکەی دنیادا، خوا لە باوەڕداران ڕازی بووەو، ئەمەش پشتگیری کردنێکی ئەو واتا پیرۆزە مرۆڤییەیە، بەڵام لەگەڵ ئاگری ڕۆژی دواییدا خوا تووڕەو پەست بووە لە بێباوەڕانو، ئەوەش نسکۆیەکی پڕ لە هەرەسو داڕوخانی سەرشۆڕکراوانەشە بۆیان"(١).

چەند نەگبەتو بەدبەختو بێبەشە، ئەوکەسەی لەماوەی ژیانی دنیایدا ئەو تاوانە ئەنجام دەدات کە دەیخاتە بەر سزای دۆزەخو سزای ئاگرەکەیو ئەو کەسەش کە بە تەمای ڕزگاربوون لەو ئاگرە هەمیشەییە ترسناکە نیە.!

## سەرکەوتنی گەورە بۆ باوەڕداران

ئەو باوەڕدارانەی لەسەر باوەڕەکەیان جێگیرو خۆڕاگر بوونو، بە تەمای پاداشتی خوا بوونو، بەرگەی ئاگر سووتاندنیان لەپێناوی خوادا گرت، چییان لێ چنییەوە؟ ئایا قازانجیان دەسگیر بوو، یان زیانیان لێکەوت؟ ئایا سەرکەوتن، یان شکستیان تووش بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لەم فەرمایشتەی خوادایە:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿١١﴾ البروج﴾.

١) في ظلال القرآن/ ٦: ٣٨٧٤ .

به‌ڕاستی ئه‌وان سه‌ركه‌وتوو بوون، سه‌رفرازو سه‌ربه‌رز بوون، ئه‌و به‌هه‌شتو باخو بێستانه‌ جوانانه‌ی به‌هه‌شتیان ده‌ستكه‌وت كه‌ چه‌ندین ڕووبارو جۆگه‌و كانی به‌ژێریاندا ده‌ڕوات. به‌ فه‌زڵو ڕه‌حمه‌تی خواش، شایسته‌ی بوون، به‌هۆی ئه‌وه‌شه‌وه‌ شایسته‌ی بوون كه‌ ژیانیانو لاشه‌یانو ته‌مه‌نیانو گیانیشیان له‌پێناویدا به‌خت كرد.

به‌ڕاستی ئه‌وان ئه‌و سه‌ركه‌وتنه‌ گه‌وره‌یه‌یان ده‌سگیر بوو كه‌ هیچ سه‌ركه‌وتنێكی هاوتاو هاوێنه‌ی نیه‌، هه‌ركه‌سێكیش به‌ به‌هه‌شت به‌خته‌وه‌رو سه‌ركه‌وتوو بێت، ئه‌وه‌ بێگومان سه‌ركه‌وتووه‌، وه‌ك خوا له‌مباره‌یه‌وه‌ فه‌رموویه‌تی:

﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ آل عمران ﴾،

واته‌: هه‌موو كه‌سێك مردن ده‌چێژێتو، ده‌مرێت، ته‌نها له‌ ڕۆژی قیامه‌تیشدا پاداشته‌كانتان پێ ده‌گه‌یه‌نرێته‌وه‌، جا هه‌ركه‌سێك له‌ ئاگری دۆزه‌خ دوور بخرێته‌وه‌و، بخرێته‌ به‌هه‌شته‌وه‌، ئه‌وه‌ به‌ڕاستی سه‌ركه‌وتووو سه‌رفراز بووه‌، ژیانی دنیاش جگه‌ له‌وه‌ی خۆشییه‌كی فریوده‌رانه‌یه‌، هیچی دی نیه‌.

بێگومان دنیا كۆتایی نیه‌، به‌ڵكو كۆتایی یه‌كه‌ له‌وێیه‌و، گرنگ چاره‌نووسو سه‌ره‌نجامی ڕۆژی قیامه‌ته‌، ڕاسته‌ كه‌ باوه‌ڕداره‌كان له‌م چیرۆكه‌دا ژیانیان لێسه‌نراوه‌و ئه‌م دنیایه‌یان جێ هێشتو، خه‌ڵكانیش به‌ خه‌ساره‌تمه‌ندو له‌نێوچووو مردوویان داناون. به‌ڵام ده‌بێت په‌ند له‌ چاره‌نووسی ڕۆژی قیامه‌تیان وه‌ربگیرێت، كه‌ ئه‌وان له‌ به‌هه‌شتداو له‌نێو باخو بێستانێكدان كه‌ ڕووباره‌كان به‌ ژێریاندا ده‌ڕۆن.

ئایا ئه‌و باوه‌ڕدارانه‌ سه‌ركه‌وتوو بوون، یان خه‌ساره‌تمه‌ند؟ بێگومان ئه‌وان به‌ هه‌موو دیارده‌كانی سه‌ركه‌وتنو، به‌ هه‌موو ماناو وێنه‌و بواره‌كانی سه‌ركه‌وتنه‌وه‌، سه‌ركه‌وتوو بوون.

ده‌ تۆش وه‌ره‌ له‌گه‌ڵماندا با پێكه‌وه‌ له‌گه‌ڵ پێشه‌وای شه‌هید (سید قطب)دا ئه‌م وته‌یه‌ی خۆی ده‌رباره‌ی سه‌ركه‌وتنی ئه‌و باوه‌ڕدارانه‌، بلێینه‌وه‌، كه‌ له‌باره‌یانه‌وه‌ له‌

تەفسیرەکەیدا (في ظلال القرآن) گوتوویە:

"بێگومان باوەڕداران لە توانایاندا هەبوو، کە ژیانی خۆیان بپارێزن و لەدنیادا خۆیان بهێڵنەوە، بەو مەرجەی لە بەرامبەر ئەوەدا شکستیان بە بیروباوەڕەکەیان بهێنایە. بەڵام ئایا هەر لە دنیاشداو، لەپێش ڕۆژی دواییدا چەندە خۆیان دەدۆڕاند؟ ئەی داخۆ گرۆی مرۆڤایەتیش (هەر هەمووی) چەندە زیانیان لێدەکەوت؟ بە لەناوبردنی ئەم مانا گەورەیە چەندە زیانیان لێدەکەوت: (مانای کەمی و پووچی ژیانی بەبێ عەقیدە)، (دزێوی و قێزەونیی ژیانی بێ سەربەستی)، (داڕووخانی ژیان لەکاتێکدا زۆردارانی لە ستەمدا ڕۆچوو دەست بەسەر ڕۆحەکاندا دەگرن دوای ئەوەی دەستیان بەسەر لاشەکان داگرت).. بەڕاستی ئەم مانایە زۆر پیرۆزەو، مانایەکی زۆر گەورەشە. جا ئەو باوەڕدارانە ئەم مانا بەرزو پیرۆزو گەورەیەیان قازانج کردبوو، لەکاتێکدا هێشتا لەسەر زەویدا مابوون.

هەروەها لەکاتێکدا ئەم قازانجەیان دەسگیر ببو، کە بەر ئاگرەکەی ستەمکاران کەوتبوون و، لاشەکانیان گڕیان دەگرت. ئیدی ئەم مانا پیرۆزەی، کە ئاگرەکە پاکژو خاوێنی کردۆتەوە، سەرکەوتوو بووە. دوای ئەوەش لەلای پەروەردگاری خۆیان حسابێکیان بۆ کراوە، بەو بەهەشتە پاداشت دەدرێنەوە، کە جۆگەو ڕووبارەکان بەژێریدا دەڕۆن، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیانە.

## چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك شیکارو زانیاریی لەسەر چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) خستۆتە ڕوو تێیاندا چەند لایەنێکی بەسوودو بەهاداری خستۆتە سەر ئەو بەشەی کە لە قورئاندا هاتووە. جا مادام فەرموودەکەش بە پلەی (صحیح) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕراوەتەوە، ئەوا پێویستە ئێمەش وەری گرین و بیلێینەوەو، ئەو مەسەلانەی، کە ئاماژەی بۆ کراوە بخەینە پاڵ ئەوانەی، کە قورئان ئاماژەی بۆ کردوون. پاشان سەیری هەردوو سەرچاوە ڕاستەکە (قورئان و فەرمودە)

بکەین و، له هەردووکیانەوە ئاماژەو ڕێنمایی یەکان بە کۆکراوەیی دەربێنین:

ئیمام (مسلم) له (صحیح)ی خۆیداو له (صهیب ی کوری سنان ی ڕۆمی)یەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گێڕاوێتییەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((لەنێو گەلێك لە گەلانی پێش ئێوەدا، پادشایەك هەبووە کە سیحربازێکی لەبەردەست دابووەو کاتێك سیحربازەکە لە تەمەندا گەورە بووە، بە پادشاکەی گوتووە: ئەوا من گەورەم بەساڵاچووم، کوڕێکی نەوجەوانم بۆ بنێرە تا فێری سیحربازیی بکەم. پادشاش کوڕێکی نەوجەوانی بۆ دەنێرێت تاکو فێری بکات.

لەسەر ڕێی کوڕە نەوجەوانەکە ڕاهیب -زانایەکی ئایینی ئەو سەردەمە- هەبوو، هەرکاتێك کوڕەکە بەوێدا بڕۆیشتایە، قسەی بۆ دەکردو، کوڕەکەش گوێی لێ دەگرت و لەلای دادەنیشت و پێی خۆشحاڵ دەبوو.

هەر کە دەچوو بۆ لای سیحربازەکە، بەلای ڕاهیبەکەدا تێدەپەڕی و لای دادەنیشت، کە دەچووە لای سیحربازەکە، سیحربازەکە لێی دەدا.. کوڕەکە سکاڵای لەلای ڕاهیبەکە کرد، ئەویش پێی گوت: ئەگەر لە لێپرسینەوەی سیحربازەکە دەترسایت بڵێ کەس وکارم لەماڵەوە دوایان خستم، ئەگەر لە لێپرسینەوەی کەس و کاریشت دەترسایت بڵێ سیحربازەکە دوای خستم.

نەوجەوانەکە بەم حاڵەتەوە مایەوە، تا ڕۆژێکیان تووشی گیاندارێکی دڕندەی گەورە بوو، کە خەڵکی دەترساندو خەڵکی لە ماڵەکانیان بەند کردبوو، بۆیە لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەمڕۆ بۆم دەردەکەوێت کە ئاخۆ سیحربازەکە باشترە، یان ڕاهیبەکە؟ بۆ ئەم مەبەستەش بەردێکی هەڵگرت و ڕووی کردە خواو گوتی: خوایە ئەگەر کاروباری ڕاهبەکە لە کاروباری سیحربازەکە لەلای تۆ خۆشەویست ترە، ئەوا ئەم گیاندارە گەورەیە بکوژە، تاکو خەڵکی بچنە سەر کارو گوزەرانیان.. دوای ئەم نزایە، کوڕەکە بەردەکەی گرتە گیاندارەکەو کوشتی، خەڵکیش چوونە سەر کارو گوزەرانیان.

ئنجا کوڕەکە هاتەوە بۆ لای ڕاهیبەکەو ئەم هەواڵەی پێگەیاند. ڕاهیبەکەش پێی گوت: کوڕم: ئەمڕۆ تۆ لەمن باشتریت، وەك دەشبینم تۆ لە مەسەلەی کاروباری ئیمانداریتیتدا زۆر پێشکەوتوویتو، لەمەولاش تووشی تاقیکردنەوە دەبیتو بە بەڵاو ناڕەحەتی تاقی دەکرێیتەوە. جا ئەگەر تووشی ئەو تاقیکردنەوەیە بوویت، ئەوا هەواڵو ناونیشانی من بە کەس نەڵێیت..

جێی باسە ئەم منداڵە، خوا موعجیزەی چاککردنەوەی کەسی کوێر- کە بە کوێری لەدایك بووبێت -و کەسی بەڵەك- پەڵەی سپی سەر پێست-ی پێدابوو خەڵکیشی لە هەموو دەردێك چارەسەر دەکرد..

ڕۆژێکیان یەکێك لە ئەنجومەنی پادشا کە کوێر بوو، هەواڵی ئەم کوڕەی بیست، بۆیە چەندین دیاریی زۆری بۆ هێناو، پێی گوت: هەموو ئەمانە بۆ تۆ، ئەگەر چاکم بکەیتەوە.. کوڕە نەوجەوانەکەش پێی گوت: من هیچ کەسێکم بۆ چاك ناکرێتەوە، بەڵکو خوا چاکی دەکاتەوە، جا ئەگەر تۆش باوەڕ بە خوا بێنیت، ئەوا دوعات لەلای خوا بۆ دەکەمو، خواش چاکت دەکاتەوە.. پیاوەکەش باوەڕی بەخوا هێناو، خواش چاکی کردەوە.

پیاوەکە چوو بۆ لای پادشاو وەك جاران لەلای دانیشت، پادشاش لێی پرسی: ئەوە کێ چاوی بۆ گێڕایتەوە؟ پیاوەکە گوتی: خوای پەروەردگارم.. پادشا لێی پرسی: ئایا جگە لە من پەروەردگاری ترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، پەروەردگاری منو پەروەردگاری تۆش هەر (اللّٰه)یە..

پادشا ئەم پیاوەی بەند کردو بەردەوام سزاشی دەدا، هەتا ناچاری کرد، کە ناونیشانی کوڕە نەوجەوانەکەی پێدا، ئنجا کوڕەکەیان بۆ لای پادشا هێناو، پادشاش پێی گوت: ئەی کوڕی خۆم، سیحربازیی تۆ گەیشتۆتە ڕادەیەك، کە کوێرو گەڕو بەڵەك چاك دەکەیتەوەو، ئەوە دەکەیتو ئەوە دەکەیت.. کوڕەکەش بە پادشای گوت: من هیچ کەسێکم پێ چاك ناکرێتەوە، بەڵکو هەر خوا چاکی دەکاتەوە.

پادشا ئەم کوڕەشی گرت‌و بەندی کردو بەردەوام سزاو ئازاری دەدا، هەتا ئەم کوڕەش ناچار بوو ناونیشانی ڕاهیبەکەی بە پاشا گوت.

ڕاهیبەکەشیان هێناو پێیان گوت: واز لە دینەکەت بێنە.. ئەویش سەرپێچیی لەو فەرمانەیان کرد، ئنجا مشارێکیان هێناو، لەسەر تەوقی سەریان داناو سەریان پێ لەت کرد، تا هەردوو کەرتەکەی کەوتە سەر زەوی.

دوای ئەوە کوڕە نەوجەوانەکەیان هێناو پێی گوترا: لە دینەکەت پاشگەز ببەوە.. ئەویش سەرپێچیی لێ‌کردن.

پادشا ئەم کوڕەی دایە دەست چەند کەسێك لە یاوەرانی‌و پێی گوتن: بیبەنە سەر فلاّن چیاو، سەری خەن بۆ سەر لوتکەکە، کاتێك گەیشتنە دوا ترۆپکی چیاکان، هەڕەشەی خستنە خوارەوەی لێ‌بکەن، جا ئەگەر لە ئاینەکەی پاشگەز بۆوە، وازی لێ‌بێنن، دەنا هەڵی دێرن بۆ خوارەوە.

ئەوانیش کوڕەکەیان بردو گەیاندیانە سەر چیاکە، کوڕەکە نزای لەلای خوا کردو گوتی: خوایە بمپارێزە لەمانە بەو ئامڕازەی کە خواستی خۆتی لەسەرە. خواش چیاکەی لەرزاندەوەو، هەموو ئەو پیاوانەی پادشا لێوەی کەوتنە خوارەوەو لەنێوچوون. ئنجا کوڕە نەوجەوانەکە بە تەنها هاتەوە بۆ لای پادشاکەو، پادشاش لێی پرسی: هاوەڵەکانت چییان کرد؟گوتی: خوا ئەوانی لەکۆڵم کردەوەو پاراستمی..

جارێکی دی پادشا ئەم کوڕەی دایەوە دەست چەند کەسێکی ترو پێی گوتن: ئەم جارە ئێوە بیبەت‌و بیخەنە نێو کەشتییەکی بچووکەوەو بیگەیەننە نێوەڕاستی دەریاکەو، هەڕەشەی سەرنگوومکردنی لێ‌بکەن، ئەگەر لە دینەکەی پاشگەز نەبێتەوە، گەر گوێڕایەڵیی نەکردن هەڵی دەنە نێو دەریاکەوە.

ئەوانیش بردیان، کوڕەکە لەم شوێنەشدا نزای کردو گوتی: خوایە بمپارێزە لەمانە بەو ئامڕازەی کە خواستی خۆتی لەسەرە. ئیتر پاپۆڕەکە هاوسەنگیی تێك چووو بەلایەکدا لار بۆوەو هەموویان خنکانو، خوا کوڕەکەی ڕزگار کرد.

کوڕەکە بەپێ هاتەوە بۆ لای پادشاکەو، ئەویش لێی پرسیەوە: هاوڕێکانت چییان کرد؟ گوتی: خودی منی لێیان پاراست..

ئنجا بە پادشاکەی گوت: تۆ ناتوانیت من بکوژیت، هەتا فەرمانێکی من ئەنجام نەدەیت.. پادشا گوتی: ئەو فەرمانە چیە؟ گوتی: لەسەر بەرزاییەك خەڵکی کۆبکەرەوەو بەقەدی درەختێکدا هەڵم واسەو، تیرێك لە هەگبەکەی من دەربێنەو بیخە نێو کەوانەکەو، پاشان بڵێ: (بەناوی خوای پەروەردگاری ئەم کوڕە)، ئنجا تیرەکەم تێبگرە. ئەگەر ئەم کارە ئاوا ئەنجام بدەیت، ئەوسا دەتوانیت بمکوژیت.

پادشاش خەڵکیی بۆ ئەم مەبەستە کۆکردەوەو، بە قەدی درەختێکدا هەڵیواسیو، تیرێکیشی لە هەگبەی کوڕەکە بەدەستەوە گرتو، خستییە نێو کەوانەکەوەو سازی کرد بۆ هاویشتن، ئنجا گوتی: (بەناوی خوای پەروەردگاری ئەم کوڕەوە)و لەدوای وتنی ئەم ڕستەیەش تیرەکەی تێگرتو، بەر لایەکی نێوچەوانی کوڕەکە-نێوان چاویو گوێچکەی- کەوت.. کوڕەکە دەستی خستە سەر شوێنی تیرەکەو، مرد.

خەڵکیش هاواریان کردو گوتیان: باوەڕمان هێنا بە خوای ئەم کوڕە، باوەڕمان هێنا بە خوای ئەم کوڕە، باوەڕمان هێنا بە خوای ئەم کوڕە.

دارودەستەی پادشاکە، چوونە لای پادشاو پێیان گوت: ئایا ئەوەت بینی، کە لێی دەترسایت؟ بەخوا ئەوەت بەسەرهات، کە لێی دەترسایت، ئەوەتا خەڵکی ئیمانیان بەخوا هێناوە.

پادشاکە فەرمانیدا لە هەریەکە لە دەروازەی ڕێگاکاندا — وادیارە هەر ڕێگایەك دەروازەیەکی هەبوە- چاڵ هەڵکەنرێت، چاڵەکانیان هەڵکەندو، ئاگریان تێدا کردەوە.

ئنجا پادشا جاڕیداو گوتی: هەرکەسێك لە دینەکەی پاشگەز نەبێتەوە، هەڵیدەنە ناوی. یان پێی گوتراوە: بچۆ ناوی.. ئەوانیش فەرمانەکەیان جێبەجێکرد.

تا نۆرە گەیشتە سەر ئافرەتێك، کە کوڕێکی مێردمنداڵی خۆی لەگەڵدابوو، لەئاست ئاگرەکەو خۆهەڵدان ناویدا لە هەڵوێستەیەکی کردو بیری لەوە کردەوە، کە

نەچێتە ناو ئاگرەکەوە.. بەڵام کوڕەکەی پێی گوت: (دایە، مەترسەو خۆڕاگر بە، چونکە بێگومان تۆ لەسەر هەقیت)[1].

## ئەم چیرۆکە لە شێوە گێڕانەوەکەی (ابن اسحاق)دا

ئیمام (ابن اسحاق) لە ژیاننامە (سیرة)دا شێوە گێڕانەوەیەکی تری لەسەر چیرۆکی (أصحاب الأخدود) دیاری کردووە، کە جیاوازی یەکی لەگەڵ شێوە گێڕانەوەکەی (ئیمام مسلم)دا هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوێتی یەوە. بەڵام (ابن اسحاق) بە پلەی (مرفوع) لە پێغەمبەرﷺ خۆیەوە نەیهێناوە، بەڵکو لە (تابعی)یەکەوە کە (محمدی کوڕی کعب القرظی)یە وەری گرتووە.

(ابن اسحاق) گوتوویەتی: (یەزیدی کوڕی ابن زیاد) لە (محمدی کوڕی کعب القرظی)یەوە بۆی گێڕامەوە، هەروەها هەندێك کەس لە خەڵکی (نەجران) لە خەڵکانی ئەوێوە بۆیان گێڕاومەتەوە، کە:

خەڵکی (نەجران) خەڵکێکی شوێنکەوتەی شیركو هاوەڵ بۆخوا دانەرو بتپەرست بوون، لە شارۆچکەیەك لە شارۆچکەکانی نزیك (نەجران)دا سیحربازێك هەبوو کە منداڵانی خەڵکی (نەجران)ی فێری سیحر دەکرد.

جا کاتێك (فەیمیوون)ی ڕاهیب هاتە ئەو شارە، -ڕاهیبەکە بەم ناوە بۆ من باس نەکراوە کە (وهب بن منبه) بەو ناوە دیاریی کردووە، بەڵکو وتیان: پیاوێك هات[2]- لەنێوان (نەجران)و ئەو شارۆچکەیەی سیحربازەکەی تێدابووە، دەوارێکی

---

١) صحيح مسلم (٥٣) كتاب الزهد والرقائق(١٧) باب قصة أصحاب الأخدود. حديث رقم (٣٠٠٥).

٢) (ابن اسحاق) لەسەرەتای چیرۆکەکەی (ابن ثامر) و (اصحاب الاخدود) باسی (فەیمیون)ی ڕاهیبی پیاوچاکی کردووە، لەگەڵ چۆنیەتی دەرچوونی لە (شام)ەوە بۆ (نەجران) و، بانگەوازی بۆ ئاییني (عیسی)-سلاوی لێبێت- لە (نەجران) و، خوێندنی (ابن ثامر) لەلای ئەو راهیبە ساڵحە.. ئەم چیرۆکەشی لە (وهب بن منبە)ی تابیعی وەرگرتووە.. خوداش هەرخۆی دەزانێت بەسەرهاتی (فەیمیون)ی راهیب چۆن بووە... بڕوانە (الروض الأنف) ١: ١٩١-١٩٥.

هەڵداوە.. خەڵکی (نەجران)یش منداڵەکانیان بۆ لای ئەو سیحربازە ناردووە تاکو فێری سیحرو جادوویان بکات.

(ثامر)یش کوڕەکەی خۆی کە ناوی (عبدالله الثامر) بووە، لەگەڵ منداڵانی (نەجران)دا ناردووە. (عبدالله)ش کە بەلای کابرای نێو دەوارەکەدا تێپەڕیوە، بە نوێژو خواپەرستی یەکەی سەرسام بووە، بۆیە لەلای دانیشتووەو گوێی لە وتەو گفتاری گرتووە، هەتا موسڵمان بووەو، لەسەردەستی ئەو ڕێبازی خواپەرستیو خوا بەیەك گرتنی پەیڕەو کردووەو، ئیدی لەسەر یاساکانی ئیسلام پرسیاری لێ کردووە.

هەتا لە ئیسلام شارەزا بووە، دواتر دەربارەی ناوە گەورەکە (الإسم الأعظم) پرسیاری لێکردووە، ئەویش پێی نەداوەو لێی شاردۆتەوەو، پێیشی گوتووە: ئەی کوڕی برای خۆم، تۆ ئەو بارەت بۆ هەڵناگیرێتو، دەترسم لەوەی بێهێزو لاواز بیت.

(ثامر)ی باوکی عبدالله گومانی وابوو کە کوڕەکەی وەك کوڕانی دیکە هاتوچۆی لای سیحربازەکە دەکات.

(عبدالله)ش کاتێك دەبینێت ئەوا هاوڕێ ڕاهیبەکەی لە بەخشینی (ناوە گەورەکە) پێی ڕەزیلی دەکاو لێی دەشارێتەوەو، ترسو نیگەرانیی لە لاوازیی (عبدالله) هەیە، پەنای بردەبەر ئەوەی کۆمەڵێك پیاڵەیەك کۆبکاتەوەو، پاشان هەموو ناوەکانی خوای کە خۆی دەیزانی لەسەر پیاڵەکان نووسی، هەر ناوێك لەسەر پیاڵەیەك، ئنجا کە هەموویانی ژمارد، ئاگرێکی بۆ کردنەوەو، پیاڵەکانی یەك یەکە فڕێ دەدا ناو ئاگرەکە. جا کاتێك گەیشتە سەر ناوە گەورەکەو بە پیاڵەکەیەوە فڕێی دایە ناوی، پیاڵەکە هەڵبەزی یەوەو هاتە دەرەوەو هیچ زیانی پێ نەکەوت. (عبدالله) ئەو پیاڵەیەی هەڵگرتو بردیی بۆ لای هاوڕێ ڕاهیبەکەیو، هەواڵی ئەوەشی پێدا کە ئەو ناوە گەورەیەی خوا کە ئەو لێی شاردبۆوە، زانیویەتی. ڕاهیبەکەش لێی پرسی: کام ناوەیە؟ ئەویش گوتی: ئاواو ئاوایە. ڕاهیبەکە دووبارە لێی پرسی: چۆنت زانی؟ (عبدالله)ش کردارو

تاقیكردنەوەكەی خۆی بۆ گێڕایەوە.

ئیتر ڕاهیبەكە پێی گوت: ئەی كوڕی برام.. بەڕاستی پێكاوتەو ناوەكەت زانیوە.. دە تۆش ئاگات لەخۆت بێتو، لەو بڕوایەشدا نیم لە خۆتەوە هەڵسوكەوت كەیت.

ئیدی (عبداللەی كوڕی ثامر) هەر كاتێك بچوایەتەوە بۆ نێو شاری (نەجران)و هەركەسێكی بە دەردو ئازارێكەوە بدیایە پێی دەگوت: ئەی عەبدی خوا، ئایا خوا بەیەك دەناسیو دێیە سەر دینەكەی من، تا منیش دوعات لەلای خوا بۆ بكەمو، لەو بەڵاو ناڕەحەتی یە ڕزگارت كاتو چاكت كاتەوە؟ ئەو كەسەش بێگومان پێی دەگوت: بەڵێ ئامادەم.. ئنجا باوەڕی بەخواش دەهێناو خوای بەیەك دەناسیو موسڵمان دەبوو، (عبداللە)ش دوعای بۆ دەكردو، ئەویش چاك دەبووەوە. بەم ڕەنگە تا لە ئەنجامدا هیچ كەسێكی دەردەدارو نەخۆش لە شارۆچكەی (نەجران)دا نەمایەوە بێت بۆ لایو شوێنی ڕێبازەكەی بكەوێت.

هەتا لە ئاكام دا ئەم مەسەلەیە بە پادشای (نەجران) گەیەنراو، ئەویش (عبداللە)ی بانگ كردو پێی گوت: تۆ خەڵكی شارۆچكەكەمت لەمن هەڵگەڕاندۆتەوەو، سەرپێچیشت لە دینەكەی خۆمو بابو باپیرانم كردووە. لەبەر ئەمە دەبێت بتكەم بە پەندو عیبرەت.

(عبداللە)ش گوتی: ناتوانیت ئاوام لێ بكەیت.

پادشاش ئەو كوڕەی لەگەڵ چەند كەسێك ناردە سەر چیایەكی بەرزو لەوێوە بەسەردا هەڵدرایە خوارەوە، كاتێك گەشتە سەر زەوی، ساغو سەلیم بووو هیچی لێ نەهاتبوو. پاشان لەگەڵ چەند كەسێكی تردا دەینارد بۆ نێو ئاوی (نەجران)و بۆ دەریایەكی وا كە هەر شتێكی تێ بكەوتایە لەناو دەچووو نەدەما و، لەوێ ئەو چەند كەسە ئەم كوڕەیان فڕێ دەدایە نێو گێژاوی دەریاوە، كەچی لەولاوە لێوەی دەهاتە دەرێو هیچی بەسەر نەهاتبوو.

جا کاتێك (عبدالله) ئاوا پادشاکەی بەزاند، پێی گوت: ئەی پادشـا، وەللاهـی تۆ ناتوانیت من بکوژیت هەتا خوا بەیەك نەناسیتو باوەڕی پێ نەهێنیت، دەبێـت باوەڕ بەو خوایە بێنیت کە من باوەڕم پێ هێناوە. جا ئەگـەر ئـاوا بکـەیت، ئـەوا بەسەرما زاڵ دەبیتو دەمکوژیت.

پادشاکەش خوای بەیەك ناسیو هەمان شایەتمانی (عبـدالله ی کـوڕی ثـامر)ی هێنـاو، پاشـان بـە داردەسـتەکەی خـۆی لێیـداو زامێکـی مامناوەنـدیی کـردە ناوچەوانیو کوشتی.

پاشان پادشاکە خۆیشی لەو جێگەیەدا مرد.

ئنجا خەڵکی (نەجران) هەموویان ڕایان هاتە سەر ئاینەکەی (عبدالله ی کـوڕی ثامر)و باوەڕیان بە خوای پەروەردگار هێنا، (عبدالله)ش لەسەر ئەو ڕێبازە بوو کـە (عیسای کوڕی مریەم)-سلاویان لێ بێت- لە ئینجیلو حوکمی خوا هێنابووی.

ئیدی لەوێوە ئەو ڕووداوو کارەساتانەی تریان بەسەردا هات، کە شوێنکەوتوانی ئاینەیان بەسـەریان داهـات. کەواتـە وادیـارە بنـچینەی ئـاینی (نەصـرانی) لـە (نەجران) لەمەوە بووبێت.. والله اعلم.

(ابن اسحاق) دەڵێت: ئەمە گێڕانەوەی (محمدی کوڕی کعب القرظي)و هەنـدێك کەسە لە خەڵکی نەجران، دەربارەی (عبدالله ی کوڕی ثـامر)، خـواش هـەر خـۆی لەمە زاناو ئاگادارە.

هەروەها لە درێژەی ئەم بەسەرهاتانەدا (ابن اسـحاق) گوتوویـەتی: پاشـان (ذو نـواس)ی پادشای یەمەن بە سەربازەکانی یەوە چووە سەر خەڵکی (نەجران)و بانگی کردوون بۆ سەر ئایینی یەهوودیو لـەنێوان ئـەم ئاینـەو کوشـتنیاندا سەرپـشکی کردوون، ئەوانیش کوژرانی خۆیان بەباشـتـر دانـاوە، وەك لـەوەی بـچنـــە سـەر دینی پادشاکە.

پادشای یەمەنیش چاڵێکی گەورەی بۆ هەڵکەندوونو، هەندێکیانی بە ئاگرەکـە سووتاندووەو کوشتووە، هەندێکی تریشیانی بە شمـشێر کوشـتووەو، لاشـەکانیانی

شێواندووه. بەم ڕەنگە نزیکەی بیست هەزار کەسیی لێ کوشتوون.

دەربارەی ئەم تاوانە گەورەیەی (ذو نواس)و سەربازەکانیی، خوا ئەو ئایەتانەی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ناردۆتە خوارەوە:

﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ البروج ﴾.

(ابن اسحاق) گوتوویە: "(عبداللەی کوڕی ابوبکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی حزم) فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە، کە ئەویش پێشتر بۆی گێڕراوەتەوە، کە پیاوێك لە خەڵکی (نەجران) لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتتاب)دا -خوا لێی ڕازی بێت- کەلاوەیەك لە کەلاوەکانی (نەجران)ی بۆ هەندێك پێداویستیی خۆی هەڵدەکەندو، لە گەرمەی کاری هەڵکەندنیاندا تەرمی (عبداللەی کوڕی ثامر)یان دۆزییەوە، کە لەوێدا نێژرابووو لە حاڵەتی دانیشتندا بووو، دەستیشی خستبووە سەر شوێنێکی لێدراوی سەریو، دەستی بەو شوێنە لێدراوەی سەریەوە گرتبوو، جا کاتێك دەستیان لەو شوێنە لابرد خوێنی لێ دەڕژا، کە دەستیشی دەخرایەوە سەریو بەردەدرا، یەکسەر دەستی دەخستەوە سەر خوێنەکەو ڕایدەگرت، لە دەستیشی ئەنگوستیلەیەك هەبوو لێی نووسرابوو (پەروەردگارم الله یە/ ربي الله). ئەم هەواڵە بە نامەیەك نێررا بۆ (عمر کوڕی خەتتاب)و مەسەلەکەیان پێ ڕاگەیاند. (عمر)یش-خوا لێی ڕازی بێت- لە نامەیەکدا وەڵامیی دانەوەو بۆی نووسین کە لەسەر هەمان حاڵەتی خۆی بیهێڵنەوەو ئەو خۆڵەی کاتی ناشتنەکەی بەسەردا بکەنەوە. ئەوانیش ئەم فەرمانەیان جێبەجێ کردووە"[1].

---

١) بڕوانە (روض الأنف لسسهیلي) بتحقیق عبدالرحمن الوکیل (١: ١٩٦-٢١٧).. هەروەها بڕوانە (لێکدانەوەی -سهیلی- بۆ هەندێك لەم وتە دیاریکراوانەی -ابن اسحاق- و شیکاری (عبدالرحمن الوکیل)یش لەسەر ئەوە لە هەمان کتێبدا.

## سەرنجێك لەسەر شێوەگێڕانەوەکەی (ابن اسحاق)

وەك تێبینی دەکرێت، (ابن اسحاق) لە هێنانی چیرۆکی (عبداللە ی کوڕی ثامر)و نەسرانییەکانی نەجراندا ئەم چیرۆکەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ و لە یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانییەوە نەگێڕاوەتەوە، بەڵکو بە پلەی (موقوف) لە (محمدی کوڕی کعب القرظي)یەوە -کە تابعی یەکی بەڕێزە-و، ئەویش لە هەندێك خەڵکی (نەجران)ەوە گێڕاویەتییەوە.

جا سەرەڕای ئەوەش کە وایان داناوە سوورەتی (البروج) دەربارەی (عبداللە ی کوڕی ثامر)و برایانی لە قوربانی یانی چاڵەگەورەکەو چیرۆکی (اصحاب الاخدود) هاتبێتە خوارەوە، بەڵام ئێمە وا ناڵێینو جێگیری ناکەین.. بەڵکو ئێمە پشت بەو فەرموودە ڕاست(صحیح)ە دەبەستین کە هەردوو ئیمام (مسلمو ترمذي) لە (صوهەیبی ڕۆمی)یەوەو ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویانەتەوەو کە تێیدا هەندیك وردەکاریو زانیاریی زیاتر لەسەر چیرۆکی (اصحاب الاخدود) هەیەو، بەڵام ناوەکانی ئەو کەسانەی نێو چیرۆکەکەو، کاتو شوێنی ڕووداوەکانیشی بەدیار نەخستووە. بەڵام لە شێوەگێڕانەوەکەی (ابن اسحاق)دا دان بە ڕوودانو واقیعیەتیدا نانێین، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەو سەرچاوە متمانە پێکراوو جێگیرکراوانەدا نەهاتووە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ خراونەتە ڕوو، چەندەها جاری تریش ڕوونمان کردۆتەوە کە بێگومان چیرۆکەکانی پێشینانو هەواڵو بەسەرهاتی سەردەمەکانی ڕابردوو تەنها لە دەقی ڕۆشنی قورئانەوە یان لە فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەرەوە ﷺ وەردەگرین.

لەبەر ئەوە بەڕاشکاوی دان نانێین بە واقیعیەتیو باری ڕاستیی ڕووداوەکانی نێو شێوە گێڕانەوەکەی (ابن اسحاق) لەسەر (عبداللە ی کوڕێ ثامر)و ئەوانی دی، هەروەها دان بەوەش دانانێین کە ئەو کەسانەی وەك (عبداللە)و ئەوانی دی لە باوەڕدارانی (نەجران) کەسانی باس کراوی نێو ئایەتەکانی سوورەتی (بروج) بن. لە

هەمان کاتیشدا بەوپەڕی دڵنیاییو (یەقین)ەوە نکوولّی لەو گێڕانەوەیەی (ابن اسحاق) ناکەین، چونکە نکوولّی لێکردنیشی وەك (دان پیانانو جێگیرکردن) پێویستی بە چەند بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرای یەکلاکەرەوەیە. ئێمەش ئەم بەڵگانەمان نیە تاکو حوکمی یەکجارەکیی بەسەردا بدەین. لەبەر ئەوە هەڵوێستی ساغو سەلیم ئەوەیە بێدەنگ بین لە ئاستیدا (بەبێ نکوولّی لێکردنیو، بەبێ جێگیرکردنیو دان پێدانانیشی). ئیدی، نە حوکمی بۆ دەدەینو، نە حوکمیشی لەسەر دەدەین. بە دڵنیاییەوە دان بەوەدا نانێین، کە (عبداللّٰهی کوڕی ثامر) کوڕە مێردمنداڵە بانگەوازکارە شەهیدەکە بێت، هەروەها نکوڵیشی لێناکەین، کە بەڕاستی هەر خۆی ئەو کەسە ئاماژە بۆکراوەی نێو فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت.

## چەند چاڵێکی گەورە بوون، نەك یەك چاڵی گەورە

زۆرکەس لە زانایانو مێژوونووسان لەو بڕوایەدان، کە چیرۆکی (خاوەنانی چاڵە گەورەکە/ أصحاب الاخدود) تایبەت نیە بە گەلێکی دیاری کراوەوەو، بەهیچ تاکە سەردەمو تاکە ناوچەو جێگایەکیشەوە پەیوەست نیە. بەڵکو ئەم چیرۆکە چەندەها جاری دی دووبارەو چەندبارە بۆتەوەو، هەر کەسێك باوەڕی بەخوا هێنابێتو گەلەکەی ئازاریان دابێتو چاڵیان بۆ هەڵکەندبێتو تێیان فڕێدابێت، لە چوارچێوەی چیرۆکەکەدایەو گرتوێتی یە خۆی.

لەم بارەیەوە (جوبەیری کوڕی نوفەیر) گوتوویەتی: "ئەو چاڵانەی هەڵکەندراون بۆ باوەڕداران لە مێژووی ڕابردوودا، سێ چاڵو لە سێ وڵاتدا بوون:

چاڵی یەکەم/ لە یەمەن هەڵکەندراوە لەسەردەمی حوکمڕانیی (توببەع)دا.

چاڵی دووەم/ لە قوستەنتینیە هەڵکندراوە لەسەردەمی حوکمڕانیی قوستەنتینو هیلایەی دایکیدا، کاتێك پڕوپاگەندەی بە نەسرانی بوونیان بۆ خۆیان دەکرد،

کەچی (قوستەنتین) نەسرانییەکانی لە ئایینی (مەسیح)و خوا بەیەك دانان هەڵگێڕایەوەو، وای ڕاگەیاند گوایە (عیسا) کوڕی خوایە، چاڵێکیشی هەڵکەند بۆ ئەو نەسرانییانەی کەلەسەر ئایینی خوا بەیەك ناسین مابوونەوە.

چاڵی سێیەم/ لە بابل لە عێراقداو لە سەردەمی حوکمڕانیی (بەخت نەسر)دا کە بتێکی دروست کردبووو فەرمانی دابوو بەوەی دەبێت کڕنووشی بۆ ببەن. باوەڕدارێکیش بەناوی (دانیال)و دوو هاوڕێی خۆیشی، ئامادەنەبوون کە ئەو فەرمانەی پادشای (بابل) بەجێ بێنن. ئەوش ئاگرێکی لەناو چاڵێکی گەورەدا بۆ کردنەوەو هەڵی دانە نێوی، بەڵام خوا ئاگرەکەی ساردو سەلامەت کردوە لەسەریان.

(سوددی)یش گوتوویەتی: چاڵەکان لە مێژووی ڕابردوودا سیان بوون: (چاڵێك لە شامو چاڵێك لە عێراقو چاڵێك لە یەمەن"[1].

هەروەها (مقاتل)یش گوتوویەتی: "چاڵە گەورە هەڵکەندراوەکان لە مێژوودا سیان بوون: چاڵێکیان لە نەجران لە وڵاتی یەمەن بووە، چاڵێکی تریان لە شامو چاڵی سێیەمیش لە وڵاتی فارس بووە، کە ئیماندارانیان تێدا بە ئاگر سووتاندووە. جا ئەو چاڵەیان کە لە شام بووە، (ئەنتانیۆسی رۆمی) هەڵیکەندووە. ئەو چاڵەش کە لە وڵاتی فارسدا بووە (بەخت نەسر) هەڵیکەندووە، ئەو چاڵەی تریش کە لە خاکی عەرەبدا بووە (یوسف ذو نواس) هەڵیکەندووە. بەڵام ئەو دوو چاڵەی، کە لە هەردوو وڵاتی فارسو شامدا بوون، خوا لە قورئاندا ئاماژەی بۆ نەکردوون، بەڵکو تەنها بە چەند ئایەتێك لە قورئاندا ئاماژەی بۆ چاڵە گەورەکەی نەجران کردوە"[2].

ئێمەش هیچ قسەوباسێك لەسەر وتەکانی ئەو زانایانە ناڵێین، تەنها ئەوە دەڵێین کە بێگومان خوا خۆی دەزانێت کە کام چاڵەیان بووە؟!

---

١) البداية والنهاية-ابن كثير/ ٢: ١٣١-١٣٢ .

٢) الروض الأنف ١: ٢١٧ حاشية الوكيل .

## چەند سەرنجێك لەسەر گێڕانەوەکەی ئیمام مسلم له چیرۆکەکەدا:

پێشتر له سەرەتای ئەم چیرۆکەدا ئەو فەرموودەیەمان دیاری کرد، کە ئیمام موسلم له (سوهەیبی رۆمی)و ئەویش له پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبارەی چیرۆکی (اصحاب الاخدود)ەوە گێڕاویانەتەوە. جا وادیارە لەم فەرموودەیەشدا، چەندەها ڕێنماییو ئاماژەو پەند هەبن‌و، دەشێت چەندین وانەو ئامۆژگاری سوودبەخشیان لێوە بەدەست بهێنرێت. لەم ڕووەوە کتێبێکی مامۆستا (روفاعی سرور) بە ناونیشانی (اصحاب الاخدود) لەبەردەستم دابوو، کە چەندین سەرنج‌و هەڵوێستەو تێڕوانینی لە ئاست ئەو فەرموودەیەدا پیشان داوەو، پاشان گەلێك پەندو ئامۆژگاری‌و هێماو دەلالەتی جوانی لێ‌دەرهێناوە. منیش لێرەدا گرنگترینی ئەو پەندو ئامۆژگاری‌و وانەو دەرهاوێژراوانەی نێو کتێبەکەی بە کورتی دیاریی دەکەم:

١- له سەرەتای فەرموودەکەدا دەفەرموێت: "لە زەمانی پێش ئێوەدا پادشایەك هەبووە.."، ئەمەش دیاریکردنی دەسپێکی چیرۆکەکەو، ئاماژەیەکیشە بۆ سەردەمە مێژوویی یەکەی، تێبینی ئەوەش دەکەین، کە بێگومان پێغەمبەر ﷺ سوور بووە لەسەر دەرنەخستنی ناوەکان‌و، ناوی ئەو گەلەی نەهێناوەو ناوی ئەو ناوچەیەشی نەبردووەو ڕووداوەکەی تیادا بووە، هەروەها ناوی ئەو سەدەو چاخەشی نەهێناوە، کە ئەو گەلە تیایدا ژیاون. ئەمەش داوامان لێ دەکات بۆ ئەوەی پابەند بین بە شێوازی پێغەمبەرەوە ﷺ لە مەسەلەی باسکردنی چیرۆکەکانی گەلانی پێشین‌و، لێکۆڵینەوەی هەواڵ‌و ڕووداوەکانیان.

٢- له دابڕینی ناوەکانی کەسان‌و سەردەم‌و ناوچەی چیرۆکەکەدا، حیکمەتێکی تر هەیە، ئەوەش دەربازکردنی چیرۆکەکەیە لە کۆت‌و پێوەندی مێژوو تاکو لە هەموو قۆناغەکانی تری مێژوودا دیارو بەرقەرار بێت. چونکە ئەگەرچی تەنها لە یەك سەردەمی ڕابردووشدا ئەم چیرۆك‌و بەسەرهاتە ڕووی دابێت، بەڵام بە هەموو ئەو دەرس‌و پەندو ئامۆژگارییانەیەوە بە شێوەیەکی گەرم‌و گوڕو وەك

چیرۆکێکی کاریگەرو تاقیکردنەوەیەکی زیندوو تا کاتی هاتنی قیامەت، دەمێنێتەوە.

٣- وشەی (لەپێش ئێوەدا /قبلکم) لە ڕستەی (کان فیمن قبلکم) بەستنەوەی رابردووە بە ئێستاوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەردوو مەسەلەی شەهیدانی (اصحاب الاخدود)و واقیعی هاوەڵە بێدەسەلاتەکانی لە مەککەی پێکەوە بەستۆتەوە، چونکە هاوەڵان لە مەککەدا بەردەوامی‌و درێژەپێدانێکی ڕاستەو دروستی ئەو بانگەوازەن، کە شەهیدانی چاڵە گەورەکە لەپێناویدا خۆیان بەخت کرد.

٤- باسی بوونی پادشایەك لە سەرەتای چیرۆکەکەدا (کان ملك فیمن کان قبلکم) ئاماژەیەکە بۆ ڕواڵەتی دوژمنانی بانگەوازی خوا لە گشت سەردەم‌و شوێنێکدا، کە ئەوانیش کەسانی دەست ڕۆیشتووو لووتبەرزن‌و خاوەنانی دەسەلات‌و پلەوپایەن.

هەروەها ئاماژەیەکیی تێدایە بۆ سرووشتی بانگەوازەکەو پێویستیی ڕوبەڕووبوونەوە لەسەرەتاوە لەنێوان بانگەوازەکەو کاربەدەستە کافرەکان‌و دەسەلاتە ستەمکارەکەیاندا.

٥- هەر لە فەرموودەکەدا (ئەم پادشایە سیحربازێکی هەبوو/ وکان لە ساحر) دیاری کردنی پەیوەست بوونی نێوان پادشاکەو سیحربازەکەیە، یان -ڕوونتر بڵێین- پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوان ڕژێمە جاهیلییە بێباوەڕەکان‌و، سیحربازو جادوگەرەکانە. بێگومان ستەمکاران پشت بە سیحربازانیش دەبەستن تاکو وەهم‌و ئەفسانە لەنێو گەلەکانیاندا بلاوبکەنەوەو، ملکەچکردنیشیان مسۆگەر بکەن بۆ خۆیان. چونکە گەر وانەبێت، ئەوا گەلان بیردە کەنەوەو، بیرکردنەوەو هوشیاربوونەوەو ڕۆشنبیرییشیان هۆکاری ڕزگاربوونیان دەبێت‌و، دەرەنجامی لەناوچوونی ڕژێمە کافرەکانیش دەبێت. هەر بۆیەش سیحربازان دەستدەکەن بەکاری زیندەبەچاڵکردنی فیکروبیرکردنەوەو سڕینەوەی ئاستی هۆشیاری خەڵکی.

٦- کاتێك سیحربازەکە گەورەبووەو چۆتە تەمەنەوە، ئاماژەی بۆ پادشاکە کردووە، کە کوڕێکی مێردمنداڵی بۆ دەستنیشان کات تاکو فێری سیحربازیی بکات، لەمەشدا دەردەکەوێت کە دارودەستەی حاکمە کافرەکان سوورن لەسەر مانەوەی بارودۆخ وەك خۆی تا هەر ئاوا بەردەوام بێت. هەروەها لەو داواکارییەی سیحربازەکەدا ئاماژەیەك هەیە بۆ حەزەرکردنی خۆی لە بەردەوامیی کارو فەرمانو پەیامە گەندەڵەکەی لەدوای خۆی، نەخاسمە ئەو گەورەیەو بەساڵاچووەو، کاتی مردنیشی نزیك بۆتەوەو، لەو پاشماوەیەی تەمەنیدا کاردەکات بۆ بەجێهێشتنی کارەکەیو بە میرات دانانی -ئەو پیشەیە بۆ کەسانی تری دوای خۆی-.

٧- لە داواکاریی سیحربازەکەدا، بە پادشای گوتووە: (کوڕێکی مێردمنداڵم بۆ بنێرە تاکو فێری سیحرو جادووی بکەم) ئاماژەیەکی دی هەیە بۆ نەخشەکێشانی ستەمکارانی جاهیلو، بۆ فڕوفێڵو پیلانگێڕانیان لەسەر تێکدانی خەڵکیو، بەردەوامیی سیستمی جاهیلیو، گۆشکردنی نەوەکانی داهاتوو لەسەر بنەماکانی جاهیلیەتو، لەسەر گومڕاییو بێباوەڕیو سیحری جاهیلییەت.. داواکردنی کوڕێکی مێردمنداڵ(غلام)یش بەڵگەیەکە لەسەر هەڵبژاردنی منداڵانو بچکۆلەکان بە مەبەستی تێکدانو لەڕێلادانیانو، سڕینەوەی حەق لەناخی دڵیانو فیترەتیانداو، شێواندنی ئەو فیترەتەیان بەو کفرو سیحرو گومڕاییەی، کە فێریان دەکەن.

٨- پادشاکەش کوڕێکی منداڵی ئاوای بۆ ناردووە، تاکو فێری سیحری بکات (فبعث إليه غلاماً ليعلّمه). کەواتە ئێستا کوڕەکە لەنێو مەینەتیو فیتنەو تاقی کردنەوەدایەو، خەریکە بشێوێنرێتو بفەوتێنرێت. کەسانی جاهیلو نەفام ئاوا لە منداڵانو نەوجەوانان دەکەن، وەك چۆن (نوح)-سلاوی لێ بێت- دەربارەیان گوتی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن

تَذَرْهُمْ يُضِلُّواْ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ نوح ﴾. واته: خوایه هیچ کەسێك که له کافرانەو دانیشتووی خانەو ماڵێکه لەسەر زەویدا مەهێڵەو لەناویان ببه، چونکه ئەگەر بیانهێڵییەوه ئەوا بەنده چاکەکانت گومڕادەکەن‌و، خۆشیان تەنها کەسانی بەدکارو بێ‌باوەڕیان لێ دەبێت.

٩- خوا لەڕێگادا، ڕاهیبێك بۆ کوڕە نەوجەوانەکە بەیدەست دەکات (فكان في طريقه إذا سلك راهب)، قەدەری خواش بۆ کوڕەکه وابووه، که به ڕاهیبەکه بگات، لەمەشدا دەردەکەوێت، که هەر قەدەرو خواستی خوا بەجێ دەگات‌و، ستەمکارانیش له نەخشەو پلانەکانیاندا شکست دێنن. بێگومان پادشاو سیحربازەکەش ویستوویانه ئەو کوڕە مێردمنداڵه تێك بدەن‌و، فێری سیحری بکەن، خواش ویستوویەتی ئەم دوانه شکست بێنن لەو کارەدا، که هەوڵی بۆ دەدەن، هەروەك ویتسووشیەتی ئەم منداڵه ببێته باوەڕدارێکی بانگەوازکار بۆ ڕێبازی خواو، پاشان ببێته شەهیدێکیش لەپێناوی خوادا. هیچ شتێکیش بەبێ ویستی خوا نابێت.

١٠- بوونی ڕاهیب لەو کۆمەڵگه جاهیلییەو له کەشه گران‌و دەردەدرەدا، ئاماژەیەکه بۆ ئەوەی، که زۆرجار لەنێو خەڵکیدا کەسانی باوەڕدارو پیاوچاك‌و بەئەمەك هەیه، تەنانەت ئەگەر کەم‌و بێدەسەلات، یان چەوساوەش بن.

١١- کوڕە نەوجەوانەکه لەلای ڕاهیبەکه دانیشتووەو قسەکانی بیستووەو پێیشی خۆشحاڵ‌و سەرسام بووه. لەمەشدا ئاماژەیەك هەیه بۆ لێ‌ڕادیتنی خێر لێی‌و بۆی، هەروەها ئاماژەشه بۆ چاکیی ڕەفتارو هەڵس‌وکەوتی ڕاهیبەکه له بانگەوازیدا بۆ ڕێبازی خواو، له شیرینیی گوتارو ئاخاوتنیدا. ئاماژەیەکی تریشی تێدایه لەسەر چاکیی بەدەمەوه هاتن‌و ئامادەیی کوڕە نەوجەوانەکەو، پاکیی فیترەتی‌و پاڵاوتەیی ناخ‌و دەروونی که هیچ کەسێك له پادشاکەو له سیحربازەکەش نەیانتوانی ئاکاری بشێوێنن‌و لەڕێی ڕاست لایدەن.

١٢- کوڕە نەوجەوانەکە وای لێهاتبوو، کە لە دوو سەرچاوەی لێك جوداو دژ بە یەکەوە دوو جۆرە زانیاریی پێچەوانەی یەکدیی وەردەگرت، لەلایەکەوە بەرنامەی ئاینو حەقی ڕاستەقینەی لە ڕاهیبەکە وەردەگرت، لەلایەکی تریشەوە دەبوایە وانەکانی سیحرو گومڕایی لەلای سیحربازەکەی پادشا بخوێنێت. بەلام بەچاکی دەیزانی، کە کام زانیارییە وەربگرێتو هەڵبژێرێت. ئەوەبوو تەنها وتەکانی ڕاهیبەکەی بەدڵ وەردەگرتو پەسندی دەکرد، چونکە هەقو ڕاستی بوون، بەلام بەهیچ شێوەیەك وتەکانی کابرای سیحربازی پەسند نەدەکردو پێشیان قایل نەدەبوو، بەڵکو تەنها بەناچاری گوێی لێدەگرتو، بە ناچاریش بەدیداری دەگەیشت، وتەکانیشی لە هۆشو دڵیدا هەڵنەدەگرت، بەڵکو بەخێرایی گوێی لێیان دەگرت.

١٣- کوڕە نەوجەوانەکە هەرکاتێك بچوایە بۆ لای سیحربازەکە، سوور بوو لەسەر ئەوەی، کە سەرەتا بۆ لای ڕاهیبەکە بچێت، لەمەشدا بەڵگەیەکی دی هەیە لەسەر پەرۆشیی ئەو کوڕە، بۆ وەرگرتنی توێشوویەکی باوەڕداریانەی وەها لەو ڕاهیبەوە، کە بتوانێت لەبەردەم سیحربازەکەو سیحرەکەیدا خۆی پێ بگرێت.

١٤- سیحربازەکە –هەرکاتێك کوڕەکە دوابکەوتایە- لێی دەدا، لەمەشدا ئاماژەو بەڵگەیەکی دی هەیە لەسەر توندوتیژییو دڵڕەقیی کەسانی جاهیل لە دژی منداڵانو، لەسەر بەکارهێنانی لێدانو ئەشکەنجەدانی جەستەیی بەرامبەریان. هەروەها لەو لێدانەی سیحربازەکە بۆ منداڵەکە، ئاماژەیەکی تر هەیە لەسەر ڕوودانی بەلاو مەینەتیو تاقیکردنەوە بۆ کوڕەکە، کە ئەمەش دووچاری هەرکەسێکی تری ئیماندار بووەو دەبێت کاتێك بە ڕێگای خوادا دەڕوات.

١٥-کوڕە مێردمنداڵەکە سکالای خۆی لەدەست ئەو سزایە بە ڕاهیبەکە گەیاندووە، چونکە ڕاهیبەکە مامۆستاو پەروەردیارو پێگەیەنەریەتی. مرۆڤی بانگەوازکاریش هەمیشە داوای ئامۆژگاری لە پەروەردیارەکەی دەکاتو، داوای

چارەسەرکردنی گرفتەکانیشی لەسەرکردەکەی دەکات. سکاڵای ئەم کوڕەش بە مەبەستی خستنەڕووی بڕوبەهانەو پاشگەزبوونەوە لەو ڕێگایە نەبووە، بەڵکو بە مەبەستی چارەسەری ئەو تەنگژەو گرفتە بووە، کە بۆتە بەربەست لەسەر ڕێگای و تەگەرەش دەخاتە سەر بەردەوامیی و جێگیری یەکەی.

١٦- کاتێك ڕاهیبەکەش گوێی لە سکاڵای کوڕەکە گرتووە، چارەسەرو ڕێو شوێنی بۆ داناوە، چونکە ئەم ڕاهیبە پەروەردیارو سەرکردەیە، بۆیە دەبێت هەموو سەرکردەیەك بەم ڕەنگە لە ئاست گرفتەکانی سەربازاندا ڕەفتار بکەن.

١٧- چارەسەری ڕاهیبەکەش بۆ کێشەی کوڕە مێردمنداڵەکە ئەوەبوو کە ڕێی پێدا درۆ لەگەڵ سیحربازە کافرەکەدا بکاتو، پێی بڵێت: دواکەوتم لەبەر ئەوەی کەسوکارم دوایان خستم، ئەمەش تاکو لە لێدانی سیحربازەکە ڕزگاری ببێت، هەروەها ئەگەر کەسوکاریشی لەهۆی دواکەوتنو درەنگ گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە لێی بپرسن، بڵێت: سیحربازەکەی دوای خستم.. ئەمەش بۆ ئەوەی لە لێدانی ئەوانیش ڕزگاری ببێت.

ئەم درۆکردنەش تەنها بۆ دەربازبوونی بووە لەو مەینەتییانەو بۆ تێپەڕاندنی فیتنەو ئاشووب. هەر لەبەر ئەمەش —لەبەر پێویستیو زەرورەت- ڕاهیبەکە ڕێی پێدا، کە درۆ بکات. ئەمەش بۆ حەڵاڵکردنی درۆ نیە، چونکە لە بنەڕەتدا حەرامەو ڕێی لێگیراوە، بەڵام بۆ کاتی زۆر پێویست ڕێی پێدراوە.

وەك زانراویشە لە ئاییینی ئێمەدا لە سێ حاڵەتدا درۆ ڕێی پێدراوە:

١) لە کاری ئاشتەوایی نێوان دوو کەسی ناکۆکدا.

٢) لە ستایشکردنی پیاو بۆ جوانی ژنەکەی .

٣) لە بەرەو ڕووبوونەوەی کافراندا بە مەبەستی پاراستنی ڕازو نهێنیی موسڵمانان.

دیارە ئەم حاڵەتانە دەقاودەق ناخەینە ڕێزو هاوشێوەی ڕێگەدانی ڕاهیبەکە بە کوڕە نەوجەوانەکە، چونکە ئەو لەسەر هەمان شەرعی ئێمە نەبووە، بەڵکو شەریعەتێکی تایبەت بەخۆی هەبووە، ئیدی بۆچی شەریعەتێکی وەك ئەوەی خۆمانی بەسەردا پیادە بکەین، کە خوا ئەو ئەرکەی نەخستبێتە ئەستۆی‌و، کە پێشتر لە زەمانی ئەودا نەکراوە بە شەرع‌و یاسا.؟

١٨- خوا بەڵگەو نیشانەیەکی تری پیشانی کوڕە نەوجەوانەکە دابوو، ئەویش ئەو گیاندارە گەورەیە بوو، کە خەڵکەکەی بەند کردبوو، ئەوەبوو کوڕەکە نزای لەلای خوا کرد، لەسەر ئەوەی ئەگەر ڕاهیبەکە لەلای خوا خۆشەویسترە وەك لە سیحربازەکە، با بتوانێت ئەو گیاندارە بکوژێت، ئیدی کوڕەکە بەردێکی گرتە گیاندارەکەو -بە فەرمانی خوا- کوشتی‌و، خەڵکیش ڕزگاریان بووو چوونە ڕێی خۆیان.

ئەو وتەیەشی، کە گوتبووی: (ئەمڕۆ دەزانم کە سیحربازەکە، یان ڕاهیبەکە کامیان باشترن)، ئاماژە دەکات بۆ بێئارامی‌و دڵنیانەبوونی لەو دۆخەدا، کە لە یەك کاتدا زانیاریی دژ بەیەکی لە سیحربازەکەو ڕاهیبەکە وەردەگرت، ئاماژەشە بۆ پەرۆشی‌و حەزکردنی لە کۆتایی هێنانی ئەو دووفاقی (ازدواجی)یە تەنگەتاوارەدا، کە زۆر ماندووی کردبووو، تەنگی پێ هەڵچنی بوو.

هەروەها لەو وتەیەدا ئاماژەیەکیش هەیە، کاریگەربوونی کوڕەکە بە ڕاهیبەکەو، هەڵبژاردنی ڕێبازەکەی‌و وەرگرتنی ئایینەکەی، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی گوایە چەند زانیارییەکی تیۆری‌و فیکری‌و ڕۆشنبیری بن، بەڵکو لەبەر ئەوەی چەند ڕاستییەکی واقیعیی ژیانو، چەند بەهاو بیروباوەڕێکی ڕاستەقینە بوون..

ئەم کوڕە دەیتوانی لە یەك وەختدا (ئاین)و (سیحر)ەکەش بەبێ نیگەرانی‌و خۆ شپرزەکردن لە هەردووکیان وەربگرێت‌و، بەبێ تێفکرین‌و گوێپێدان، وتەی ڕاهیبەکەش‌و سیحربازەکەش ببیستێت، چونکە گوێگرتنی ڕواڵەتی‌و بێباکیی

دایدەبڕێ لە سەرسام بوونو بایەخ پێدان، ئیدی (ئاین)و (سیحر)یش، تەنها وەك چەند قسەیەك لەلای دەمانەوە. بەلاّم وادیارە ئەم کوڕە زیرەکە، ئاوا ڕەفتاری نەکردووە، چونکە ئەو دینەی، کە لە ڕاهیبەکەوە وەیدەگرت، شتێکی تری لێ دەخواست، نەك بێباکیو گوێپێنەدان.

١٩- نزای کوڕەکە کە تیایدا گوتبووی: (خوایە ئەگەر کاروباری ئەم ڕاهیبەت لەلا باشترو خۆشەویستترە وەك لە کاروباری سیحربازەکە، ئەو گیاندارە دڕندەیە بکوژە..)، ئەم نزایەشی مانای ئەوە نیە، کە ڕاهیبەکەو سیحربازەکە —لە دیدو بۆچونی ئەم کوڕەدا- وەك یەکنو، دەیەوێت لە یەکێکیان دلّنیا بێت، وەك هەندێك کەس ئاوای لێتێدەگەن. بەلّکو نزاکەی بۆ ئەوەبووە، کە دلّنیابێت لە کاروباری ڕاهیبەکەو ئایینەکەی لەسەر زەمینەی واقیعدا، ئەمەش دوای ئەوەی، کە پێشتر بە یەقینی فیترەتو بیروهۆشو تێڕوانین بەو ڕاستییە گەیشتبوو.

بەلّگەیەکی تر لەسەر قەناعەت هێنانی کوڕەکە بە کاری ڕاهیبەکەو پەسندکردنی ئەوکارەی، ئەوەیە کە نزاکەی بە وشەی (اللّهم/ خوایە) دەست پێ کردووە، نزاکردنەکەی لەلای خوابەو شێوازەی، کە لە ڕاهیبەکەوە فێری بووە، بەلّگەیە لەسەر باوەڕداریێتیو ئیمان هێنانی بە خوا.

٢٠- وجودی ئەو گیاندارە دڕندەیەش، کە ڕێی لە خەلّکی گرتووە، وەك بوارێکی تاقیکردنەوەو هەلّسەنگاندنو، پاشان گەیشتن بە یەقینو دلّنیایی، مژدەی خێرو کارێکی چاك بووە.

چونکە بوونی ئەو گیاندارە دڕندەیەو ڕێگرتنی لە خەلّکی، هاوشێوەی ئەو پادشا ستەمکارەیە، کە خەلّکی بۆ خۆی کۆیلە دەکاتو دەیەوێت لەجیاتی خوا بیپەرستنو، لە ئایینی خواش دووریان دەخاتەوە.

جا کە کوڕەکە ئەم گیاندارە دڕندەیەی بە بەردێك کوشتوە، ئاماژەیە کە ئەم کوڕە خەلّك لەو پادشا ستەمکارە ڕزگار دەکاتو، ڕێی ڕاستی خوایان پیشان

دەدات‌و، بەرەو بەهەشتیان دەبات.

٢١- هەروەها کاتێك ئەم کوڕە گیاندارەکەی کردوەتە سەرەتایەك بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی، ئاماژەیە بۆ دەستپێکردنی بانگەوازی خەڵکی‌و خزمەت کردنیان‌و دەستەبەرکردنی خێرو چاکە بۆیان‌و، لابردنی ئازارو مەترسی لەسەریان. بەم پێیەش لەڕێی ئەو پێشنیازە کردەیی‌و ئەو خزمەتە کۆمەڵایەتی یەوە، خۆی‌و بانگەوازەکەی بە خەڵکی ناساندووە. لەمەشدا ژیانێك بۆ بانگەوازەکەو سەرەتایەکیش بۆ پەسندکردنی بانگەوازەکە لەلایەن خەڵکی یەوە، هەیە.

٢٢- کاتێك کوڕە نەوجەوانەکە، گیاندارە دڕندەکەی کوشتووە، گەڕاوەتەوە بۆ لای ڕاهیبەکەو هەواڵەکەی پێ گەیاندووە، ئەویش زۆر دڵشاد بووەو، پێشی گوتووە: (کوڕم، ئەمڕۆ تۆ لەمن چاکتریت).

ئەم وتەی (کوڕەکەم) بە کوڕەکە ڕادەگەیەنێت. کە لەخۆی چاکترە، کە ئەمەش وتەی خۆشویستن‌و سۆز پێدانە، بەڵگەیەکە لەسەر پەیوەندییەکی تۆکمەی ڕۆحی لە نێوانیانداو، بەڵگەشە لەسەر ڕەزامەندیی ڕاهیبەکە لە دەروونەوە لەوکاتەی ئەمەی پێ ڕادەگەیەنێت.

٢٣- ڕاهیبەکە کاتێك کوڕەکەی لەخۆی بەچاکتر داناوەو هەواڵی ئەمەشی پێ ڕاگەیاندووە، دەلالەت دەکاتە سەر لێبڕان‌و دڵسۆزیی بۆ خواو، زوهدو خۆنەویستی لە دنیاداو، خۆ پەنادانیشی لە هەرشتێك، کە نەفس خوازیاریەتی.

٢٤- چاکتربوونی کوڕە نەوجەوانەکە لە ڕاهیبەکە، لە کاتێکدا قوتابی ئەوەو، لەکاتێکدا ڕاهیبەکە چەندان ساڵ لەبواری باوەڕهێنان‌و دینداریدا لەپێش ئەویشەوەیەو، چەندین ساڵی دوورودرێژی لە ڕێگای خوادا بڕیوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چاکی‌و پایەداریی لە بانگەوازدا بە پێودانگی ئەو تەمەنە نیە، کە موسڵمان تێیدا دەژی، بەڵکو بەڕادەی ئیمانداری‌و خۆپاریزی‌و دڵسۆزی‌و خۆ ساغ کردنەوەو یەکلابوونەوەیە.

٢٥- ڕاهیبەکە ئەو هەواڵەش بە کوڕە نەوجەوانەکە دەدات کە لەمەودوا تووشی بەڵاو نارەحەتیو تاقیکردنەوە دەبێت، لەمەشدا ئەوە بە کوڕەکە -و بە ئێمەش- دەناسێنێت کە ڕێگای بانگەوازکاریی یەو، مەشخەڵو سیماو تایبەتمەندیی یەکانیەتیو، تێیدا ڕاستییەکی یەکلاکراوەو، سوننەتێکی ڕاستەوانەی هەمیشەییشمان پیشان دەدات کە بێگومان بەڵاو نارەحەتی -وەکو تاقیکردنەوەیەك لەسەر ڕێگاکە- سوننەتو ڕێسای بانگەوازەکانەو، بانگەوازکارانیش هەر دەبێت تووشی ئەو ڕووداوو کارەساتانە بن کە خوا بە خواستو قەدەری خۆی بۆی داناون.

جا کاتێك ڕاهیبەکە ئەم هەواڵە بە کوڕە نەوجەوانە ئیماندارەکە لە سەرەتای قۆناغە ئاشکراکەی بانگەوازەوە) ڕادەگەیەنێت، بۆ ئەوەیە تاکو خۆی ڕابهێنێت لەسەر ئەو ڕووداوانەی، کە بەرەو ڕوویان دەبێتەوەو، خۆیان بۆ ئامادەو ساز کاتو، توێشەبەرەکەشی بە توێشووی -ئارام گرتنو خۆپاریزیو خۆڕاگریی- پڕ بکات.

ئەوەی لەسەر شانی سەرکردەو پەروەردیارو بانگەوازکارانیشە، ئەوەیە دەبێت ڕێگای بانگەوازو مەشخەڵو سیماکانی ئەم ڕێگایە بە شوێن کەوتوانیان بناسێننو، ئەو کارەشیان بۆ ڕوون بکەنەوە کە بەدیی دێننو، ئەو سەرەنجامەشیان بۆ مەزەندەکەن کە لە بواری ڕاپەڕاندنی کاروباری بانگەوازەکەدا چاوەڕێیان دەکات، تاکو شوێنکەوتانیان لەسەر چاوڕۆشنیو بەرچاوڕوونی هەنگاو بنێنو، خۆیان ڕێك خەن بۆ بەرەوڕووبوونەوەی مەترسییەکان.

٢٦- ڕاهیبەکە داوای لە کوڕە نەوجەوانەکە کردووە کە کاری ئەو ئاشکرا نەکاتو ڕاستیی لەسەر نەڵێتو ئاماژەی بۆ نەکات. لەمەشدا بەکارهێنانی ڕێسای (نهێنگیریی) لە پەیکەری (ڕێکخستنی بانگەوازکاریی) پێویست بووە. نهێنگیریی ڕێکخراوەیی، بانگەوازیش لەڕووی کاروباری ڕێکخستنو

سەرکردایەتیدا، مەسەلەیەکی گرنگو جێی بایەخ بۆ بانگەوازکردن لە هەر سەردەمو وڵاتو ناوچەیەکدا بێت.

ئەم دیاردەی نهێنگیرییەش لە ژیانی زۆربەی زاناو بانگەوازکارە پێشینەکاندا رەنگی داوەتەوە، وەك لە هەندێك دیمەنو لایەنی چیرۆکەکانیان لە قورئاندا ئاماژەی بۆکراوە. دیارترینی ئەم نهێنگیرییەش لە چیرۆکی موسادایە-سلاوی لێ بێت- کە لە سوورەتی (قصص)دایە، هەروەها لە سوورەتی (غافر)یش دایە، کە پیاوێکی باوەڕدار-کە باوەڕەکەی شاردبۆوە- لەبەردەم فیرعەوندا بەرگریی لە (موسا) دەکرد[1]. لە ژیاننامەی پێغەمبەریش ﷺدا بە تایبەتیش لە قۆناغی بانگەوازی نێو (مەککە)یاندا (شێوازی نهێنگیریی) شێوازێکی بەدیی کراوو ئامانجدارو خوازراو بووەو لە زۆربەی ژیانی هاوەڵانو هەڵسوکەوتو کاروبارياندا پەیڕەو کراوە. دیارترین نموونەش لەم بارەیەوە چیرۆکی موسڵمان بوونی (ابو ذری غفاري)یە-خوا لێی ڕازی بێت-، هەروەها کۆچی پێغەمبەری خواش ﷺ بۆ مەدینە.

٢٧- دوای ئەوەی مێردمنداڵەکە ناسراوەو، مەسەلەکەی لەنێو خەڵکیدا بڵاوبۆتەوە، دەستی کردووە بە بانگەواز لەنێویاندا، ئەمەش گواستنەوەی قۆناغەکەیە لە نهێنگیرییەوە بۆ ئاشکراکردنی بانگەوازو گەیاندنی پەیام.

٢٨-کوڕە مێردمنداڵەکە بوارێکی چاكو مەیدانێکی کاریگەریی بۆ خۆناساندنی بە خەڵکیو، بۆ ناساندنی بانگەوازو ئاینەکەشی پێیان، هەڵبژارد، ئەویش بواری خزمەتکردنیانو گەیاندنی خێرو چاکە بوو پێیانو، لابردنی ئازارو مەترسیش لەسەریان. ئەوەبوو مرۆڤی کوێرو گەڕو بەڵەکی چاك دەکردەوەو، هەموو جۆرە نەخۆشیەکی چاك دەکردەوە.

---

١) لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا (چیرۆکی پێشینەکان لە قورئاندا) بەدرێژیی باسی ئەو شێوازی نهێنگیری یەمان لە هەردوو چیرۆکەکەدا کردووە.

ئەم کوڕە لەو مەیدانەدا لێهاتوو بووو، لەو بوارەشدا سەرکەوتوو بوو، چونکە بەو هۆیەوە ئیدی خەڵکییش خۆشیان دەویت‌و، ئەو دینەشیان هەر خۆش دەویت، کە پێیان دەگەیەنێت، ئەو خوای پەروەردگارەیشیان خۆش دەویت، کە چاکیان دەکاتەوەو شیفایان دەدات.

پێویستە بانگەوازکارانی تریش، ئەم دەرسە لە شێوازی بانگەوازکاریی کوڕە مێردمنداڵەکە فێرببن.

٢٩- ئەم کوڕە کاتێك چارەسەری دەردو نەخۆشیەکانی خەڵکیی کردووەو،کوێرو گەڕو بەڵەکی بە فەرمانی خوا چاك کردۆتەوە، بەبێ‌ئەوەی فێری یاساکانی چارەسەرو بنەما پزیشکییەکان بوبێت، بە ڕێزو کەرامەتێك دادەنرێت، کە لە خوای پاك‌و بێ‌خەوشەوە پێی بەخشراوە، ئەمەش لەو ڕێزو کەرامەتانەی ئەولیاو دۆستانی خوایە، کە خوا بەهۆیەوە ڕێزیان لێ‌دەنێت.

بێگومان شیفاو چاککردنەوە-بە ڕێگەدان‌و بە خواستی خوا-یە، بەڵام هەڵس‌و کەوتی کوڕە مێردمنداڵەکە، تەنها هۆکارێکی ماددیانەی ڕواڵەتیی مرۆیی بووە بۆ بەدیی هێنانی تواناو قەدەری خوای گەورە.

٣٠- ئەو ڕووداوەش، کە لەنێوان کوڕەکەو هاونشینی پادشادا بووە، کە کوێر بووەو هاتووە بۆ لای، تا چارەسەری بکات، بە وانەیەك بۆ بانگەوازکاران دادەنرێت لە کاری پەیوەندیی بەستنیان لەگەڵ خەڵکیدا. ئەوەبوو هاونشینەکەی دیوەخانی پادشا، چەندین دیاریی زۆرو هەمەچەشنەی بۆ کوڕەکە هێناو پێی گوت: ئەمانە هەموو بۆ تۆ، گەر بتوانیت چاکم بکەیتەوە. بەڵام کوڕە مێردمنداڵەکە، تەنها خۆی بۆ خوا یەکلاکردبۆوەو تەنها خۆی بۆ کاری بانگەواز تەرخان کردبووو، ئەو هەموو دیارییە زۆرو هەمەڕەنگانەی هاونشینەکەی پادشای ڕەت کردەوە.

کەواتە پێویستە مرۆڤی بانگەوازکار خۆی بۆ ئایینەکەی‌و پەروەردگاری‌و بانگەوازەکەی یەکلا بکاتەوەو، داوای هیچ شتێك لە خەڵکی نەکات‌و، هیچ شتێکیشیان لێ وەرنەگرێت، هەروەها نابێت لەسەر ئەو بانگەوازەی، هیچ کرێیەکیان لێ داوا بکات‌و، ئەرکی هیچ ماڵ‌و سامان‌و کەرەسەیەکیشیان نەخاتە سەر ئەگەر ئەوان شتێکیان پێشکەش دەکرد، بەڵکو دەبێت گەر شتێکیشیان پێ‌دابوو هەوڵی ڕەتکردنەوەی بدات‌و بیانداتەوە. تاکو پەیوەندیی‌و ئاشنایەتیی لەگەڵیاندا پاك‌و بێگەرد بێت‌و هەروا بمێنێتەوەو هیچ گەردێکی ماددیی‌و دنیایی تێ‌نەکەوێت. چونکە هەر ئەوە چاکترە بۆ بەدەست هێنانی سۆزو خۆشەویستیی خەڵکی‌و، پەسندکردنی بانگەوازەکە. چونکە نەویستنی ئەو ماددەو کەرەستانەی، کە لە دەستی خەڵکی دان، هۆیەکە بۆ ئەوەی کە خەڵکی مرۆڤی زاهیدو دنیانەویستیان خۆش بوێت.

٣١- وەڵامی کوڕە مێردمنداڵەکەش، کە بە هاونشینە خاوەن دیاری یەکەی پادشای گوتووە: (من خۆم کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو ئەوە خوایە کە شیفا دەدات‌و خەڵکی چاك دەکاتەوە).

لەم وتە وەڵامدارەیدا خوا بە هاونشینەکە دەناسێنێت‌و عەقیدەو ئیمانداریێتیی بە شێوەیەکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرا بۆ دیاریی دەکات. هەروەها دەست دەکات بە بانگکردنی –بەشێوازێکی بنچینەیی‌و هەرەگرنگ- کە شێوازی خستنەڕووی عەقیدەو ئیمانداریێتییە.

٣٢- کوڕە مێردمنداڵەکە داوای لە هاونشینە ڕاوێژکارەکەی پادشا کردووە، کە ئەگەر بە تەمای چاك بوونەوەیە با ئیمان بە خوا بێنێت، وەك پێی گوتووە: (ئەگەر باوەڕ بەخوا بێنیت ئەوا لەلای خوا نزات بۆ دەکەم‌و، خواش چاکت دەکاتەوەو چاوەکانت بۆ دەگێڕێتەوە)..

کوڕەکە لێرەدا –ئاتاجی هاونشینەکە بەچاك بوونەوە- دەقۆزێتەوە تاکو باسی ئیمانداریێتیی بۆ بکات، یان ڕاستتر بلێین هەوڵ دەدات نزیکی کاتەوە لە خواو پێویستییەکەی بەخواو ئاڕاستەکردنی دڵو فیترەتیشی بۆ لای خوا، دەقۆزێتەوە. چونکە مرۆڤ لە حاڵەتی پەنا بۆخوا بردنو ئاتاجیدا، زیاتر لە خواوە نزیك دەبێتەوە.

٣٣- هاونشینەکەی پادشا بەدەم بانگەوازی کوڕەکەوە چووەو، باوەڕی بەخوا هێناوەو، خواش بە نزای کوڕەکە چاکی کردۆتەوەو چاوەکانی بۆ گەڕاندۆتەوە.

ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی، کە بێگومان باوەڕو ئیمان لە قولایی دڵەکانی خەڵکیدا مەلاس دراوەو، سروشتو فیترەتیشیان هەمیشە ڕووی لە خوایە. بەڵام بێباوەڕیی کەسانێكو سەرپێچیو گوناهەکانیان ئەو فیترەتە پاکەی بۆ داپۆشیونو بەری دڵی گرتوون. جا کاتێك کەسێکیان چاوی دەکەوێت بە بانگەوازکارێکی کارامەو کاریگەری وا کە شێوازێکی ڕاستو دروستو بەجێی هەبێت، دڵی بێدار دەبێتەوەو فیترەتیشی دەکەوێتەوە گەڕو ڕوو دەکاتەوە خوا.

بێگومان جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان هەڵوێستی ڕاهیبەکە لە بەرامبەر کوڕە مێردمنداڵەکەو هەڵوێستی کوڕەکە لە بەرامبەر هاونشینی پادشاکەدا.. چونکە ئێمە زانیمان، کە ڕاهیبەکە خوازیاریی نهێنگیریی بووەو، بۆ ئەم خواستەش کوڕە مێردمنداڵەکەی بەوە ڕاسپاردووە، کە لەکاتی تەنگانەو نارەحەتیو تووشبونی ئازارو ئەشکەنجەیدا ناوی ئەو نەباتو کاروباری دەرنەخات. بەڵام کوڕەکە ئەم داواو ڕاسپاردەیەی لە هاونشینی پادشاکە نەخواستووەو پێی نەگوتووە: لەکاتی تەنگانەدا باسی من نەکەیتو پەردەم لەسەر هەڵنەدەیتەوە.

**جا ئایا جیاوازیی نێوان ئەم دوو هەڵوێستە چی بێت؟**

جیاوازییەکە لەو قۆناغەدایە، کە بانگەوازەکە پێی گەیشتووە. لەکاتێکدا ڕاهیبەکە ئەو ڕاسپاردەیەی بە کوڕە مێردمنداڵەکە داوە، کە ناوی نەهێنێت، لەو کاتەدا بانگەواز نهێن بووەو، لەبەر ئەمەش ڕاهیبەکە سوور بووە لەسەر دەرنەخستنی بانگەوازو کاروباری خۆی.

بەڵام لەکاتێکدا کوڕە مێردمنداڵەکە چارەسەری چاوی هاونشینەکەی پادشا دەکات، لەو کاتەدا بانگەوازەکە ئاشکرا بووە، چونکە کوڕەکە بانگەوازەکەی بۆ قۆناغ کاری ئاشکراو جمو جووڵی ئاشکرا گواستۆتەوە.

ئەوەبوو تیماری خەڵکیی لە هەموو دەردێك دەکرد، هەموو خەڵکی هەر هەمووی.

ئیدی لەنێو خەڵکیدا ناسراو، هیچ ئاتاجێکیشی تێدا نەمابوو کە بەکابرای هاونشینی پادشا بڵێت کە ئاشکرای نەکات.

لە قۆناغی یەکەمدا، کە نهێنی بووە، تەنها پەیوەندییەکی تایبەتیی نێوان دوو تاکە کەس، کوڕە مێردمنداڵەکەو ڕاهیبەکە بووە. بەڵام لە قۆناغی دووەمدا پەیوەندییەکە گشتیو ئاشکرا بووە لەنێوان کوڕەکەو هەموو خەڵکیدا، ئەمەش لە ڕێی پەیوەندییکردنی پێیانەوەو چارەسەریيو تیماریی بۆیان.

لەلایەکی ترەوە ڕاهیبەکە لە قۆناغی یەکەمدا خوازیاری کاری نهێنی بووەو، نەچۆتە نێو بواری کاری ئاشکراوە، بەڵام کوڕە نەوجەوانەکە بە ئاشکرا جموجووڵی کردووەو، بەم جموجووڵەش کاری لە خەڵکی کردووەو، دڵی ئەوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوەو پشتگیریی ئەوانیشی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە.

جموجووڵ لە قۆناغی یەکەمدا لە بوارێکی هێجگار تەسكو سنووردارو کەم دابووەو، وەك دەردەکەوێت تەنها لەوەدا بەند بووە، کە کوڕە نەوجەوانەکە بە ڕاهیبەکە گەیشتووەو، یەکترییان ناسیوەو بانگەوازی لێ وەرگرتووە. بەڵام ئەم جموجووڵە، لە قۆناغی دووەمدا ئاشکراو گشتیو جەماوەرییانە بووە.

لەبەر ئەم جیاوازییانەی نێوان هەردوو قۆناغەکە، وا گونجاوە کە ڕاهیبەکە ئەو کوڕە بەوە ڕاسپێرێت کە لەکاتی تەنگانەو کەوتنە بەر سزاو ئازاردا ڕاستی لەسەر ئەو نەڵێتو ئاشکرای نەکات. ئەمە لەکاتێکدا کوڕە مێردمنداڵەکە ئەم ڕاسپاردەیەی بە هاونشینەکەی پادشا نەداوەو، بەڵکو وەك ئەوە وایە کە ڕاسپاردەی پێچەوانەی ئەوەی پێدابێتو داواشی لێ کردبێت کە لەلای خەڵکی ناوی بێنێتو ئاشکرای بکات.

٣٤- هاونشینەکەی دیوەخانی پادشا، چۆتەوە بۆ لای پادشاو چاوی بۆ گەڕاوەتەوە. بەڵکو بەوپەڕی عیززەتو بوێریو سەربەرزیو ئازایەتی یەوە بۆ لای پادشا گەڕاوەتەوە، تەنانەت لە هەموو ئەوانەش گرنگ تر بە ئیمانەوە بۆ لای گەڕاوەتەوەو، وەکو جارانی پێشوو لەلای دانیشتووە.

پادشاش سەری سوڕماوە کاتێك دیویەتی کە چاوانی بۆ گەڕاوەتەوە، بۆیە لێی پرسیوە: (ئەری کێ چاوەکانی بۆ گەڕاندیتەوە)؟ ئەویش گوتوویەتی: (خوای پەروەردگارم). پادشا لێی پرسیوە: (ئایا جگە لەمن پەروەردگاری ترت هەیە)؟ هاونشینەکەشی کە چاوی چاك بۆتەوەو باوەڕیی بەخوا هێناوە، لە وەڵامدا پێی گوتووە: (پەروەردگاری منو پەروەردگاری تۆش —اللە-یە).

بێگومان ئەم پیاوە لە ئەرکی هاونشینیەتی یەوە بۆ پادشا —کە هاوڕازو نهێنگرو عابیدیو ملکەچی بەردەستی بووە- گۆڕاوە بۆ باوەڕدارێك بەخواو بانگەوازکارێك بۆ ڕێی خوا.

بۆ گەیاندنی بانگەوازەکەشی دڵڕەقترینو ستەمکارترین پیاوی هەڵبژاردووە، ئەویش ئەو پادشایەیەتی کە ئیددیعای پەروەردگارێتی بۆ خۆی دەکاتو داوا لە خەڵکی دەکات لەجیاتی خوا بیپەرستن. هاونشینەکەشی ئەمی هەڵبژاردووە بۆ بانگ کردنی بۆ ڕێی خواو گەیاندنی ڕێی ڕاستی خوا پێیو، ئاشکراکردنی ئەم بانگەوازە لەلای.

بۆ یەکەم جاریش وتەیەکی زۆر سەرسوڕهێن دەدات بە گوێیدا، کـە لەناخـەوە بە توندیی دەیلەرزێنێت، پێی دەڵێت: (پەروەردگـاری منو پەروەردگاری تۆش، -الله-یە).

لەم دەستەواژەیەی هاونشینە چاو ڕۆشـنە باوەڕدارەکـەدا بـوێریو ئازایـەتیو ڕاشکاویو سەربەرزیو سـووربوون لەسـەر وتـەی ڕوونو بانگـەوازو گەیانـدن، بەدیی دەکرێت.

٣٦- هاونشینە چاو ڕۆشنەکەی پادشا، وەك هەر بانگەوازکارێکی تری ڕێی خـوا، تووشی بەڵاو نارەحەتی لـە دوژمنانیـەوە بـووە، ئـەوەبوو پادشـاکە سـزایەکی ترسناكو تۆقێنەریداو، بەڵام لەسەر دینەکەی خۆی جێگیرو دامەزراو بوو.

بەڕاستی هەڵوێستی ئەم هاونشینە ئیماندارەی پادشا، هاوشـێوەی هەڵوێـستی ئەو سیحربازانەی فیرعەونە، کە پێـشتر بەکرێگیـراوی فیرعـەونو کاسەلێـسی بوونو، دواتر -لەڕێی موساوە- ئیمانیان بەخوای پەروەردگاری جیهانییان هێناو، دڵیان پڕ بوو لە ئیمانو، بوونە چەند بانگخوازێکی گەیەنەرو، بەوپەڕی ئارامیو خۆڕاگرییو دڵنیایییەوە، ڕووبەڕووی سزاو ئەشکەنجەی فیرعەون بوونەوە.

٣٧- دوای ئەوەی پادشا بە کاروباری بنچینەیی کوڕە نەوجەوانەکەی زانیوە، پـێی گوتووە: (کوڕەکەم...)، بەم دەستەواژەیە دەیدوێنێت، کـە ڕواڵەتەکـەی سـۆزو خۆشەویـستیو بـەزەیی یـە، بـەڵام لەڕاسـتیدا هـەمووی فـڕوفێڵو پـیلانو چاوبەستەکییە، وەك ئەوە وایە، کە لە ڕێی فریودانو هەڵنانییـەوە ئامـاژە بـۆ تایبەتمەندییەکانی لێك نزیکیی بکاتو، ملکەچـی کـات بـۆ خـۆیو، بـەڵێنی ئایندەیەکی گەشو ژیانێکی پڕ لە خۆشیو ڕابواردنی بۆ چاوەڕێ بکات.

بەڕاستی جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو وشەی پـڕ نـازی باوکایـەتیو ناسکیو میهرەبانییەی، کە پێشتر ڕاهیبەکە بە کـوڕە نەوجەوانەکـەی گوتبـوو (کوڕم)، هەروەها لەنێوان ئەو وشە پـڕ لـە فـڕوفێڵو پیلانگێڕانەیـەی، کـە لـە دەمی پادشاکەشەوە دەرچووەو پێی گوتووە (کوڕم)..

ڕاسته، که پیتەکانی ئەم وشەیه له هەردوو حاڵەتەکەدا هەر هەمان پیتن‌و وشەکەش هەر ئەو وشەیەیه. بەڵام جیاوازیی له ئامانجی بگۆو دەربڕەکەی دایەو لەو حاڵەتەش دایه، که تیایدا دەیدرکێنێت.

٣٨- گەندەڵیی پادشاو فرۆفێڵی مەکربازانەی لەو وتەیەیدا ڕەنگ دەداتەوە که بە کوڕه مێردمنداڵەکه دەڵێت: (بەڕاستی سیحربازیی تۆ گەیشتۆته ڕادەیەك که دەتوانیت کوێرو بەڵەك چاك بکەیتەوەو ئەوه بکەیت‌و ئەوه بکەیت...).

پادشا بەم شێوەیه هەوڵ دەدات کارامەیی کوڕەکەو سەرکەوتنی لەو کارانەدا بداته پاڵ خۆی‌و، کاروبارەکانیشی بەو سیحرو جادوگەرییه لێك بداتەوە که لە سیحربازەکەی پادشاوە وەریگرتووه. ئەمەش شێواندنی ڕاستییەکانەو هەڵگێڕانەوەی مەسەلەکانه له خەڵکی‌و، لێکدانەوەی حەقه بە ناحەق، تاکو ڕاستی له خەڵکی بشارێتەوە.

٣٩- کوڕه نەوجەوانەکه له ڕووبەڕووبوونەوەی پادشادا کاراو لێهاتوو دەبێت‌و، بەربەستی فریودانەکەی تێدەپەڕێنێت‌و، بەیارمەتی‌و کۆمەکی خوا بەسەریا باڵادەست دەبێت.

به باوەڕی پتەوو جورئەت‌و سەربەرزی‌و خۆڕاگرییەوە لەبەردەم پادشادا دەوەستێت‌و پێی دەڵێت: (من هیچ کەسێك چاك ناکەمەوە، بەڵکو خوا چاکیان دەکاتەوە).

بێگومان هیچ کەسێك توانای ڕوبەڕووبوونەوەی زۆرداره خۆ بەزل زان‌و ملهوڕەکانی نیه تەنها کەڵەپیاوان‌و شێرەکوڕانی بانگەوازکاری خاوەن باوەڕی پۆڵایین نەبێت.

٤٠- پاشان کوڕه نەوجەوانەکه بە قۆناغێکی تری ترسناکدا تێدەپەڕێت، ئەوەیه پادشا دەیگرێت‌و سزای دەدات، بەردەوام سزاو ئازاری دەدات، کوڕەکەش زیاتر لەسەر دینەکەی جێگیر دەبێت، بەڵام ناتوانێت لەسەر ئەوه خۆی ڕاگرێت که

ڕازو نهێنیی مامۆستاکەی دەرنەخات، بۆیە بە ناچاریو دوای فشارێکی زۆر ڕازو نهێنیی ئەویش دەردەخاتو ئاشکرای دەکات.

کوڕە بانگەوازکارەکە لەمەدا گازاندەی لێناکرێتو، بە گوناهباریش دانانرێت، بەڵام ئەوانە نهێنیی ڕێکخستننو، لەوانەیە لەبەردەم چەوساندنەوەی دڕندانەو ئەشکەنجەی تۆقێنەردا بەنهێنی نەمێنێتەوە.

زۆر جاری وا هەبوە کە لە مەیدانەکانی ئەشکەنجەدانو کونجی زینـدانو ژوورە تاکەکەسییەکانداو بە چەندین هۆو ئامڕازی ئازاردانی هەمەچەشن، چەندین بانگەوازکاری ڕاستگۆو وابەستەی حەقیان ناچار کردووە، کە نهێنییەکانی ڕێکخستن بدرکێنێت. دیارە ئەوانە بە زۆرو ناچاریو، هەندێك جار لە حاڵەتی بێهۆشیو (لا ارادی)دا ڕازەکانیان ئاشکرا کردووە.

بێگومان ستەمکاران هێندە ئامرازی تازەی ئەشکەنجەدانی تۆقێنەرانە دادەهێنن، کەوا لە بانگەوازکاری سزادراو دەکەن هۆشو عەقڵو ئیدراكو خواستی خۆی لەدەست بداتو، ڕازو نهێنییەکانیشی لە خانەی بێهۆشی (لاوعی)و بێهەستی (لاشعوری)یەوە لەدەست دەرچێتو، تەنها زمانی کار بکاتو، ئیدی وای لێبێت لەخۆیەوەو لە ئەنجامی وڕێنەپێکردنەوەو لەکاتێکدا دەرزیی بێهۆشکردن یان خەو لێخستنی لێدراوە، هەموو شتێك بدرکێنێت.

ئەم مەسەلەیەش وا لە بانگەوازکاران دەکات، کە پێویستە کەمتر بەلای ڕازو نهێنییەکانی ڕێکخستن دا بچنو، هێندەش بەدوای ئەو مەسەلەو ڕازو نهێنییە ڕێکخراوەیی یانەی بانگەوازدا نەچن کە پەیوەندی ئەوتۆیان بەوانەوە نی یە. هەروەها ئەوەندەش لە هەواڵو زانیاریی برایانی تریان لەنێو ڕێکخستندا نەکۆڵنەوە، جا ئەگەر زیندانی کرانو ئەشکەنجەدرانو کەوتنە حاڵەتی قسەی سەیرو سەمەرەو (هەلەقو مەلەق)کردن، ستەمکاران هیچ زانیاریو هەواڵێکیان لە عەقڵی شاراوەی ئەوانە دەست ناکەوێت.

پێویستە سەرکردایەتیی بەرپرسیار لە کاری ڕێکخراوەییش، بۆ ئەو بارودۆخ‌و حاڵەتە بڕوانێت کە بانگەوازکار تیایدا هەرچی لای بووە درکاندویەتی‌و هەندێك نهێنیی بانگەوازیی ڕێکخستنەکەی بۆ ستەمکاران ئاشکرا کردوە، بۆیە نابێت هەموان بەیەك شێوە هەڵسەنگێنێت‌و، یەك مامەڵەی سەرزەنشت یان چاوپۆشین یان پاکانە بۆکردنیان لەگەڵدا بکات. بەڵکو بەپێی حاڵەتی ئەو ڕۆژگارەو، باری دەروونیی بانگەوازکارەکە لەبەردەم ستەمکارەکان داو، شێوازو چۆنیەتی درکاندنی ئەوەی لە دڵیدا بووەو، بەپێی ڕادەی ئەو زانیاری‌و هەواڵانەی پێی گەیاندوون، حوکمی ئیدانەو سزادان، یان چاوپۆشی‌و لێبوردنیان بۆ دەربکات.

٤١- پادشاکە سزای هاونشینەکەی خۆی‌و، ڕاهیبەکەشی داوەو، سووربووە لەسەر هەڵگێڕانەوەشیان لە دینەکەیان. چونکە لە دین هەڵگێڕانەوەیان، وەك لەناوبردنی بانگەوازەکەیە. بەڵام کوشتنی ئەو دوانە، ژیان بەخشینە بە بانگەوازەکە. لەبەر ئەمە ئەو پێشنیازی (پاشگەزبوونەوە لە دین)ی خستە بەردەمیان، کاتێك ئەوان نکوڵییان کردو پاشگەزنەبوونەوە، ئیدی پاشاش هەردووکیانی کوشت بە لەتکردنیان بە مشار.

کوشتنیان بە مشار بەڵگەیە لەسەر بوونی ڕقێکی زۆر لە دڵی پادشادا لەدژی بانگەوازەکەو ئاینەکە، هەروەك بەڵگەشە لەسەر جەنگی تۆڵەستاندنی پڕ لە کینە، کە دوژمنان لە دڵی بانگەوازکاران بەرپای دەکەن، بەڵگەشە لەسەر بەکارهێنانی چەندین ئامڕازی دڕندانەی نامرۆیی‌و ناماقووڵ لەو جەنگەیاندا.

هەروەك لە پەنابردنی پادشاکە بۆ شێوازی کوشتن بەڵگەیەکی دی هەیە لەسەر ئەوەی، کە بێگومان کافران تەنها ئەو شێوازە دەزانن لە ڕووبەڕووبوونەوەی حەق‌و شوێنکەوتوانی حەقداو، هەر بۆیەش ئەوان شێوازی گفتوگۆو ئاخاوتن‌و قەناعەت پێ‌هێنان‌و بیروڕا گۆڕینەوەو (مناظرة) ڕەت دەکەنەوە.

جێگیربوونی هاونشینەکەو ڕاهیبەکەش لەسەر ئاینەکەیان‌و، هەڵبژاردنی (شەهیدبوون) لەجیاتی (هەڵگەڕانەوە لەدین)، بەڵگەیە لەسەر ڕەگ داکوتانی

باوەڕ لە دەروونیانداو، لەسەر خۆڕاگرییانو سەربەرزییانو خواستنی ڕەحمەتی خواو ڕەزامەندیی خوا بۆ خۆیان.

٤٢- پادشاکە، ئەو کوڕە نەوجەوانەی بە سەرکردەی عەمەلیو کاری بانگەوازەکە دادەنا، هەر بۆیەش سوور بوو لەسەر هەڵگەڕاندنەوەیو، لەخشتە بردنیو، نەکوشتنی. چونکە گەر کوڕەکە واز لە دینەکەی بێنێت، ئەوا دەبێتە هۆی لەناوبردنی بانگەوازەکەی.

پاشان بێگومان کوشتنی ئەو کوڕە، هەراوهوریاو فیتنەیەکی گەورەی لەنێو خەڵکیدا دەنایەوە، لەبەر ئەوەی کوڕەکە لەنێو ئەواندا ناسرابووو بەناوبانگ بوو لە ناوچەکەداو، لەلاشیان خۆشەویست بوو بەهۆی ئەوەی خزمەتی دەکردن.

٤٣- سووربوونی پادشاکە لەسەر نەکوشتنی مێردمنداڵەکە لەوەدا دەردەکەوێت کە لەبەرئەوەی پێشتر لەناوبردنی دووکەسی وەك ڕاهیبو هاونشینەکەی پیشان داوە، تاکو ئەم کوڕەش لاواز ببێت، یان بترسێتو پاشگەز ببێتەوە، پاشان لەگەڵ کۆمەڵێك لە سەربازانی خۆیدا ناردویێتیی بۆ سەر شاخێك، تا لەوێوە بەریدەنەوە، یان لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا بۆ نێو دەریای ناردوە، تاکو بیخنکێننو سەرنگوومی کەن. خۆ پادشاکە لەجیاتی ئەم دوو جۆرە کوشتنە، دەیشیتوانی لەشی کوڕەکە بەمشار وەك دوو هاوڕێکەی پێشووی، لەت لەت کاتو ببڕێتەوە.

٤٤- وادیارە پادشا لە گرتنەبەری ئەو ئامڕازەی تردا، بۆ کوشتنی کوڕە مێردمنداڵەکە، مەبەستێکی تری هەبووە، بەوەش ویستویەتی دەرفەتێکی بیرکردنەوەی بۆ بڕەخسێنێتن، تا لەو دەرفەتەدا تووشی دوودڵیو ڕاڕایی ببێتو، پاشان واز لەو دینە بێنێت، کە لەسەریەتی.

ئەمەش هەمووی لەو ماوە دوورو درێژەی ڕێگادا، واتە چ لە ڕێگایدا بۆ سەر چیاکە، یان بۆ دەریاکە.

٤٥- کوڕەکە باوەڕی بە خوای پەروەردگاری هێنابووو، متمانەی پێی هەبووو،

پشتی پێبەستبووو کاروباری خۆیشی پێ سپاردبووو هەر تەنها لە خواش داوای ڕزگاربوونو دەربازبوونی دەکرد، وەك لە دووعای کاتی سەرچیاکەدا ڕووی کردە خواو، لەکاتی نێوەڕاستی دەریاکەشدا هەمان دووعای لای خوا کردو گوتی: (خوایە بمپارێزە لەمانە بەو ئامرازەی، کە خواستی خۆتی لەسەرە.)

بێگومان لەو دوو حاڵەتەی سەر چیاکەو ناو دەریاکەشدا کوڕە نەوجەوانەکە لە کاری ڕزگارکردنی خۆیدا دەستەوستان بوەو هیچ شتێك لە هۆکارە ماددییەکانی بۆ ڕزگاربوون بەدەستەوە نەبوو، کارەکەشی تەنها بەخوا سپاردبوو، کە بیپارێزێت لە شەڕو خراپەی ئەو بەدکارانە بە هەر ئامرازێك، کە خوا خۆی خواستی لەسەریەتیو، بە هەر شێوازێکیش کە ویستو ئیرادەی خوای پاكو باڵادەستی تێدایە.

٤٦- لە بەتەنگەوەهاتنی خوادا بۆ نزاو پاڕانەوەکەی ئەم کوڕەو بۆ ڕزگارکردنی بە تەنها لەنێو ئەو سەربازانەی دارودەستەی پادشادا لەسەر چیاکە کاتێك چیاکەیان لەژێر پێدا دەلەرزێتو هەمویان دەکەونە خوارەوەو دەمرن، یان کاتێك لە ناوەڕاستی دەریاکەدا کەشتییەکەیان لاردەبێتەوەو هەموویان سەرنگووم دەبن تەنها کوڕەکە نەبێت، لەم دوو حاڵەتە سەختەدا یارمەتیو بە هاناوە هاتنی خوا بۆ کوڕەکەو بەرگریی لێکردنیو، تەرخانکردنی هۆکاری پشتگیریی خوا بۆ ئەو ڕەنگ دەداتەوە. هەروەها لەم حاڵەتانەدا ئەو ڕێزو کەرامەتەش ڕەنگ دەداتەوە، کە خوا بەو کوڕە بانگەوازکارو پشتیوانەی دینی خوای بەخشیوەو، ئەمەش چووەتە سەر ڕێزو کەراماتی پێشووی.

٤٧- ئاخۆ کوڕە مێردمنداڵەکە، دوای لەنێوچوونی هەردوو تامە سەربازەکەی پادشا لە هەردوو جارەکەدا چیی کردبێت؟ ئایا لە مەیدانەکە ڕای کردووە، لەکاتێکدا دەیتوانی ڕابکات؟ ئایا لەبەر چاوانی خەڵکی نەماوەو خۆی شاردۆتەوە؟ پاشان سەرەڕای ئەوەی کە ژیانیشی لە مەترسی دابووە، ئایا لەسەر ژیان سوور بووە؟

نەخێر، بەڵکو ئەو لەدوای هەردوو جارەکە بەپێ هاتۆتەوە بۆ لای پادشاکەو، زانیویشیەتی کە گەڕانەوەی بۆ لای پادشا چ مانایەك دەبەخشێتو، چ سەرەنجامێکیش بۆ خۆی لە پادشاوە چاوەڕوان دەکات.

ئەی بۆچی بۆ لای ئەو مەترسی یە دیارو چاوەڕوان کراوە گەڕاوەتەوە؟ چونکە ئەو لە بەرەوڕوو بوونەوەیەکی سەختو جەنگێکی قورسدا بووەو، خۆشاردنەوەو حەزکردنی لە رزگاربوون، مانای شکستیو بەزینی خۆیو بانگەوازەکەشی لەو جەنگەدا دەگەیەنێت.

بێگومان ئەم کوڕە، بەرژەوەندیی خۆی، لە بەرژەوەندیی بانگەوازەکەیدا دیوەتەوە، ژیانی خۆیشی هەر لە ژیانی بانگەوازەکەیدا دیوەتەوە. جا مادام بەرژەوەندیی بانگەواز ئەوە بێت، کە سواری پشتی مەترسی بێت، دەبێت پێیدا هەڵگەڕێت. تەنانەت گەر بەرژەوەندیی بانگەواز لە مردنی خۆیو لەدەستدانی ژیانیدا بێت، ئەوا دەبێت ژیانی بۆ بەخت کات.

گەڕانەوەی ئەم کوڕە لەدوای ئەو دوو جارە بۆ لای پادشا، مانای بێباکیو سەرەڕۆیی نیەو بەوە لێك نادرێتەوە، خۆ رزگارکردنیشیو ڕاکردنی بەرەو جێیەکی دیکەش، بە زیرەکیو دانایی لێك نادرێتەوە، بەڵکو لە ڕاستیدا گەڕانەوەی بۆ لای پادشا لەوپەڕی لوتکەی ئازایەتییەوە بووە.

پێویستە لە هەڵوێستەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکارانو هاوکارانیاندا جیاوازیی لەنێوان سێ وشەی (ترسنۆکی)و (بێباکی)و (ئازایەتی)دا بکەینو، بەم ڕەنگە:

(ترسنۆکی): ئامادەنەبوونە بۆ ڕەنجدانو قوربانیدان لەکاتی پێویستیدا.

(بێباکی): قوربانی دانێکە بەبێ پێوستیو ئاتاجێك.

(ئازایەتی): قوربانیدانی پێویستو سوودبەخشانەیە.

٤٩- لەکاتی گەڕانەوەی کوڕەکەدا بۆ لای پادشا، پادشاکە لێی پرسیوە:

(هاوڕێکانت چییان کرد؟) لەم پرسیارەدا حیکمەتێکمان بۆ دەردەکەوێت، کە تاقمە سەربازەکەی خۆی، کە ناردبووی لەگەڵ کوڕەکەدا بۆ لەناوبردنی، کەچی لەم پرسیارەدا دەیانخاتە پاڵ کوڕەکەو بە هاوڕێیانی ئەویان دادەنێت، هەرچەندە ئەوان خوازیاری کوشتنیی بوونو، بۆ ئازاردانی دەرچووبوون، ئەی داخۆ مەبەست لەم هاوڕێیەتییە چی بێت؟

بێگومان ئەو تاقمە سەربازە نێرراوەی، کە لەناوچوون، پێشتر لە هاوڕێیانی پادشا بوون، وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە: (پادشا ئەم کوڕەی بە چەند کەسێك لە هاوڕێیانی سپارد)، واتە هاوڕێیانی پادشا. بەڵگەی هاوڕێیەتیشیان بۆ پادشا ئەوەیە، کە ئەوان بە فەرمانێکی پادشاو بۆ ڕاپەڕاندنی فەرمانی ئەو ڕۆشتبوون.

بەڵام دوای شکست خواردنیان لەبەردەم خۆڕاگریی کوڕە نەوجەوانەکەداو، دوای ئەوەی خواش تەفروتووناى کردوون، وەك دۆستانو هاوڕێیانی پادشا وەسف نەکراون، چونکە دوای شکست هێنانەکەیان پادشا وازی لێ‌هێناون.

دەسەڵاتدارانی ستەمکاریش، بەم ڕەنگە لەکاتی شکست هێنانیاندا، واز لە خزمەتکارو ئەڵقە لەگوێکانیان دێنن.

پادشاکەش ئەو خزمەتکارانەی خۆی، لەو کاتی شکستەدا بە کۆمەڵی لایەنگری خۆی دانانێت، تاك لەبەردەم کوڕە مێردمنداڵە کاراو سەرکەوتووەکەدا، شکستی ئەوان نەخاتە پاڵ خۆی.

٥٠- پادشاکە بە تەواوی دڵنیابووە لەوەی، کە ناتوانێت کوڕە نەوجەوانەکە بکوژێت. کوڕەکەش بەمەی زانیوە، هەر بۆیەش فەرمانێکی لەوبارەیەوە بۆ پادشا دەرکردووەو، پادشاش فەرمانەکەی جێبەجێ کردووە.

ئەوەبوو پێی گوت: (ئەی پادشا، تۆ ناتوانیت من بکوژیت، تا ئەو فەرمانەی، کە پێت دەدەم، جێبەجێی نەکەیت)، پادشاش گوتوویەتی: (ئەو فەرمانە چیە)؟

پەنا بەخواو پاکیو گەورەیی هەر بۆ خوایە.. تەماشـا، خـوا چـۆن یـاری بـە عەقڵی دوژمنانی دەکاتو، ستەمکاران ڕیسوا دەکات. پێش نەختێك لەوەوبەر پادشا هەر خۆی فەرماندارو قەدەغەکار بووەو، لووتبەرزو خۆهەڵکێش بـووەو، وای ڕاگەیانـدووە گوایـە خـوای خەڵکییـە، کەچـی وا ئێـستا لەبـەردەم کـوڕە نەوجەوانەکەدا ملکەچە، لەبەردەسـتیدا بـە ملکەچـیو زەلیلییـەوە دامـاوەو، بەوپەڕی بێدەسەلاتیو سەرشۆڕیو بچووکیو لاوازییەوە ڕاوەستاوەو، دەیـەوێت لەو تەنگژەیە ڕزگاری بێتو، بـە هـەر ڕێگەیـەکیش بێـت کـوڕە نەوجەوانەکـە لەنێوبەرێت، تاکو ئایینی ئەم کوڕە لـەنێو خەڵکیـدا بڵاونەبێتـەوەو، پادشـاش زیانی لـێ نەکەوێت. هەر بۆیەش ئامادەی بیستنی هەر جۆرە ئامۆژگارییەکـە، تەنانەت گەر لە زاری کوڕەکەشەوە دەربچێتو پێی ڕابگەیەنرێت.

بەڕاستی ئێستا کوڕەکە لەبەردەم پادشادا زۆر گەورەیە، ئـەو پادشـایەی، کـە بۆتە مرۆڤێکی بچووكو کورتەباڵا، کوڕەکەش ئێستا فەرماندارو کاربەدەستەو، جەنابی پادشاش تەنها فەرمانی بۆ راپەڕاندن لـێوەردەگرێت.

کوڕەکە پێی دەڵێت: (هەتا ئەوە جێبەجێ نەکەیت، کە فەرمانت پێ دەدەم)، پادشاش بە باڵەفڕتێی خۆشییەوە هاوار دەکات: (ئەو فەرمانە چیە)؟

لەوانەشە ئەمە یەکەمین فەرمان بێت، کە پادشاکە لە ژیانیدا وەریگرتبێـتو، ناچاریش بووبێت، کە ڕایپەڕێنێت.!

٥١- با هەڵوێستەیەکیش بکەین لە ئاست ئەو شێوازەدا، کە کوڕە مێردمنداڵەکـە بۆ چۆنیەتی کوشتنی خـۆی – لەلایـەن پادشـاوە-و بـۆ خـۆ لـێڕزگارکردنی، دایناوە، بابڵێیـن: ئەو دەزانێ، کە قۆناغی داهاتوو ئەوە دەخوازێت، بێگومـان ژیانیشی بە بانگەوازەکەیەوە پەیوەستەو، بۆ ئەو بانگەوازەی تەرخان دەکات.

هـەروەها کوڕەکـە دەیـەوێت، ئـەو ئیدیعایـەی پادشـاکە بـۆ خوایـەتیو پەروەردگارێتی خۆی دەکـات، کۆتـایی پـێ بێنێـتو، لاوازیو دەستەپاچـەیی

پادشاکە پیشانی خەڵکی بدات، تەنانەت گەر ئەمە لەسەر حسابی گیانو ژیانی خۆیشی بێت.

٥٢- لە وتەی کورەکەدا بە پادشا: (خەڵکی لە شوێنێکی دیاری نەختێك بەرزدا کۆبکەرەوە)، سووربوونی کوڕەکە دەردەکەوێت لەسەر بانگکردنی جەماوەر بۆ دینی خوا، تاکو ئامادەی دیتنی رووداوەکە بنو لێی وردبنەوەو بیری لێبکەنەوەو، حەقیش لە ناحەق جیابکەنەوەو بیناسن. کوڕەکە لەمەدا رووی بانگەوازەکەی دەگوازێتەوە بۆ خەڵکی، دەیەوێت هەروا نادیار یان بینەر نەبن، بەڵکە دەیەوێت ئەوانیش بێنە مەیدانی جەنگەکەوەو، بەشداری تیادا بکەنو، بچنە پاڵ بەرەی حەق.

ستەمکارانیش کاتێك ڕووبەڕووی حەق دەوەستن، سوور دەبن لەسەر بزرکردنی جەماوەرو بەرکەنارکردنیان، هەروەك سووردەبن لەسەر بەرپەرچدانەوەی سەربازانی حەقو، سزادانی سەختیان، بەڵام لە شوێنێکی دوور لە ئاگاداریی جەماوەر، چونکە دەترسن لە بێداربونەوەی فیترەتی ساغ لە دڵی ئەو جەماوەرەداو نەبادا بچنە پاڵ حەق.

٥٣- کوڕە مێردمنداڵەکە، ئاماژەی بۆ چۆنیەتی خۆ لێڕزگارکردنەکە کردووەو فەرمانی بە پادشا داوە، کە جێبەجێی بکات: بە قەدی درەختێکەوە هەڵیواسێت، ئەمەش بۆ ئەوەی لاوازی تەواوی کوڕە مێردمنداڵەکە لەبەردەم ئەو جەماوەرە قەرەباڵغەدا دەرکەوێتو، بەو دیمەنەش بخروشێنو هەڵچن: سەرنج بدەن چۆن کوڕێکی بچووکی مێردمنداڵو بێدەسەڵاتی دابڕاو لە گشت هێزێکی ماددی، بە قەدی درەختێك هەڵواسراوە.

لەمەشدا بەشدارییەکی ویژدانی عاتیفی، لەنێوان کوڕەکەو خەڵکیدا بەدی دەکرێت.

٥٤- کوڕە مێردمنداڵەکە فەرمانی بە پادشا کردووە، کە تیرێك لە هەگبەی

تیرەکانی کوڕە هەڵواسراوەکە- نەك لە جێیەکی ترەوە- دەربێنێت، تاکو پادشا خۆیو خەڵکە ئامادەبووەکەش بزانن کە بێگومان کوڕەکە خۆی خاوەنی ئامرازو هۆکاری کوشتنەکەیە، نەك پادشاکە.

٥٥- کوڕە نەوجەوانەکە لە کرداری کوشتنی خۆیدا بۆ گشت کارو جووڵەیەك پادشاکە ئاڕاستە دەکاتو فەرمانی یەکەیەکەی کارەکەی- ئەگەرچی ئاشکراشە- پێدەکات، کە پێی دەڵێت: (پاشان تیرەکە بخەرە سەر چەقی کەوانەکە)، بەمەش دەیەوێت بێدەسەلاتی پاشاکە دەربخاتو، لەخۆیەوە هەڵسوکەوت نەکاتو، هیچ جووڵەو هەنگاوێك سەربەخۆی ئەنجام نەدات، تا بە تەواوەتی ملکەچی کوڕەکە بێتو، لە بەردەمیدا لەوپەڕی لاوازیدا بێت.

٥٦- هەروەها کوڕەکە فەرمان بە پادشاکە دەکات، کە دان بە وجودی (اللە)ی پەروەردگاری خۆیو پەروەردگاری کوڕەکە دابنێتو، بە ناوی خواوە کوڕەکە بکوژێت: (بڵێ: بەناوی خوای پەروەردگاری کوڕەکە/ بسم اللە رب الغلام).

بەم شێوەیە کوڕەکە دەیەوێت — لەپێش مردنی خۆیدا- تەفسیرو لێکدانەوەیەکی ڕاستو دروستی ڕووداوەکان بخاتە بەر دیدەی جەماوەرو، خواشیان پێ بناسێنێتو، دەستەوە ستانیو لاوازیی پادشاشیان پیشان بدات، ئیتر چۆن ئەم پادشایە لە جیاتی (اللە) بە پەروەردگاری خۆیان دادەنێت.

٥٧- پادشاکە ویستوویەتی دووجار کوڕە مێردمنداڵەکە بکوژێت، بەڵام لەوەدا شکستی تووش بووەو، خواش سەربازەکانی بۆ لەناو بردوون. جا هەرچەندێك هەوڵی کوشتنی بدات هەر شکستی تووش دەبێتو نوشوست دێنێت، چونکە خوا ویستی لەسەر نەبووە.

بەڵام کاتێك خوا ویستی کوڕەکە بمرێت، ئیدی هیچ شتێکی تر لەبەردەم ویستی خوادا نەبووە، کوڕە نەوجەوانەکە ئەو شێوازە کاریگەرە بانگەوازییەی بۆ کۆتایی هێنانی ژیانی خۆی هەڵبژاردووە. بۆ ئەوەبووە، کە خەڵکی بە چاکی

بزانن کە مردنو کوژرانی ئەم کوڕە بە قەدەرو خواستو ئیرادەی خوایە، نەك بە ئیرادەی ئەو پادشایەی کە دەست وەستانیو بێتوانایی ئەویان بۆ دەرکەوت.

٥٨- پادشاکەش -وەك کەسێکی لاوازی بێچارە- بەدەم فەرمانەکانی کوڕە مێردمنداڵەکەوە دێت، چونکە خۆی لەبەردەم سێ مەسەلەدا دیوەتەوە:

یان واز لە کوڕە نەوجەوانەکە بێنێت کە بە ئارەزووی خۆی خەڵکی بۆ دینی خوا بانگ بکات، بەبێ هیچ گومانێکیش، خەڵکەکە باوەڕ بە خوا دێنن.

یان لەسەر هەوڵەکانی کوشتنی بەردەوام بێت، بەمەش لە دووپاتکردنەوەی دەستەوەستانییەکەی لەبەرچاوی خەڵك بەردەوام دەبێت.

یاخود بەپێی فەرمانەکانی کوڕەکە بیکوژێت، تا خۆی لێ دەرباز بکات.

دیارە پادشاش -بەناچاریو حەز لێ نەبوونەوە- سێیەمی هەڵبژارد، پادشای دەستەوەستانی هەژار نەیزانیوە، کە خەڵکی هەموویان باوەڕ بە خوای پەروەردگاری کوڕە نەوجەوانەکە دێنن.

٥٩- کوڕە نەوجەوانەکە بە دانانی دەستەواژەی (بەناوی خوای پەروەردگاری کوڕەکە/ بسم الله رب الغلام) بۆ کوشتنەکەی، ویستوویەتی خوای پەروەردگاری پادشا بە خەڵکەکە بناسێنێت، چونکە بێگومان پێشتر خەڵکی، ئەو کوڕەیان خۆشویست بەهۆی ئەو سوودو خێرو چاکەیەی، کە پێی بەخشیبوون، بۆیە هەر ئەوە ماوە، کە بەر لە جێهێشتنیانو گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگاری، ئاڕاستەیان بکات بۆلای ئەو خوایەی ئیلهامی خزمەتکردنیانو سوود پێگەیاندنیانی پێبەخشیوە، کە هەر ئەو بووە شیفای نەخۆشییەکانی پێداون.

هەروەها کوڕەکە ویستویەتی ڕادەی ئەو دەستەپاچەییو بێتوانایییەی پادشا دەربخات، کە پێی گەیشتووە، چونکە پادشاکە ئەو ستەمکارە بە زەبروزەنگەیە، کە پڕوپاگەندەی خوایەتی بۆ خۆی دەکردو، هەر کەسێکیش دان بەوەدا نەنێت، دەیکوژێت، وەك چۆن هاونشینەکەی دیوەخانو، ڕاهیبەکەشی

کوشت، ئێستاش حاڵو مەسەلەی هاتۆتە سەر ئەوەی، کە دان بە خوای پەروەردگاری کوڕە نەوجەوانەکە دابنێتو، بەناوی ئەو خوایەوە بیکوژێت.

٦٠- پادشاکە ئەو فەرمانەی ڕاپەڕاند، کە کوڕەکە پێی کرد، تیرێکی گرتە کوڕەکەو، بەر لایەکی نێوچەوانی کەوت، کوڕەکەش دەستی خستە سەر ئەو لایەی نێوچەوانی، کە شوێنی زامی تیرەکە بوو، پاشان مرد.

خەڵکە ئامادەبووەکەش تەماشای ئەم ڕووداوەیان دەکرد، گەلێك دڵتەنگ بوونو خرۆشان بەو سەرەنجامە خەمبەخشەی کوڕەکە، کە زۆربەیان خۆشیان دەویست بەهۆی ئەو کارە خزمەتگوزارییە سوودبەخشانەی پێشکەشی کردبوون.

کوڕە نەوجەوانەکە وەك بانگەوازکارێکی خۆڕاگرو جیهادکار ئەم دنیایە جێدێڵێتو، شەهیدبوونیش -کە بەرزترین پلەی ئاواتەکانو ترۆپکی هیواکانە- بەدەست دێنێتو، بە بەشی لای خوا شادو بەختەوەر دەبێت.

بەڕاستی ئەو کوڕە تەمەنی خۆی بۆ بانگەوازەکەی تەرخان کرد، هەربۆیەش تەمەنی لەو ڕێگایەدا بەخشیی، لە ژیانو لە مردنیشی هەر بانگەوازی بۆ لای خوا دەکرد، وەك چۆن ژیانی بانگەواز بوو بۆ ڕێبازی خوا، مردنەکەشی هەر بانگەوازێك بوو بۆ ڕێبازی خوا.

٦١- شەهیدبوونی کوڕە نەوجەوانەکە کاریگەرێتییە خوازراوەکەی خۆی لە دەروونی خەڵکیدا خولقاند، ئەوەبوو خەڵکەکە بیریان کردەوەو تێڕامان لەوەی کە: مێردمنداڵێکی بچووك، ئەمانی خۆشدەویستو خێروچاکەو سوودی پێشکەش دەکردنو، لەپێناویشیاندا دەمرێتو، دەستەپاچەییو بێتوانایی پادشاکەشیان بۆ دەسەلمێنێت، ئیدی بۆچی باوەڕ بە پەروەردگاری کوڕەکە نەهێنن؟

ئەو ترسەش، کە لە پادشا بەزیوو دەستەوستانەکە هەیانبوو، لەدڵیاندا نەماو، باوەڕیان بە پەروەردگاری کوڕە نەوجەوانەکە هێنا . کە خەڵکەکە باوەڕیان هێنا، دوای شەهید بوونی کوڕەکە. بیریان کردەوەو تێگەیشتن کە ئەوە

بانگەوازێکی بەهادارو مەزنە، کە خاوەنی بانگەوازەکە گیانو ژیانی خۆی لە پێناویدا دادەنێتو، لە سەروو هەموو شتێکی دنیاوە دایدەنێت، کە خاوەنەکەی کاتێك بە دنیاش دەردەچێت، خۆی لە هەموو خێرو خۆشییەکی دنیا دادەڕنێت، لەبەر ئەوەی بەرەو شتی چاکترو بەردەوامتر دەڕوات.

بێگومان خەڵکیش دەیانەوێت بانگەوازکاران قوربانیدەر بنو، دوای شت ومەکی دونیایی نەکەونو خۆیان بۆ بانگەواز یەکلا بکەنەوە. کاتێك دەبینن بانگەوازکاران هەموو شتێك لەماڵو سامانو کاتو کارو ئاواتو جەستەو خوێنو گیانیان بۆ بانگەوازەکەیان دەبەخشن، خەڵکیش کاریان تێدەکرێتو بەدەم بانگەوازەکەیانەوە دەچنو پەیڕەویی ڕێبازەکەیان دەکەن. لەوانەشە ئەم بەدەمەوەچوونەی خەڵکیش، دوای شەهیدبوونی بانگەوازکاران بێت، کاتێك ئەم دنیایە بە شەهیدی لەپێناوی خوادا جێدێڵن.

٦٢- دوای گیان لەدەستدانی کوڕەکە، خەڵکی بە یەك دەنگ هاواریان دەکرد: (باوەڕمان بە پەروەردگاری کوڕەکە هێنا.. باوەڕمان بە پەروەردگاری کوڕەکە هێنا.. باوەڕمان بە پەروەردگاری کوڕەکە هێنا..)

ئەم باوەڕهێنانە مەزنەشیان لە چرکەساتی خۆ ڕزگارکردن دابوو، لە گشت کۆتو پێوەندێکی وەهمو نەفامیو، لە چرکەساتی عیززەتو سەربەرزیشیان دابوو لە دوای سەرکوتکارییو سەرشۆڕیی. هەروەها لە چرکەساتی بەهێزییدا بوو لە دوای بێهێزییو ترسو لاوازیی. بەڕاستی هەموویان چەندین مرۆڤی گەورە بوون لەکاتی باوەڕهێنانیاندا بە خوای پەروەردگاری کوڕە نەوجەوانەکەو، خۆیشیان بۆ خوا یەکلاکردەوەو، بۆ لای ڕێبازی پاکی خوا گەڕانەوەو، ئامادەی بەخشینی سەروماڵیش بوون لە ڕێی خوادا.

دیارە ئەوان دەشیانزانی، کە باوەڕهێنانو ئیمانداریتیەکەیان، ئەرکی زۆریان دەخاتە سەر، بۆیە ئامادەی بەخشینی هەموو شتێك بوون لە پێناویدا. چونکە بە چاوانی خۆیان شەهیدبوونی کوڕە مێردمنداڵەکەیان بینیو، دەشیانزانی

هەمان چارەنووسی ئەو لە دنیادا تووشی ئەوانیش دەبێت، کۆتاییشیان وەکو کۆتاییەکەی ئەوە. کەچی سەرەڕای ئەوەش نەترسانو، ترسنۆکیش نەبوون، بەڵکو باوەڕی خۆیان ئاشکرا کرد.

ئەوان تا چەند چرکەساتێکی پێشتریش ترسنۆكو سەرکزو کۆیلەکراوان بوون، بەڵام ئێستا بوون بەو هێزە مەزنەی کە لە چیاکانیش خۆڕاگرترو ڕەگ داکوتاوترنو، بەربەرەکانیی مەترسییەکان دەکەن.

بە ڕاستیش باوەڕ چەندین سەروەریو قارەمانێتی دەخولقێنێت.

٦٣- کاروبار لە دەستی پادشادا نەماو، جڵەوی بارودۆخیش لە دەستی دەرچووو حوکمو فەرمانڕەواییشی بەسەر ئەو کۆمەڵە باوەڕدارەدا نەما. لەو کاتەشدا کەسێك لە نزیکەکانی خۆی هاتە لایو بە سوێند خواردنەوە پێی گوت: (ئەرێ بینیت ئەوەی لێی دەترسایت؟ دەسا بەخوا ئەوەی لێی دەترسایت تووشت بوو، ئەوا خەڵکی ئیمانیان هێنا).

بێگومان پادشا دژی حەق پلانی دادەنا، خواش دژی ئەو پادشایە پلانی داناو، خواش هەر خۆی باشترینی پلان دانەرانە.

٦٤- پادشا بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی جەماوەری باوەڕداران پەنای بۆ هەمان ئامراز برد کە هەموو ستەمکارێك پەنای بۆ دەبات، ئەویش ئامرازی سزادانو چەوساندنەوەو کوشتنی باوەڕدارانو خوێن ڕشتنیانە.

بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانیدا چەند چاڵێکی گەورە لەسەر دەروازەکانی ڕێگا دیارەکاندا هەڵکەنن، چاڵەکان هەڵکەندرانو ئاگریشیان تیادا کرایەوەو سوتەمەنییان بۆ ئاگرەکە دانا.

ئنجا فەرمانی کرد، کە خەڵکە باوەڕدارەکان لە لێواری چاڵەکان نزیك بکەنەوەو بیانترسێنن، جا هەرکەسێکیان وازی لە ئاینەکەی هێناو لەو باوەڕە تازەیەی پاشگەز بۆوە، ئەوا لەلای پادشا سەربەرزو بەڕێز دەبێتەوە، هەرکەسێکیش لەسەر ئەو ئاینو باوەڕەی بمێنێتەوە، ئەوا هەڵی دەدەنە نێو

چاڵە ئاگرینەکانەوە یان پێی دەڵێن: (خۆت، خۆتی تێ فڕێدە).

هەڵسوکەوتی ستەمکاران لە گرتنەبەری هۆکارەکانی زەبروزەنگو کوشتندا، مانای شکست خواردنیانە لە بەرەو ڕووبوونەوەی هەقداو، تێشکانیشیانە لەو جەنگە تیۆری‌و فیکرییەیان لەگەڵ هەقدا.

ئەی بۆچی لە بەرامبەر حەقدا شێوازی گفتوگۆو ئاخاوتن‌و بیروڕاگۆڕینەوە ناگرنەبەر؟ بۆچی بەو شێوازە ناتوانن ڕایگرن‌و ڕاستییەکان هەڵوەشێننەوە؟

لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیەك، یان نموونەیەکی ڕێنیشاندەر، یان ژیربێژی (منطق)ێکیشیان بەدەستەوە نیە، لەبەر ئەوە دڵنیان لە شکستی تەواویان لە بەردەم حەقدا. بۆیە هیچ ئامرازێکی هێمنانەی ئاوایان لەبەردەمدا نامێنێت، تەنها ئامرازە نامرۆیی یە دڕندانەکان نەبێت، وەك ئەو شێوازو ئامرازەی، کە گیاندارانی دارستان لە دژی یەکدی پەنای بۆ دەبەن‌و، حساباتی نێوخۆی خۆیانی پێ یەکلادەکەنەوەو، گرفتەکانیان پێ دەبڕیننەوەو، ناکۆکییەکانیان پێ تەخت دەکەن. ئەویش شێوازی پەلاماردان‌و ئازار گەیاندن‌و کوشتن‌و خوێن ڕشتنە.

٦٥- جا ئایا چاڵە ئاگرینە گەورەکان هوروژم ولێشاوی باوەڕهێنانی جەماوەریان ڕاگرت؟ ئایا بەو چاڵانە توانییان باوەڕداران لە دینەکەیان هەڵگێڕنەوە؟ ئەی ئایا بەو چاڵانە ترس‌و لەرزو تۆقاندن‌و ترسنۆکییان لە دڵ‌و دەروونی باوەڕدارەکاندا دروست کرد؟

کەی ئامرازەکانی زەبروزەنگ‌و ئەشکەنجەدان، توانیویانە خەڵکی لە دین وەرگێڕن‌و سەریان لێ تێك بدەن؟ لە کەیەوە ئەو ئامرازانە توانیویانە بانگەوازی حەق لەنێوبەرن؟

بێگومان بانگەوازەکانی حەق بە زەبروزەندو لە بارودۆخی چەوسانەوەدا بەهێز دەبن. هەروەها تەنها بە بەڵاو ناڕەحەتی‌و ئەو تاقیکردنەوانە، درێژ دەبنەوەو گەشە

دەکەن‌و ڕەگ دادەکوتن، هەر تەنها بە مەینەتی‌و کەوتنە بەر میحنەتەکان دەچەسپێن‌و دەسەلمێنرێن.

لەم چیرۆکەشدا، جەماوەری باوەڕداران لە پاڵەپەستۆی یەکدییدا بوون بۆ سەر چاڵە گەورە ئاگرینەکان، جەماوەری باوەڕداران لەسەر باوەڕەکەیان خۆڕاگر بوون‌و ئەوەیان هەڵبژارد، کە لەلای پەروەردگاریان بۆیان دابین کراوەو، گیانەکانی خۆیان لە پێناوی دینەکەیاندا بەخت کرد.. لەش‌و لارەکەیان بە ئاگری پڕ سوتەمەنی سووتاندو، گیانەکانیشیان بە ئاسمانی بەرزدا فڕین‌و، بە شەهادەت‌و بەهەشت شادو سەرکەوتوو بوون، ئەم دنیایەشیان بە جۆرێك بەجێهێشت، کە هیچ داخ‌و پەژارەیەکیان بۆ دەرنەبڕی.

## (ئا ئەوەیە ڕێگاکە)

باسەکەمان دەربارەی چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) بە بەندی (ئا ئەوەیە ڕێگاکە) کۆتایی پێ دێنین، کە مامۆستای پێشەوا (سید قطب) کردبویە دوایین بەندی کتێبە پێشەنگەکەی خۆی (معالم في الطريق)، کە لەو کتێبەیدا تیشکی خستۆتە سەر چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە)و هەندێك لەو مەشخەڵ‌و ڕوخسارە گەشانەی ڕێبازەکەی ئیمانداراني نێو ئەم چیرۆکەی تیادا تۆمار کردووە.

جێگای باسیشە، کە مامۆستا (سید قطب) ئەم بەندەی کتێبەکەی، پێشتر وەك پاشبەندێکی لێکدانەوە بۆ تەفسیری سوورەتی (البروج) لە (في ظلال القرآن)ەکەیدا نووسیبووو، کە دەبوایە لەگەڵ تەفسیرە بەناوبانگەکەی (في ظلال) چاپ بکرایە. بەڵام دەزگای چاودێری‌و سانسۆری میسر نەیهێشت لەگەڵ چاپی (في ظلال)دا بڵاوبکرێتەوە. بۆیە (سید قطب)یش ئەو پاشبەندەی بۆ دوایی هێشتەوەو لە کتێبی (معالم)دا بڵاوی کردەوە. جا ئەگەر بزانین کتێبی (معالم في الطريق) دوایین کتێبی بڵاوکراوەی (سید قطب) بێت‌و بشزانین، کە بەندی (هذا هو الطريق/ ئا ئەوەیە

ڕێگاکه) دوایین بەندی ئەو کتێبە بێت، ئەوا دەشزانین‌و پەی دەبەن بەوەی، کە مامۆستا (سید قطب) هەمان ئاکامی، وەك ئاکامی ئیماندارانی نێو چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) بۆ خۆی چاوەڕێ دەکردو، هەمان شەهادەتیش، کە ئەو ئیماندارانه بەدەستیان هێنا، بۆخۆی بەدەست هێنابوو، ئەمەش وەك ئەوە وایه، کە لە بواری ئەم بەندەی (ئا ئەوەیە ڕێگاکە)وە پرسەی خۆی ڕابگەیەنێت.

وەك ئەوەش وایه، کە (سید قطب) لەم بەندەدا، کاتێك دنیا جێدێڵێت، بانگەوازکارانی دوای خۆی، بە خۆڕاگریی‌و جێگیربوون لەسەر ڕێبازەکە ڕادەسپێرێت، تەنانەت گەر ڕووبەڕووی هەر جۆرە مەترسیەکیش ببنەوە، چونکە ئەم ئەو ڕێگایەیە، کە خوا خۆی بۆ بانگەوازکارانی داناوە.

## دەقی وتەکەی (سید قطب)

بێگومان (چیرۆکی هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) وەك لە سوورەتی (البروج)دا هاتووە، شایستەی ئەوەیە، کە باوەڕدارانی بانگەوازکار بۆ لای خوا لە گشت خاك‌و ناوچەیەك‌و لە گشت نەوەو سەرەمێکدا لێی وردببنەوەو سەرنجی قووڵی لێ بدەن. چونکە قورئانی پیرۆز، کە ئەم چیرۆکەی بەم شێوازی دارشتنەیەوەو بە پێشەکی‌و پاشبەندیی‌یەوە هێناوەو بەو یاساو ڕێنماییی‌یانەشەوە، کە لەگەڵ چیرۆکەکەدا دیاریی کردون، چەند هێڵێکی درێژی لەسەر شێوازی بانگەواز بۆ لای خواو، ڕۆڵی مرۆڤ تێیداو، ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکانی نێو ئەو بوارە فراوانە —کە لە ڕووبەری زەوی فراوانەوە-و — مەودایەکی دوورتریشی لە ژیانی دنیا هەیە)، کێشاوەو، مەشخەڵەکانی ڕێگەش (معالم في الطريق)ی بۆ وێنا کردوەو، دەروونیشیانی ئامادەو ساز کردوە بۆ بەرەوڕووبوونەوەی هەر یەکێك لەو ئەنجامانەی، کە قەدەری وێناکراوی خوا— بەپێی حیکمەتە شارراوەکەی نێو غەیبی داپۆشراوی خوا- بەسەریا پیادە دەبێت.

ئەمە چیرۆکی دەستەیەکە لە خەڵکی، کە باوەڕیان بە پەروەردگاریان هێناوەو، حەقیقەتی باوەڕەکەشیان کەوتۆتە بەر ئاوێنەی ئاشکرابوونو، پاشان ئەم باوەڕە پتەوەیان کەوتۆتە بەر تاقیکردنەوەو، ڕووبەڕووی چەند دوژمنێکی بە زەبروزەنگو دڕندە بوونەتەوە، کە سووکایەتییان بە مافی مرۆڤ کردووە لە بواری سەربەستیی باوەڕهێناندا بە حەقو، باوەڕهێنان بە خوای بالادەستی سوپاسکراوو، بە کەرامەتی مرۆڤ لەلای خوا، تا نەبێت بەو گەمەیەش، کە ستەمکاران بەهۆی ئازارەکانی ئەشکەنجەدانی باوەڕدارانەوە، تەسەلای دڵیان پێ بێتو، خۆشیو ڕابواردنیش لەو دیمەنەیان لەکاتی ئازاردانیاندا بە سووتاندن ببینن.

بەڕاستی ئەو ئیمانە دڵی باوەڕدارانی (نێو چیرۆکەکە)ی لە سەروو فیتنەو نارەحەتییەکەدا ڕاگرتووەو، تیایدا (عەقیدە) بەسەر (ژیان)دا سەرکەوتووەو، ملی بۆ هەڕەشەی دەسەڵاتدارانی ستەمکار کەچ نەکردووەو، لە دینەکەش پاشگەزی نەکردوونەتەوە، لە کاتێکدا بە ئاگر دەسووتێنران، تا مردن.

بەڕاستی ئەم دڵانە لە کۆیلایەتی بۆ ژیان ڕزگار ببونو، خۆشویستنی لە ژیاندا مانەوەش لەکاتی دیتنی مردندا بەم شێوازە دڕندانەیە ملکەچی نەکردن، بەڵکو هەموویان لە گشت کۆتو پێوەندەکانی زەویو، لە شتە سەرنج ڕاکێشەرەکانیشی خۆیان رزگارکردو، بەهۆی سەرکەوتنی عەقیدەشەوە بەسەر ژیانی زەویدا، لەسەروو هەموو ئەو کۆتو پێوەندو شتە فریودەرانەی دنیاوە بوون.

لە بەرامبەر ئەو دڵە باوەڕدارو چاکەخوازو بەرزو بەخشندانەشدا، چەند تاقمێکی سەرکێشو شەڕانگێزو تاوانکارو بەدخوو هەبوون، دۆستانو شوێنکەوتوانی ئەم شەڕخوازانەش لەسەر لێواری چاڵە ئاگرەکان دانیشتبوونو تەماشای چۆنیەتی ئازار پێگەیشتنی باوەڕدارانو چۆنیەتی ئێشو ئازاریان دەکردن، دانیشتبوون خۆشییان لە دیمەنی ژیانێك دەبینی، کە ئاگر دەیخوارد، دیمەنی کەسانێکی بەڕێز، کە دوای چەند ساتێکی تر دەبنە سووتەمەنیو خۆڵ.. هەر جارێکیش کوڕێکی لاو، یان کچێکی لاو، یان نەوجەوانێك، یان پیرەژنێك، کوڕێکی

مێردمنداڵ، یان پیرەمێردێکیان لە باوەڕدارە چاکە خوازە بەڕێزەکان هەڵدەدایە نێـو ئاگرەکەوە، مەستیو سەرخۆشی ی نەفسی نزمانەی نێو دەروونی ستەمکاران زیاتر دەبووو هاوکات بوو لەگەڵ زیادبوونی گـەرمایيو کڵپـەی شـێتیەکەیاندا بـۆ سـەر خوێنو جەستە پارچەپارچەبووەکانی باوەڕداران.

ئا ئەمەیە ئەو ڕووداوە دڕندانەیەی، کە تاقمی سـتەمکاران لەسـەری بـەردەوام بـوونو، لـەو کـوورە ئاگرینـەدا مـەرگی قـەرەباڵغیان تیـادا خولقانـدو، واشـیان لـێهاتبوو چێژیان لە دیمەنە ترسناكو توندوتیژەکەی ئاشکەنجەدان دەبینی.

بەم نەفس نزمییەوەی، کە هیچ گیاندارێکی دڕنـدەش پـەلی بـۆ نەهاویـشتووە ئاکاری خۆیان نواند، دیارە گیانداری دڕندە پەلاماری ئاژەڵانی دی بۆ ئـەوە دەدات تاکو خۆراکی خۆی پەیدا کات نەك بۆ ئەوەی چێژ لە ئازارەکانی ئەو نێچیرەی —بـە ئاکاری بەدخوویيو بێپەروایی یەوە- وەربگرێت.

هەر لەم ڕووداوەشدا گیانەکانی ئیمانداران بـەرزو بڵنـد بۆتـەوەو، رزگـاربوونو گەیشتوونەتە ئەوپەڕی ترۆپکی باڵاو پیرۆز، کە گرۆی مرۆڤایەتی لە گـشت نـەوەو سەردەمێکیدا پێیەوە شەرەفمەندە.

*　　　*　　　*

لـــە ڕووی حـــساباتو مەزەندەکارییـــەکانی ســـەر زەوییـــەوە - وادیـــارەو وا لێکدەدرێتەوە- کە (ستەمکاریی) بەسەر (بـاوەڕدارێتی)دا سـەرکەوتبێتو گوایـە ئەو باوەڕەی کە بەو لوتکە بڵندە گەیشتووەو لەنێو دڵی ئەو چەند کەسە خێرخوازو بەڕێزو خۆڕاگرو نەفس بەرزەدا بووە، هیچ کێشو بەهایەکی لـەو جەنگـەی نێـوان (باوەڕدارێتی)و (ستەمکاری)دا نەبووە.

ئەو بەسەرهاتو ڕیوایەتانەی، کە لەسەر ڕووداوەکە هاتوونو، قورئانی پیرۆزیش لە دەقەکانی تایبەت بەو ڕووداوانەدا ئاماژەیان بۆ هـیچ هـەواڵێکی دی نـەکردووە لەسەر چۆنیەتی سزاو خەشمی خوا بۆ سـەر ئـەو تاوانبارانـە لـە بەرامبـەر تاوانـە

درندانەکەیاندا وەك چۆن سزای گەلی (نوح)و گەلی (هود)و گەلی (صالح)و گەلی (شوعەیب)و گەلی (لوط)ی داوەو ئاماژەی بۆ سزاکانیان کردووە، یان وەك چۆن باسی شێوازی سزادانی فیرعەونو سەربازەکانی کردووە، کە بە هێزو توانای خۆیەوە خوای خاوەن هێزو بەتوانا سزای داونو لەناوی بردوون.

ڕاستە کە لە حساباتو تێڕوانینی ژیانی سەر زەویدا ئەو کۆتایییەی چیرۆکەکە خەمناكو دڵتەزێنە. بەڵام ئایا ئیدی هەر ئاوا -بەم ڕەنگە- کۆتایی بە مەسەلەکە هاتووەو هەروا بە خۆڕاییش تاقمە ئیماندارەکە -کە لە ترۆپکی ئیمان دابوون- لەنێوچوون؟ ئایا هەر بە کۆتایی هاتنی ڕووداوەکە، خەمو ئازارەکانی نێو چاڵە ئاگرینە گەورەکانیش بەبادا چوونو، تاقمی زۆردارانی لە ستەمدا ڕۆچووش -وەك بەرزەکی بانان- بۆی دەرچوون، لەکاتێکدا ئەو چاڵە قووڵە ئاگرینەیان هەڵکەندو خەڵکی باوەڕداریان تیادا سووتاند؟!

بێگومان لێکدانەوە چەندو چوونی خەڵکی سەرزەوی شتێك لە دڵدا لەسەر ئەو کۆتاییە خەمناکە دەوروژێنێت، بەڵام قورئان شتێکی دی فێری باوەڕداران دەکاتو، حەقیقەتێکی تریان بۆ دەردەخاتو، بەرچاویان ڕۆشن دەکات لە ئاست زانینی ماهیەتی ئەو بەهاو بیروباوەڕانەی، کە مەسەلەکانی پێ تاووتوێ دەکەنو، هەروەها لە ئاست زانینی ئەو جەنگەی، کە بەشداریی تێدا دەکەن.

ژیانو هەموو ئەو خۆشیو ناخۆشییەی، کە پێیەوە دەلکێن لەڕێی بەهرەمەندبوون بە شتەکان، یان بێبەش بوون لێیان، ئەو بەها گەورەیەی نێو تەرازوەکە نیەو، ئەو کەرەسەیەش نیە، کە ڕادەی قازانجو زیان دیاری دەکات، سەرکەوتنیش لە بەرزترین وێنەیدا، سەرکەوتنی گیانە بەسەر ماددەداو، سەرکەوتنی عەقیدەیە بەسەر ئازارەکانداو، سەرکەوتنی ئیمانیشە بەسەر فیتنەداو تاقیکاریی پڕ بەڵاو ناڕەحەتیی ڕۆژگاردا.. لەم ڕووداوەشدا گیانەکانی باوەڕداران بەسەر ترسو ئازاردا سەرکەوتوون، هەروەك بەسەر شتە بەکێشکەرەکانی سەرزەویو شتە فریودەرەکانی ژیانیشدا سەرکەوتوون.

بەڕاستی بەجۆرێك بەسەر فیتنەو کوفرو ناڕەحەتیدا سەرکەوتوون، کە هەتاهەتایە هەموو ڕەگەزی بەشەری -بە هەموو تیرەو هۆزو گەلو نەتەوەکان-و لە گشت چاخو سەردەمێکدا، گەورەو پایەدار دەکاتو، جێی شانازیو شەرەفمەندیشیانە.. ئائەوەیە سەرکەوتن..

بێگومان خەڵکی هەموویان هەر دەمرن، هۆیەکانی مردنیشیان هەمەڕەنگو لێك جودایە، بەڵام هەموو خەڵکیش ئەم سەرکەوتنەیان دەست ناکەوێتو، لەو ئاستە بڵندەدا بەرز نابنەوەو، ئەو جۆرە ئازادییەش بەدەست ناهێننو، بەو جۆرەش بەرەو ئاسۆی گەش هەنگاو نانێن. بەڵکو ئەمە خواستو ڕێزلێنانی خوایە بۆ کۆمەڵێك کەسی بەڕێز لە بەندەکانی تاکو -وەك خەڵك بمرنو بەشداریی مردنی حەتمی بن- بەڵام جودا لە خەڵکی دیکە بەو پلەی سەروەرییە بگەن.. سەروەری لەگەڵ خەڵکە بەڕێزەکەی ئاسمانو، لە هەمان کاتدا لە دنیای خەڵکی سەر زەوییشدا، گەر لەم ڕووەشەوە ئێمە حسابی نەوە لەدوای نەوەی دانیشتوانی دنیاشیان بۆ بکەین.

بێگومان ئەو باوەڕدارانە دەیانتوانی ژیانی خۆیان لە هەمبەر شکستی پێهێنانی بیروباوەڕیاندا ڕزگار بکەن، بەڵام داخۆ چەندە خۆیان دەدۆڕاند؟! ئەی داخۆ مرۆڤایەتیش چەندەی زیان لێدەکەوت؟! ئاخۆ ئەو باوەڕدارانە چەندیان زیان لێ دەدات، کاتێك ئەو واتا بەرزەیان دەکوشت، واتای نەویستنی ژیان بەبێ عەقیدەیەكو، گەندەڵیی ژیانیش بەبێ سەربەستیو، داڕووخانیشی لە زەمانێکدا کە ستەمکاران دوای ئەوەی بەسەر جەستەکانی خەڵکیدا زاڵ دەبن، بەسەر ڕۆحەکانیشیاندا زاڵ بن؟

بەڕاستی واتایەکی پیرۆزەو، واتایەکی زۆر گەورەشە ئەو قازانجەی، کە بەدەستیان هێناو هێشتا لەسەر زەویش مابوون، ئەو قازانجەی لەکاتی کەوتنەبەر ئاگرداو، سووتانی جەستە لەنێوچووەکانیاندا بەدەستیان هێنا، ئەم واتا پیرۆزەش، کە ئاگر پەرەی پێدەدات، هەر سەردەکەوێت.

پاشان بواری جەنگیش خۆ هەر لەسەر زەویدا نیە، ژیانی دنیاش، هەر تەنها

ئەوە نیە. ئامادەبوانی جەنگەکەش، هەر تەنیا ئەو خەڵکەی سەردەمێك لە سەردەمەکان نیین. بەڵکو خەڵق کراوە بەرێزەکانی سەرووش (الملأ الأعلى) -واتە فریشتەکانی خوا-ش بەشداریی ڕووداوەکانی زەوی دەکەنو، ئامادەی دەبنو شاهێدیش دەبن لەسەریان. بەڵام بە تەرازوویەکی دی جودا لە تەرازووی زەویو لە هی نەوەیەك لە نەوەکان، دەیکێشن، تەنانەت بە تەرازوویەکی جودا لە تەرازووی هەموو نەوەکانی سەر زەوی.

ئەو خەڵکە بەرێزەی سەروو خۆیان چەندەها ڕۆحلەبەرن کە چەندان هێندەی خەڵکی سەر زەوین. هیچ گومانێکیش لەوەدا نیە، کە ستایشو ڕێزلێنانی ئەو خەڵکەی سەروو گەورەترو سەنگین ترە لە هەر تەرازووو پێوەرێکی بیروڕای خەڵکی سەر زەویو لە هەر تێڕوانینێکیان.

لەدوای هەموو ئەمەش ڕۆژی دوایی هەیەو، ئەمەش ئەو بوارە ڕەسەنەیە، کە بواری سەرزەوی پێی دەگاتو لێی جیانابێتەوە، نە لە ڕاستییە ڕوودراوەکەداو، نە لە هەست کردنی مرۆڤی باوەڕداریشدا بەو ڕاستییە.

کەواتە هێشتا جەنگەکە تەواو نەبووەو، کۆتاییـیە ڕاستەقینەکەیشی هێشتا نەهاتووە. بە حوکم دان لەسەر ئەو بەشە کەمەی، کە لە زەویدا ڕوویدا حوکمێکی نادروستە.. چونکە حوکم دانێکە بەسەر کەرتێکی کەمو کورتو بڕاوەیدا.

  

ڕوانینی یەکەم، ڕوانینێکی کورت مەوداو، بوار تەسکە، کە مرۆڤی بە پەلەو بزێو وای بۆ دەڕوانێت. ڕوانینی دووەمیش ڕوانینێکی گشتگیرو، دوور مەودایە کە قورئان باوەڕدارانی لەسەر ڕادەهێنێت، چونکە ئەو حەقیقەتە دەنوێنێت کە تێڕوانینی دروستی باوەڕداریتیی لەسەر وەستاوە. لەوێشەوە بەڵێنی خوا بۆ باوەڕداران هاتووە لەسەر پاداشتدانەوەی باوەڕهێنانو خواپەرستیو گوێڕایەڵیو، خۆڕاگریی لە بەرامبەر بەڵاو تاقیکاریی ڕۆژگارداو، سەرکەوتن بەسەر ئاشووبو فیتنەی ژیاندا، ئەم بەڵێنەی خواش لەسەر پاداشتدانەوەی باوەڕداران -بۆ دڵنیاییو

جێگیریی دڵە لەسەر ڕێبازەکە- وەك دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ الرعد﴾.

هەر ئەمەش ڕەزامەندیی و خۆشەویستیی لە خوای میهرەبانەوە تێدایە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾ مريم﴾.

دیارە لەنێو خەڵکە بەڕێزەکەی سەرووشدا (لەنێو فریشتەکاندا) خوا باسی بەندە چاکەکانی سەر زەوی دەکا، لەم ڕووەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **﴿إِذَا مَاتَ وَلَدُ الْعَبْدِ قَالَ اللَّهُ لِمَلَائِكَتِهِ: قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ. فَيَقُولُ: قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ. فَيَقُولُ: مَاذَا قَالَ عَبْدِي؟ فَيَقُولُونَ: حَمِدَكَ وَاسْتَرْجَعَ. فَيَقُولُ: ابْنُوا لِعَبْدِي بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ، وَسَمُّوهُ بَيْتَ الْحَمْدِ...﴾**[1].

واتە: ئەگەر کوڕی بەندەیەکی باوەڕداری خوا بمرێت، خوا لە فریشتەکانی خۆی دەپرسێت: ئایا گیانی ئەو کوڕەیتان کێشا؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ. دووبارە لێیان دەپرسێت: ئایا گیانی بەروبوومی دڵو جگەرگۆشەکەیتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ. ئنجا خوا لێیان دەپرسێت: ئەدی بەندەکەم چیی گوت؟ فریشتەکانیش دەڵێن: سوپاسی تۆی دەکردو دەیوت (انا لله وانا اليه راجعون). پاشان خوا بە فریشتەکان دەفەرموێت: لە پاداشتی ئەوەدا، خانوویەك لە بەهەشت بۆ ئەم بەندەیەم بنیات بنێن و ناوی بنێن: خانووی سوپاسگوزاری.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەم ڕووەوە فەرموویەتی: **﴿يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، فَإِذَا ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُ. فَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ شِبْرًا اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا اقْتَرَبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي مَشْيًا أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً﴾**[2].

---

١) أخرجه الترمذي.

٢) اخرجه الشيخان.

واتە: خوای گەورەو باڵادەست دەفەرموێت: من لە جێی متمانەی بەندەی خۆم دام، من لەگەڵیدام کاتێك یادو زیکری من دەکات، ئەگەر لە دڵو دەروونیدا زیکرو یادی منی کرد، ئەوا منیش لەلای خۆم بەیادی دەکەمەوە. خۆ ئەگەر لەنێو کۆمەڵە کەسێکدا یادو باسی منی کرد، ئەوا منیش لەنێو کۆمەڵە کەسێکی بەڕێزتر لە کۆمەڵەکەی ئەو باسو یادی دەکەم. ئەگەر بەقەد بستێك لێم نزیك بێتەوە، ئەوا من بەقەد قۆڵێك لێی نزیك دەبمەوە. ئەگەر بەقەد قۆڵێك لێم نزیك بێتەوە، ئەوا من گەزێك (دوو قۆڵ) لێی نزیك دەمەوە. خۆ ئەگەر بە رۆیشتن بەرەو لای من بێت، من بەڕاکردن بەرەو لای دەچم..

هەروەها خوای پەروەردگار دەربارەی خەریك بوونی خەڵقکراوانی سەروو (الملأ الأعلى) بە کاروباری باوەڕدارانەوە لەسەر زەوی، فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ٧﴾ غافر.

واتە: فریشتەکانی خوا، ئەوانەی کە عەرشی خوایان هەڵگرتووەو ئەوانەش کە لە دەوری عەرشەکەن، تەسبیحاتو نوێژو یادی خوا دەکەنو لە بەندایەتیو عیبادەت دانابڕێنو سوپاسی پەروەردگاریان دەکەنو باوەڕیشی پێ دێننو، داوای لێخۆشبوون بۆ کەسانی باوەڕدار دەکەنو دەڵێن: ئەی خوای پەروەردگارمان، تۆ بە ڕەحمەتو زانستی بەرفراوانی خۆت هەموو شتێکت گرتۆتەوەو پەلت بۆ هەموو مەخلوقات کێشاوە، داواکارین لێت خوایە، لەو بەندانە ببوریست، کە تەوبەیان کردووەو لە گوناهەکان پەشیمان بوونەتەوەو، دوای ڕێبازی دینەکەی تۆ کەوتوون، دە تۆش خوایە لە سزای ئاگری دۆزەخ بیانپارێزە.

ژیانێك لەلای خوا، هەر تەنها ژیانی دابینکراویەتی بۆ شەهیدان، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ١٦٩ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم

مِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ آل عمران﴾، واته: گومانت وانەبێت، كه ئەوانەی له ڕێی خوادا كوژران، چەند مردوویەك بن، بەڵكو چەند زیندوویەكن‌و، لەلای پەروەردگاری خۆیان بەردەوام رزق‌و رۆزییان پێ دەدرێت. ئەوانیش دڵشادن بەو نیعمەتانەی كه خوا به فەزڵ‌و چاكەی خۆی پێی بەخشیون، هەروەها ئەوان داواكارن مزگێنی بەو برایانەی خۆیان بدەن، كه هێشتا پێیان نەگەیشتوون‌و له دوایانەوەن، لەبارەی حاڵی خۆیشیانەوە هیچ ترس‌و نیگەرانییەكیان لەسەر نەماوەو دڵتەنگیش نین. پاشان داواكاریشن مژدەی پاداشتێكی زۆر له نیعمەت‌و فەزڵی زیاتری خوا كه پێیان دراوە، به چاكەكاران بگەیەنرێت، خواش بێگومان پاداشتی چاكەكاران ون ناكات.

لەلایەكی ترەوە خوا بەڵێنی دووبارەو چەندبارەكراوەی لەسەر ئەوەش داوە كه سزای كەسانی بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەران‌و پەیامەكانیان‌و، سزای ستەمكاران‌و تاوانباران له رۆژی دواییدا بدات، هەرچەندە ماوەیەكی كەم لەسەر زەویدا بواریان پێدەدات‌و، تا وادەیەكی دی دوایان دەخات، هەندێك جاریش هەر له دنیادا سزای هەندێك كەس دەدات، بەڵام سووربوونی تەواو لەسەر سزادانیان‌و ئاماژەی یەكەم بۆ ئاخیرەت كراوە، كه دوایین بەشه، وەك دەفەرموێت: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ ﴿١٩٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ آل عمران﴾.

هەروەها دەربارەی ستەمكاران خوا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ ﴿٤٣﴾ إبراهيم﴾.

واته: وا گومان مەبه، كه خوا بێئاگا بێت لەو تاوانە گەورانەی ستەمكاران ئەنجامیان دەدەن، بەڵام خوا دوایان دەخات بۆ رۆژێك كه كاتێك دەهێنرێنه پێش بۆ

لێپرسینەوە، چاوەکانیان زەقەو کراونەتەوەو لەترسی ئەو ڕۆژە پێڵووی چاوانیان بۆ بەیەکدا نادرێتەوە، بەخێرایی‌و ملکەچی‌و سەرشۆڕیشەوە دێنە پێشەوەو سەریان بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوەو چاوانیشیان بۆ داناخرێت‌و ئەبلەق بوون. دڵو هۆش‌و بیریشیان لەوەرگرتن‌و تێگەیشتن بەتاڵە بەهۆی زۆریی ئەو ترس‌و لەرزەیان کە هەیانە.

هەر دەربارەی کاروباری ئەو ستەمکارانە خوا لە جێیەکی تری قورئاندا فەرموویە: ﴿ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۚ ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾ المعارج ﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر، ئیدی واز لەو کافرانە بێنە، کە هیچ پەندو ئامۆژگاری یەك سوودی نیە بۆیان، وازیان لێ بێنە، تاکو بە ئارەزووی خۆیان چی قسە وباسیان لەسەر ناهەق هەیە لەنێو خۆیاندا دەیکەن‌و، لە دنیاشدا چی گاڵتەو گەمەی خۆیان هەیە بیکەن، تا دەگەن بەو ڕۆژەی، کە بەڵێنیان لەسەری پێدراوە، ئەو ڕۆژەی، کە بە پەلە لە گۆڕەکانیانەوە دێنە دەرەوەو بە پەلە دێن‌و ڕێك ڕادەوەستن -وەك چۆن لە دنیادا لەبەردەم بتەکانیان دەوەستان-، جا لەو ڕۆژەدا سەرشۆڕو چاو بەرەوژێرن بەهۆی ئەو سزایەوە، کە چاوەڕێی دەکەن‌و، کە هەر لەو کاتەدا ڕیسوایی‌و زەلیلی دایاندەگرێت. بێگومان ئەمەش ئەو ڕۆژەیە، کە لە دنیادا بەڵێنیان لەسەر هاتن‌و وەدیهێنانی پێدەدرا، کە چ بەدرۆیان دادەنا.

بەم ڕەنگەش ژیانی خەڵکی، بە ژیانی خەڵکی سەروو(مەلائیکە) پەیوەست کراوەو، دنیاش بە ڕۆژی دوایی یەوە پەیوەست کراوە. ئیدی هەر تەنها (زەوی) تاکە بواری جەنگی نێوان چاکەو خراپەو، هەق‌و ناهەق‌و، باوەڕو ستەمکاریی، نیە. ژیانی دنیاش دوا خولگە نیەو، وادەی یەکلاکردنەوەی ئەم ململانێیە نیە.. هەروەها ژیان‌و هەموو ئەو خۆشی‌و ئازارو بەختەوەریی‌و بێبەختییەش، کە پەیوەندییان پێوەی هەیە، ئەو بەها بەرزو گەورەیەی نێو تەرازووەکە نیە.

بوارەکە لە شوێن (مکان)ەکەدا فراوان بووە، لە سەردەم (زمان)ەکەشدا فراوان بووە.. هەروەها ئەم بوارە لە بیروباوەڕو، پێوەرو تەرازووەکانیشدا فراوان بووە. ئاسۆکانی دەروونی خاوەن باوەڕیش فراوان بووەو، مەسەلەکانی جێی بایەخ پێدانیشی گەورە بوون. ئیدی زەوی‌و ئەوەی لەسەریەتی، بچووك بوونەوە، ژیانی دنیاو، هەرچی پەیوەندیی پێوەی هەیە، بچووك بوونەوە. مرۆڤی باوەڕداریش بە رادەو ئەندازەی ئەو ئاسۆو زیندەگییانەی دیوێتی‌و زانیوێتی گەورە بووە.

چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە)یش لە لوتکەی دایە بۆ داڕشتنی ئەو تێڕوانین باوەڕدارێتییە گشتگیرو گەورەو پیرۆزە.

* * *

چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە)و سوورەتی (بروج) لەلایەکی دییەوە، شەپۆلێك تیشکی تر دەخەنە سەر سروشتی بانگەواز بۆ خواو، هەڵوێستی بانگەوازکاریش لە ئاست هەر ئەگەرێکدا.. بێگومان مێژووی بانگەوازیش بۆ لای خوا، چەندین نموونەی هەمەجۆری لە کۆتایی یەکانی ژیانی هەندێك گەل‌و کۆمەڵی بەخۆوە دیوە، کە بانگەوازی جۆربەجۆریشیان تیادا ئاڕاستە کراوە.. وەك کۆتایی هاتن‌و لەنێوچوونی گەلی (نوح)و گەلی (هود)و گەلی شوعەیب)و گەلی (لوط)و، لە هەریەکە لەو گەلانەشدا، تەنها تاقمێکی بەژمارە کەمی باوەڕدار لە سزای خوا رزگاریان بووە قورئانی پیرۆزیش دوای مانەوەی ئەم کەسە رزگاربوانە لەسەر زەوی‌و لە ژیاندا، باسی هیچ کارێکی تری ئەوانی لە ژیاندا نەکردووە.

ئەم نموونانەش، کە دەربارەی لەناوچوونی ئەو گەلانە دیاری کراون، دەیسەلمێنێت، کە خوای گەورەو باڵادەست، هەندێك جار دەیەوێت بەشێك لە سزای خۆی لە دنیادا بۆ بێباوەڕە ستەمکارو بەدرۆخەرەوەکانی بانگەوازی پێغەمبەران بنێرێت. بەڵام سزای هەرە دیارو هەرە تەواو لە رۆژی قیامەتدا پێیان دەگەیەنێت..

هەروەها مێژووی بانگەوازی لەناوچوونی فیرعەون‌و سەربازەکانی بەخۆوە بینیوە. هاوکات لەگەڵ ئەوەدا ڕزگاربوونی موساو گەلەکەی موساشی بەخۆوە

بینیوە، لەگەڵ دیتنی دەسەڵاتداریتیی ئەو گەلەدا بۆ ماوەیەك، كە لە هەموو نەوەكانی تریان- لەمێژووی خۆیان- باشتر بوون، سەرەڕای ئەوەی هەرگیز بە تەواوەتی لەسەر ئیمانەكەیان جێگیر نەبوونو، هەرگیز ئایینی خوایان بە تەواوەتی لەسەر زەویدا وەك بەرنامەیەكی هەمەلایەنەی ژیان پەیڕەو نەكردووە. ئەم نموونەیەشمان وەك نموونەكانی زوو نیە.

هەروەها مێژووی بانگەوازی لەناوچوونی ئەو موشریكانەی قورەیشی بەخۆوە بینیوە، كە لە ڕێی ڕاستو باوەڕهێنان بە پێغەمبەری خوا محمد ﷺ یاخی بوون، لەگەڵ دیتنی سەركەوتنی تەواوی موسڵمانان، لەگەڵ سەركەوتنی عەقیدەش لە دڵو دەروونیاندا بەو شێوە دەگمەنو سەرسوڕهێنە. بۆ یەكەم جاریش لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەرنامەی خوا لەسەر زەوی پەیڕەو كرا، كە سەرتاپای لایەنەكانی ژیانی گرتەوەو لە شێوازێكی واشدا پیادە كرا، كە هەرگیز گرۆی بەشەری نە لەوەوپێشو، نە لەوەوپاش پێی ئاشنا نەبووە.

هەم دیسان مێژووی بانگەوازیی، نموونەی كارەساتی، وەك (هاوەڵانی چاڵە گەورەكە)ی بەخۆوە بینیوە -كە لەم باسەدا هاتە بەرچاومان-، جگە لە دیتنی چەندین نموونەی دی، كە لە تۆماری مێژووی ئیمانداریی سەردەمی كۆنو نوێدا كەمتر دەرخراون. بەردەوام مێژووی بانگەواز، چەندەها نموونەی تریشی بەخۆوە دەبینێت، كە لە پلەو ئاستەكانی ئەو جۆرە ئاكامو سەرەنجامانە دان، كە پێشتر لە سەردەمەكانی تردا تووشی گەلانی سەر ڕووی زەمین بوون.

هەر دەبوو ئەم جۆرە نموونەیەی وەك كارەساتی (هاوەڵانی چاڵە گەورەكە) لەپاڵ نموونەی بەسەرهاتە هەمەجۆرەكانی تردا -چ ئەوانەی لێوەی نزیكنو هاوشێوەی ئەون، چ ئەوانەش لێوەی دوورن ڕوویدات.

هەر دەبوو ئەم نموونە دڵتەزێنەش، كە باوەڕداران تیایدا ڕزگار نەبوونو، باسی سزادانی كافرانیشی تیادا نەكراوە ڕوبدات، تاكو لە هەستو نەستی باوەڕداران- خاوەنانی بانگەوازی خواییدا- ئەو مەسەلەیە جێگیر ببێت، كە لەوانەیە بگەنەبەر

ئاکامێکی، وەك ئەم جۆرە کارەساتە لەکاتی ڕۆیشتنیان بە ڕێگای خوادا، هەروەها هیچ خواستێکی خۆشیان تیادا نابێت، چونکە کاروباری خۆیانو کاروباری عەقیدەکەشیان بە خوا سپاردووە.

بۆیە ئەوان تەنها ڕاپەڕاندنی ئەرکی خۆیان لەسەرەو، دوای ئەوە دەڕۆن - سا بە هەر ئاکامێك بڕۆن- هەم دیسان ئەرکێکی تریان ئەوەیە، کە ڕەزامەندیی خوا هەڵبژێرنو، عەقیدەکەیان لەژیان بەگرنگتر دابنێنو، هەر بە هۆی ئیمانەکەشیانەوە بەسەر فیتنەو نارەحەتیدا زاڵ بنو، لەگەڵ خواشدا چ لە کارکردنو چ لە نیازو مەبەستیاندا ڕاستگۆ بن. پاشان خواش بە خواستی خۆی ئاکامەکان بەسەر ئەوانو دوژمنانیشیاندا دێنێت، وەك چۆن بەسەر بانگەوازو دینەکەشیدا دێنێت. ئیدی دەگەنە جۆرە کۆتاییەك لەو کۆتاییانەی، کە مێژووی باوەڕداریتی بەخۆیەوە بینیویەتی، یان هەر جۆرە کۆتاییەکی دی، کە خوا خۆی - بەپێی خواستو تێڕوانینی دانایانەی خۆی- بەدیی دەهێنێت.

بانگەوازکارانیش چەند کرێکارێکی لای خوانو، خوا لە هەر شوێنێكو لە هەر کاتێكو لە هەر شێوازێکدا کاریان لێ بخوازێت، ئەوانیش دەیکەنو، کرێ زانراوەکەی کاری خۆیان وەردەگرن. جا ئەگەر چارەنووسی بانگەوازەکەش بەرەو هەر لایەك بڕوات، ئەوە بێگومان بەدەست بانگەوازکاران نیەو لەسەر ئەوانیش حیساب نیە، چونکە ئەوە لە دەسەڵاتی خاوەن کارەکەدایە، کە بەکرێ دەبەخشێت، نەك لە دەسەڵاتی کرێکارەکاندا.

جا کاتێك بانگەوازکاران یەکەم بڕی کرێکەیان وەردەگرن، ئەو بڕەش، واتە ئارامی یەك لەنێو دڵداو، بەرزبوونەوەیەکیش لە هەستو شعورداو، جوانی یەکیش لە تێڕوانینداو، ئازادبوونێکیش لە کۆتو پێوەندو شتە فریودەرەو بە کێشکەرەکانو، ڕزگاربوونیش لە ترسو بێئارامی لە گشت جۆرە حاڵەتێکدا.

هەروەها کاتێك بڕی دووەمی کرێکە وەردەگرن، کە ستایش کردنی خوایە، واتە خوا لەلای خەڵقکراوە بەڕێزەکانی لای خۆی بە باسکردنیانو ڕێزلێنانیانەوە

ستایشیان دەکات، ئەوان هێشتا لەسەر گۆی ئەم زەوییە بچووکەدان..

پاشان بڕێکی هێجگار گەورەتر لە ڕۆژی ئاخیرەتدا وەردەگرن، کە حسابێکی زۆر کەم و ئاسانیان لەگەڵدا دەکرێت و نیعمەتێکی فرە گەورەیان پێ دەدرێت.

بەخششێکی دی، کە لەگەڵ هەر بڕێك لە کرێکەدا بە کارگوزارانی بانگەواز دەدرێت، کە لە هەمووشیان گەورەترە، ڕەزامەندیی خوایە بۆ ئەوان، ئەوانیش بۆ ئەوە هەڵبژێردراون، کە ببنە چەند ئامرازێکی قەدەری خواو، پەردەیەکیش بۆ قودرەتی، کە بێگومان خوا بە خواستو توانای خۆی هەر کارێکی بوێت، پێیان دەکات.

* * *

هەر بەم ڕەنگەش پەروەردە قورئانییەکە ئەو دەستە بژاردەیەی موسڵمانانی سەردەمیی یەکەمی بەو پێشکەوتنە گەیاندو، لە خەریك بوون بە کاروباری شەخصیو تایبەتیی خۆیان رزگاری کردنو قوتاری کردن، بۆ ئەوەی ببنە چەند کرێکارێك لەلای خاوەنی کارەکەو، ئەوەی خوا بۆی دانان بە هەر بارێکداو، بە هەر حاڵێکدا بوو، پەسەندیان کردو پێی ڕازی بوون.

پەروەردەکردنی پێغەمبەریش ﷺ بۆئەوان بەپێی ڕێنمایی یەکانی قورئان بوو، کە دڵانی ئەوانو سەرەنجەکانیانی بەرەو بەهەشت ئاراستە دەکرد، بەڵام سەرەتا بۆ ئارام گرتن لەسەر ئەو ڕۆڵە هەڵبژێرراوەیان ئاراستەی دەکردن، تا خوا خۆی بە خواستی دانایانەی خۆی لە دنیاو لە ئاخیرەتیشدا چییان بۆ بەدیی دەهێنێت.

ئەوەبوو - بۆ نموونە- پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەیبینی ئەوا (عەممار)و دایكو باوکی- خوا لێیان ڕازی بێت- لە مەککە سزایەکی توند دەدرێن، هیچ ڕێنمایی یەکی زیاتری لە (ئارامگرتن) ئاراستە نەدەکردن، بەڵکو پێی دەفەرموون: ((صبراً آل یاسر.. **موعدکم الجنّة**/ ئارام بگرن ئەی خانەوادەی یاسر.. وادەی ئێوە بەهەشتە.)).

لە (خەبابی کوڕی ئەرەت)ەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گێڕراوەتەوە، کە گوتوویەتی: سکاڵامان لە دەست حاڵی خۆمان لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، لەکاتێکدا لەسەر کەواکەی لەبەر سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، لێمان پرسی: ئەی داوای هاناو کۆمەکمان بۆ ناکەیت؟ لەلای خوا نزامان بۆ ناکەیت؟ ئەویش فەرمووی: ﴿قَدْ كَانَ مَنْ قَبْلَكُمْ، يُؤْخَذُ الرَّجُلُ فَيُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ، فَيُجْعَلُ فِيهَا، ثُمَّ يُؤتَى بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ، فَيُجْعَلُ نِصْفَيْنِ، وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ وَعَظْمِهِ، فَمَا يُبْعِدُهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ. وَاللَّهِ لَيَتِمَّنَّ هَذَا الأَمْرُ، حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ، فلا يَخَافُ إِلاَّ اللهَ، وَالذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ، وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ (١).

واتە: لەپێش ئێوەداو لە سەردەمانی پێشوودا ئیماندار دەسگیردەکراو چاڵێکی لە زەویدا بۆ هەڵدەکەنراو تێی فڕێ دەدرا، پاشان مشارێکیان دەهێناو دەیانخستە سەر سەری‌و لاشەیان دەبڕی یەوەو دەیانکرد بە دوو کەرتەوە. یان بە شانەی ئاسنین گۆشت‌و ئێسقانی داهێنراوە، بەڵام ئەوە لە دینەکەی خۆی دووری نەخستۆتەوە.. دەسا بەخوا، خوا ئەم دینەی سەردەخات‌و هێندەش ئارامی‌و متمانە دادێت کە سوارێك لە (صنعا)وە هەتا (حەزرەمەوت) دەڕوات‌و لە خوا نەبێت لە هیچ کەسێکی دی ناترسێت‌و ترسی گورگیش لەسەر ڕانەکەی. بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.

* * *

بێگومان خوا حیکمەتێکی لە پشت گشت بارودۆخ‌و گشت حاڵەتێکەوە هەیەو، هەڵسوڕێنەری هەموو گەردوونەو، ئاگاداری سەرەتاو کۆتاییەتی‌و، ڕێکخەری ڕووداو و پەیوەندییەکان‌و شتە پێکەوە بەستراوەکانە.

هەندێك جار دوای چەندین نەوەو سەدە حیکمەتی ڕووداوێکمان بۆ ئاشکرا دەبێت، کە هاوسەردەمەکانی ئەو ڕووداوە پەی‌یان پێ نەبردووە. لەوانەشە هەندێك کەس پرسیبێتی: (بۆچی؟ خوایە بۆچی ئەمانە ڕوودەدات؟) ئەم پرسیارەش ئەو

---

١) أخرجه البخاري.

نەفامی یەیە، کە دەبێت مرۆڤی باوەڕدار خۆی لێ بپارێزێت، چونکە لە سەرەتاوە دەزانێت کە حیکمەتێك لە پشتی هەموو قەدەرێکەوە هەیە.

جا لەبەر ئەوەی بواری تێڕوانینەکەی فراوانەو، ماوەی سەردەمو شوێنو بیروباوەڕو بەهاو پێوەرەکانیش دوور مەودان، ئەوا هەر ئەوەندە بەسە، کە سەرەتا وای لێ بکات بیر لە وروژاندنی ئەو جۆرە پرسیارانە نەکاتەوە، ئیدی بەوپەڕی خۆدانە دەست قەدەری خواو دڵنیایییەوە لەگەڵ سووڕی قەدەردا دەڕوات.

بێگومان قورئان چەند دڵانێکی وا بنیات دەنێت، کە ئامادەو سازیان دەکات بۆ هەڵگرتنی سپاردەکە. ئەم دڵانەش دەبێت هێندە پتەوو بەهێزو ساغ بن، کە لە کاتێکدا هەموو شتێك دەخەنە گەڕو، بەرگەی هەموو شتێکیش دەگرن، بۆ هیچ شتێك لە زەویدا ئاوڕ نەدەنەوەو، سەیری هیچ شتێك نەکەن، تەنها بۆ ڕۆژی دوایی بڕوانن. بەتەمای هیچ شتێکیش نەبن، تەنها ڕەزامەندیی خوا نەبێت. بەڵکو دڵانێك بن، کە ئامادە بن ماوەی هەموو ژیانی سەر زەوی، تا مردن بە ناڕەحەتیو سەختیو بێبەش بوونو سزاو قوربانی دانەوە ببڕنو، لەم زەوییەشدا هیچ پاداشتێکی زووتر وەرنەگرن، هەرچەندە ئەم پاداشتە - لە هەندێك زەماندا- سەرکەوتنی بانگەوازەکە بێتو سەرکەوتنی ئیسلام باڵادەستیی موسڵمانان بێت، یان هەرچەندە ئەم پاداشتە خێرایەی دنیا، لەناوچوونی ستەمکارانیش بێت، کە خوای باڵادەستو بەتوانا دەیانگرێتو لەنێویان دەبات، وەك چۆن ئەم کارەساتەی بەسەر ستەمکارانی پێشیندا هێناوە، کە پەیامی خوایان بەدرۆ دادەنا.

تەنانەت ئەگەر کاتێك ئەم دڵە پڕ لە باوەڕانە، بەچاکی دەزانن، کە هیچ دەربازێکی تریان لە گەشتی ژیانی زەوییاندا نیە، تەنها ئەوە نەبێت، کە بەبێ بەرامبەر -ئەو بەرامبەرە هەرچییەك بێت- دەبێت ببەخشنو، تەنها چاوەڕێی ژیانی ئاخیرەت بکەن بۆ جیاکردنەوەی حەقو ناهەق لە یەکتری. هەروەها تەنانەت کاتێك ئەم دڵانە ڕاستیی نیەتو ئامانجی خۆیان بەدیکردو خواش ئەوەی لێ بەدیی کردن، کە لەسەر بەیعەتو بەڵێنی خۆیان نیەتی راستو پاکیان هەیەو، لەسەر ئەو بنچینەیەش سەرکەوتنی لە زەویدا پێدانو، کردنی بە سپاردەیەك

لەسەریان. نەك بۆ خۆیان، بەڵكو دەبێت سپاردەی بەرنامەی خوایی بگەیەنن‌و، شایستەی گەیاندنی ئەمانەش بن، لەو كاتەوەی بەڵێنی هیچ دەسكەوتێكی دنیاشیان پێ‌نەدراوەو بۆ دەسكەوتێكی بەخشراوی زەویشیان نەڕوانیوە، ئەوسا دەردەكەوێت، كە ئەم دڵانە تەنها بۆ خوا ساغ‌و یەكلابوونەتەوەو بە ڕاستیش زانیویانە، كە لەدنیادا بەتەمای هیچ پاداشتێك نابن تەنها ڕەزامەندیی خوا نەبێت.

جا هەموو ئەو ئایەتانەش، كە باسی سەركەوتنیان تێدا كراوەو، باسی دەسكەوتەكان‌و باسی سزای خوا بۆ موشریك‌و بێ‌باوەڕان لەسەر دەستی باوەڕداران كراوە، لە شاری مەدینە ئەو ئایەتانە هاتونەتە خوارەوە. واتە دوای ئەو بانگەوازەو، دوای ئەوەی مەسەلەو كاروبارەكان لە دەرەوەی بەرنامەی مرۆڤی باوەڕدارو چاوەڕوانی‌و ڕوانینیدا بووە، ئیدی سەركەوتنەكەش خۆی هاتووە، چونكە خواستی خوا وای گەیاندووە، كە ئەم مەنهەجە واقیعیەتێكی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەبێت‌و، لە وێنەیەكی كردەیی (عملی)ی دەستنیشانكراودا، كە هەموو نەوەكان (أجیال) دەیبینن، بڕیاری لەسەر دەدات. چونكە ئەو سەركەوتنە -وەك پاداشتێكی ماندووبوون‌و ناڕەحەتی‌و قوربانیدان‌و ئازارەكانی سزاو ئەشكەنجەخواردن- نەهاتووە، بەڵكو بە بڕیارێك لە قەدەری خواوە هاتووە، كە حیكمەتێكیشی لە پشتەوەیەو، ئێستاش هەوڵی بەدییكردنی دەدەین.

هەمدیسان ئەم ئاوڕدانەوەیە، شایستەی سەرنج دان‌و لێوردبوونەوەی بانگەوازكارانی ڕێی خوایە لە هەر ناوچەو سەردەم‌و، هەر نەوەیەكی گرۆی بەشەریدا. هەر ئەمەش توانای ئەوەی هەیە، كە مەشخەڵ‌و ڕووبەندەكانی ڕێگاكە (معالم الطریق)یان بەڕوونی‌و، بەبێ تەم‌ومژ پیشان بدات‌و، هەنگاوەكانی ئەو ئیماندارانەش جێگیر كات، كە دەیانەوێت ڕێگاكە بەرەو كۆتاییەكەی ببڕن -سا ئیتر ئەم كۆتاییە هەرچۆنێكیش بێت-، ئەوساش قەدەری خوا لەسەر بانگەوازەكەیان‌و لەسەر خۆیشیان بەو ڕەنگە دەبێت، كە خوا دەیخوازێت.

بۆیە ئەم ئیماندارە بانگەوازكارانەش، لەكاتی ڕۆیشتنیاندا بەو ڕێگا خوێناوییەدا، كە -بە كەللە سەرەكان‌و لاشە پارچە پارچە بووەكان‌و، بە عەرەق‌و

خوێن- ڕاخراوه، بۆ هیچ سەرکەوتنێك یان زاڵ بوونێك ناڕوانن، یان بۆ هیچ خاڵێکی جیاکەرەوەی نێوانی هەق‌و ناهەقیش لەم زەوییەدا، ناڕوانن. بەڵام ئەگەر خواش خواستی وابێت شتێك لەمانە -له سەرکەوتن، زاڵ بوون، خاڵی جیاکەرەوەی نێوان هەق‌و ناهەق- بە بانگەوازەکەی‌و دینەکەی خۆی ببەخشێت، ئەوا ئەم خواستەی خوا- نەك وەك پاداشتێك لەسەر ئازارو ئەشکەنجەو قوربانیدان-بەدی دێت، نەخێر، چونکه ژیانی سەر زەوی خانەی پاداشتدانەوه نیه، بەڵکو بەدی هاتنێکی قەدەری خوایه له کاروباری بانگەوازەکەی‌و، مەنهەجەکەیدا، که لەسەردەستی چەند کەسێك له بەندەکانی بە ئەنجامی دەگەیەنێت تاکو بە ویستی دانایانەی خۆی کارێکیان پێ ڕاهیی بکات. ئەوانیش ئەم خواستە بەشخندانەیەی خوایان له دنیادا بەسه، که ئەم ژیانە له بەرامبەریدا سووك‌و سانا دەبێتەوەو هەر ڕووداوێکی تری گەشتی ژیانی زەویش، له خۆشی‌و ناخۆشیدا، هەر سووك‌و ساناو بێ‌بەها دەبێت.

❊ ❊ ❊

حەقیقەتێکی دی هەیه، که ڕستەیەك له ئایەتەکانی تایبەت بە لێکدانەوەو بەدواداچوونی قورئان لەسەر چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) ئاماژەی بۆ دەکات، که له فەرمایشتەکەی خوادایه: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝٨ البروج﴾، واتە: ئەوانە بۆیە ڕقیان لە باوەڕدارەکان هەستاو بەو شێوەیە داخی دڵی خۆیان پێ ڕشتن، چونکه باوەڕیان بەخوای سەروەرو سوپاسکراو هێنابوو.

جا ئەو حەقیقەتەی، که ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکات، که پێویستە باوەڕدارانی بانگەوازکار بۆ لای خوا لە گشت خاك‌و نەوەیەکدا لێی ورد ببنەوە، ئەوەیە بێگومان جەنگی نێوان باوەڕداران‌و ناحەزانیان لە بنج‌و بناواندا جەنگێکی ئایدیۆلۆژی- عەقیدەیی-یەو، لە ڕاستیدا لەسەر هیچ شتێکی دی نیه.

ناحەزانیشیان تەنها لەسەر باوەڕو ئیمانداریێتی یەکەیە، کە سزاو ئازار بە باوەڕداران دەگەیەنن و، تەنها بەهۆی عەقیدەشەوەیە، کە لێیان پەستو توورە دەبن.

بێگومان ئەمە جەنگێکی سیاسیش نیەو، جەنگێکی ئابووریش نیەو، جەنگێکی نەتەوایەتی و ڕەگەزپەرستیش نیە، خۆ ئەگەر جەنگەکە لەسەر یەکێك لەو لایەنانە بوایە، ئەوا ڕاوەستاندنی ئاسان دەبووو، چارەسەری هەر گرفتێکی تریشی هەر ئاسان دەبوو. بەڵام لە بنەڕەتو کرۆکی خۆیدا جەنگێکی عەقیدەیی یەو، سا ئیتر یان (کفر) باڵادەست دەبێت، یان (ئیمان)، هەروەها یان (جەهل و نەفامی) باڵادەست دەبێت، یان (ئیسلام)..

ئەوەبوو لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامیشدا گەورە موشریکانی قورەیش، هەموو جۆرە ماڵو سامانو کەرەسەیەکی فریودەری دنیایان دەخستە خزمەتی پێغەمبەری خواوە ﷺ لە بەرامبەری تاکە یەك شتدا، ئەوەبوو، کە واز لە جەنگە عەقیدەیی یەکەی بێنێتو، لەوەدا خاوبێتەوەو سازش بکات. خۆ ئەگەر -حاشاو دوور لە ڕووی پێغەمبەر ﷺ- وەڵامی تۆزقاڵێك لەو خواستانەی ئەوانی بدایەتەوە، ئەوا لە زەمینەی واقیعدا، جەنگێك لەنێوان خۆیو ئەواندا نەدەما.

بەڕاستی ئەمەش مەسەلەی عەقیدەیەو، جەنگی عەقیدەیەو، پێویستە باوەڕداران هەرکاتێك ڕووبەڕووی دوژمنێکیان دەبنەوە بە چاکی دەرکی پێبکەن. چونکە ئەو تەنها لەبەر ئەو عەقیدەیە دژایەتیی دەکرێتو، دژایەتیشیان دەکات (﴿إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾). هەروەها پێویستە ئیمانداران لەم جەنگەدا تەنها گوێڕایەڵو ملکەچی خوا بن.

لەوانەشە دوژمنانی باوەڕداران، ئاڵایەکی تری غەیرە عەقیدە لە جەنگەکەدا بەرزکەنەوە، وەك ئاڵایەکی ئابووری، یان سیاسی، یان ڕەگەزپەرستیی نەتەوایەتی، تاکو حەقیقەتی جەنگەکە لە باوەڕداران هەڵگێڕنەوەو، بڵێسەی عەقیدەش لە ڕۆحیاندا بکوژێننەوە. بۆیە ئەرکی باوەڕدارانیش ئەوەیە، کە بەوە هەڵنەخەڵەتێنو، دەبێت بشزانن، کە ئەوە هەڵگێڕانەوەیەکی هەقە بۆ سەر باری ناهەق بۆ

مەبەستێكی پەنهانی. جا ئەو كەسەش، كە ئالاّو دروشمی جەنگەكان دەگۆڕێت، لەڕاستیدا دەیەوێت باوەڕداران بەو جۆرە فریو بدات، كە لە چەكی ڕاستەقینەی سەركەوتن دووریان خاتەوە، سا ئیتر هەر جۆرە سەركەوتنێك بێت، سەركەوتنی لایەنی ڕۆحی وەك بۆ باوەڕداران لە ڕووداوی چاڵەگەورەكە ڕوویدا، یان سەروەریو باڵادەستی- كە لە سەركەوتنی ڕۆحییەوە سەرچاوەی گرتووە- وەك ئەوەی بۆ نەوەی یەكەمی موسڵمانان ڕوویدا.

ئێمەش لە سەردەمی ئەمڕۆماندا نمونەیەك لە شێواندنی ئالاّو دروشمەكان دەبینین وەك هەوڵدانێكی خاچپەرستیی جیهانی، بەوەش دەیەوێت باری ڕاستی جەنگەكەمان لێ ئاوەژوو كاتو، مێژووش بشێوێنێتو، ئیددیعای ئەوەمان لەلا بكەن، گوایە جەنگەكانی خاچپەرستان بۆ پەردەپۆشیی داگیركاری بووە.. نەخێر.. لەڕاستیدا داگیركەر لەم سەردەمانەی دواییدا، دەركەوت بۆ پەردەپۆشیی ئەو گیانی خاچپەرستییە بوو، كە نەیدەتوانی وەك سەدەكانی ناوەڕاست خۆی پیشان بدات! كە لەو سەدانەدا لەسەر گاشەبەردی عەقیدەو بە سەركردایەتی موسڵمانان، لە گشت جۆرە تیرەو ڕەگەزو نەتەوەیەك، بەزیو تێكشكا، لەو سەركردانە (صلاح الدین)ی كوردیو، (تۆران شا)ی مەملوكی، ئەو سەركردانەی لایەنی نەتەوایەتییان فەرامۆش كردووەو، عەقیدەو بیروباوەڕیان بەدیار خستووەو، لەژێر ئالاّی عەقیدەكەشیاندا سەركەوتوون.

﴿ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ البروج ﴾.

بەڕاستی خواش لەمەدا ڕاستی فەرمووەو، هەر فەرمایشتی خوا ڕاستەو، چەواشەكارانو فریودەرانیش درۆ دەكەنو، هەموو ئالاّو دروشمو ئیددیعاكانیان بۆ چەواشەكاریو فریودانە.

# وتـــەی کۆتـایی

بەم ڕەنگە کۆتایی دێنین بەو وتەو لێدوانەمان- هێندەی کە خوا بەقەدەری خۆی بۆی دانـابووین- دەربـارەی (چـیرۆکەکانی پێـشینان لـە قورئانـدا)، لـەم بەشـەی سێیەمدا، بەم بەشە کۆتایی دێـنین بـەو نوسـینو لێکۆڵینـەوەمان دەربـارەی ئـەو چیـرۆکە.

لەم بەشەدا دەربارەی ئەم هەشت چیرۆکە دواین:

یەکەم: چیرۆکی هاروتو ماروت لە سوورەتی (البقرة)دا.

دووەم: چیرۆکی ئەو پیاوەی بـەلای شارۆچـکەکەدا تێپـەڕی، هـەر لـە سـوورەتی (البقرة)دا.

سێیەم: چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەم، لە سوورەتی (المائدة)دا.

چوارەم: چیرۆکی ئەو کەسەی خۆی لە پەیڕەوکردنی ئایەتەکانی خوا دامـاڵی، لـە سوورەتی (الاعراف)دا.

پێنجەم: چیرۆکی (لوقمان) لە سورەتی (لقمان)دا.

شەشەم: چیرۆکی (سەبەء) لە سوورەتی (سبأ)دا.

حەوتەم: چیرۆکی دانیشتوانی شارۆچکەکە، لە سوورەتی (یس)دا.

هەشتەم: چیرۆکی (هاوەڵانی چاڵە گەورەکە) لە سوورەتی (البروج)دا.

بەڕاستی هەڵوێستو تێڕامانەکان لە ئاست ئەو چیرۆکانەدا درێژ بوونو، سـەرنج لێدانو تێڕوانینیش لێیان وردو قووڵ بوون، ئەو وانەو دەرسانەش لێیان دەرهێنـرا، زۆرو هەمەلایەنە بوون، ئامـاژەو ڕێنمـایی یـە سروودبەخشەکانیـشیان کاریگـەرو سەرنج ڕاکێش بوون، سوپاس بۆ خوا.

ئێمە ئیددیعای ئەوە بۆ خۆمان ناکەین، کە لە هەر وتەیەکماندا ڕاستیمان پێکابێت، چونکە هەڵە نەکردنو پارێزراوی (عصمة) تەنها بۆ پێغەمبەری خوا بووە ﷺ تەواویی و ڕێكوپێکیش لە گشت لایەنێکەوە تەنها بۆ خوای بالادەستە، کاری ئێمەش ئەوەیە، کە هەوڵو کۆششمان تیادا کردووەو لەسەر ڕاستیو پێکانی حەقیقەت سوور بووین، جا ئەگەر هەڵەشمان کردبێت، ئەوە بێگومان هەڵەیەکی بە ئەنقەستو بە مەبەست نەبووە، بەڵکو لە دیاردە لکێنراوەکانی ئەو لاوازییە مرۆییە یەمانەوەیە کە بە هەموو مرۆڤێکەوە لکاوە.

هەروەها ئێمە ئیددیعای ئەوە ناکەین، کە پەلمان هاویشتبێت بۆ هەموو ئەو دەرسو ڕێنمایییو پەندو ئامۆژگارییو وتە نەستەقو ئاماژەو سەرنجو ئاڕاستانەی کە لەو چیرۆکانەوە دەردەهێنرێت، بەڵکو ئەوەی وەرمان گرتووە لێیانەوە، تەنها مشتێکی خەوارێکەو، بەشێکی کەمە لەو گەنجینە زۆرو دەوڵەمەندو فرەیەی قورئان. قورئانیش فێر ئەوەی کردووین کە بە گیانێکی لەخۆبوردوانەوە لەخوا بپاڕێینەوەو بڵێین (خوایە زانستی زیاترمان پێ ببەخشە)و، کەموکورتیو نەزانینو کەمیی زانستو زانیاریی ئێمەی بۆ دەرخستووین، کە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ الإسراء﴾، واتە: ئێوە تەنها بڕێکی کەمتان لە زانستو زانیاری پێدراوە.

ئێمە داواکارین لە خوشكو برایانمان - لە شوێنکەوتوانی قورئانو سەربازانی قورئان- کە هەڵوێستەی درێژ لە ئاست ئەم چیرۆکانەی نێو قورئاندا بکەنو، سەرنجی قووڵیان لێبدەن، ئیدی ئەوانیش هەڵوێستە لە ئاست ئەو دەستەواژانە دەکەن کە ئێمە هەڵوێستەمان لە ئاستیاندا کردووە، دیارە بەم پێیە ئەوان دەرسو پەندی تری لێدەردێنن، کە ئێمە لێیمان دەرنەهێناوە، هەروەها ئاوڕ لە هەندێك شتی تریان تیادا دەدەنەوە، کە ئێمە ئاوڕمان لێنەدابێتەوە.

ئایەتەکانی قورئانیش بەو ڕێنمایی‌و پەندو وانەو ئاماژەو سەرگوزەشتەو وتە نەستەق‌و ئاراستەکارییانەیانەوە گەنجینەیەکن کە هەرگیز نابڕێتەوەو، دەریایەکن کە هەرگیز وشك ناکات‌و، کارێزێکی سازگاریشن، کە هەرگیز ئاوی لێ نابڕێت‌و، بەخششێکی بەردەوام‌و تازەبووەوەشن تاکو ڕۆژی قیامەت.

ئێمەش لە خوا دەپاڕێینەوە کە نیعمەتی ژیانمان لە سایەی قورئاندا لەسەر بەردەوام کات‌و لە خێرو بەرەکەت‌و واتە قووڵەکانیمان بە لێشاو بەسەردا بڕێژێت‌و، لە فتوحات‌و کردنەوەی دڵان‌و وڵاتاندا، دەرگای ڕەحمەتمان لێ بکاتەوەو، ئەم قورئانە پیرۆزو خۆشەویستەش، بکاتە بەهاری دڵەکانمان‌و، ڕووناکیی سینەکانمان‌و، نەمانی خەمەکانمان‌و، ڕەوینەوەی پەژارەکانمان‌و، بواری خوێندنەوەی قورئانیشمان، لە کاتە ناسکەکانی شەوگارو کاتە سەرەتاو کۆتاییەکانی ڕۆژگاردا بۆ برەخسێنێت، ئەو مەسەلانەش، کە لە قورئاندا نەمانزانیوە، زانستی هەموویانمان فێرکات‌و، ئەوەی بیریشمان چووە بە بیرمانی بێنێتەوەو، بیشیکاتە بەڵگەیەك بۆمان لە ڕۆژی قیامەتدا.

ئیدی هەر سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە بە نیعمەتی ئەو، هەموو کارە چاکەکانیش بەدیی دێن.. سڵاوو دروودی بێ‌پایانیش بۆ سەر گیانی گەورەمان، پێغەمبەری نەخوێندەواری خوا، محمد ﷺ.

# سەرچاوەکان

١ ــ أصحاب الأخدود، لرفاعي سرور. دار نشر التراث العربي ــ القاهرة ــ ١٩٧٧م.
٢ ــ البداية والنهاية، للإمام ابن كثير. مكتبة المعارف ــ بيروت ــ الطبعة الأولى ١٩٦٦م.
٣ ــ تفسير القرآن الحكيم «تفسير المنار»، لرشيد رضا. دارالمعرفة ــ بيروت ــ الطبعة الثانية ــ بدون تاريخ.
٤ ــ التفسير الكبير، للإمام الرازي. دار الكتب العلمية ــ طهران ــ بدون تاريخ.
٥ ــ جامع البيان عن تأويل آي القرآن، للإمام ابن جرير الطبري. تحقيق محمود شاكر ــ دار المعارف ــ مصر ــ بدون تاريخ.
٦ ــ الجامع لأحكام القرآن، للإمام القرطبي. دار الكتاب العربي بمصر ــ الطبعة الثالثة ١٩٦٧م.
٧ ــ حجة القراءات، لابن زنجلة ــ تحقيق سعيد الأفغاني. مؤسسة الرسالة ــ بيروت ــ الطبعة الثالثة ١٩٨٢م.
٨ ــ الدر المنثور في التفسير بالمأثور، لجلال الدين السيوطي. دار الفكر ــ بيروت ــ الطبعة الأولى ١٩٨٣م.
٩ ــ الروض الأنف شرح سيرة ابن هشام، للإمام السهيلي ــ تحقيق عبد الرحمن الوكيل. دار الكتب العربية ــ مصر ــ بدون تاريخ.
١٠ ــ شرح النووي على مسلم، للإمام النووي. المكتبة المصرية ومطبعتها ــ القاهرة ــ بدون تاريخ.
١١ ــ صحيح الإمام مسلم، بعناية محمد فؤاد عبد الباقي. دار الفكر ــ بيروت ــ بدون تاريخ.

١٢ ـ صفحات من صبر العلماء على شدائد العلم والتحصيل، لعبد الفتاح أبو غدة. مكتب نشر المطبوعات الإسلامية ـ ١٣٩١هـ ـ ١٩٧١م.

١٣ ـ عرائس المجالس في قصص الأنبياء، لأبي إسحاق الثعلبي. المكتبة الثقافية ـ بيروت ـ بدون تاريخ.

١٤ ـ عمدة التفسير عن الحافظ ابن كثير، لأحمد شاكر. دار المعارف بمصر ـ بدون تاريخ.

١٥ ـ غرائب القرآن ورغائب الفرقان، للقمي النيسابوري ـ تحقيق إبراهيم عطوة عوض. طبعة مصطفى الحلبي بمصر ١٣٨١هـ ـ ١٩٦٢م.

١٦ ـ فتح الباري بشرح صحيح البخاري، لابن حجر العسقلاني ـ بعناية محمد فؤاد عبد الباقي. دار المعرفة ـ بيروت ـ بدون تاريخ.

١٧ ـ في ظلال القرآن، لسيد قطب. دار الشروق ـ الطبعة العاشرة ١٤٠٠هـ ـ ١٩٨٠م.

١٨ ـ الكشّاف، للزمخشري. دار الفكر ـ بيروت ـ بدون تاريخ.

١٩ ـ مسند الإمام أحمد بن حنبل، تحقيق أحمد شاكر. دار المعارف بمصر ١٣٧٧هـ ـ ١٩٥٨م.

٢٠ ـ معالم في الطريق، لسيد قطب. دار دمشق ـ بدون تاريخ.

٢١ ـ المفردات في غريب القرآن، للراغب الأصفهاني ـ تحقيق محمد سيد كيلاني. طبعة مصطفى الحلبي بمصر ١٦٨١هـ ـ ١٩٦١م.

٢٢ ـ ملاك التأويل القاطع لذوي الإلحاد، لأبي جعفر بن الزبير الغرناطي ـ تحقيق د. محمود كامل أحمد. دار النهضة العربية ـ بيروت ـ ١٤٠٥هـ ـ ١٩٨٥م.

# نـێـوەڕۆك

پێشـەکی ........................................................ ٥
**چیـرۆکی یەکـەم : چیـرۆکی هـاروت و مـارووت** .................... ١١
واتاکانی وشـە نامۆکـان .................................... ١٣
چەند قسـەوباسێکی ئیسرائیلی لەسەر ئەم چیـرۆکە: ...................... ١٥
زانا سـاغکـەرەوەو لێکۆڵـیارەکان ئەو دەقانەی ئیسرائیلـیات ڕەت دەکەنەوە.......... ١٧
کـەواتە بەسـەرهاتەکـەیان چۆنـە؟!........................................ ٢٢
جوولەکـەکان واز لە هـەق دێنن بۆ ناهـەق ................................ ٢٥
شـەیتانەکانو، سـیحربازیو، سـولەیمان (سـڵاوی لـێبێت)........................ ٢٨
تیشـکێك لەسـەر گێڕانەوەکـەی (ابن عباس)..................................... ٢٩
شـەیتانەکان کـێبوون؟.................................................. ٣٠
مانای ﴿وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ﴾ .............................. ٣٢
سـیحر کفـرەو سـیحرباز کـافرە ........................................ ٣٥
ئایا ئامـرازی (ما) لە ئایەتەکـەدا (نافیـة)، یان (موصـولة)؟.......................... ٣٧
چۆن فریشـتەکان خەڵکـیان فێری سـیحر کردوە؟!........................... ٤٠
دیاری کردنی ئامـرازی (ما) لە ئایەتەکـەدا ................................ ٤٢
جـۆرەکانی سـیحـر......................................................... ٤٤
ئایا سـیحـر کاریگـەریی هـەیـە؟ یان خـەیاڵاندنـێکـە؟ .......................... ٤٧
سـیحـر کردن لە پێغـەمبەری خـوا ﷺ ........................................ ٥٠
سـیحری ڕەوا ((ان من البیان لسـحراً)) ...................................... ٥٩
پیـاوو ئافرەت" هـەریەکەیان هاوسـەری یەکتـرن ................................ ٦٦
سـیحرباز (ژنو پیاو) لە یەك دەکات ............................................ ٦٩
سـیحر بە خواسـتی خوا زیان دەگـەیەنێـت ........................................ ٧٣
زانسـتی زیانبـەخـش........................................................... ٧٦
" لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ " ............................................................ ٧٩
**چیـرۆکی دووەم: چیرۆکی ئەو پیاوەی کە بەلای شـارۆچکـەکەدا تێپەڕی**.......... ٨٣

